# کۆچ

٢٢

کۆچ بــەرەو مەعریفە

وەرزە گۆڤــارێکی روونـــاکبیرییە
گرنگی بە بواری لێکۆڵینەوە دەدات


**خاوەنی ئیمتیاز**

**عەلی عەبدوڵڵا کاکە ئەحمەد**

**سەرنووسەر**

**حەبیب محەمەد دەروێش**

٠٧٧٠١٥٨٢٧٣٨ — ٠٧٥٠١١٩٩٦٩١

habeblawyer@yahoo.com
govarikoch@yahoo.com

**دیزاینی ناوەرۆک**

**حیکمەت مەعروف / ئالین دیزاین**

**دیزاینی بەرگ**

**هەرێم عوسمان**

نرخ: ٤٠٠٠ دینار

**بۆ خوێندنەوەی سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری کۆچ، سەردانی ماڵپەڕی کۆچ بکە:**
www.govarikoch.com

**سەرنج:**

هەموو ئەو بابەتانەی لەم گۆڤارەدا بڵاودەبنەوە بۆچوونی نووسەرەکانیان دەردەخەن.

**بۆ ئەو بەڕێزانەی دەیانەوێت بابە تمان بۆ بنێرن،**
**تکایە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:**

١. بابەتەکان ئەگەر دەستنووس بوون، با لەسەر لاپەڕەی (A4) بێت و لەسەر یەک دیوی بە خەتێکی جوان بنووسرێت.
٢. پەراوێزەکان لە کۆتایی بابەتەکەوە بنووسرێن.
٣. سەرچاوەکان لە کاتی پێویستدا دیاری بکرێن.
٤. ئەگەر تایپکراو بوو لە ڕێگەی سیدی و فلاش میمۆری، یان ڕێگەی ئیمایلانەوە بۆمان بنێرن.

goavrikoch@yahoo.com , arsalantofiq@yahoo.com , salam_80jornalist@yahoo.com

٥. لە کاتی تایپکردندا تکایە بۆ زمانی کوردی فۆنتی (Ali_K_Sharif) و،
بۆ زمانی عەرەبی (Ali_A_Sharif) بەکاربهێنن.
٦. بابەتی وەرگێڕان، دەبێت دەقە وەرگێڕدراوە ئەسڵییەکەی لەگەڵ بێت.

– – –

**ئاگاداری:**

**خوێنەرانی خۆشەویستی گۆڤارەکەمان ئاگادار دەکەینەوە کە فایلی ژمارەی ئایندە لەسەر –**
**( لە سەلەفییەتی فیقهییەوە تا سەلەفییەتی جیهادی ) یە و دەتوانن بە بابەتەکانیان گۆڤارەکەمان دەوڵەمەند بکەن.**

## ناوەرۆك



— — —

**فایلی شەریعەتی ٢٣٥**



– – –

# ئایا ئیسلامییەکان دەبنە دۆست و داکۆکیکەری مافەکانی ژنان؟

## ململانێی و سازشەکان لەسەر ئەجێندای مافەکانی ژن لە تورکیادا

**نووسینی: سەربیل سانکۆ(*)**

**وەرگێڕانی: ماجید خـەلیل**

پرسیاری بنچینەیی لە چۆنیەتی پێشخستنی گفتوگۆی دێموکراسیدایە، گفتوگۆیەك کە لەسەر بنەمای فرەیی سیاسییدا بێت. ئەو فرەییەی کە هەردوو کاراکتەرە ئیسلامیی و لائیکەکان لەنێو کۆمەڵەگەیکی زۆرینە موسڵمانـدا گردبکاتەوە. لەم سۆنگەیەوە ئاتاجی ئەوە هەیە ئاماژەبکەین بەو جیاوازییە ئاشکرایەی کە لەنێو گروپە کـەمـینـە ئیسلامییەکانی نێو ولاَتانی کۆمەڵگەی مەسیحی و سیستەمی سیاسیی سیکۆلاردا هەیە لەگەڵ ئەو ئیسلامییانەی کە لە ولاَتێکی زۆرینە موسڵمانی رژێم دێموکراسیی و هاوسۆز بە ئیسلامییە. تورکیا تەنها نموونـەیـەکـی جـۆری دووهەمی ئەم نەزمی حوکمڕانییەیە. هەرچەند لەم دوو ساڵەی دوایشدا نموونەگەلێکیتری لەوجـۆرەی تـورکـیـا لـە چوارچێوەی ولاَتانی عەرەبیدا سەریانهەڵدا لەوانە میسر و تونس. لەوێندەریش هەوڵ و هەیەجانێك لە چـوارچـێـوەی راپەڕینگەلێکدا بۆ چنگخستنی فەرمانبەردارییەکی فرەڕەنگ هاتەگۆڕێ.

لەم توێژینەوەیەدا نموونەگەلێکی کەمان لەسەر هەڵمەتی مافەکانی ژنی تورکیـا وەك نـموونـەی دۆزی ژن دەستەبژێرکردووە کە تێیدا داتاگەلێکی تۆکمەمان لەمەڕ دیالۆگی پێشکەوتووخوازانە و ئەجێـنـدای پـێـکـەوەیـی مافەکانی ژن خستووەتەڕوو. لەڕاستیدا ئەورۆ جۆرێك لە پێکبەستەگی لەنێوان ئیسلامـیـیـەکـان و کـاراکـتـەرە ژنگەراکانی عەلمانیدا لەسەر گەلێ لە پرسەکانی وەکیەکیی جێندەری و قەدەغەکاری توندوتیژییە خـێـزانـیـیـەکـان روویداوە.

سەرەتا شیکردنەوەیەکی کورت لەمەڕ شێوەجیاوازەکانی رێکخراوەکانـی پـەیـوەسـت بـە مـافـی ژن و تایبەتمەندییان لەوبوارەدا دەخەینەڕوو. پاشان رادەی ناکۆکی و سازشەکانی نێوان کاراکتەرەکانی پاراستنی مافی ژن پیشاندەدەین. لەم روانگەیەوە بۆچوونی من وایە کە توێژەران پێویستە تیشك و تینیان بخەنەسەر زەمینە و ستراتیژی ئەو ولاَتانەی کە لە نەزمێکی وەهادان بتوانن جێگیری سیاسیی و پێشکەوتنی دێموکراستی چنگبخەن.

*) زانکۆی ئەنکەرە، فاکەڵتی زانستە سیاسییەکان.

**رامیاریە جیاوازەکان لەبارەی مافەکانی ژن لە تورکیا:**

کاتێك تەماشای بوونی بزووتنەوەکانی پەیوەست بە مافەکانی ژن دەکەین لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا، دەتوانین لەهەندێك باکگراوندی مێژوویدا پێکهاتەیەکی رەگەزیی ریشەدار و توێژ و چینگەلێکی جیاجیا پێشچاوبخەین کە تاوەکو ئەورۆ توانیویانە لەگەڵ رۆژگاردا بەربەن، نەوەکانیتریش هاوسەردەمیانە بە داب و پەرستشی سیاسی جیاجیا هاتوونەتە مەیدان. لەم رەوش و رووەدا، تورکیا دارای چوار مۆدێلی جیاوازە سەبارەت بە رەونەق و رامیاری مافەکانی ژندا. هەموو ئەمانە شانبەشانی یەکتر لە کار و چالاکیدان و تێکڕایان لە زەمینە سیاسی و مێژووییە جیاوازەکاندا بە وابەستەگیی و ئینتیمای سیاسیی جیاوازەوە لە رابردوو و ئێستادا نومایانی واقیعی ژن دەکەن لە تورکیا. هەموو ئەوانەیش بریتینلە نەتەوەگەرایی مۆدێرنی کەمالیستەکان، ژنگەراکان و ئیسلامییەکان، لەگەڵ مافی نەتەوەیی لەسەر بنەمای (نەتەوەی کورد) رامیاریی مافەکانی ژن.

**یەکەم: سیاسەتی مافەکانی ژنی نەتەوەگەرای مۆدێرن:**

جۆری نەتەوەگەرای مۆدێرن لە مافەکانی ژندا سەرتاترین چەشمەندازی رەوتێکە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەستپێکی سەدەی بیستەم و ساتەوەختی دامەزراندنی کۆماری تورکیا. ئەم مێژووە یەکانگیربووە بە سەردەمی دژە ئیستعماری و شێوەگیربووە لەگەڵ هەست و سۆزی نەتەوەیی کۆمەڵگای دوای داگیرکاریی تورکیا. ئەم قۆناغە مێژووییە ئاکامی عەلمانیی، ناسیۆنالیستی، دەسەڵاتدارییەتی مۆدێرن بوو کە شانبەشانبوو لەگەڵ ئەندازەی کۆمەڵایەتی و گواستنەوەی کۆپی و نەزمی کۆمەڵگەی خۆرئاوا بۆ تورکیا.

بەمجۆرە هەوەڵ شەپۆلی رامیاریی مافەکانی ژن وەك دەرهاویشتەیەکی ئەو قۆناغە مێژووییە هاتەبوون و هەروەها بووە رەگەزیی بنچینەیی پێکهاتەکانی ئەم سەردەمە مێژووییە. لەم قۆناغە مێژووییەدا رامیارییەکان رەنگڕێژبوون بە رامیاریگەلێکی نموزەجیی مۆدێرنیزەکراو و ژنیش بەشێکبوو لەو پرۆژەی نوێگەرییە کە رووی لە ولاّت نابوو، لەم پرۆژەیەدا ژنی سیکۆلار و مۆدێرن و شێوەژیانی خێزان بە نەزمێکی هاوچەرخ لەپێشچاوگیرابوو. هەموو ئەو رەوتە ژنگەرایەی ئەو سەردەمە لەسەر توراسی فێمێنیستە عوسمانییەکان خەملێن و خرۆشان کە دارای هەموو ئەجێنداکانی ئەم شەپۆلە ژنخوازەی سەدەی بیستەم بوون. ئەوان لەوقۆناغەدا خوازیاری مافی یەکسان و مامەڵەی یەکسانبوون وەك خواستێکی مافەکانی مرۆڤ. بۆنموونە یەکسانی لە هاوسەرگیری و خێزان و مافی یەکسانی لە خوێندنی گشتی و بەشداری یەکسان لەتێکڕای ئاستەکانی ژیانی مۆدێرنەدا. وەلێ ئەوان دارای زیاتر لەوەبوون. کاریان دەکرد بۆ زیاتر پڕچەککردنی ژن بە کەرەستەی کێشمە نوێیەکانی دنیای سەردەم، ئامانجیان بوو ژنان لەپاش پرۆژەی دەوڵەتی سەربەخۆ و نەتەوەی نوێی تورك هۆشیاربکەنەوە بە ژینگە و ژیانی نوێ و ئامادەکاریبکەن بۆ پشتیوانی لە بونیادنانی پرۆژەکانیان. ئەم نەزمە بەکاوەخۆ و نیانبوو، دروست هاوشێوەی بزافە دوا کۆلۆنییەکانی هاوشێوەی جایاواردینا( رێبەری تەفگەری فێمینیستی سریلانکا). دامەزرێنەرانی دەوڵەتی نەتەوەیی سیکۆلار دەستیانکردە ریفۆرمگەلێکی بواری یّنەریی لەڕێگەی دەستەبژێرکردن و هێنانەناوەوەی ژن بۆنێو بواری گشتیی و گرتنەبەری سیاسەتێك بۆ دروستکردنی کاراکتەری ژنی مۆدێرن وەك هێزێکی کاریگەریی

کۆمەڵگەی مۆدێرن. رۆڵی سەرەکی ژنان لەلایەن کاراکتەری پیاوانەوە نەخشەی بۆکێشرا و بەشێوەیەکی دیار لە شوێنەگشتییە و لە کرۆکی ئەجێنای کارەکانیاندا ژن لەپێشچاوگیرا. وەلێ بەشێوەیەکی نابەرابەر و نامەعقول، ژنان هیچ شوێنێك و هیچ ئاستێکی بالآیان لە دەوڵەتی نوێدا پێنەدرا. بەکۆتایهاتنی ئەم قۆناغە و بەتایبەتی لە سێ و چلەکانی سەدەی رابردوودا. لە بزووتنەوەی نەتەوەگەراکاندا جۆرێك لە هەماهەنگی پیاوسالارانە لەنێوان رێبەرانی نوێگەر و کۆنخوازی پیاوسالاردا بەرێوەبرا کە تێیدا ژنان لەدەرەوەی هێزی بونیادنان و لەدەرەوەی توانا سازی بونیادنانی نەتەوەییەوە مانەوە.

لەوقۆناغەدا بوونی ژن کورتکرابوویەوە لەهەندێك لە پێگە پیشەییەکان و نێوەندەکانی خزمەتگوزاریی گشتیدا کە بەجیاکاریی رەگەزیی و لەسەر بنەمای ملکەچیی بۆ بەرپرسایەتییە لۆکاڵییەکان تێکرای ئەوانە رەنگرێژکرابوون. لەبەرئەوە دەکرێت بڵێین لە قۆناغی سەرەتای کۆمار و ماوەکانی (١٩٢٠-١٩٦٠) رامیاریی لەمەڕ مافەکانی ژن خۆیدەبینییەوە لە بوار ریفۆرمەکانی یەکسانی رەگەزیی کە تێیدا مافە لۆکاڵییەکانی وەك هاوسەرگیریی و جیابوونەوە و حەزانە و هەتادوایی رەچاوکرابوون. بەمپێیە ژنان لە ساڵی ١٩٢٦وە بەتەواوی پێوەندییان لەتەك ئاییندا پچڕێنرا و وابەستەکران بەهەندێك بەندوباوی لۆژیکیی مافە مەدەنییەکانەوە. لەڕاستیدا ئەم هەنگاوە گرنگترین بەشبوو لە ریفۆرمە نوێیەکانی کۆماردا کە پاڵنەرێکی سەرەکی ئامادەکرد لەپێناو بزووتنەوەی مافەکانی ژندا، تا مافگەلێکیتر بۆ هەر ژنێك دەستەبەربکات بەبێ هیچ کەموکورتی و لەبیرچوونێك. بەداخەوە ئەمە خۆی لە قەرەی مافە سیاسییەکانی ژن نەدا. لە نووسینەوەی هەوەڵ دەستوری بنچینەیی کۆماری تورکیادا ١٩٢٤ مافە سیاسییەکان تەنێ بۆ پیاوان بوون. سیاسەتی هەوەڵ شەپۆلی دەستپێکردنی ئەجێندای مافەکانی ژن و سکالآی بندەسکردنی ژن سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا و ژنان لە کۆماری نوێدا مافە مەدەنییەکانیان وەك پێکهاتەیەك لە دەستوریی بنچینەیی ولآتدا نەناسرا، تابتوانن چالاکیی ئەنجامبدەن. دواتر لە ساڵی ١٩٣٤ ژنان توانییان مافی دەنگدان دەستەبەربکەن. بەمجۆرە دەساڵ دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا یەکەم ژن وەك پالێوراو بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان دەستنیشانکرا و هەمانساڵیش هەڵبژێردرا.

بۆیە کات فرە نالەباربوو بۆ دەستپێکی رامیاری دۆستانە لەگەڵ مافەکانی ژندا. بەشداری ئاسانی ژن لە دامەزراوە سیاسییەکاندا، وەك ئامادەییان لە پارتە سیاسییەکاندا و لەنێو پەرلەماندا، ئەو ئاڵۆزی و سەختییە بۆ بڕینی ئەو قۆناغە بە پەیوەندیداربوو بە راپەڕین و ئاڵۆزی فاشیستەکان لەسەراسەری ئەوروپادا کە بەتەواوی کاریگەریی هەبوو لەسەر حەوزەی سیاسیی کۆماریی ساوای تورکیا. ئیدی دوابەدوای ئەم کاریگەرییە سیاسییە دەوڵەتی تاکحیزبیی لەتورکیادا دەستیگرت بەسەر تەواوی مافە سیاسییەکانی ژندا و ژنانی بەتەواوی بندەست و دەماخکرد. ئەم شڵەژانە مێژووییە دارای کۆسپ و لەمپەربوو لەبەردەم کرانەوەی مافەکانی ژندا و کاریگەرییەکانیشی بەدرێژایی مێژووی کۆمار درێژەیکێشا. چەمکی مافی یەکسان بۆ ژنان لەوکاتەدا بەشێوەیەکی بنچینەیی دەربارەی پرسی هاوسەرگیریی بوون کە لەسەر بنەمای مافی رازیبوون و خواستی جیابوونەوە لەکاتی داواکردندا و مافی حەزانە بۆ منداڵ و هاوسەرگیریی لەتێکڕای تەمەنی مامناوەندیدا بوو. هەموو ئەو مافانە وەك بەشێك لە چاکسازی رژێمێکی سیکۆلار بە یاساییکرابوون. ئیدی ئەم لۆژیکی نوێگەرییە بووە لانکەی رامیاریی مافەکانی ژن و بەبێ گۆڕانکاریی

تاکۆتایی نەوەدەکان درێژەیهەبوو. بەهۆی پێشهاتی چەشمەندازەکانی ئەم بەردەوامییە، هەندێك لە مافەکانی ژن لەلایەن ڕێکخراوە سیکۆلار و نوێخوازەکانەوە وەك یاسا دەرچوێنرا و پشگیرییانلێکرا کە بەشێوەیەکی سەرەکی جەختکرابوویەسەر مافگەلێکی وەك مافی خوێندنی یەکسان بۆ کچان و تەواوکاریی ژنان بۆ ژیانێکی کۆمەلآیەتی مۆدێرن و پێشگیریی لەبەرێوەچوونی پاشماوەی هەندێك نەریتی باوکسالارانە و دیاردەی بەشوودانی بەتۆپزی و زووهاوسەرگیریی. ئەم دیدگا نوێگەرییە پەیوەستبوو بە مافەکانی ژنانەوە و جەختیکردەوەسەر مافی خوێندنی یەکسان و بەرابەر هاوکات هەندێك پیشەی باشکۆ ئەوانیشی گرتەوە وەك مامۆستای زانکۆ و کاری پارێزەریی و پزیشکیی. بەمپێیە هەموو ئەم سیاسەتانە نێوبران بە فێمینیزمی دەولّەت، چونکە یاسا و مافەکان بەکاریگەریی ڕێکخراوەکانی پەیوەست بە مافەکانی ژن هاتنەبوون و ئەوان هۆیەك بوون بۆ پەیوەندیکردن بە توێژی نەتەوەیی بالآدەست، بەلآم دیسان سیاسەتمەدارانی ژن نەیانتوانی ڕێگەبگرن لە مانەوەی ژنان لەپشت سیاسەت و دەسەلآتی پیاوانەوە لەنێو پارتی دەسەلآتداردا. ئەوان جیاکرانەوە و تەرخانکران بۆ بوارەکانی پەیوەست بە بەخششی کۆمەلآیەتی و کلتووریی و بەم نەزمە تاچەندین سالّ مانەوە لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی رابردووەوە ناسیۆنالیست و نوێخوازەکان لەسەروبەندی کردنەوەی هەلی یەکسانی خوێندن و بەسیکۆلارکردنی یاسای باریی کەسیین لەتورکیادا. جیا لەوانە ئەوان سەرنجی کەمتریانداوە لەچوونەپێشەوە بۆ بەشداری سیاسی و مەحرومییەتیان لە کێبڕکێی چوونەنێو پێکهاتەی هێز و دەسەلآتی میرییەوە. ئەوان ئێستایش لەهەمان پێگە و پێناوی کۆری رەگەزییەوە دەنالێنن کە شتێکی زیاترنییە جگەلە ئەولەوییەتدان بە بابەتەکانی سیکۆلاریزەکردن و نوێسازیکردن. رامیارییەکانی مافەکانی ژن لە تورکیا دارای چارەسەرێك نییە بۆ ئالۆزییەکان لەنێوان ئامادەیی گشتی و گوێڕایەلّی نێوخۆیی ژنان کە ڕێگادەکەنەوە بۆ گیرۆدەبوون لەداوی پیاوسالاریی مۆدێرن و سیکۆلاردا.

**تایبەتمەندییەکانی بزووتنەوەی فێمینیستی لەنەوەدەکاندا:**

لە ماوەی سالآنی هەشتا و نەوەدەکاندا شەپۆلی دووەمی بزووتنەوەی مافەکانی ژن لەتورکیادا سەریهەلّدا و پەلوپۆی داکوتا، ئەم شەپۆلە لەرێگەی گروپە ژنگەرا سەربەخۆکانەوە جێگەی خۆیکردەوە. ئاراستەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی ئەم گروپە فێمینیستییانە دروست لەگەلّ گروپەکانی پاش ١٩٦٨ی ئەوروپا هاوشێوەی یەکتربوون. ژنان لە چینەکانی نێوەندەوە و خۆنەوارەکانیان پێداگربوون لەسەر پرسەکانی هەیمەنەی نێرسالاریی و هەلّگری نەزعەی نیۆ چەپ و زەمینە سیاسی و لیبرالّییەکان بوون. ئیدی لە زەمینەیەکی لەمجۆرەدا ئەولەوییەتی ڕێکخستنەکانیان درابە سیاسەت و تایبەتمەندبوون لە زەمینەی سیاسیدا. لەوکاتەوەی کە رژێمی سەربازی تورکیا تەواوی بزووتنەوە سیاسییەکان و گروپە فێمێنیستییەکانی سەرکوتکرد. ئیدی بوارێك بۆ گەشونمای هاوسەنگی بزووتنەوەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیخوازیی نەمایەوە وەك ئەوەی کە لە ئەوروپای خۆرئاوادا دەگوزەرا. لە سالآنی نێوان ١٩٨٥-٢٠٠٠ تەواوی گروپە فێمینیستییەکان رووبەڕووبوونەوە لەتەك رەوشگەلێکدا کە لەلایەکەوە سوودمەندبوون و لەلایەکیتریشەوە دووچاری گرفتی کردن. ئەم بزووتنەوەیە وەك هێزێکی تەنهای راست زیاتر لە دەهەیەك رووبەرووی تەواوی بزووتنەوەکان وەستا. لە دەستپێکی نەوەدەکاندا گروپە فێمێنیستییەکان وەك گروپی سیاسی و بەئەجێندای

دژە پیاوسالارییەوە هاتنەمەیدان. ئەوان بەزوویی لەگەڵ رەوتە لیبراڵ و کۆنخوازەکاندا دووچاری مشتومڕبوونەوە، ئەمە لەبری کاراکتەری سیاسیی رامیاریی ئازادیی هاتنەگۆڕێ بۆنموونە مافە مەدەنییەکان و بزووتنەوەکانی ئاشتی و رەوتەچەپەکان هەروەك چۆن لەتەواوی جیهاندا لە گەشونمادان. لەکۆتایی نەوەدەکاندا بزووتنەوەی فێمینیستی کەموزۆر دەرکەوتبوو، ئامادەیشبوو کارلەسەر رەوشەکە بکات. بەندە سەرەکییەکانیان کارکردن لەسەر ئەجێندایەك بوو کە جیاوازییە رەگەزییەکان بسڕێنەوە و ریفۆرمگەلێکی یاسایی بهێنێتەگۆڕێ. رێکخراوە فێمێنیستییەکان و گروپە سەربەخۆکان هەڵمەتی رێکخراوەییان دەستدایە بۆ نەهێشتنی رەوشێك کە تێیدا ژن قوربانی جیاوازی رەگەزی و توندوتیژییە، لەوێدا ژن وەك توندوتیژی تاکەکسی و توندوتیژی وەك گروپ و کۆمەڵ لەتە لە پێگەی دەدرێ. بۆنموونە دورخستنەوەی ژنانی سیاسی لە پێگە بالاکاندا و بندەستکردنیان و هاوکات جیاکاریی رەگەزیی لە بواری پیشەیی و بوارەکانی هاتوچۆ و هەڵسوکەوتی بەڵتەییانە لە بواری ژیانی بازرگانی و پیشەییاندا و یا کاریی لەسەر بنەمای رەگەز لەمیدیادا. ساڵی ۱۹۹۰ وەزارەتی کاروباری ژنان دامەزرا. هاوکات کاراکتەری مێیینە لە بوارەکانی رامیاریی مافەکانی ژندا کەوتنەخۆ. لە کۆتایی نەوەدەکاندا جۆرێکیتر لە گروپەکانی ژن هاتنەنێو کایەی رێکخراوەییەوە، هەموو ئەمانە هەڵگری جۆرێك لە ئەجێندای دیاریکراوبوون لەبارەی مافەکانی ژنانی تورکیا. هەموو ئەوانە بەشێوەیەکی گشتی رێکخراوگەلێکی ژنخوازی کوردیی و ئیسلامیبوون.

## قەیرانی دەوڵەتی نەتەوەیی تورکیا و گەشەی رامیاریی شوناسیی رەگەز، بزووتنەوەی فێمێنیستی کوردیی دوای ۲۰۰۰:

بزووتنەوەی ئازادیخوازیی نەتەوەی کورد لەبەر زەبری رامارییی توانەوەی نەتەوەیی کورد کە رژێمی سەربازیی لەهەشتاکاندا پێرەویدەکرد مایەپوچببوو. رەوشی سەرکوت و توانەوە بزووتنەوەی بەرگریی چەکاریی دژبە مێریی هێنایەبوون. تەڤگەریی چەکاریی کورد خوازیاریی بەفەرمیی ناساندنی جیاوازییە نەتەوەییەکانیان بوو، هاوکات داوایاندەکرد دەوڵەت لەسەر بنەمای دەوڵەتێکی فرەنەتەوە بونیادبنرێتەوە و دەستورێکی نوێ دابرێژرێت کە ئاماژە بە کوردەکان بکات وەك بەشێکی بنچینەیی لە پێکهاتە نەتەوەییەکانی ولاتدا. لەوساتەوە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە کێشمەکێش و جەنگایە دژبە بانگەشەی یەکشوناسیی نەتەوەیی تورکیا. فەرهەنگی سیاسیی تورکیا پشتدەبەستێت بە یەك زمان و یەك نەتەوە و یەك کەڵچەر کە ئەویش تایبەتکارە نەتەوەییەکانی تورکن. بەپێچەوانەیشەوە کورد خوازیاریی دەوڵەتێکی بنکە فراوانی نەتەوەیین لە زەمینەکانی سیاسەتدا. بەمجۆرە ژینگەی رامیاریی تورکیا رێگەیکردەوە لەبەردەم فرسەتی پێدابوونی تەڤگەریی رێکخراوەیی فێمێنیستی کوردی بەتایبەت لەونێوچانەدا کە زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن. هەربۆیە لە سایەی ئەم رەوشە سازدراوەدا دوو جۆر لە رێکخراویی ژنان لەو قۆناغەدا هاتنەپێش. یەکەمیان رێکخراوگەلێکی فێمێنیستی کوردی بوون، ئەوان دوا بەدوای رێکخراوە فێمێنیستییەکانی سەراسەریی ولات کەوتنە جووڵەو هاتنەمەیدانەکەوە. ئەوان دارای پێگەیەکی سەربەخۆ و جیابوون و دژی بزووتنەوەی سیاسیی نەتەوەی کورد و پارتە سیاسییەکان بوون، لەوانە هەردوو گەریلا چەکدارییەکانی پەکەکە و پارتی کۆمەڵگەی دێموکراتی هەڵبژێردراوی نێوپەرلەمان. ئەوان بەماوەیەکی کەم توانییان رێکخراوگەلێکی کارا و

کارامە و مەزن پێکەوەبنێن و توانیان تۆڕێکی گورجوگۆڵ و بەرفراوان دابمەزرێنن بەناوی کامێر[١]. ئیدی لە کۆتایی نەوەدەکانەوە ڕێکخراوە فێمێنیستییەکانی کورد و ڕێکخراوە فێمێنیستیەکانی تورك پێوەندییەکی تونـدوتۆڵیان هەبوو، بەگشتی پێکەوە چاپوك و چالاکبوون و کاریانئەنجامدەدا. ئەم بزووتنەوە فێمێنیستیانەی مافەکانی ژنی کورد بەگورجی لە سەراسەری ولاتدا دەنگۆ و کاردانەوەی مەزنیان لێکەوتەوە و کاریگەری فراوانیان کردەسەر شوناسی نەتەوەیی جوولانەوەی سیاسیی کورد. ئیدی بڕیاریاندا سازگاربن لەگەڵ مافە نەتەوەییەکانی کوردا و ڕێگەبکەنەوە لەبەردەم شوناسی نەتەوەییدا و هاوکات بیانپەرژێتەسەر مافەکانی ژنی کورد وەك دۆزێك کە لەپێناویدا دروستبوون. ئەوان وەك ناوەندەکانی ژن دامەزران کە وابەستەبوون بەوشارەوانییانەی کە فەرمانبەردارەکانیان کوردبوون و وەك نوێنەری زۆرینەی کورد لە ڕێکخراوەکانی پارتی کۆمەڵگەی دیموکراتیدا هەڵبژێردرابوون. ئەوانە زیاتر لە ڕۆژهەلات و باشووری ڕۆژهەلاتی ولاتدا ئاپۆرایان بەستبوو. هەموو ئەو ڕێکخراوانە زۆر بەخێرایی ئاوێتەی باقی ڕێکخراوە ژنگەراکانیدیکە بوون[٢]. ئەوە لەکاتێکدایە کە ئەولەوییەتی ئەمانیش دراوە بە رامیارییەکانی پێناسیی نەتەوەچییەتی. ئیدی بەتێپەڕبوونی کات رامیارییەکانی ئیتنی کورد لەگەڵ پارتی سیاسیی هەڵبژێردراوی نێوپەرلەمان توانیان نەریتی چەقبەستوویی و سنوورەکانی رامیارییەکانی پارتە نەتەوەییەکان بەگورجی تێپەڕێنن. ئیدی ئەو ڕێکخراوانە بوونە قارەمانی بەدەستهێنانی پشکی ٤٠٪ لە هەڵبژاردنە لۆکالی و نەتەوەییەکانی ولاتدا و زیاتر لەوەیش ئەوان داوایانکرد سیستمی خولانەوە و دەستاودەستکردنی دەسەلات لەنێوان دوو ڕەگەزدا و هاوکات بوونی ڕێبەری ژن لە لقەکانی حیزب و بازنەی هەڵبژاردنەکاندا لەتەواوی شار و شارۆچکەکاندا. ئیدی بوونە نوێنەری پارتە سیاسییەکان و بەڕێژەی بەرزەوە وەك نوێنەر و پەرلەمانتار خۆیاندییەوە. ئیدی ئەم دیاردەیە ڕێگەیدا تا لیستەکانیتر و پارتەکانیتر بیربکەنەوە و ڕێژەی کاندیدە ژنەکان لە لیستی هەڵبژاردنەکاندا بەرزبکەنەوە. پێویستە ئاماژە بۆئەوەیش بکرێت کە لەماوەی دەیەی رابردوودا هەماهەنگی و کاریگەرییەکی دوو لایەنەی گەورە لەنێوان ڕێکخراوەکانی ژنان و بزووتنەوە نەتەوەییەکانی پارتە کوردییەکاندا هەبووە. ئیتر فێمێنیستەکان تێگەیشتن لەو نەزمە ناهەموارەی کە چۆن ڕەخنەبگرن لە رامیاری توانەوەی نەتەوەکان بەهۆکاریی نەتەوەی زۆرینە و سەردەست.

لەلایەکیترەوە کوردەکان ڕێگایان خۆشکرد بۆ دەستپێکی رامیارییەکی نوێی جێندەریی کاریگەر کە هاندەربوو بۆ دەرچواندنی گەلێ بڕیاری پەیوەست بە مافەکانی ژنان و بەرابەریی جێندەریی لەنێوچە دابڕاو و دوورەکانی جوگرافیای ڕۆژهەلاتی ولاتدا. بەتێپەڕبوونی کات، هەردوو ڕێکخراوە ژندۆستەکانی کورد و فێمێنیستە سەربەخۆکانی ڕەگەزیی کورد بوونە بەشێك لە تۆڕێکی بەرین و فراوانی نەتەوەیی و بوونە پلاتفۆرمێك بۆ داکۆکیکردن لە ئەجێندای مافەکانی ژن، بەلام هەموو ئەمانە زۆر هاوکار و هەماهەنگی یەکترنەبوون و ریزەکانیان تۆکمەنەبوو، ئەوەیش بەهۆی مشتومڕ و ناکۆکییان لەسەر رامیاریی خەباتی بەرگریکارانە و چەکدارانەی پەکەکە هاتبووەئاراوە کە دژی ئەو نەزمە بیرکردنەوەیە بوون. لەم نێوەندەدا ڕێکخراوە فێمێنیستییەکانی تورك ببوونە نێوەندێك لەنێوان ئەواندا و کاریاندەکرد تا بەشێوەی جیا بەشداریبکەن لە پلاتفۆرمی مافەکانی ژندا. هەربۆیە ئەمڕۆ بەبێ بەشداریکردنی جۆرە جیاوازەکانی ڕێکخراوەکانی مافەکانی ژنی کورد، ناتوانرێت ئەجێندای مافەکانی ژنان بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بەئاکامبگەیەنرێت.

**ڕێکخراوەکانی ژنانی ئیسلامی و دیاردەی نوێی سیمای ژنی موسڵمان:**

ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا لە وڵاتانی ئیسلامیی وەك توركیا تێبینیدەكرێت، بریتییەلەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەی کە خەریکە ئیسلام تێیدادەبێتە کەلتورێکی بنچینەیی و نموزەجێکی سیاسیی کاریگەر. ئەمڕۆ دیاردەی ئیسلامی لە بەشەکان و ئاستە کۆمەڵایەتییەکاندا زیاتر لەپێشوو دەردەکەوێت و ڕەنگێکی ئیسلامییانە لە بوارە جیاجیاکاندا لەبرەودایە. هاوکات وەك بەشێك لەوکاریگەرییانە ژنان و چالاکوانانی ژنانی ئیسلامی زیاتر لەنێوەند و بوارە کۆمەڵایەتییەکاندا دەردەکەون.

**دەتوانین چالاکوانە ئیسلامییە ژنەکان لە کۆمەڵگەی سیاسیی تورکیادا و لەم زەمینە نوێیەدا پۆلێنبکەین بۆئەمانەی خوارەوە:**

**یەکەم:** گروپەکانی ژنان لەنێو ڕێبازە ئایینییە ترادیشناڵەکاندا وابەستەبوون بە ستایلێکی کۆنی ئەرسەدۆکسیی لەئیسلامدا. ئەمەیش بۆ ژنان بەردەوام هێزێکی داوە کە پیاوان لە ڕێڕەوی ڕێبەرایەتی خۆیان لەنێو سیاسەتی ڕێبازە ئاینییەکاندا بەڕەوا بزانن.

هەربۆیە ئەم ڕەوشە ٤ گرفتی پەیوەندیداری لەخۆیدا گردکردووەتەوە:

**یەکەم:** بەگوێرەی گەلێ لەو هەڵسەنگاندنانەی کە ئەنجامدراون لەنێوان ژنانی فێمێنیستی سیکۆلارو ئیسلامگەراکانی داکۆکیکار لەژن، ئەوە ڕوون بووەتەوە کە ئەوان دارای دانوستانو نێزیکبوونەوە نینو بەچاوی ئایدیالۆژییەوە دەڕواننە قەسدو قانونی ڕێکخراوەیی یەکتریی‌و لە کەمپینو بزووتنەوە بەرگریکارانەکانی ەبارەت بەمافی ژنان لێك دوورن ئەو ڕەوتە ئیسلامیانەیش زێدەتر بریتین لە ڕێکخراو گەلێکی ژنان لە نەزمی شێوە مێمناوەندی نێو تۆڕە سۆسیۆئاینییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی یاخود ڕێکخراوە نابەرژەوەندخوازەکانی وەك ئەکەپە و بزووتنەوەی گولەنییەکان و.. هتد

**دووەم:** ڕێکخراو گەلێکی ژنان لە نەزمی شێوە مێمناوەندی نێو تۆڕە سۆسیۆئاینییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی یاخود ڕێکخراوە نابەرژەوەندخوازەکانی وەك ئەکەپە و بزووتنەوەی گولەنییەکان و.. هتد.

**سێهەم:** ژنانی نێو ئیسلامییە جیهادییەکان یاخود ڕەوتە سیاسییە فەندەمێنتالیستەکان کە فرە بەتوندی بەستراون بە ئیسلامییە دەمارگیرەکانی نموونەی وەك حیزبوڵلاّوە.

**چوارەم:** ڕێکخراوگەلێکی ژنانی نیمچە سەربەخۆی گچکە وەلێ ڕێکخراوی ژنانی ئیسلامیی کاریگەرن، ئەوانەی بوونەتە زەمینەی پلاتفۆرمگەلێکی نوێ، بۆ نموونە مێمبەری نێوەندیی ژنان ( Başkent Kadın Platformu). بەجۆرە دەرکەوتنی چالاکییەکانی ژنانی ئیسلامی وەك دەرکەوتەیەکی نوێ بەو نەزم و شێوازە جیاوازە ڕێگەی خۆشکرد بۆ دەرکەوتنی ژنانی موسڵمان لە بوارە گشتییەکاندا. ئیدی دەنگ و ڕەنگی ڕێکخراوە ژنگەرا ئیسلامییەکان قابیلی چاوپۆشی نەبوونو گەلێ پرسوجۆی جدییان ورووژاندز ئیدی ئەو پیاوسالارییەی کە نەزمیی ڕژێمی ئاینیی شوێنیکردبوویەوە ڕوونەبوو ئایا ملدەدات بۆئەو گۆڕانە شکلییەی کە هاتووەتە نێونـاوانەوە کە دەتوانین ئاماژەبکەین بە چەند زەمینەیەکی هەڵتۆقیوی ئاینیی لەم بوارانەی خوارەوە:

ژنانی موسڵمان ئاماژەن بە نەریتێکی ئایینی لە رەفتار و رەوشە نوێیەکاندا کە هەموو ئەو تایبەتمەندییانەیش دەدرێنەپاڵ پراکتیکە ئاینییەکانی مێیینە و مەعریفەیان لە راڤەی قورئانیدا بۆ چوارچێوەی ئافرەت. لەراستیدا دەرهاویشتەکانی ئەم پەیوەستییە ئاینییەی ژنان دەمانباتەوە بۆ هێما و هێزێکی پیاوسالاری لە خودی پراکتیکەکەدا کە ئەویش بالاپۆشکردن و بانگەشەی حیجابە بۆ مێیینە. هاوکات ئامادەیی ژنانی ئیسلامی لە میدیا نێونەتەوەیی و جیهانییەکانیشدا لە رەوشێکی ئێزگار بالادایە و بەرەو ئاستێکی بەرز دەکشێن، هاوکات زمان و گوتاری ئیسلامییەکان وەختە ببێتە زمانێکی ئاشکرا و باو لەکۆمەڵگەکاندا، هەروەها بەشداریی ژنانی موسڵمان لە پرۆسەی دەرچواندنی بریاردا لەنێو دامەزراوە سیاسی و پارتە سیاسییەکاندا لەرێگەی ئێن جی ئۆکانی چالاکوانە سیاسییە ئیسلامییەکانەوە رێگەیان بۆ خۆشکراوە

لە دەساڵی رابردوودا رێکخراوەکانی ژنان لە بوارە گشتییەکانی کارکردندا زیاتر بەردیدەدەکەون و زیاتر لەنێوەندە سیاسییەکان و دەسەلات نێزیکدەبنەوە. دیارە ئەم ژینگەیەیش بەهۆی سەرکەوتنەکانی پارتی دادوگەشەپێدانەوە هاتووەتەدی کە سەروساختی لەگەڵ ئیسلامگەراییدا هەیە و سێ جار توانیویەتی لەهەڵبژاردنەکاندا زۆرینەی زۆری دەنگەکانی تورکیا بەدەستبهێنێت. هەربۆیە لە رەوشێکی وەهادا لێکنێزیکبوونەوەی تەوژمی ئیسلامخواز و ژنگەراکان بەشێوەیەکی بەرچاو لەتورکیادا رەچاوکرا. لێرەوە ئیدی مشتومرەکان لەبارەی فێمێنیزمی ئیسلامی هاتنەنێو کایەی رۆشنبیریی و کۆمەڵگە و ناوەندەکانی بریاری تورکیاوە. لەمیانی سەرهەڵدانی دەستەواژەی فێمێنیزمی ئیسلامی لەنەوەدەکاندا، ئیدی وەك دیاردەیەك بوویە جێگەی بگرەوبەردە و لەسەر راوەستان. ئەم مشتومرانە سەریکێشا بۆ ناکۆکیگەلێکی جیاواز، لەوێدا سەرچاوە هزرییەکانی قورئان وەك پاساوێك بۆ یەکسانی ژن دەهێنرانەوە و هاوکات ئاوێتەدەکران بە پراکتیکیی ئاینیی ژنانەوە وەك کاروبارێکی ئازادیخوازانە، لەلایەکیتریشەوە هەندێك دەگەران تا بەرگرییبکەن دژ بەوتەوژمەی کە دەیهەوێت پراکتیکیی هەیمەنەی ژن بەنێوی ئایینەوە لە ژیانی ژناندا بەرجەستەبکات. بەمجۆرە فێمێنیزمی ئیسلامی لەنێو چوارچێوەی پلار و رەخنەگەلێکدا گەشەیکرد، ئەم نماکردنەیەی لە نواندنی رۆژهەلاتگەرایی بوو لەنێو خۆرئاوادا کەوەك جەستەیەکی پەیوەست خۆی نومایاندەکرد و وەك نانوێگەرێك هاتەناو پرۆسەکەوە. رەوشەکە لەتورکیاوە دەستپێکرد، لێرەدا پێویستە ئاماژە بە دوو سیاسەتی ژنانی ئیسلامگەرا بکرێت کە لەنێو بزووتنەوە ژنخوازە ئیسلامییەکاندا لەبرەودان. زۆرینەی رێکخراوەکانی ژنان کە چالاکییە ئاینییەکانی ژنانیان رێکخستووە، پشتیوانی تەواو لە رژێمی باوکسالاریی دەکەن و لەپاش ئەو چالاکوانە ژنخوازانەوە دێن کە بریارەکانیان لە چوارچێوەی ئەولەوییەتی سیاسیدان لەبەرئەم راستییەیە کە هەموو ئەو گروپانە پێویستە بەشێویەکی جیاواز لە فێمێنیستە ئیسلامییەکان مامەڵەیان لەتەکدابکرێت. هەرچۆنێکبێت ئەم دوو جۆرە پێوەندییەکی نێزیکیان لەنێواندا هەیە، لەبەرئەوە هەردوو لایان لەهەمان زمان و نەزمی ئاینیدا بەشدار و هاوبەشن. هاوکات هەندێك پێکدادانی ئاشکرا لەنێو ئەمانەدا هەیە. فێمێنیستە ئیسلامییەکان بچووکن، وەلێ گروپگەلێکی کاریگەرن و کاریگەریی بەهێزیان هەیە لەسەر نەوەی ئایینخوازی ئەورۆ.

**قۆناغگەلی بزووتنەوەکانی ژنانی ئیسلامیی:**

هەوەڵجار ژنانی ئیسلامی وەك بەشێك لە ئیسلامییە فەندەمێنتالیستە سیاسییەکان هاتنەنێو دیمەن و دامەزراوە سیاسییەکانی تورکیا و خێرا بوونە بەشێك لە رامیارییە کۆنەپەرست و کۆنخوازییەکەی هەشتاکانی تورکیا. لەمیانی ئەم قۆناغە سەرەتاییەدا. زمانی ژنانی ئیسلامی گۆشکرا لەسەر بنەمای رەخنە و پلار لە رەوشی مۆدێرنێتە و عەلمانیگەرای تورکیا. لەوکاتەدا بەهیچ کلۆجێك رووی رەخنەکانیان لە نەزمی باوکسالاریی نەبوو کە لەنێو زانیارییە پراکتیکییەکانی ئیسلامێدا شوێنی کرابوویەوە، بەڵکو ئەوان بەگورجی تەحەدای رەنگ و بۆی مۆدێرنێتە و نوێخوازییەکانی خۆرئاوایان دەکرد لەسەر سیما و سنوورەکانی کاری ژناندا. هەربۆیە لەوەدەمەدا رامیاریی حیجابی ژنانی ئیسلامی بە نەزمێکی بنچینەیی دژ بەو بە سیکۆلارییەتی کۆمەڵگەی تورکیی بەشێوەیەکی گشتی. ئەوان بەسەختی لە بانگەشەی مافگەلێکدا بوون وەك بالاپۆشی لە دامەزراوەکانی فێرکردن و خوێندندا و هاوکات خواستی پەچە و عابابوون لە بواری خزمەتگوزارییە گشتییەکان و بوارە گشتییەکانی وەك مەیدانی کاری پارێزەریی و وانەبێژی و.. هتد.

چالاکی ژنانی موسڵمان بووە مایەی ململانێیەکی قووڵ لەنێوان کاراکتەرە سیاسییە عەلمانی و ئیسلامییەکان. هاوکات ململانێکە تەشەنەیسەند بەرەو نوێنەرانی میریی لەنێوان کاراکتەرە مەدەنییەکان و پارتە سیاسییەکاندا و دواجار ململانێکە خزایەنێو دەسەلاتە کارگێڕییەکان و تەنانەت دادگای بالای دەوڵەتیشی گرتەوە. لەکۆتاییدا و بە بڕیاری دادگا لە مانگی هەشتی ١٩٩٧دا لەلایەن میریی و دادگای بالا و رامیارییەکانی قەدەغەکردنی حیجاب لەتورکیادا کارپێکرا. ئیدی ئەم قۆناغە بەهاندان و دەستێوەردانی سەربازیی بۆنێو کایەکانی سیاسەت لەلایەن میرییەوە توانرا حەسمبکرێت و چەلەحانێکان کۆنترۆڵبکرێت، دیارە ئەمەیش لە مانگی یازدەی ١٩٩٧دا سەریهەڵدا. ئیدی هەمووجۆرە رەوتە ئیسلامییەکانی ژنان دەستیاندایە هەنگاونان بەرەو ناڕەزایی دەربڕین دژ بەقەدەغەکردنی حیجاب و بالاپۆشی لە نێوەندەکانی خوێندن و لە حەرەمی زانکۆکاندا. لەوکاتانەدا پیاوانێکی ئیسلامی لە هێڵی پێشەوەی ناڕەزاییەتییەکاندا دەبینران و رژابوونەسەر شەقامەکان، ژنانیش کە لەوەدەچوو سەرخەر و پشتیوانی چالاکییەکانی وانن، لە ریزەکانی پاش ئەواندا ستاریانگرتبوو.سیاسەتمەدارە ئیسلامییەکان ژنان و حیجابی ژنانیان وەك هێمایەك بۆ رەواییدان بە تەڤگەرێکی مەدەنی لەپێشچاو دانابوو. ئەوان ژنانیان وەك دڵی ئەجێندا سیاسییەکانیان بەکاردەهێنا. تاوای لێهات پیاوان کەوتنە دوای جووڵانەوەی ژنان و ژنان بوونە کاراکتەرێکی سیاسی و چالاکتر لەمەیدانەکەدا و سەربەخۆیانە پەرژایانەسەر بەرگریکردن لە خواستەکانیان. لەپاش ٢٠٠٢ کاتێك پارتی دادوگەشەپێدان توانی لەهەڵبژاردنەکاندا سەرکەوێت و دەسەلاتی حکومەتی گرتەدەست. ئیدی خواستی ئافرەتانی بالاپۆش بۆ مافی حیجاب پەسەندیی لە بوارەکانی کارکردندا ئێجگار بەرینتر تورکیای گرتەوە. هاوکات ململانێی هەوادارانی پارتی فەرمانڕەوای ئیسلامی بۆ بەرگریکردن لە حیجاب لەبەرامبەر هەوادارانی دادگەی بالا بۆ قەدەغەکردنی حیجاب بووە مایەی قەیرانێکی نوێ لەتورکیادا. بەتێپەڕبوونی کات کۆدەنگییەکی لاوەکی لەسەر رەوازانینی حیجاب لە حەرەمی زانکۆکاندا هاتەگۆڕین وەلێ لەنێو پەرلەمانی نەتەوەیی تورکیادا ئەو دیاردەیە هەر بەقەدەغەکراوی مایەوە. لەبەرئەوە دیاردەی حیجاب نەیتوانی بخزێتەنێو دامەزراوە بالاکانو وەزیر و ئەندام پەرلەمان

و بیۆکراتەکانی میریی نەگرتەوە. هاوکات سەرەڕای ئامادەیی بەرچاوی ژن لە شوێنە گشتییەکاندا، وەلێ جیاکاری رەگەزی و ملکەچی و نەویبوونی ژن لە زۆرێك لە رێکخراو و دامەزراوە ئیسلامییەکاندا هەر بەزەقی تێبینیدەکرا. هەربۆیە بەهۆی دوالیزمەی سیاسییە ئیسلامییەکانەوە لەسەر رەوت و رەونەقی ژن لە بوارەکانی ژیاندا ئیدی کارەکتەری ژن و چالاکوانە ئیسلامییەکانیان دەرگای رەخنە و دەمی تووڕەییان دژ بە پیاوانی سیاسیی ئیسلامی کردەوە.

**هەڵمەت و بانگەشەکانی مافەکانی ژنان:**

لێرەدا وەك نموونە لەنێو تێکڕای چالاکییە سیاسییەکاندا پێشنیازی هەندێك لە رەوتە ئیسلامییەکان و رێکخراوە فێمێنیستییەکانی تەوەرەی مافەکانی ژن خراونەتەڕوو کە دەتوانرێت لەنێزیکەوە هەڵبسەنگێنرێن. لەڕاستیدا ئیسلامییەکان و کارەکتەرەکانی مافەکانی ژنانی فێمێنیست لەمیانی ئەو هەڵمەتانەدا لەسەر پرسی مافەکانی ژن، هەم دارای هاوهەڵوێستی و هاوئامانجی بوون هەمیش لەبوارگەلێکدا هەمەچەشن و هەمەرەنگ بوون هەڵمەتگەلێك بۆ شرۆڤە و وردبوونەوە لەم بوارانەدا:

**یەکەم:** چاکسازی لە یاسای باری کەسێتی و یاسای تاواندا (١٩٩٥-٢٠٠٥)

**دووەم:** گرتنەبەری نەخش و رێوشوێنی سیاسەتی داهاتوو لە لابردن و سڕینەوەی توندوتیژی دژ بە ژن (٢٠٠٥ تاوەکو ئێستا)

**سێهەم:** بەرهەڵستکاریی لەبارەی رامیاریی قەدەغەکردنی بالاپۆشی (١٩٩٧-٢٠١١)

**چوارەم:** پشگیریی بۆ هەڵمەتی (نا حیجاب، نا دەنگدان) کە لە هەڵبژاردنە گشتییەکانی ٢٠١١ دا راگەیەنرا.

**پێنجەم:** بەرهەڵستکاریی بۆ گۆڕینی رەشنووسی تایبەت بە رێنومایی لەباربردنی زارۆ ( ٢٠١٢)

**هەڵمەتەکان:**

**کەیسی یەکەم:** هەڵمەتی چاکسازی مافکانی ژن و بەرهمهێنانی رامیاریگلێکی گشتی (١٩٩٥-٢٠٠٢)

هاوپەیمانێتییەکی تۆکمە لەنێوان کارکتەرەکانی مافخوازانی ژن و پێکەوەپەیوەستبوون و گەڕانەوە بۆ دۆخی نیوەی نەوەدەکان. لەڕاستیدا کۆششێکی زۆر لەنێوان فێمێنیستی تورکیدا کە رەگەزەکانی عەلمانییەکان و چەپەکان دەیجوولاند لەتورکیادا تادەستێکی ٢٠٠٠ سەریهەڵدابوو، ئەوان گرنگترین خاڵی تایبەتمەندییان لەوەدابوو مافی ژنیان لە ئایدیۆلۆژیای حیزبی جیاکردەوە. بۆئەم مەبەستەیش چەندین بڕیار و یاسای پەیوەست بە مافی ژنانەوە هاتەگۆڕێ. لەپاش هاتنەسەرکاری پارتی دادوگەشەپێدانیش کە پێشینەی ئیسلامگەرایی و راستڕەوی لەمۆخیاندا زیندووە. دیسانەوە ژنانی ئیسلامگەرا هەمان تەقلیدی ژنانی چەپ و نەتەوەیی و دیموکراتخوازیان کردەوە. هەرچەند لەڕووکەشدا چەمکی حیجاب بووەتە مشتومڕی نێوەندە میدیاییەکان، وەلێ ئەوە گرفتێکە وابەستەیە بە زەینی میدیاکانەوە و هیچ لەمپەرێکی لەپێش جووڵە و چالاکی ژندا دروستنەکردووە. ژنی تورکیا ئەمڕۆ هێزێکی کاریگەرە و لە دووهەزارەکانەوە هەنگاوگەلێکیان بڕیوە کە ژنانی ئەورووپا بە پەنجاساڵ جا توانیان ئەو هەنگاوانە ببڕن. ئەمڕۆ ژن لە تورکیا چ ئیسلامی و چ عەلمانی و چ ژنانی کرێکار و فەرمانبەر و وابەستە بەخێزانیش دارای مافگەلێکی

بنچینەین لە دەستوری نوێی تورکیادا. هەرچەند کە ئیسلامییەکان بە سنوور و حەزەرەوە ئافرەتیان هێناوەتەپێشەوە، بەڵام بە توێژی واقیع و بە جوهدی سەنگینی ژنان ئەوان بوونەتە پەرچەمهەڵگری ئازادی ئافرەت و ئافرەتیان هەمیشە وەك کایەی زیندووی بڕیار تەماشاکردووە و نموونەی دەستبردن بۆ پرسی ئافرەت لەلای ئیسلامییکانی تورکیا نموونەیەکە جیاواز لە ئیسلامییەکانی خەلیج و ئاسیای ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی دوور و دەکرێت تەقلیدی ئەو میکانیزمە لە دنیای ئیسلامیدا ببێتە ئەمری واقیع.

•••

١) http://www.kamer.org.tr

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە رێکخراوە فێمێنیستییە سەربەخۆکانی کورد= بڕوانە: http://www.vakad.org.tr

٢) For the women's organizations working paralel to ethnic identity parties and local governmennts look at:

**سەرچاوەکان:**

1) June 2012, http://www.turknorthamerica.com/
2) Kürtaj yasağına karşıyım", Fatma Bostan Ünsal - 09.06.2012, Taraf
3) kurtajyasaklanamaz.com
4) http://bianet.org/bianet/toplumsal-cinsiyet/139069-kadinlar-kurtaj-icin-orta-yolun-sartlarini-acikladi.
5) For protest movements watch these: http://www.youtube.com/watch?feature=player_embedded&v=Vt579R6RhoM.
6) http://saynoabortionban.com.

# سوهرەوەردی و ئیشراقییەکان

وەرگێڕانی: دیار عەبدولباقی خەلیل

**زەمینەی پێش سوهرەوەردی:**

فەلسەفەی پیادەڕەوەکان کە لەگەڵ ئیبن سینا گەیشتە لوتکەی بالآیی خۆیی، لەدوای ئەو بەهۆی هەندێك لە قوتابییە شایستەکانی وەکو (بەهمەنیار و ئەبو عەباسی لۆکەری) بلآوبووەوە و پەرەیسەند، هەر لە سەرەتای ئەوکارەوە بووە جێی رەخنەی هەندێك لە زانایانی (فیقە)و سوفییەکان کە لایەنگری شێوازی تەواو بەڵگەیی ئەرستۆ بوون. لە سەدەی چوارەم دوژمنێکی نویّ چووە ریزی بەرهەڵستکارانەوە و لەراستیدا بووە بەرهەلستکارترین دوژمنی فەلسەفەی پیادەڕەوی. ئەم بەرهەڵستکارە تازەیە، زانستی کەلامی ئەشعەری بوو کە شێوازی سەرەتایی ئەو لەلایەن (ئەبو حەسەنی ئەشعەری) دارێژرابوو و دوای ئەو لەلایەن کەسانێکی وەکو (ئەبوبەکری باقەلانی) لە سەدەکانی چوارەم و پێنجەم شرۆڤەکرا و وردەوردە پەسندکرا لەلایەن رێبازی سوننەوە.

لە سەدەی چوارەم دەسەڵاتی خەلیفەکانی عەباسی سنووردارببوو و میرە ناوچەییەکان کە زۆرینەیان شیعە بوون و سەبارەت بە زانستی ئەقلی لەبەرانبەر زانستی گوازراو (نقلی) کە پەیوەستە بە قورئان و فەرموودەکانە، بیروبۆچوونێکی نەرمونیانتریان هەبوو، ئەم میرانە دەسەڵاتداری وڵاتە ئیسلامییەکان بوون.

کەواتە زانستە ئەقلییەکان کە فەلسەفە یەکێك بوو لەوان، بەردەوام لەپەرەسەندندابوو و وەهاپەرەسەندنێکی بەخۆوەدی کە دەتوانرێت بە سەدەکانی چوارەم و پێنجەم بگوترێت (سەدە زێرینەکان)، بەڵام وردەوردە بارودۆخی سیاسی گۆرا، لە سەدەی پێنجەم (سەلجوقییەکان) کە قارەمانانی رێبازی سوننە بوون و لایەنگری خەلیفە عەباسییەکان بوون، توانییان خاکی ئاسیایی رۆژئاوا بەتەواوەتی داگیربکەن و حکومەتێکی ناوەندی بەهێز بونیادبنێن کە لەرووی سیاسی لەژێر دەسەڵاتی سوڵتانە سەلجوقییەکان بێت و لەرووی ئایینیشەوە سەربە خەلیفەکانی بەغدا بێت.

هەر لەمکاتەدا بوو کە پەسەندکردنی بیروبۆچوونەکانی قوتابخانەی کەلامی ئەشعەرییەکان دەستپێکرد و کۆمەلەناوەندێکیان بۆ فێرکاری بنەمای بیروباوەرەکانی ئەم قوتابخانەیە و بلآوکردنەوە و پەرەسەندنی بونیادنرا، وەهابوو کە زەمینە رەخسا بۆ هێرشە بەناوبانگەکانی (غەزالی) لە دژی فەلسەفە. غەزالی زانایەکی فیقە و موتەکەلیمێك بوو کە لە فەلسەفە تێدەگەیشت و کاتێك کە گومانێکی ئایینی بۆ دروستببوو بۆ رزگاربوون لەونەخۆشییە دەروونییەی، روویکردە سوفیگەرێتی و دلْنیایی و ئاسوودیی لەودا بەدەستهێنا. لەئەنجامدا بەهۆی

ئەوەی خۆشەویست و زانابوو و ئەوئەزموونەی هەیبوو، هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی رێچکەی تەواو بەڵگەیی لە جیهانی ئیسلامیدا. بۆئەم مەبەستەش سەرەتا فەلسەفەی پیادەڕەوی لە کتێبێکی خۆیدا "مقاصد الفلاسفه" کە یەکێکە لەباشترین پوختکراوەکانی ئەم فەلسەفەیە لە جیهانی ئیسلامیدا شرۆڤەکرد و پاشان لە کتێبی زۆر بەناوبانگی خۆی "تهافت الفلاسفه" هێرشیبردووەتەسەر ئەو بیروباوەڕانە کە لەگەڵ فێرکارییەکانی سروشی "وەحی" ئیسلام ناگونجێت.

دەبێت ئەوەبزانین کە هێرشی غەزالی بۆ فەلسەفەی تەواو بەڵگەیی زیاتر لەلایەنی سۆفیگەری ئەوەوە سەرچاوەدەگرێت، هەتا لایەنی ئەشعەری بوون و بیروبۆچوونە کەلامییەکانی، ئەگەرچی لەنووسینەکانی، بۆنموونە "المنقذ من الضلال" لەگەڵ ئەوەی بیروڕای موتەکەلیمەکانی بەگونجاوتر و کۆکتر دەزانی لە بیروڕای فەیلەسوفەکان لە ئاست بنەماکانی بیروبۆچوونە ئیسلامییەکان، بەڵام بیروبۆچوونی ئەو تەنها سوفیگەرێتییە کە ئامرازی گەیشتن بەدڵنیایی و بەختەوەری دەخاتە بەردەستی مرۆڤ. لەراستیدا گرنگی غەزالی لە مێژووی ئیسلامیدا تەنها لەورووەوە نییە کە هێز و دەسەڵاتی رێچکەی تەواو بەڵگەیی کەمکردووەتەوە، بەڵکو لەو رووەشەوەیە کە وایکرد سۆفیگەرێتی لە دیدی زاناکانی فیقە و موتەکەلیمەکان، شایستەی پەسندکردن و رێزلێگرتنبێت. لەکۆتاییدا وەهایلێهات کە فێرکاری سۆفیگەری بە ئازادی لە قوتابخانە ئایینییەکان رەواجی پەیداکرد، تەنانەت گەر کەسانێکی وەکو (ئیبن تەیمییە و ئیبن جوزی) جاربەجار دەرکەوتوون و هێرشیانکردووەتەسەر سۆفیگەرێتی، بەڵام دەنگی دژایەتیکردنیان نەگەیشتووەتە گوێی کەس و نەیانتوانیوە لە رێزی کۆمەڵگاکانی ئایینی بۆ سۆفیگەری کەمبکەنەوە. نووسینەکانی غەزالی لەراستیدا لەرووییەکەوە نوێنەری لایەنی ناوەکی "باطني" ئیسلامییە کە بۆئەوەی بتوانێت ژیانی دەروونی خۆی لە چوارچێوەی دنیای رووخساری و رواڵەتی پارێزگاری لێ بکات، دەرکەوتێکی رۆخساری گرتۆتە خۆ. لەگەڵ هاتنە سەرکاری غەزالی درێژەی فەلسەفەی پیادەڕەوی لە رۆژهەڵاتی ئیسلامی دەستپێکردووە و ئەم فەلسەفەیە بەرەوە رۆژئاوا و ئەندەلوس سەفەریکرد، لەوێدا کۆمەڵێك فەیلەسوفی بەناوبانگی وەکو (ئیبن باجە، ئیبن توفەیل و ئیبن روشد) بۆ ماوەی یەك سەدە گرنگیانداوە بە گەشەکردن و پەرەسەندنی. ئیبن روشد، قارەمانی گەورەی فەلسەفەی ئەرستۆیی لە ئیسلام و باشترین شرۆڤەکاری نووسینەکانی ئەو زانایە لە سەدەکانی ناوەراست هەوڵیدا تاکو ئەو گورزەی غەزالی لە کتێبی "تهافت الفلاسفه" لەو فەلسەفەیەی داوە، بە گورزێکیتر لە کتێبی "تهافت التهافت"ی خۆی بەرپەچ و تۆڵەبکاتەوە.

بەلام داکۆکی ئەو لە فەلسەفە لە جیهانی ئیسلامیدا ئەوەندە کاریگەرنەبووە کە لەرۆژئاوادا کاریگەربوو و لەوێدا زیاتر گوێیان لە قسەکانی دەگرت. قوتابخانەیەك بەناوی (قوتابخانەی ئیبن روشدی لاتینی) بونیادنرا کە ئامانجی پەیرەوکردن بوو لە فیرکارییەکانی ئەو و جێکردنی لە جیهانی مەسیحییەتدا. بەمشێوەیە دەکرێت بلێین لەوکاتەدا کە قوتابخانەی ئەرستۆیی وەکو سیستەمێکی فەلسەفی، تەواو پەیوەست بە فەلسەفەی بەڵگەیی لە جیهانی ئیسلامی بەلاوەنرا، ئەم فەلسەفەیە لەرێگای وەرگێرانی بەرهەمەکانی پیادەڕەوەکانی رۆژهەلات، وەکو (فارابی و ئیبن سینا)و هەروەها بەرهەمی ئەندەلوسییەکان و بەتایبەت ئیبن روشد ناسرا و لەرۆژئاوادا دەستپێکرد. لەراستیدا جیابوونەوەی رێگاکانی نێوان هەردوو شارستانییەتی مەسیحییەت و ئیسلام، لەدوای سەدەی حەوتەم دەتوانرێت

تارادەیەکی زۆر لەرێگای رۆڵێك کە فەلسەفەی تەواو بەڵگەیی لە هەریەکە لەم دوو شارستانییەتەدا هەیبووە روونبکرێتەوە. لەرۆژهەڵاتدا، لەبەرئەنجامی هێرشەکانی غەزالی و ئەوانیتر، وەکو (فەخرەدینی رازی) هێزی رێچکەی تەواو بەڵگەیی رووی لەکزی کرد و زەمینەی بۆپەرەسەندنی بیروباوەڕی ئیشراقی سوهرەوەردی و عیرفانی قوتابخانەی (ئیبن عەرەبی) رەخساند، بەڵام لەرۆژئاوادا هاتنی رێچکەی تەواو بەڵگەیی ئەرستۆ رۆڵێکی کەمتری نەبووە لەوێرانکردنی "قوتابخانەی ئەفلاتونی ئۆگوستینی کۆنی وەستاو لەسەر ئیشراق"، لەکۆتاییدا بەرپەرچدانەوەی ئەو، دروستبوونی شێوەیەکی قوتابخانەی تەواو بەڵگەیی و سروشتی و نائایینی بوو کە لە سەدەی رێنیسانس، خۆی دژەقوتابخانەی فێرکاری سەدەکانی ناوەراستی وێرانکرد.

**ژیان و بەرهەمەکانی سوهرەوەردی:**

زانایەك کە بیروڕاکانی ئەو تارادەیەکی زۆر، بەتایبەت لە ئێران، جێگری فەلسەفەی پیادەڕەوی بوو کە کەوتبووەبەر هێرشی توندی غەزالی، (شەهابەدین یەحیا کوڕی حەبەشی کوڕی ئەمیرەکی سوهرەوەردی بوو کە هەندێکات ئەویان بە نازناوی (مەقتول= کوژراو) ناودەبرد، بەڵام زیاتر و بەتایبەت لەلای کەسانێك کە هەتائێستا قوتابخانەکەی ئەویان بە زیندوویی هێشتووەتەوە، بە نازناوی "شێخی ئیشراق" بەناوبانگە.

ئەو شایستەییەی نەبووەنسیب کە بەرهەمەکانی لە سەدەکانی ناوەراست وەرگێڕدرێتەسەر زمانی لاتینی و هەتا ئەم سەدانەی دوایی لەرۆژئاوادا دەکرێ بڵێین نەناسراوبوو، لەم دواییە هەندێك لە توێژەران کە (هانری کوربن) یەکێك بوو لەوان، زنجیرە خوێندنەوەیەکی گرنگی لەبارەوەکرا و هەندێك لە بەرهەمەکانیان وەرگێرا. هیشتا دەکرێ بڵێین لە دەرەوەی ئێران بە نەناسراوی ماوەتەوە، ئەم گوتەیە لەوەدا دەردەکەوێت کە لە زۆربەی کتێبەکانی مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی، (ئیبن روشد) یان بە لێکۆڵینەوەیەکی زیاتر (ئیبن خەلدون) بە خاڵی کۆتایی مێژووی ئەقلی ئیسلامی هەژماردەکەن و بەشێوەیەکی گشتی هیچ لەبارەی قوتابخانەی ئیشراق و ئیشراقییەکانی پاش سوهرەوەردی، ناڵێن. جگەلەوەش، زانایانی تازەی عەرەب، پاکستانی و هیندیش ئەو هەڵەیە دووبارەدەکەنەوە" هۆکاری ئەمەئەوەیە کە متمانەی ئەوان زیاتربە کتێبەکانی رۆژهەڵاتناسە تازەکانی مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی و لەگرنگیی قوتابخانەی ئیشراق بێئاگا ماونەتەوە و لەوانەیە ئەمە لەبەرئەوەبووبێت کە حیکمەتی ئیشراق سەرەتا لە ئێران دەرکەوتووە و هەرلەوێدابووە کە تاکو ئەم سەردەمە ماوەتەوە.

کاردانەوەی شیعە و سوننە، سەبارەت بە فەلسەفە جیاوازی هەبوو. لە جیهانی سوننی، پاش داڕووخانی قوتابخانەی پیادەڕەوی، دەکرێ بڵێین فەلسەفە نەما و لەقوتابخانەکاندا تەنها لۆژیك دەخوێنرا، جگەلەوە بیرباوەڕی عیرفانی بەهێزبوو و تەنانەت بووە بەشێك لە بەرنامەی قوتابخانە ئایینییەکان. لە جیهانی شیعەدا بارودۆخ بەتەواوەتی شێوەیەکیتری هەبوو، قوتابخانەی سوهرەوەردی لەلایەك و لەلایەکیترەوە فەلسەفەی ئیبن سینا و لەلایەکیترەوە بیروڕا عیرفانییەکانی ئیبن عەرەبی ئاوێتەبووبوون و ئەم کۆمەڵەیە چوونە چوارچێوەی شیعەوە و لەراستیدا شێوەی بەرزەخێکی نێوان فەلسەفە و عیرفانی پەتی گرتەخۆ. لەبەرئەم هۆیەیە کە هەرتوێژەرێك ژیانی ئەقلی ئێران و ئەو ناوچانەی کە کەلتوری ئێرانی کاریگەربووە بەسەریانەوە - وەکو هیند کە لەوێدا بیرباوەڕی

ئیشراقی تەنانەت لەنێوان سوننەکانیش باوی هەبووە - توێژینەوەی لەبارەوەبکات، دەگاتە ئەوئەنجامەی کە فەلسەفەی ئیسلامی لە واتا راستەقینەکەی، بە ئیبن سینا کۆتاییهاتووە، بەڵکو لەپاش مردنی ئەو و بڵاوبوونەوەی بیروبۆچوونەکانی سوهرەوەردی لە ناوچەکانی رۆژهەلاتی ئیسلامی دووبارە دەستپێکرد و سەرلەنوێ بووژاوەیە.

سوهرەوەردی لە ساڵی (٥٤٩)ی کۆچیی، لە گوندی سوهرەوەردی زەنجان هاتەدنیاوە، لەم گوندە پیاوگەلی بەناوبانگیتریش هاتووەتەدنیای ئیسلامییەوە. خوێندنە سەرەتاییەکانی لە مەراغە لەلای (مەجدەلەدینی جیلی) تەواوکرد و ئەم مەرەغایە هەمان ئەو شارەیە کە هۆلاکۆی مەغۆل تێدا بە ئاماژەی (خاجە نەسرەدینی توسی) نۆرپنگەیەکی دروستکرد کە ناوبانگی جیهانی پەیداکرد. سوهرەوەردی دواتر روویکردە ئیسفەهان کە لەوسەردەمەدا گرنگترین ناوەندی زانستی بوو لەئێراندا، درێژەی خوێندنی لەلای (زوهێرەدین قاری) تەواوکرد. جێی سەرسوڕمانە کە یەکێك لە هاوپۆلەکانی ئەو (فەخرەدینی رازی) بوو کە لە گەورە پیاوانی دژەفەلسەفە بوو، لەبەرئەوەی لەدوای ئەوکاتەوە و لەپاش مردنی سوهرەوەردی بەرگێك لە کتێبی "تەحویلات"ی ئەویان پێدا، رازی کتێبەکەی ماچکرد و بە یادی هاورێی کۆنی قوتابخانەکەی کە رێگایەکی پێچەوانەی ئەوی هەڵبژاردبوو، فرمێسکی بەچاودا هاتەخوارەوە.

سوهرەوەردی لەگەڵ کەمی تەمەنی، نزیکەی پەنجا کتێبی بە فارسی و عەرەبی نووسیوە کە زۆربەیان گەیشتوونەتە دەستی ئێمە. نووسینەکانی شێوازێکی سەرنجراکێشیان هەیە و لەرووی ئەدەبییەوە بەبایەخن و ئەوانەی بە فارسین بە شاکاری (نثر)ی ئەم زمانە هەژماردەکرێن کە پاشان بوون بە سەرمەشقی (نەسر- نثر) نووسی چیرۆکی فەلسەفی. بەرهەمەکانی چەند جۆرێکن و دەکرێ دابەشیانبکەین بۆ پێنج جۆر یان بەش:

١. چوار کتێبی گەورەی فێرکاری و تیۆری کە هەموویان بە زمانی عەرەبین، لەوانەدا لە فەلسەفەی پیادەڕەوی بەوشێوەیەی کە لەلایەن سوهرەوەردی شرۆڤەکراوە و گۆرانی بەسەرداهاتووە لێکۆڵینەوەی لەبارەوەدەکرێت، پاشان لەسەر بنەمای ئەم فەلسەفەیە، حیکمەتی ئیشراق لێکۆڵینەوەی لەبارەوەدەکرێت. ئەم چوار کتێبە بریتینلە: (تحویلات، مقاومات، مطارحات - ئەم سێ کتێبە لەوگۆرانە دەدوێن کە بەسەر فەلسەفەی ئەرستۆدا هاتووە -و لەکۆتاییدا شاکاری سوهرەوەردی واتا "حکمە الاشراق" کە تایبەتە بە دەربڕینی بیروباوەڕی ئیشراقی.

٢. کتێبگەلێکی کورتتر بە فارسی و عەرەبی کە لەوانەدا بابەتەکانی چوار کتێبەکەی پێشوو بە زمانێکی سادەتر و بەشێوەیەکی پوختتر شرۆڤەکراون، ئەوانەش بریتینلە: "هیاکل النور و الالواح العمادیه" پێشکەشکراون بە "عیمادەدین" کە هەردووکیان بە عەرەبی و فارسی نووسراون، پەرتونامە، فی اعتقاد الحکماء، اللمحات، یەزدانشناخت و بوستان القلوب. ئەم دوو کتێبەی کۆتایی دراوەتەپاڵ "عەینەلقوزاتی هەمەدانی"و "سەیید شەریفی جوزجانی"، بەڵام ئەگەری زیاتر هەیە کە سوهرەوەردی خۆی خاوەنی بێت.

٣. چیرۆککگەلێکی هێمایی و نهێنی و شاراوە یان چیرۆکگەلێك کە لەوانەدا باس لە سەفەری دەروون (نفس) دەکرێ لە قۆناغەکانی بوون و گەیشتن بەئاسوودەیی و ئیشراق. ئەم کتێبانە هەموویان بە فارسی نووسراون، بەڵام هەندێکیان وەرگێرانی عەرەبیشیان هەیە. ئەوانەش بریتینلە: "عەقلی سوور، ئاوازی پەڕی جوبرائیل، الغربة الغربیة، لوغەتێ موران، رسالة في حالة الطفولیة، رۆژێك لەگەڵ کۆمەڵەی سوفییەکان، رسالة في المعراج و سەفیرێ سیمورغ."

٤. نووسین، وەرگێران، شرۆڤە و تەفسیرگەلێك کە سەبارەت بە کتێبە فەلسەفییەکانی کۆنتر و هەروەها سەبارت بە

قورئان و فەرمووده نووسیوێتی. وەکو: "وەرگێرانی "رسالة الطیر"ی ئیبن سینا، شیکارێك بۆ "ئیشارات"ی ئیبن سینا" نووسینی "رسالة في حقیقة العشق" کە لەسەر بنەمای کتێبی "رسالة في العشق"ی ئیبن سینا دارێژراوە و کۆمەڵە تەفسیرێك بۆ چەند سورەتێکی قورئان و هەندێك لە فەرموودەکان.

٥. دوعاگەلێك و موناجاتنامەگەلێك بە زمانی عەرەبی کە سوهرەوەردی ئەوانی بە "الواردات و التقدیسات" ناوناوە.

ئەم کۆمەڵە بەرهەمە و شرۆڤەگەلێك کە لەدرێژایی حەوت سەدەی رابردوو لەبارەیانەوە نووسراون، سەرچاوەی زانیارین لەبارەی بیرباوەڕی قوتابخانەی ئیشراق. گەنجینەیەکە لە حیکمەتێك کە تێیاندا هێماگەلێك لە میراتی یەك بەدوای یەکی زەردەشتی، پیتاگۆراسی (ڤیساغۆرس)، ئەفلاتونی و هورموزی خراوەتەسەر هێما و نیشانە ئیسلامییەکان، چونکە سوهرەوەردی لە سەرچاوەی جیاواز سوودیوەردەگرت. لەمبارەیەوە هیچ دوودڵییەکی نەدەکرد لە دۆزینەوەی هەرشتێك کە بەگونجاوی بزانیایە لەگەڵ بیروڕای گشتی خۆی، لەهەرشوێنێك بێت پەسەندیبکات و بەکاریبهێنێت لە بیروڕاکانی، بەڵام جیهانی ئەویش هاوشێوەی ئیبن عەرەبی جیهانێکی ئیسلامییە کە لەئاسمانیدا هەندێك هێما و نیشانەی بەرلە ئیسلام دەبینرێت و بەهەمانشێوەی ئەو کلێسا جیهانییەی (دانتە) شیکردووەتەوە کلێسایەکی مەسیحییە کە جوانکاریی ئیسلامی و ئەسکەندەرانی پێوەدیارە.

### سەرچاوەکانی حیکمەتی ئیشراق

ئەو سەرچاوانەی سوهرەوەردی تێیاندا رەگەزگەلێکی دەهێنا و لە لێکدانی ئەوانە حیکمەتی ئیشراقی خۆی پێکهێنا، بەرلەهەموویان بەرهەمە سۆفیگەرییەکان بەتایبەت نووسینەکانی (حەلاج و غەزالین) کە "مشکوه الانوار"ی غەزالی کاریگەرییەکی راستەوخۆی بەسەر پەیوەندی نێوان رووناکی و ئیمام بەوشێوەیەی کە سوهرەوەردی لێتێگەیشتووە هەبووە. سەرچاوەیەکیتر، فەلسەفەی پیادەڕەوی ئیسلامییە و بەتایبەت فەلسەفەی ئیبن سینا کە سوهرەوەردی دواتر رەخنەیلێگرت، بەڵام ئەوی بۆتێگەیشتن لە بنەماکانی ئیشراق بەپێویستدەزانی. لە سەرچاوەکانی بەرلە ئیسلام لە قوتابخانەی پیتاگۆراسی و ئەفلاتونی و هەروەها هورموزی بەوشێوەیەی کە لە ئەسکەندەرییە هەبوو و دواتر لەلایەن سابئینی حەڕان پارێزرابوو و بڵاوبووبووەوە کە بەرهەمە هورموزییەکانیان هاوشێوەی کتێبە ئاسمانییەکان تەماشادەکرد، سوودێکی تەواوی لێوەرگرتوون.

لەسەرووی ئەم سەرچاوە یۆنانییانە، سوهرەوەردی گرنگی بە حیکمەتی ئێرانییە کۆنەکان داوە کە خۆی لە هەوڵی زیندووکردنەوەی ئەوانەبوو و زاناکانیانی بە میراتگری راستەوخۆی حیکمەتێك دەزانی کە بە سروش بۆ پەیامبەر (ئیدریس) یان (ئەخنوون) بە عیبری (ئەنوخ) پەیامبەری بەرلە تۆفان نێردراو، زانا موسوڵمانەکان ئەویان لەگەڵ هورموز بە یەك کەسی هەژماردەکەن. بە ئاماژە بۆ ئایینی زەردەشتی، سوهرەوەردی زیاتر بەلایەنی هێمای رووناکی و تاریکی و فریشتەناسی گرنگیداوە و زۆرێك لە چەمکەکانی هەرلەوێوە وەرگرتووە، بەڵام سوهرەوەردی بەباشی ئەوەی پیشانداوە کە دوانەپەرەستنەبووە و ئامانجی ئەوەنەبووە کە پەیڕەوی لە فێرکارییەکانی رووخساری و

روالّەتی زەردەشتییەکان بکات، بەڵکو خۆی لەگەڵ گروپێك لە حەکیمەکانی ئێرانی بە هاوشێوە دەزانی کە بیرباوەڕی ناوەکی (باطني) وەستاو لەسەر یەکتایی باوەڕی خودایی هەیانبووە کە وەکو نەریتی کۆتایی و نهێنی لە ئایینی زەردەشتیدا هەبووە، هەروەکو خۆی نووسیوێتی:

(لەنێوان ئێرانییە کۆنەکان گروپێك لە خەڵکی هەبوون کە ڕێوشوێنی خودایان گرتبووەبەر و خودا لەسەر ڕێی ڕاست پێشەواییانیدەکرد، ئەم حەکیمە دێرینانە لە کەسانێك نەدەچوون کە خۆیان بە (موغ) ناودەبرد. حیکمەتی خودایی و ئیشراقی ئەوان کە دۆخەکان و ئەزموونە ڕۆحانییەکانی ئەفلاتون و هاوتوێژەکانی ئەویش گەواهی بوون بۆئەو، ئێمە دووبارە لە کتێبی خۆمان، (حكمه الاشراق) زیندوومانکردووەتەوە).

لەگەڵ ئەوەشدا نابێت وەهابیربکەینەوە کە سوهرەوەردی لەگەڵ بەهرەمەندبوون لەم هەموو سەرچاوە جیاوازانە جۆرێك قوتابخانەی (بەشبەشی) بونیادناوە، بەڵکو ئەوخۆی بە کەسێك دەزانێت کە ئەوەی بە (الحكمة الدنية)و (الحكمة العتيقة) ناونراوە سەرلەنوێ کردوویەتییە یەك. ئەو لەوباوەڕەدا بوو کە ئەمە حیکمەتێکی هەمەکی و هەتاهەتاییە کە بەشێوەی جیاواز لەنێوان هیندییەکان، ئێرانییەکان، بابلییەکان و میسرییەکان و هەروەها لەنێوان یۆنانییەکان هەتا سەردەمی ئەرستۆدا هەبووە. لە دیدی سوهرەوەردی حیکمەتی ئەرستۆ دەستپێکی فەلسەفەی یۆنانی نەبووە، بەڵکو کۆتایی ئەوبووە، بەپێی بیرباوەڕی ئەو ئەرستۆ بەسنووردارکردنی حیکمەت بەهۆی بەڵگەییکردنی کۆتایی بە میراتی کۆن هێناوە .

شێوە تێڕوانینێك کە سوهرەوەردی لەبارەی مێژووی فەلسەفە هەیبووە، خۆی زۆر جێی ئاماژەیە، چونکە لایەنی سەرەکی حیکمەتی ئیشراقی بەدیاردەخات، بەپێی بیروڕای سوهرەوەردی و هەندێك لەنووسەرەکانیتری سەدەکانی ناوەڕاست حیکمەت یان حیکمەتی خودایی (ئیلاهی) لەلایەن خودا و لەڕێگای سروش گەیشتووەتە پەیامبەر ئیدریس یان هورموز. ئیدریسیان لەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست لە ڕۆژهەلآت و هەندێك لە قوتابخانەکانی ڕۆژئاوا بە دامەزرێنەری زانستەکان هەژماردەکرا. حیکمەت لەپاش ئەو بوو بە دوو بەشەوە، یەکێکیان هاتە ئێرانەوە و ئەویتر چووە میسر، لەوێوە چووە یۆنان و پاشان هاتەناو شارستانییەتی ئیسلامییەوە.

سوهرەوەردی فەیلەسوفە بەناوبانگەکانی بەگرنگترین کاریگەری ڕاستەوخۆی لە جیهانی ئیسلامی نەدەزانی، بەڵکو یەکەمین سۆفییەکانی بەهۆکاری کاریگەر بەسەر خۆی دەزانی. لەیەکێك لە نووسینەکانی باس لە خەیاڵێك دەکات کە تێیدا نووسەری کتێبی (ئوسۆلۆژیای ئەرستۆ) کە ئەوی بە هی ئەرستۆ دەزانی و لەڕاستیدا هی ئەفلۆتین بوو - ڕووبەڕووبووەتەوە و لەوپرسیاریکردووە کە ئایا پیادەڕەوانێکی وەکو (فارابی و ئیبن سینا) دەتوانرێت بە فەیلەسوفی ڕاستەقینە لەئیسلامدا بزانین یان نا؟ ئەرستۆ لەوەڵامدا گوتویەتی کە "یەك لەهەزاریشا وانییە، بەڵکو حەکیمە ڕاستەقینەکان (بوستامی و تستەری) سۆفی بوونە".

بیروڕای سوهرەوەردی لەبارەی گواستنەوەی ئەم حیکمەتە هەمەکییە جیهانییە بەهۆی زنجیرەیەك حەکیمی دێرین - کە هەندێکیان حەکیم و پاشاکانی چیرۆکەکانی ئێران بوونە- دەتوانرێت بەمشێوەیەی خوارەوە پوختبکرێت:

| | |
|---|---|
| هورموز | |
| ئاگاسدمۆن(شیس) | |
| ئەسقلبیۆس | شا کاهینانی ئێرانی |
| پیتاگۆراس | کیومەرس |
| ئەمبادوکلیس | فەرەیدون |
| ئەفلاتون و (ئەفلاتونییە نوێیەکان) | کەیخەسرۆ |
| زۆلنونی میسری | ئەبو یەزیدی بوستامی |
| ئەبو سەهلی تستەری | مەنسوری حەلاج |
| ئەبو حەسەنی خرقانی | |

سوهرەوەردی وەها کە دەردەکەوێت، شێخی ئیشراق خۆی وەکو ناوەندێك دەزانی کە ئەو دوو میراتە حیکمەتەی کە لە سەرچاوەی یەکەمین پەیدابووبوون دووبارە بۆ هەمان خاڵ گەراندووەتەوە و بوونەتە یەك. بیرۆکەی ئەو ئەوەبوو کە حیکمەتی زەردەشتی و ئەفلاتون تێکەڵبکات و لێکیانببەستێت و بەهەمانشێوە کە (گمیستۆس پەلسۆن) پاش سێسەدە، هەستا بە هەوڵێك لە شارستانییەتی هاوسێی واتا رۆمی رۆژهەڵات، لەگەڵ ئەوەی گرنگی ئەم دوو پیاوە بەتەواوی جیاوازبوونە لەگەڵ یەك.

### واتای ئیشراق

نووسەر و فەیلەسوفە ئیسلامییەکان لەبارەی واتای ئەمجۆرە لە زانینە (مەعریفە) کە سوهرەوەردی لە لێکدانی دوو میرات حیکمەتێکی بەرهەمهێنا و ناویناوە ئیشراق، لەبیروڕادا لەگەڵ یەك جیاوازیان هەیە.

جوزجانی لە کتێبە بەناوبانگەکەی واتە "تعریفات"، ئیشراقییەکانی بە "فەیلەسوفانی قوتابی و پەیڕەوکاری ئەفلاتون" ناودەبات. لەکاتێکدا کە (عەبدولڕەزاق کاشانی) لە شرۆڤەی بۆ "فصوص الحکمی" ئیبن عەرەبی" ئەوانە بە پەیڕەوکارانی (شیس) هەژماردەکات کە بەپێی سەرچاوە ئیسلامییەکان بونیادنەری دامەزراوەکانی توێژی پیشەوەران بووە، بەڵام (ئیبن وەحشییە) کە تا ئەوشوێنەی دیارە یەکەمین کەسە لە جیهانی ئیسلامی کە چەمکی ئیشراقی بەکارهێناوە، ئیشراقییەکان بە چینێك لە کاهینە میسرییەکان دەزانێت کە خوشکەزای هورموز بوونە.

لەم پێناسانە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە هەموویان حیکمەتی ئیشراقیان پەیوەستکردووە بە سەردەمی پێش ئەرستۆ، واتە کاتێك کە هێشتا فەلسەفە شێوازی تەواو بەڵگەیی نەگرتبووەخۆی و دۆزینەوە و شهودکردنی هزری هێشتا باشترین رێگابوو بۆ بەدەستهێنانی زانین. سوهرەوەردی خۆشی پێناسەیەکی هاوشێوەی بۆ حیکمەتی ئیشراقی کردووە:

ئەگەرچی بەرلەنووسینی ئەم کتێبە کتێبگەلێکی کورت و پوختم لەبارەی فەلسەفەی ئەرستۆ نووسیوە، ئەم کتێبە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانە و خاوەنی جیاوازە. هەموو شتەکانی لەرێگای بیرکردنەوە و بەڵگەهێنانەوە

دەستەبەرنەکراوە، بەڵکو دۆزینەوە و شهودی هزری و تێرامان و کرداری خەڵوەتکێشان پشکێکی گەورەی هەبووەتێدا. لەوێوە کە گوتمان لەڕێگای بەڵگەی ئەقلی نەهاتووەتەدەست، بەڵکو لە بینینی دەروونی و تێرامان و بینین دەرکەوتووە، شك و گومانی گومانکاران ناتوانێت پوچەڵیبکاتەوە.

هەرکەسێك کە موریدی ڕێگای حەقیقەت بێت، لەم ڕێگایەدا هاوەڵ و یاریدەدەری منە. شێوازی مامۆستای فەلسەفە و پێشەوای حیکمەت، واتە ئەفلاتونی ئیلاهیش وەهابوو، ئەو حەکیمانەی کە لەڕووی کاتەوە دەکەونەپێش ئەفلاتون، وەکو هورموز باوکی فەلسەفە، هەر لەسەر ئەم ڕێچکەیە بوون لەبەرئەوەی کە حەکیمانی رابردوو بەهۆی نەزانی زۆرینەی خەڵکی گوتەکانیانیان بەشێوەی رەمز و هێما دەردەبڕی، ئەو بەرپەچدانەوەیەی لە دژی ئەوان نووسراوە، هەموویان پەیوەستن بەشێوازی رووخساری و رواڵەتی گوتەکانیان نە بەمەبەست و ئامانجی راستەقینەی ئەوان. حیکمەتی ئیشراقی کە ستوون و بنەماکەی، هەردوو بنەڕەتی رووناکی و تاریکییە، بەوشێوەیە کە لەلایەن حەکیمە ئێرانییەکان، وەکو، (جاماسەب، فەرشادشور و بزورگمیهر) گوتراون کەوتووەتە نێوان ئەم رەمز و هێما نهێنییانە.

### چینەکانی زانایان

لە وشەکانی سوهرەوەردی ئەوە دەردەکەوێت کە حیکمەتی ئیشراق وەستاوە لەسەر هەردوو بنەمای بەڵگەهێنانەوە و دۆزینەوە و شهود، یەکێکیان لە پەروەردەکردنی هێزە ئەقلییەکان دێتەدی و ئەویتر لە سیفاتی دەروون. سوهرەوەردی بەپێی ئەوەی کە یەکێك لەم دوو هێزە یان هەردووکیان گەشەیانکردووە کەسانێك کە وێڵی حەقیقەتن بۆ چوار چین دابەشدەکات:

١. ئەوانەی تازە هەستیان بە گەرمایی زانین کردووە و ڕێی گەڕان بەدوای ئەویان گرتووەتەبەر.

٢. ئەوانەی گەیشتوونەتە زانینی وێنەیی (صوری)و لە فەلسەفەی بەڵگەیی، گەشتوونەتە تەواوەتی (کماڵ)، بەڵام بێگانەن لە عیرفان. سوهرەوەردی، (فارابی و ئیبن سینا)ی لەم گروپە هەژماردەکرد.

٣. ئەوانەی بەهیچ جۆرێك گرنگیان بەشیوازی بەڵگەیی زانین نەدەدا، بەڵکو وەکو (حەلاج، بوستامی و تستەری) گرنگیانداوەتە پاڵاوتنی دەروون و گەیشتنە دۆزینەوە و شوهود و رۆشنایی دەروون.

٤. ئەوانەی کە هەم لە فەلسەفەی بەڵگەیی گەیشتوونەتە تەواوەتی و هەم ئیشراق و عیرفانیان بەدەستهێناوە. ئەو تاکەکانی ئەم گروپەی بە حەکیمی باڵا ناودەبات و پیتاگۆراس و ئەفلاتون و لە جیهانی ئیسلامی خۆی لەوانە هەژماردەکات.

لەسەرووی ئەم چوار گروپە، زنجیرەی ئاسمانی یان هەبووە رۆحانییەکانی جیهانی نادیار (غیب) دێن کە سەردەستەی ئەمانە جەمسەر یان ئیمامە کە هەریەکە لەوتاکانەی زنجیرەی پلەبەندی و رۆحانی، وەك نوێنەرێك لەلایەن ئەوەوە کاردەکەن. ئەم هەبووە رۆحانییانە بە نۆبەی خۆیان هۆکارێکن کە بەهۆی ئەوانەوە دەروونی مرۆیی ئیشراق دەبێت و لەکۆتاییدا لەگەڵ جەمسەر یەکێتی پەیدادەکەن و دەبنە یەك.

**نموونە = تمپیل و هێمای جوگرافیایی**

بەرلەوەی شیکاری رەگەزە جۆراوجۆرەکانی حیکمەتی ئیشراقی بکەین کە لە یەکگرتنی ئەقل و شهود هاتوونەتەدی، پێویستدەکات لەبارەی خودی چەمکی ئیشراق و (نموونە = تمپیل)و هێمای جوگرافیایی پەیوەست بەئەو چەند گوتەیەك بڵێین. بەهەمانشێوە کە لە بەشی یەکەم دیتمان، ئەم چەمکە لە زمانی عەرەبی پەیوەندی هەیە بە وشەی رۆژهەڵات و بە وشەی رووناکی و روناکبوون، سوهرەوەردیش لەسەر بنەمای ئەم واتا دوولایەنەی وشەی ئیشراق و هەمان ئەو واتا شاراوە و پینهانە، شرۆڤە و شیکاری جیهانی خۆی کردووە و ئەمە هەمان ئەوکارەیە کە ئیبن سینا بەدیقەتێکی کەمتر بەرلەو پێیهەستابوو. جوگرافیای عیرفانێك کە بیروباوەڕی ئیشراقی لەسەری دامەزراوە و رەهەندی ئاسۆیی و پانیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا دەگۆڕێت بۆ رەهەندی ستوونی و درێژی، ئەمە بەو واتایەیە کە لەم حیکمەتە، رۆژهەڵات بە واتای جیهانی رووناکی و رەها یان جیهانی فریشتە نزیکەکانە کە لەهەر مادەیەك یان تاریکییەك بێبەرییە" کەواتە لەبەرامبەر هەبووە لەناوچووە نادیارەکان دێت. مەبەست لە رۆژئاوا جیهانی تاریکی یان مادەیە، رۆژئاوا ناوەندی فەلەکی نادیارە و لەوێدایە کە رووناکی تاریکی تێکەڵی یەکبوونە. بەمشێوەیە درێژەی پانیی و ئاسۆیی لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا شێوەیەکی درێژیی و وەستاو بەخۆوەدەگرێت، بەوواتایە کە رۆژئاوا دەبێتە بوونێکی پانیی کە مادە تێیدازاڵە و رۆژئاوا ناوەندی فەلەکی ئەستێرەکانە و رۆژهەڵاتی راستەقینە و باڵاترە لە ئاسمانی نادیار" کەواتە لەچاوی خەڵکی لەناوچوو، شاراوە و نادیارە. کەواتە سنووری نێوان "رۆژهەڵات"و "رۆژئاوا"، وەکو فەلسەفەی ئەرستۆ، فەلەکی مانگ نییە، بەڵکو فەلەکە نەگۆڕەکانە یان بزوێنەری یەکەمە. فەلەکەکان کە جێی خوێندنەوەی ئەستێرەناسەکانن بەشێکن لە رۆژئاوا، بەڵام بەشێکی پاکترە و لەبەرئەوەی نزیکترە لە جیهانی رووناکی. لێرەدا هێشتا مادە بوونی هەیە و لەئەنجامدا تەواوەتییەك کە تەنها پەیوەستە بە جەوهەرە فریشتەییە پەتییەکان نابینرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، لە حیکمەتی ئیشراق جیاوازییەکی بەرچاو لەنێوان ناوچەکانی ژێر فەلەکی مانگ و ئاسمانەکان، بەوشێوەیە کە لە فەلسەفەی ئەرستۆییدا هەبوو، بوونی نییە.

کەواتە زمانی سوهرەوەردی لەهەر شوێنێك کە لەبارەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا یان لە خۆری هەڵهاتوو و ئاوابوو دەدوێت، پێویستە لەسەر زەمینەی ئەم جوگرافیایەی جیهان، لێبتێبگەین و هەر لەم زەمینەیەدایە کە زۆرینەی رووداوە چیرۆکییە نموونەییەکانی ئەو، بەتایبەت چیرۆکی "غوربەتی رۆژئاوا = غربة الغربية" کە تێیدا باسی دابەزینی مرۆڤ بۆ جیهانی مادە دەکرێت، هێمای غوربەت و دوورخستنەوە "تبعید" بە رۆژئاوا خەملێنراوە. لەوکتێبەدا ئەم دابەزین و بەربوونەوەیە بەشێوەی بەربوونەوەی مرۆڤ بۆناو چاڵێك لە شاری "قەیرەوان" دەردەبڕێت، هەروەکو دەزانین ئەم شارە لەدوورترین ناوچەی رۆژئاوای جیهانی ئیسلامییە. جێی سەرەکی و بنەڕەتی ئەو کە لەوێوە بەرێکەوتووە و ئارەزوومەندە کە جارێکیتر بۆ ئەوێ بگەرێتەوە (یەمەنە) کە لەرووی زمانەوانی بە واتای شوێنێکە کە کەوتبێتە (لای راست)و هێمایە بۆ رۆژهەڵاتی رووناك کە دەروون پێش جیابوونەوە، لەوێوە دابەزیوە بۆ جیهانی مادە و لەوێدا وەکو جەوهەرێکی ئیلاهی و فریشتەیەك، ماڵی هەبووە.

### حیکمەتی ئیشراق و بنەما سەرەکییەکانی

بۆئەوەی تێبگەین لە بنەماکانی قوتابخانەی ئیشراق باشترین سەرچاوەیەك کە دەبێت بۆی بگەڕێینەوە خودی کتێبی "حکمە الاشراق"ە کە پێکهێنەرەکانیمان بەجوانی لێرەدا شرۆڤە و شیکارکردووە. ئەم کتێبە کە لەڕووی ئەدەبییەوە یەکێکە لەبەرچاوترین کتێبەکانی هاوشێوەی خۆی، لە ساڵی (٥٣٢ ك) لە ماوەی چەند مانگێك نووسراوەتەوە و وەها کە خودی سوهرەوەردی گوتویەتی ئیلهامبەخشی ئەو (روح القدس = جوبرائیل) بووە و لەکاتێکدا نووسراوەتەوە کە (قران)ی حەوت هەسارەکە لە کەڵووی تەرازوو پێکهاتبوو. شێوەی نووسینی ئەم کتێبە ئەوە بەدیاردەخات کە بەخێرایی و جۆشوخرۆشێکی زۆر نووسراوەتەوە و شارازایی ئەدەبی نووسەرێك بەدیاردەخات کە جوانیی و روونی نووسینەکانی لە بەرهەمە عەرەبی و فارسییەکانی لەیەك ئاستدان.

سوهرەوەردی لە "حکمە الاشراق"دا لە یاسای گشتی دابەشکردنی کتێب بۆ چوار بەش واتە (لوژیك، بیرکاری، فیزیك "طبیعیات" و خوداناسی "تیۆلۆژی") کە لە کتێبە فەلسەفییەکان وەها باوبووە کە پەیڕەوی لەمجۆرە دابەشکارییە بکەن - هەندێکیانیش بەشی بیرکاریان بەلاوەناوە و کتێبەکانی "شیفا و نەجات"ی ئیبن سینا و هەروەها سێ کتێبە فێرکارییەکانیتری خودی سوهرەوەردیش هەر بەهەمانشێوە نووسراونەتەوە، بەڵام لەم کتێبەیدا "حکمە الاشراق" وەها یاسایەکی بۆ دابەشکردنی ئەم کتێبەی بەکارینەهێناوە. ئەم کتێبە بنەڕەتییەی حیکمەتی ئیشراقی پێکهاتووە لە پێشەکییەك و دوو بەش. لە لۆژیك دەستپێدەکات و بەیەکگرتن لەگەڵ خودا و پلەوپایە و پایەبەرزیی و گەورەیی کۆتاییدێت.

### رەخنەگرتن لە فەلسەفەی پیادەڕەوەکان

سوهرەوەردی لە پێشەکی کتێبەکەی لەوەدەدوێت کە چۆن ئەوکتێبەی نووسیوە و لەچ جۆرە کتێبگەلێکە و بۆچ ئامانج و مەبەستێك نوسیویێتی. پاش ئەوەی رەوشی گشتی کتێبەکەی بەمشێوەیە روونکردەوە، بەشی یەکەمی تایبەت کردووە بە لۆژیك و بەهەمانشێوە کە ئەرستۆ و فەرفۆریۆس پۆلێنیانکردووە باسیلێوەدەکات، بەڵام بەتەواوەتی ئەم پۆلێنکردنە پەسەندناکات. تەوەری دووەمی بەشی یەکەمی کتێبەکە پێکهاتووە لە شیکارێکی گشتی لە هەندێك لەلایەنەکانی فەلسەفەی ئەرستۆ و بەتایبەت لوژیك، لێرەدا رەخنە لە پێناسەی "تعریف" ئەرستۆ دەگرێت و ئەوە بە یاریکردن بە بێژە دەزانێت و ژمارەی رواڵەتەکان (اعراض) لە (٩)وە کەمکردەوە بۆ چوار کە بریتینلە (رێژە = نسبە، چۆنیەتی = کیفیە، چەندێتی = کمیە، جوولە = حرکە).

رەخنەی گشتی ئەو لە ئەرستۆ و پیادەڕەوەکان و هێرشکردنەسەر هەندێ بنەما سەرەکییەکانی فەلسەفە بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە هەلبڕەخسێنێت بۆ رێکخستنی بیروباوەڕی ئیشراقی خۆی. بۆنموونە، بیروڕای ئیبن سینا و ئەرستۆییەکانیتری بەلاوە پەسەندنەبوو سەبارەت بەوەی کە هەرشتێکی هەبوو ، بوونی راستەقینەیە و (چییەتی = ماهیە) بۆئەوەی ببێتە راستی و راستەقینە پێویستی بە بوونە. لە دیدی سوهرەوەردی و بەپێی گوتەکانی خۆی تەنها شتێك کە راستەقینەیە چییەتییە و هەرئەوە کە بنەڕەتە و "بوون" رۆڵی رواڵەتی و لاوەکی هەیە کە دەچێتەسەر چییەتی. ئەم جۆرە تێڕوانینە کە ناوی بنەڕەتی چییەتییە (اصالە الماهیە)، لەگەڵ ئەوەی لەلایەن

(میرداماد) پەسندکرا، بەڵام بەتوندی لەلایەن (مەلا سەدرا) رەخنەی لێگیراوە و هەموو حیکمەتی ئیشراقی لەسەر بنەمای (بنەڕەتی بوون) شرۆڤەدەکات و تیۆلۆژی بنەڕەتی بوونی کردە جێگری تیۆلۆژی بنەڕەتی چییەتی سوهرەوەردی.

رەخنەیەکیتری سوهرەوەردی لە ئەرستۆ ئەوەبوو کە ئەرستۆ جیهانی باڵا و نموونەیی ئەفلاتونی مامۆستای خۆی لاپەسندنەبوو و بەمشێوەیە هەبووەکانی لەبەهرەمەندبوونی راستەقینەییەك لە پلەیەکی باڵاتر لە بوون بێبەشکردووە، هەروەها پێناسەی ئەرستۆی لەبارەی (شیاو) بەلاوەناوە و واتایەکی بۆ (شیاو) دەستنیشانکردووە کە لە بیروبۆچوونی ئەفلاتون نزیکترە.

سوهرەوەردی بە بەلاوەنانی یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی سیستەمی فەلسەفی ئەرستۆی، واتە باوەڕداری بە (وێنە و مادە) کە بزوێنەری سەرەکی فەلسەفەی سروشتی پیادەڕەوانە، شێوەی ئەویگۆڕیوە بۆ شێوەیەکیتر. لە دیدی سوهرەوەردی و ئیشراقییەکانیترەوە، "جیهان" بریتییەلە پلە و ئاستی رووناکی و تاریکی کە لەڕاستیدا نەمانی رووناکییە. جەستەکان (اجسام) تاکو ئەوشوێنەی کە پەیوەندی هەیە بە لایەنی مادی ئەوانەوە، شتێك جگەلە تاریکی یان رووکەشێك نییە کە رێگرە لەچوونەناوەوەی رووناکی. سوهرەوەردی "وێنەی" ئەفلاتونی بەهەمان فریشتە دەزانێت کە "چاودێرە"و پارێزگاری لەهەموو شتێك دەکات و رووناکییەکە لەهەموو تەنەکاندا و بەهۆی هێزی ئەوەوە، تەن شایستەیی هاتنەبوون پەیدادەکات.

هەروەها شێخی ئیشراق دژی بەڵگەی ئەبەدی و هەتاهەتایی "دروون"ی پیادەڕەوەکانە. ئەو بەڵگەیەی ئەوان بەلاوازدزانێت و لەجیهاندیدێکیترەوە دەڕوانێتە بابەتی خوێندنەوەی دەروون. فەیلەسوفە پەیڕەوکارەکانی ئەرستۆ زیاتر لە هەوڵی ئەوەدابوون کە هێزە جیاوازەکانی دەروون پێناسەبکەن، بەڵام سوهرەوەردی زیاتر لە هەوڵی ئەوەدابوو کە سەرچاوەی جیهانی فریشتەیی دەروون ساغ و پشتڕاستکاتەوە و لە دۆخی ئێستادا دەروون گرفتار و بەدبەختە و ئەو دەیویست رێگایەك بدۆزێتەوە کە دەروون بتوانێت لەورێگایەوە لە زیندانی زەوی یان ئەوشوێنەی کە بۆی دوورخرابووەوە، واتە روژئاوا، هەڵبێت و جارێکیتر بگەڕێتەوە بۆ مەنزڵگای بنەڕەتیی خۆی، چونکە تەنها لەوێدایە کە ئاسوودەیی و بەختەوەری بەدەستدەهێنێتەوە.

لەکۆتاییدا پێویستە لەبارەی ئەو رەخنانەی سوهرەوەردی لەهەردوو تیۆرەی (بینین)ی باو لە سەدەکانی ناوەڕاست گرتوویەتی بدوێین. بەشێوەیەکی گشتی لایەنگرانی ئەرستۆ لەوباوەڕەدا بوون کە بینینی بەهۆی رووناکییەکەوەیە کە لە شتەکانەوە ئاراستەی گلێنەی چاو دەبێت و لەوێدا دەگوێزرێتەوە بۆ هەستی هاوبەش و لەکۆتاییدا دەگاتە دەروون و بەمشێوەیە شتەکان دەبینرێن، بەڵام زانایانی بیرکاری بیروباوەڕێکی پێچەوانەیان هەبوو، دەیانگوت لەکاتی دیتندا رووناکییەك لەچاوەوە دەردەچێت کە سەری لەچاودایە و بنی لەسەر شتەکەیە کە دەبینرێت. سوهرەوەردی بە بەرپەرچدانەوەی هەردوو تێزەکە کرداری فیزیکی بینین پەیوەستدەکات بە ئیشراق کە هەموو جۆرە زانینێك بەهۆی ئەوەوەیە کاتێك کەسێك دەتوانێت شتێك ببینێت کە ئەو شتە رووناك بێت. لە وەها دۆخێك دەروونی کەسی بینەر، ئەو شتە دەورە دەدات و بە رووناکی ئەوەوە شتی جێی ئاماژەی بینین رووناکدەبێت و هەر ئەم کردارەی رووناکبوون و ئیشراقە کە بە ناوی "بینین" ناودەبرێت. بەمشێوەیە تەنانەت بینینی فیزیکیش لە ئیشراقی زانین

پشکداره. پاش رخنەگرتن لەم تێزانە و تێزەگەلیتری فەلسەفەی پیادەڕەوی، سوهرەوەردی دەچێتەسەر بەشی دووەم و لەم بەشەدا باس لە خودی بنەماکانی حیکمەتی ئیشراق دەکات. سوهرەوەردی ئەم بەشە دابەشدەکات بۆچەند تەوەرێك و لەم تەوەرانەدا لەبارەی واتای (رووناکی و جۆراوجۆرێتی پلە و ئاستەکانی، بابەتی "بوون"ی پەیوەست بە نموونەکانی رووناکی، زنجیرەی پلە و ئاستەکانی فریشتەکان یان فریشتەناسی، فیزیك، دەروونناسی و لەکۆتاییدا بابەتگەلێکی پەیوەست بە رۆژی دوایی و یەکگرتنی رۆحانی دەدوێت).

**رووناکی رووناکییەکان (نورالانوار)و زەمینەکانی بوون:**

بەپێی تێروانینی سوهرەوەردی، راستەقینە جیاوازەکان شتێك نین جگەلە رووناکی کە لەڕووی بەهێزیی و بێهێزی جیاوازن لەیەکتر. راستەقینە پێویستی بە پێناسەنییە، چونکە بنەماکە وایە کە پێویستە تاریکی بەهۆی رووناکییەوە پێناسەبکرێت. ئەوە روونە کە هیچشتێك لە رووناکی، روون و ئاشکراترنییە.. کەواتە ناتوانرێت ئەو بەهۆی هیچشتێکیتر پێناسەبکرێت. لەڕاستیدا هەموو شتەکان بەهۆی رووناکییەوە بەدیاردەکەون و ئاشکرادەبن و پێویستە بەهۆی ئەوەوە پێناسەبکرێن. رووناکی پەتی کە سوهرەوەردی ناویناوە (نورالانوار= رووناکی رووناکییەکان)، حەقیقەتی خودایە کە رووناکی ئەو بەهۆی بەهێزی رووشنایییەکەیەوە کوێرکەرە. رووناکی بالاّ سەرچاوەی هەموو بوونە، چونکە گەردوون لەهەموو پلە و ئاستەکانی راستەقینەیی خۆیدا شتێك نییە جگە لەئاستی جیاوازی رووناکی و تاریکی. گوتەی خودی سوهرەوەردی لەمبارەیەوە وەهایە:

" یەکەمین خودێتی رووناکی پەتی، واتە خودا بە بەردەوامی رووناکی دەپەرژێنێت (ئیشراق) دەکات و هەر لەمرێگایەوە بەدەردەکەوێت (تەجەلادەکات)و هەموو شتەکان دەهێنێتەبوون و بە رووناکی خۆی ژیانیان پێدەبەخشێت.

هەموو شتەکانی ئەم گەردوونە رەنگدانەوەیە لە رووناکی خودێتی ئەو و هەر جوانی و تەواوەتییەك لە بەرئەنجامی بەخشندەیی ئەوەوەیە" و رزگاری بریتییەلە بەتەواوەتی بەدەستهێنانی ئەم رووناکییە".

کەواتە ئاستی بوونی هەموو هەبووەکان پەیوەستە بەڕادەی نزیکیان لە رووناکی بالاّ و رادەی ئیشراق و رووناکبوونیانەوە . سوهرەوەردی ئاماژە بۆ چەند رێگایەك دەکات کە بەپێی ئەوانەوە قەڵەمڕەوە جیاوازەکانی گەردوون لەیەکتر جیاوازدەبن. بۆنموونە لەوانەیە کەسێك لەوڕووە بڕوانێتە شتەکان کە رووناکی یان تاریکی، گەر رووناکی بێت ئایا ئەم رووناکییە لەخودی ئەوانەوەیە کە لەم دۆخەدا پێیدەگوترێت رووناکی پەتی یان رووناکبوونی ئەوان لەسەرچاوەیەکیترەوەیە کە لەم دۆخەدا بە رووناکی رواڵەتی (عرضي) ناودەبرێت. بەهەمانشێوە تاریکیش یان پەیوەستە بەخودی جەوهەرەوە کە لەم دۆخەدا پێیدەگوترێت (غسق = تاریکی پەتی) یان بەهۆی شتێکیترەوەیە کە پێیدەگوترێت (هیئەت).

هەروەها سوهرەوەردی دابەشکارییەکیتر دەکات بۆ هەبووەکان کە پەیوەستە بە ئیدراك و ئاگامەندییانەوە. هەبوویەك یان لەبوون بەئاگایە یان بێئاگایە. ئەگەر بەئاگایە یان ئەم ئاگامەندییە بەهۆی خۆیەوەیە، وەهاکە رووناکی بالاّ و فریشتەکان و دەروونی مرۆیی و خودای جۆر (رب النوع) وەهان یان بۆ بەئاگاهاتنەوە پێویستی بەشتێکیترە،

وەکو ئەستێرەکان و ئاگر" بەهەمانشێوە گەر هەبوویەك لە خۆی بێئاگایە یان ئەم بێئاگاییە لەخودی خۆیەتی و وەکو تاریکییە، هەروەکو جەستە سروشتییەکان"اجسام الطبیعي"، یان بوونی پەیوەستە بە شتێکی جگەلە خۆی، وەکو رەنگ و بۆنەکان. بەمشێوەیەیە کە قوناغە جیاوازەکانی زنجیرەی ئاستی هەبووەکان جیاوازدەبێت لەیەکتر. لەئەنجامدا پێوەر بۆ جیاوازی پلەی هەبووەکان، رووناکییەکە کە هەریەکەیان هەیانە و ئەم رووناکییە هەمان ئەو زانین و ئاگامەندیەیە. بەمشێوەیە گەردوون لەسەر رووناکی بالآ سەقامگیردەبێت، بەبێ ئەوەی هیچجۆرە پەیوەستەبوونێکی "مادی"و "جەوهەری" لەنێوانیاندا هەبێت. سەرەڕای ئەوەش "رووناکی رووناکییەکان" لە هەریەکە لە قەڵەمڕەوەکان نوێنەرێك یان هێمایەکی راستەوخۆی هەیە، وەکو خۆر لە ئاسمان، ئاگر لەنێوان رەگەزەکان و رووناکی (ئەسفەهبدی) لە دەروونی مرۆیی" بەشێوەیەك کە لەهەموو شوێنێك نیشانەیەك لەوببینرێت و هەموو شتێك گەواهی دەدات لەسەر هەبوونی ئەو.

**فریشتەناسی**

پەیبردن بە جیهانی فریشتەکان یان فریشتەناسی کە باسە سەبارەت بە زنجیرەی پلە و ئاستە بەرفراوانەکانی رووناکی و جەوهەرەکانی نێوان جیهانی سێبەر و تاریکی و رووناکی بالآ، بەشی سەرەکی حیکمەتی ئیشراق پێکدەهێنێت. فریشتە لەیەککاتدا، راگری گەردوونە، ئامرازی زانینە و لەهەمانکاتیشدا شتێکە کە مرۆڤەکان هەوڵدەدەن پێیبگەن و لەم ژیانەی سەرزەوی بە بەردەوامی لە هەوڵی دۆزینەوەیین. سوهرەوەردی، سەرەڕای چەمکە قورئانییەکانی سەبارەت بە فریشتەکان، رێژەیەکی زۆر لە چەمکەکانی فریشتەناسی (مەزدایی) کە هێشتاش لە رۆژژمێری ئێستای ئێران بەکاردەهێنرێت، بۆ ناونانی رووناکییە جیاوازەکان ناوی فریشتەیەکی بەکارهێناوە. بەردەوامی جوانی و فرمانی فریشتەیە کە لە جیهانی ئیشراقی دەدەرەوشێتەوە و هەرکەسێك کە ئامانجی دیتنی ئەو بێت واقوورماوی دەبێت. سوهرەوەردی بەپێچەوانەی فارابی و ئیبن سینا، ژمارەی فریشتەکان سنووردارناکات بە ژمارەی فەلەکە دیارەکان، هەروەها رێژەی ئازادی ئەوانە بۆ سێ رەهەندی هزری کە پیادەرەوەکان دەستنیشانیان کردووە سنووردارناکات. سوهرەوەردی رەخنە لە فەیلەسوفەکانیتر دەگرێت کە زنجیرەی پلە و ئاستەکانی فریشتەکانیان بەمشێوەیە سنووردارکردووە. لە دیدی سوهرەوەردی ژمارەی فریشتەکان یەکساننییە بە ژمارەی (١٠) فەلەکی هەسارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بەڵکو ژمارەیان ئەوەندەی ئەستێرەکانە، واتە لەتوانای ژماردنبەدەرن. شێوازێك کە فریشتەکان لەسەرلێژبوونی خودا سوودمەند و ئیشراق دەبن، تایبەتنییە بەهیچ شێوەیەکی لوژیکی کە لەپێشترەوە بتوانرێت بەدەستبهێنرێت. سوهرەوەردی توێژینەوەی کردووە سەبارەت بە زنجیرەی پلە و ئاستەکانی فریشتەکان لەهەردوو رەهەندی درێژی و پانی. لەسەرووی زنجیرەی درێژی فریشتە نزیکەکان کە باشترینیان بە (بەهمەن) ناودەبرێت یان رووناکی هەرەگەورە (نور الاعظم) یان رووناکی هەرەنزیك (نور الاقرب) ئەم فریشتە نزیکە بالآیە فریشتەکەی خواروو نزیکی خۆی دەهێنێتەبوون کە لەو و لە رووناکی رووناکییەکان، رووناکی بەدەستدەهێنێت. ئەم سەرلێژبوونە بە نۆبە دەگوێزرێتەوە هەتا زنجیرەی وەستاو کەهەمان درێژییە کاملبێت و هەریەکە لەبەشداربووانی بە رووناکی (قاهر) ناودبرێن. ئەم زنجیرەیەی درێژی بە زنجیرەی (دایکەکان)یش (امهات) ناودەبرێت" ئەش لەورووەوە کە

هەموو شتەکانی گەردوون لەوەوە دێنەدی و لەدایکدەبن و بەشەکانی بەشێوەیەکن کە هەر فریشتەیەکی نزیکی سەروو لایەنی رق و بالادەستی سەبارەت بەوەی لەژێرییەوەیە هەیە و ئەوەی ژێرەوە سەبارەت بەوەی سەروویەوە هەڵگری لایەنی خۆشەویستییە" هەر رووناکییەك لەناوچەیەکە لەنێوان دوو رووناکی سەروو و ژێروو. ئەم رووناکییە نێوەندە وەکو رووپۆشێك وایە کە لەیەککاتدا ئاستی رووناکی بالاتر بەدیاردەخات و داشیدەپۆشێ - دایدەپۆشێت تاکو بەهەموو تینێکەوە نەگوێزرێت" و بەدیاریدەخات تاکو کەمێك لە سەرلێژی ئەو بتوانێت تێپەڕببێت و بەشی خوارووی لە زنجیرەکە بێتەبوون .

لەلایەنی نێرینەیی ئەم زنجیرەیە بالایە، واتا لایەنی بالادەستی و بینین، زنجیرەی پانی فریشتەکان دێنەدی کە گونجاون لەگەڵ جیهانی (خوداکانی جۆرەکان = ارباب انواع) یان (نموونەی بالا)ی ئەفلاتون. یەکەکانی ئەم زنجیرەیە چپتر وەکو زنجیرەی درێژی لەیەکترناکەونەوە. هەرشتێك لە جیهانی خواروو، تەلیسم یان بتی یەکێك لەم خوادای جۆرانەیە کە کاریگەری فریشتەیەکی تایبەت هەڵگری ئەوە و هەرلەبەر ئەم هۆیەشەوەیە کە سوهرەوەردی ئەوانە بە (خواکانی جۆرەکان یان خواکانی تەلیسمەکان ناودەبات)، چونکە لەڕاستیدا هەریەکێکیان بەسەر جۆرێکی تایبەت دەسەلاتی هەیە کە ئەو خوای جۆری ئاسمانی و (نموونەی بالای ئەفلاتونی) ئەوە. لێرەدایە کە سوهرەوەردی بۆ ناونانی (خواکانی جۆرەکان) زۆر سوود لە ناوەکانی ئەمشاسپێتمانی زەردەشت وردەگرێت. بۆنموونە (خوای جۆرەکانی) وەکو: ئاو بە خورداد، خوای جۆری کانزاکان، بە شەهریوەر، خوای جۆری رووەکەکان، بە مورداد و خوای جۆری ئاگر، بە ئوردیبهشت، ناودەبات. هەریەکە لەم شتانە بەمشێوەیە لەژێر فرمانی فریشتەیەکی تایبەتی پانییە کە ئەم شتە هەروەکو تەلیسمی ئەووایە. بەمشێوەیە سوهرەوەردی نموونە بالاکانی ئەفلاتوون لەگەڵ هێزەکانی ئەهورامەزدا لە ئایینی زەردەشتی کردە یەکشت و تێکەڵێکردن.

ئەم زینجیرانەی فریشتەکان کە تاکوئیستا گوتران هێشتا لەسەرەوەی فەلەکی دیارەوەن، بەلام لەمەبەدواوە، لەلایەنی مێیینەیی زنجیرەی درێژی فریشتەکانی نزیك کە هەمان لایەنی (خۆشەویستی و پەسند کرن)ی ئەوانە سەبارەت بە رووناکی و سەرلێژبوون، سەقامگیرەکان دێنەدی و بە ناوبژی ئەوانەوە فەلەکەکانی ئەستێرکانیتر بەدیاردەکەون. بەمشێوەیە فەلەکە دیارەکانی جەوهەراتی جیهانی فریشتەیی "بوونەتە خاوەن جەستە". دەتوانرێت ئەمانە وەکو لایەنی "نەبوو = عدم"ی فریشتە نزیکەکان یان بە جیامانەوەیان بزانین لە رووناکی رووناکییەکان کە تەنها رووناکی رووناکییەکانە کە بەشێوەی رەها هەیە کەواتە لە هەر لایەنێکی نەبوون بێبەرییە.

لەکۆتاییدا لە زنجیرەی پانی فریشتەکان گروپێك فریشتەی مامناوەند دێنەبوون کە وەکو (سەرکردەکانیان = خلفا) راستەوخۆ بەسەر جۆرەکان حکومەت دەکەن. ئەندامانی ئەم زنجیرە مامناوەندە بە رووناکییە چارەسەرکەرەکان و هەندێکجار بە رووناکییە (ئەسفەهبدییەکان) ناودەبرێن و ئەم ناوەی دوایی واتا (ئەسفەهبدی) زیاتر بۆئەو گروپە لە فریشتەکانە کە دەسەلاتیان هەیە بەسەر دەروونی مرۆیی. ئەم فریشتانە بەناوبژیوانی خۆشەویستی، فەلەکەکان دەجوولێنن و پارێزەری هەموو ئافرێنراوەکانی زەوین واتە: کانزایی و رووەکی و ئاژەڵی و مرۆیی.

لە ناوەندی هەر دەروونێك لەمرۆڤدا، رووناکییەکی ئەسفەهبدی هەیە کە رابەرایەتی کردارەکانی مرۆیی دەکات. هەموو جۆرەکانی مرۆیی بەشێوەیەکی گشتی لەژێر رابەرایەتی جوبرائیل دان کە بە خوای جۆری مرۆیی

ناودەبرێت. سوهرەوەردی ئەو لەگەڵ (روح القدوس و روحی محەممەدی) هەروەها لەگەڵ گەیەنەری سروش "وەحی" بەیەکشتیان دەزانێت و جوبرائیل بە ئیلهام بەخشی هەموو زانینێك دەزانێت.

سەرەڕای ئەوە جوبرائیل پارێزەری هەموو جۆرەکانی مرۆڤە، هەرکەسە فریشتەیەکی پارێزەری تایبەت بە خۆی هەیە کە لە جیهانی فریشتەکان جێگیرە. لە دیدی سوهرەوەردییەوە، هەر دەروونێك بەرلە دابەزینی بۆناو جەستە لەناو فریشتەکان ماڵی هەبووە. لەکاتی چوونەناو جەستە، دەروون یان ناوکی ناوەندی ئەو کە نامادییە و هی جیهانی فریشتەکانە، دەبێتە دوو بەشەوە. یەکێکیان لە ئاسمان دەمێنێتەوە و ئەویتر دادەبەزێت بۆ بەندیخانەی "قەلا" جەستە. لەبەرئەم هۆیەیە کە دەروونی مرۆیی بەردەوام لەم جیهانە خەمبارە و نامۆیە و لە گەڕانە بەدوای نیوەیتری ئاسمانی خۆی، لەوکاتەدا بەختەوەر و خۆشحاڵدەبێت کە لەگەڵ نیوەکەیتری کە لە جیهانی فریشتەکانە یەکبگرێت و بڕوات بۆ مەنزڵگای ئاسمانی خۆی.

وێنەی مرۆیی بەمشێوەیە جارێکیتر لەگەڵ نیوەی رۆحانی و نموونەی فریشتەیی خۆی کە "ویژدانی" راستەقینەی ئەوە و شتێکە کە پێویستە "ببێت" تاکو بتوانێت "هەبێت"، یەکدەگرێت. بەوواتایەی کە پێویستەببێت بەوەی لەڕاستیدا "هەیە"و ناتوانێت ئارامببێت و ئەم سەرگەردانییە کۆتاییپێبهێنێت کە لە ونبوونی منداڵێك دەکات لەناو قەیسەرییەکی پڕ پێچوپەنا، رزگارنابێت مەگەر لەگەڵ فریشتەی پارێزەری ئاسمانی خۆی کە نیوەی راستەقینەی ئەوە، سەرلەنوێ یەکبگرێتەوە.

### سروشتناسی"طبیعیات"و دەروونناسی "علم النفس"

سوهرەوەردی پاش کۆتاییپێهێنان بە باس سەبارەت بە جیهانی فریشتەکان، گرنگیداوە بە توێژینەوە لەبارەی جیهانی جەستەکان یان مادە "اجسام"و دەروونەکان، واتە سروشتناسی و دەروونناسی. سروشتناسییەکەی بەهەمانشێوە کە چاوەڕواندەکرێت لەسەر بنەمای رووناکی بونیادنراوە، نا لەسەر هەیولەی "مادەی بنەڕەتی"و وێنەیی ئەرستۆیی کە بەلایانی ناوە.

هەموو تەنەکان = جەستەکان پلەیەکن لە رووناکی و سیبەر "تاریکی". سروشتناسی بریتییەلە باس لەبارەی رووناکییەك کە هێزی ئەو بەهۆی تاریکی جیهانی مادە کەمبووەتەوە. ئەو جەستەکان دابەشدەکات بۆ سێ گروپ: یەکێکیان رێگا لە رووناکی دەگرێت و رێگریدەکات لە درزەکردن و چوونەناوەوەی رووناکی. دووەم ئەوانەی کە روونن و رێگری لەتێپەڕبوونی رووناکی ناکەن و لەکۆتاییدا گروپی سێیەم ئەوانەن کە رووناکی لە پلە جیاوازەکانیدا، تێدەپەڕێنێت و بەمشێوەیە خۆی دابەشدەبێت بۆ چەند گروپێکیتر. بەمجۆرە ئاسمانەکان لە دۆخی رووناکیدا سەربە گروپی دووەمن و زەوی سەربە گروپی یەکەمە و ئاو لە دۆخی ئاساییدا سەربە گروپی دووەمە، هەوا سەربە گروپی سێیەمە کە چەند دۆخێك لەخۆدەگرێت. ئاگر چوارەم رەگەزی رەگەزەکانە و سوهرەوەردی بە رەگەزی زەمینی نازانێت، بەڵکو ئەو بە وێنەیەك لە رووناکی و جێگری رووناکی باڵای دەزانێت لە ناوچەی زەویدا.

سوهرەوەردی بەپشتبەستن بەم زەمینەیە، گرنگیدەدات بە توێژینەوە لەبارەی نیشانە جیاوازە سروشتییەکان و بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندییان هەیە بە شوێنەوارەکانی کەشوهەواوە" و هەمان شێوازی گشتی پیادەڕەوەکان

بەکاردەهێنێت، بەڵام لایەنەکانی توێژینەوەی ئەو لەگەڵ فەلسەفەی پیادەڕەوەکان جیاوازی هەیە. بۆنموونە، بەهەڵمبوون و تێزەی هەڵم پەسندناکات، لەهەمموو نیشانەکانی بونەوەرەکانی هەوا و گۆڕانەکانیاندا ئاماژە بەگرنگیی رووناکی دەدات. لەڕاستیدا هەمموو سروشتناسی سوهرەوەردی، پەیوەستە بە توێژینەوە لەبارەی ئەو جەستانەی کە وەکو بەرزەخێکن لەنێوان پلە جیاوازەکانی رووناکی کە بە رێژە جیاوازەکان بەرپەچ یان دەگوێزرێنەوە. جەستەکان لەژێر فرمانی فەلەکەکاندان و فەلەکەکان لەژێر فرمانی دەروونەکان و دەروونەکان لەژێر فەرمانی چینە جیاوازەکانی فریشتەکان و فریشتەکانیش ملکەچی رووناکییەکانن.

لە پەیوەندی رەگەزەکان لەگەڵ یەکتر، سێ جیهانەکەی هەبووەکان دێنەدی کە هەریەکە لەوانە تەلیسمی فریشتەیەکی تایبەتە. بۆنموونە لە جیهانی کانزاکان، زێر و گەوهەرە گرانبەهاکان دەرەوشانەوەیەکی تایبەتییان هەیە و کاریگەرییان بەسەر دەروونی مرۆیی ئەوەیە کە هۆی شادی و بەختەوەری و یان ئەمە لەوڕووەوەیە کە رووناکی شاراوەی ناویان لە رووناکی شاراوەی ناو دەروونی مرۆڤ دەکات. بەمشێوەیە، لە رووەك و گیانلەبەرانیش رووناکی فریشتەیەك زاڵ و بەسەر کردارەکانی هەریەك لە جۆرەکان فەرمانڕەواییدەکات.

سوهرەوەردی لە ژماردنی هێزی دەروونەکانی رووەکی و ئاژەڵی پەیڕەوی لە شێوازی گشتی ئیبن سینا و پیادەڕەوەکانیتر دەکات. دەروونی رووەکی یان دەروونی گەشەکەر (نامی) بەپێی بیروبۆچوونی شێخی ئیشراق، سێ هێزی سەرەکی هەیە کە بریتینلە (خواردن و خواردنەوە = غاذیة، گەشەکردن = نامی، بەدیهێنان = مولود). هێزی خواردن و خواردنەوەش بە نۆبەی خۆی دابەشدەبێت بۆ چوار هێز "هێزی راکێشان = جاژبە"، "هێزی گرتنەخۆ = ماسکە"، "هێزی هەرسکردن"و "هێزی پاڵنەر = دافعە". دەروونی ئاژەڵیش سەرەڕای ئەمانە هێزی جووڵەشی هەیە کە بریتییەلە ئارەزو و ئاوات و تووڕەیی و شەهوەت کە لەتایبەتمەندییەکانی دەروونی ئاژەڵین، بەڵام کۆی ئەم هێزانە، چ لە دەروونی رووەکی و چ لە دەروونی ئاژەڵی کۆمەڵە دەرکەوتێکن لە رووناکی مەلەکی، هەریەکە لەجۆرەکان و کار و ئەرکی ئەوانە دەبێت لەڕێگای پەیوەستبوونیان بە رووناکی لێتێبگەیین.

مرۆڤ کە باشترین جۆری ئاژەڵە، سەرەڕای ئەمانە و پێنج هەستی دەرەکی کە لەوانەدا لەگەڵ هەندێك لە ئاژەڵە باڵاکان هاوپشکە، پێنج هەستی ناوەکیشی هەیە کە کاریگەرییە وەرگیراوەکانی جیهانی دەرەکی بۆ رووناکی (ئەسفەهبدی) کە لەناویدا هەیە دەگوێزرێتەوە. سوهرەوەردی ئەم پێنج هەستە ناوەکییە بە ("هەستی هاوبەش"، "ویناکردن = متصورة"، "درككردن = مدركة"، "خەیاڵکردن = متخیلة" و "یادەوەری = حافظة" ناودەبات، دەروونی قسەکەر (ناطقة) کە لەڕاستیدا هەمان رووناکی ئەسفەهبدییە، وەکو تاجێك بەسەریانەوەیە و ئەوەش خۆی وەکو بروسکێکە لە رووناکی فریشتەیەك کە وەها لە زیندانی جەستە (لەش) دیلبووە کە مەنزڵگای راستەقینەی خۆی بیرچووەتەوە. سوهرەوەردی و ئیشراقییەکان، بەرلەوەی لە هەوڵی ژماردنی هێزەکانی دەروون بن، گرنگیدەدەن بەوەی کە ئەو بارودۆخە ناڵەبارەی دەروون تووشیبووە بەدیاربخەن و بڵێن کە چۆن بە بەیادهێنانەوەی رابردووی دەروون، ئاگاداری جێی راستەقینەی خۆی بکەنەوە و بیخەنەوەسەر ئاراستەی گەڕانەوە بۆ جێگاکەی.

**دیدار و پێکگەیشتنی مەعنەوی**

بەشی کۆتایی "حكمة الاشراق" پەیوەستە بە باسکردنی پێکگەیشتنی مەعنەوی و دۆخی دەروون لەپاش مردن. سوهرەوەردی کۆمەڵە ڕێگایەك دەخاتەڕوو کە بەهۆی ئەوانەوە دەروون دەتوانێت، لەهەمانکاتدا کە پەیوەستە بە جەستەوە لە کۆتوبەندە مادییەکان ڕزگاریبێت و لە ئیشراقی ڕووناکی فریشتەیەك بەهرەمەندبێت. ئامانجی هەر مرۆڤێك پێویستە ئەوەبێت، چونکە هەر دەروونێك بەلەبەرچاونەگرتنی پلەکەی لەهەرساتێك لە ژیانی خۆی لە گەڕانە بەدوای ڕووناکی باڵا، تەنانەت گەر خۆشی لە مەبەستی سەرەکی گەڕانیشی ئاگادارنەبێت. شادی بەختەوەری لە ئیشراقبوون بە ڕووناکییە ئاسمانییەکان دێتەدی، سوهرەوەردی لەمبارەیەوە بەردەوامدەبێت و دەڵێت: هەرکەسێك کە تامی شادی ئیشراقبوونی بەهۆی ڕووناکییە (قاهرەکان) نەچێشتبێت، تەنانەت لە واتەی شادی و حەقیقەتی ئەو بێخەبەرە. هەموو شادییە لاوەکییەکان و گوزەرانی ئەم جیهانە شتێکنییە جگەلە ڕەنگدانەوەی شادی ئیشراقبوون و عیرفان.

دۆخی دەروون لەپاش مەرگ پەیوەستە بە پلەی پاکی و مەعریفەتێك کە لە ژیانی ئەم جیهانە پێگەیشتووە. بەپێی جیاوازی پلەکانی مەعریفەت، دەتوانرێت سێ گروپ یان دەستە لە دەروون دەستنیشانبکرێت: یەکەم بەختەوەرەکان کە لەم ژیانەدا گەیشتووەتە پلەیەك لە پاکی و خۆشی، دووەم گومڕاکان کە دەروونی ئەوانە بەشەڕ و نەزانی تاریکبووە، سێیەم ئەوانەن کە لە ژیانی ئەم جیهانە گەیشتوونەتە ئیشراق و وڵاتەکەی خۆیان، واتە زانایان و پیاوچاکان. دەروونی بەشێك لە خەڵکی ئاسایی کە سەر بە گروپی یەکەمە، لەپاش مەرگ دەچنە جیهانی خاوەن جۆرەکان و لەوێدا چێژ لە تام و بۆن و دەنگ دەبینن کە دەرکەوتە زەمینییەکان سێبەری ئەوان بوونە. گروپی دووەم، بۆ جیهانی وێنە ئاوێزانەکان و داڵانی پڕپێچ و پەنا و پێچاوپێچی جیهانی خەیاڵی دەڕۆن کە جیهانی تاریکی و هێزە شەڕانگێزەکان و جەنگەکانە. لەکۆتاییدا دەرروونی عاریفەکان (سۆفییەکان)و گەورەپیاوان، پاش جیابوونەوەیان لە جەستە، ئەوەندە بەرزدەبنەوە کە جیهانی فریشتەکانیش تێدەپەڕێنن و لەبەختەوەربوون لەوەی کە نزیکن لە ڕووناکی ڕووناکییەکان بەهرەمەنددەبن.

بارودۆخی دەروون لەپاش مەرگ کە ئایا دووچاری ڕەنج و ئازار یان بەختەوەری و خۆشی دەبێت، پەیوەستە بەوخۆشی و تەواوەتییەی کە تاچ ڕادەیەك توانیبێتی تواناکانی بەکاربهێنێت و گەیشتبێتە زانین. دەروونێك کە پاك و تەواو (کامڵ) بێت یان لایەنیکەم یەکێك لەم دوو تایبەتمەندییەی هەبێت، لەجیابوونەوە لەم جیهانە کە بابەت و ئامانجی خۆشەویستی و حەزی زۆرێك لە خەڵکییە لەم ژیانەدا، ئەوەندە ئازارنابینێت تەنها دەروونێك کە لەیەککاتدا ناپاك و ناتەواوبێت، لەجیابوونەوەی لەم ژیانەی ئەم جیهانە تووشی ڕەنج و ئازاری هەمیشەیی دەبێت.

شێخی ئیشراق بەئاماژەدان بەم گوتانە ئامۆژگاریمان دەکات کە پێویستە مرۆڤ قەدری ئەو ڕۆژانەی ژیانی کە بووەتە نسیبی بزانێت و گرنگیبدات بە بەختەوەری دەروونی خۆی، تاکو وەهای لێبێت کە لە فریشتە بکات و هاوشێوەی خوای جۆریی (رب النوع) ئاسمانی خۆی لێبێت.

## گرنگی چیرۆکە نموونەییەکانی

شرۆڤە و شیکاری تێزە سەرەکییەکانی حیکمەتی ئیشراقی بەوشێوەیەی کە لە کتێبی (حکمە الاشراق)دا هاتووە، لایەنی فێرکاری بەرهەمەکانی سوهرەوەردی بەدیاردەخات و حەقیقەتی خوداناسی تێدا شێوەیەکی زەق و بەرجەستە دەگرێتەخۆی، بەڵام بۆ بەدەستهێنانی دانایی تەواو لەبارەی نوسینەکانی سوهرەوەردی و شێوەی گشتی نووسینەکانی، پێویستە چیرۆکە نموونەییەکانیشی خوێندنەوەی بۆبکرێت. ئەمانە کۆمەڵە کتێبێکی کورتی هێمایی و سۆفیانەن کە ئەزموونێکی رۆحی تایبەت لەواندا بە زمانێکی زۆر هێمایی دەربڕدراوە و خودی ئەم هێمایەش بەشێك لە بینین و خەیاڵ پێك دەهێنێت. لەم چیرۆکە کورتانەدا - کە لە زۆر رووەوە - لە چیرۆکە هێماییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا دەچێت، بۆ نموونە (پارسیفال) کە هەولێکی بێسوودە بۆئەوەی حەقیقەت لەهەموو دەرکەوتەکانیدا بەدیاربخرێت، بەڵکو لەهەر کتێبێك قوناغێك لە ژیانی رۆحی و ئەزموونی دەروونی ئاشکرابووە و پەردە لەسەر هەندێك لە هێماکان لابراوە. لەمرێگایەوە بیروبۆچوونێکی جوان لەبارەی جیهانی ئیشراق و رۆحی خودی سوهرەوەردی دێتەدەستەوە.

دەرەفەتی ئەوەنییە کە لێرەدا باس لەهەموو ئەو چیرۆکانە بکەین، بەڵام بۆئەوەی ئاشنای شێوەی گشتی ئەوان بین، باشتروایە یەکێك لەوانە (ئاوازی پەڕی جوبرائیل) کە هەڵگری تایبەتمەندی هاوبەشە لەگەڵ چیرۆکەکانیتر، لێرەدا بەکورتی باسیلێوەبکەین. حیکایەتی سەرەکی کراوەتە دوو بەش و لە بەشی یەکەم، قوتابی یان قارەمانی چیرۆکە نموونەییەکە باس لە زانایەك دەکات کە "پەیامبەری دەروونی"و فریشتەی رێنوماییکەری ئەوە لەگەیشتن بە حەقیقەت. قوتابی لە زاناکە دەپرسێت کە ماڵی لەکوێیە؟ زاناکەش لەوەڵامدا دەڵێت: من لە (ناشوێن) هاتووم کە لەڕاستیدا ناوچەیەکی خەیاڵییە و لەم جیهانەدا بوونینییە، واتە لە جیهانی سێ رەهەندی خراپترە. دوای ئەوەی قوتابی، زانی زاناکە لەکوێوە هاتووە، دەستدەکات بەپرسیارکردن لەبارەی لایەنە جیاوازەکانی حیکمەت.

لە بەشی دووەمی ئەم چیرۆکە، ئاوازی گشتی کتێبەکە گۆڕانی بەسەردادێت. قوتابی لە مامۆستاکەی دەوێت کە ناوی (هەرەگەورەی = اعظم) فێربکات. زاناکەش پەسەندیدەکات و سەرەتا فێری نهێنییەکانی زانستی (پیتەکان = جفر)ی دەکات کە زانستی ناوەکی بە واتەی شاراوەی پیت و وشەکانە لەرێگای هێما و نموونەی ژمارەیی ئەوانەوەیە. پاشان دەڵێت کە خودا وشەگەلێکی وەکو فریشتەکانی ئافراند و وشەیەکی باڵای ئافراند کە زۆر باشترە لە فریشتەکان، بەهەمانشێوە کە خۆر باشتر و باڵاترە لە رووناکی ئەستێرەکان. مرۆڤیش وشەیەکە لە خودا و ئاوازێکە لە پەڕی جوبرائیل. باڵەکانی جوبرائیل بەسەر ئاسمانەکان و زەوی باڵیکێشاوە - ئەم جیهانەی سێبەرەکان یان "رۆژئاوا" شتێك نییە جگەلە سێبەری باڵی چەپی جوبرائیل بەهەمانشێوە کە جیهانی رووناکی فریشتەکان یان "رۆژهەڵات" رنگدانەوەیە لە باڵی راستی ئەو. بەمشێوەیە هەموو هەبووەکانی ئەم جیهانە لە ئاوازی پەڕی جوبرائیل هاتوونەتەدی. بە وشە و بە ئاوازی پەڕی ئەم فریشتە نزیکەیە کە مرۆڤ هاتووەتەدی و بە وشە - واتە لەگەڵ ناوی خودایە - کە ئەو دەگاتە تەواوی و بۆ دۆخی بنەڕەتی و بنەڕەتی ئیلاهی خۆی دەگات.

## حیکمەتی ئیشراق

هەندێکات سوهرەوەردی بەوەتاوانباردەکەن کە مەیلی دژەئیسلامی هەبووە و ویستوویەتی دینی زەردەشتی سەرلەنوێ زیندووکاتەوە لەبەرامبەر ئایینی ئیسلام. بەڵام لەڕاستیدا وەهانییە، بەڵام بەهەمانشێوە کە بە دوورودرێژی باسمانلێوەکرد، سوهرەوەردی فرەهێما و نیشانەی زەردەشتی بەکارهێناوە بۆ دەبڕینی بیروبۆچوونەکانی. بەهەمانشێوە کە (جابری کوڕی حەیانیش) بەرلەو هێما و نیشانە (هورموسییەکان)ی بەکارهێنابوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەمە ئەوەناگەیەنێت کە بیروباوەڕی ئەو بەپێچەوانەی ئیسلامەوە بووبێت. هەمەکیبوونی ئیسلام بووەتە هۆی ئەوەی کە رەگەزە جیاوازەکانی تێداپەسەندبکرێت و لایەنی ناوەکی ئیسلامی شایستەی ئەوەبێت کە لە شێوازەکانی رابردووی حیکمەتی ئایینی سوودمەندبێت و لە ئێران کە قوتابخانەی سوهرەوەردی زیاترین لایەنگری پەیاکرد و بە گوتەی (ماسینیون)، رۆحانییەتی ئیسلام وەکو رووناکییەکبوو کە "ئێران بەهۆیەوە جیهانی دیار و بەرچاوی لەپشت بڵاوکراوە دەرەوشاوەکانی حیکایەتە کۆنەکانی خۆی تەماشادەکرد". کەلتوری ئیشراقی، لەگەڵ ئەوەی لەنێوان سوونەکان، شرۆڤەکار و لایەنگری پەیداکرد، بەڵام زیاتر لەناو شیعەدا رەواجی پەیاکردووە. نووسینەکانی سوهرەوەردی، بنەمای بیربۆچوونەکان و سەرچاوەی قوتابخانەی ئیشراقی پێکهێنا و زاناکانی پاش ئەو بەبەردەوامی شرۆڤە و شیکارییان لەبارەی ئەو نووسینانەوە نووسیوە. لەگرنگترین شرۆڤەکانی "حکمە الاشراق" یەکێکیان ئەوەی شەهرەزوورییە کە قوتابی و هاوکاری سوهرەوەردییە" باشترین شرۆڤەی ناسراو (قوتبەدینی شیرازی) نووسیوێتی کە قوتابی بەناوبانگی (خاجە نەسرەدینی توسی و سەدرەدینی قونەوی) بوو کە یەکێك لەوکەسانەی کە بیروبۆچوونەکانی ئیبن عەرەبی لەڕۆژهەڵاتدا ناساند. لەم دوو شرۆڤەیە کە هەردووکیان لە سەدەی حەوتەم نووسراون، شرۆڤەکەی (قوتبەدین) چەند سەدەیەك وەکو شرۆڤەی فەرمی دەقی خوێندن بوو. چاپی بەردینی کۆنی (حکمە الاشراق) کە لەهەندێك لە قوتابخانە کۆنەکان لەکاتی بڵاوبوونەوەی لە (سەردەمی قاجاری)، وەکو وانە دەگوترایەوە، ئەم شرۆڤەیە و هەروەها شیکاری (مەلا سەدرا) کە سێسەدە دواتر نووسراوەی لەگەڵدایە.

لەنێوان شرۆڤەکارانی بەرهەمەکانیتری سوهرەوەردی پێویستە ناوی (ئیبن کەمونە، شەهرەزوری و عەلامە حەلا) بەرین کە بەنۆرە لە سەدەکانی حەوتەم و هەشتەم شرۆڤەگەلێکیان لەبارەی (تەحویلات) نووسیوە و (جەلالەدین دوانی، سەدەی نۆیەم و عەبدولڕەزاق لاهیجی، سەدەی یانزەهەم) کە (هیاکل النور)یان شرۆڤەکردووە. سەرەڕای ئەمانەش، پێویستە کۆمەڵە فەیلەسوفێك ناوبەرین کە لەژێر کاریگەری بیروبۆچوونەکانی سوهرەوەردیدا بوون. لەم نێوەندەدا ناوی (خاجە نەسرەدینی توسی)، فەیلەسوف و زانای بەناوبانگی سەدەی حەوتەم، بەرلەهەمووان دێتەهزر. لەگەڵ ئەوەی ئەو بە شرۆڤەی شارەزایانەی خۆی بۆ (ئیشاراتی ئیبن سینا) قوتابخانەی بەرهەڵستکاری قوتابخانەی ئیشراقی واتە قوتابخانەی پیادەڕەوەکانی بووژانەوە، لەهەندێك لە بابەتەکان، وەکو بابەتی زانستی خودا سەبارەت بە گەردوون، لەژێر کاریگەری قوتابخانەی ئیشراقدا بوو. لەم بابەتەدا بەڕوونی بیروڕای ئیبن سینای بەلاوەناوە و روویکردووەتە قوتابخانەی سوهرەوەردی. لەمەبەدواوە بیروبۆچوونەکانی سوهرەوەردی پەرەیسەند و بڵاوبووەوە و لەنێوان فەیلەسوفەکانی ئێران و ئاسیای بچووك و هیند و لەبەرئەوەی سەفەوییەکان هاتنەسەرکار لەئێراندا کاریگەری بیروبۆچوونەکانی ئیشراقی بەسەر رەوتی هزری ئیسلام گەشتە لوتکەی خۆی.

لە سەردەمی سەفەوییەکان ڕێبازی شیعە بووبە ڕێبازی ڕەسمی ئێران“ نە تەنها لەم سەردەمەدا هونەری بیناسازی ئێران - وەها کە لەهەموو جیهان بەناوبانگە - بووژایەوە“ زانستە هزرییەکانیش نوێبوونەوە و ئەم نوێبوونەوەیەی ڕەوتی هزری، بەپێچەوانەی ڕەوتی نوێبوونەوەی هونەر هەتاکوئێستا لە دەرەوەی ئێران بە نەناسراوی ماوەتەوە. توێژینەوە لە فەلسەفە و ئیشراق لەلایەن میرداماد‌ەوە - گەورەترین قوتابخانەی ئیسفەهان لە سەردەمی (شا عەباس) - سەرلەنوێ ژیایەوە. ئەو مامۆستایەك بوو کە قوتابخانەیەکی ئیبن سینایی بە شرۆڤەیەکی فێرکارییانەی سوهرەوەردی، لە دیدی لایەنگرانی ڕێبازی شیعەی بونیادنا. لەپاش "میرداماد" قوتابییە بەناوبانگەکەی ئەو واتە (مەلاسەدرا) کە لە ئێران ئەو بەگەورەترین حەکیمی موسوڵمانی هەموو سەدەکان هەژماردەکرێت، تێزەکانی سوهرەوەردی خستەناو نووسینە پێکهاتەییەکانی خۆی و دەربڕینی ئەوی گەیاندە ئەوپەڕی تەواوەتی. بیروباوەڕی مەلا سەدرا هەڵگری ڕەگەزی فەلسەفەی پیادەڕەویش بوو و هەندێك لە بنەما سەرەکییەکانی عیرفانی قوتابخانەی ئیبن عەرەبیشی گرتبووەخۆ“ بەڵام هەموو ئەمانەی لە چوارچێوەی ڕێنومابییەکانی ڕێبازی شیعەدا داڕشتووە و بەتایبەتی لەگەڵ ڕێنومابییەکانی پەیوەست بە حیکمەتی ئیلاهی شاراوە لە کتێبی (نهج البلاغە) ی ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیب (د.خ) گونجاندبوو.

لەگەڵ ئەوەی بەرهەمەکانی سوهرەوەردی وردەوردە لە قوتابخانە فەرمییەکان کەوتەژێر کاریگەری نووسینەکانی مەلا سەدرا، بەڵام لەڕێگای ئەم بەرهەمانەشەوە بیربۆچوونە ئیشراقییەکان خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی لەبارەوەدەکرا و هەر لەم ڕێگایەشەوە بوو کە فەیلەسوفەکانی دواتری، وەکو (حاجی مەلا هادی سەبزەواری) بەناوبانگترین شرۆڤەکاری ڕێنومابییەکانی مەلا سەدرا لە سەدەی قاجارییەکان و (شێخ ئەحمەدی ئەحسائی) دامەزرێنەری ڕێبازی (شێخییە)و دژی هەندێك لە تێزەکانی مەلا سەدرا، لەژێر کاریگەری ڕێنومابییەکانی سوهرەوەردیدا بوون.

لە نیمچە قارەی هیندیش بەرهەمەکانی سوهرەوەردی، چ بەشێوەی ڕاستەوخۆ و چ لەڕێگای نووسینەکانی مەلا سەدرا، هەتاکوئیستاش دەخوێنرێن و فێرکارییانە وەکو وانە دەگوترێنەوە. لەئێرانیش بەهەمانشێوەیە و فەلسەفە و حیکمەت لە قوتابخانە کۆنەکان دەگوترێتەوە و تەنانەت لە پەیمانگای خوداناسی (تیۆلۆژی) زانکۆی تارانیش یەکێکە لە وانە سەرەکییەکان“ و کورسییەك تایبەتە بە گوتنەوەی حیکمەتی ئیشراق و کورسییەکیتریش تایبەتە بە گوتنەوەی بیروبۆچوونەکانی قوتابخانەی مەلا سەدرا.

سەرەڕای ئەوەش کاریگەری سوهرەردی تایبەت نەبوو بە جیهانی ئیسلامییەوە و هەندێك لە بەرهەمەکانی سەردەمی ئیمپراتۆرەکانی مەغۆلی هیند وەرگێڕدراونەتەسەر زمانی عیبری و بەمشێوەیە بیربۆچوونەکانی گەیشتوونەتە هەردوو جیهانی جیاواز لەیەکی یەهودی و هیندی. بەرهەمەکانی ئەو هەروەها لەلایەن (موئبد عیرفانمەئابی زەردەشتی ئازەر کەیوان)و لەلایەنگرانی بەوردی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی لەبارەوەکرا کە لە سەردەمی سەفەوییەکان ئێرانیان بەجێهێشت و ڕوویانکردە هیندستان. ئەو حیکمەتە هەتاهەتاییەی شێخی ئیشراق مەبەستی دامەزراندنی هەبوو یان مەبەستی دووبارە دامەزراندنەوەی هەبوو، نە تەنها لەکاتی ئەو ژیانە کورتەی کە هەیبووە بووە ڕوانگەیەکی هزری باڵا لەنێوان لایەنگرانی ڕێبازی شیعە و بەشێوەیەکی گشتی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی

ئیسلام، تەنانەت سنوورەکانی ئیسلامیشی بەزاند و گەیشتە میراتگەلیتریش. لە زۆر رووەوە بووبە رەگەزێك لە جیهانی توێژینەوەی هاوبەشی نێوان ئیسلام و دراوسێکانی، واتە جیهانێك کە لەگەڵ یەکایەتی خودا کە لە دەرکەوتە جۆراوجۆرەکانی حەقیقەت شاراوەتەوە، خۆی دەنواند.

•••

تێبینی:

وەرگێڕدراوە لە کتێبی: سه حکیم مسلمان، نویسنده: سید حسین نصر، ترجمه: احمد ارام، تهران، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ ششم، ١٣٨٤، ص: (٥٥ - ٨٦).

# گەڕان بەدوای مانادا

## پشکنینی مانای ژیان لە روانگەی فەلسەفییەوە

وەرگێڕانی: فاتیمە ئەدهەم


سروش دەباغ

بە باوەڕی "گابریل مارسیل"، مانای ژیان بییەکێك لە گرنگترین راز و نهێنییەکانە کە مرۆڤەکان لەگەڵیدا رووبەڕوون. هەڵبەتە مانای و مەبەستی ئەو لە مانا لەگەڵ مانا گشتییەکەی راز جیاوازی هەیە. بە باوەڕی "مارسل"، لە "راز و نهێنی"دا جیاوازی نێوان بکەری ناسراو و بابەتی ناسین لەناودەچێت. ئەو دەڵێت: (راز شتێکە کە خودی من گرفتاری ئەو شتەم و لەمڕووەوە تەنها وێنایەك دەتوانم بۆئەو شتەم هەبێت، وێناکردنی ئەو قەڵەمڕەوییەیە کە تیایدا جیاکاری و جیاوازی نێوان ئەوەی لەمندایە مانای خۆی و ئیعتیباری یەکەمینی خۆی لە دەستدەدات.) بە روونکردنەوەیەکیتر "مارسل" باوەڕیوایە، راز و نهێنییەکان راستەقینە و حەقیقەتگەلێك نین لە سەرووی ئێمەوە بن، بەڵکو حەقیقەتی گشتگیر "فراگیرندە" ئێمەن. ئەو باوەڕیوایە بۆ ناسینی رازی هەر کەسێك دەبێت لەسەرەتاوە کار ئەنجامبدات و بە بەشداری قووڵ راز و نهێنییەکانی بوون کەشفبکات، لەبەرئەوە لە قەڵەمڕەوی "راز"دا، رێگەچارەی گشتی و گشتگیر بوونیان نییە، بەڵکو تەنها بەشداریکردن و دانپێدانان و باوەڕهێنانە. گوتە دەگمەن و دڵبزوێن و خرۆشێنەرەکانی "مارسل" لەبارەی مانای ژیان و رازەوە خاڵی داهێنان و نوێی زۆریان تێدایە کە پێویستی بە تێڕامان و وردبوونەوە زۆر هەیە، بەڵام گەڕان و لێکۆڵینەوە لای فەیلەسوفانی شیکاری پێچەوانە و جۆرێکیتر هاتووە کە لەگەڵ "دکتۆر سروش دباغ"دا خراوەتەڕوو. ئەو کە لە سوننەتی "ئەنگلۆسەکسۆنی"دا "فەلسەفەی ئەخلاق"ی خوێندووە لەم گفتوگۆییەدا هەوڵیداوە ئاماژەیەك بکات بە مانای ژیان لای فەیلەسوفانی شیکاری، بەسەرنجدان لە پێشینە و سەلیقە و زەمینەی بابەتەکانی سوننەتی فەلسەفەی شیکاری "تحلیلی" لەبارەی مانای ژیانە کارێکی دژوارە و خودی ئەم گفتوگۆیەش نومایانکەری و روونکەرەوەی ئەم سەختی و دژوارییەیە. فەیلەسوفانی شیکاری زیادلەوەی سەرنجیان دەرگای کەڵکەڵەبوونییەکانی "وجودی" مرۆڤی گۆشت و خوێن و خاوەنی ئێسك و جەستە بێت، سەرنج و دڵیان لەناو شیکاری لۆژیکی و زمانی بابەت و لێکۆڵینەوەکاندا هەیە و لەمڕووەوە گەڕان بەدوای مانادا لای ئەم فەیلەسوفانە کارێکی هێندە ئاسانییە و پێویستی بە روانینی ئامۆژە و فێرکارییەکانی فەیلەسوفانی شیکارییە لە روانگەی جیاوازەوە.

**– ئەگەرچی باسکردن لە مانای ژیان پێشینەی فیکری دوورودرێژی لە مێژووی بیرکردنەوە و بەتایبەت بەشە گرنگەکانی وەکو فەلسەفەی قارەیی وەکو "بوونگەرایی" هەیە، بەڵام لە فەلسەفەی شیکاریدا باسێکی نوێ و تازەیە، بۆچی ئەم بابەتە لە قۆناغێکی ئەم فەلسەفەیەدا بوویە جێگەی سەرنج و قسەلەسەرکردن؟**

**سروش دباغ:** هەر بەوجۆرەی ئاگادارن، باس و بابەتی مانای ژیان لەماوەی (١٢٠) ساڵی فەلسەفەی شیکاری کە پێگەیشتووە و نییە، پێش ئەوەش مرۆڤ لەوڕووەوەی کە بیر لە ژیان ومردنی خۆی دەکردەوە و بە دەستەواژەی "ئونامۆنۆ" (فەیلەسوفی ئیسپانی. و.کوردی) دەردی نەمری و جاویدانی هەبووە، هەمیشە بیری لەم بابەتە کردووەتەوە مەبەست لە هاتن و رۆیشتنی دەتوانێت چ شتێك بێت و لەناوچوون و مانەوەی پەیوەندی بەچییەوە هەیە. یەکێك لەوبەڵگانەی بۆچی لە فەلسەفەی شیکاریدا باس لەم بابەتە کراوە، رەنگە بەسەرنجدان لە پێشینەی فەلسەفەی شیکاری بەتایبەت لە قۆناغی یەکەمدا رەنگە بتوانرێت روونبکرێتەوە. لەم قۆناغەدا لەگەڵ روونکردنەوەی چــەمکەکاندا رووبـەڕووین. ســوننەتێك کە بە مانایەك لە "مۆر"ەوە دەستپێدەکـــات و ئەو لە ( Principia Ethica) باسێك لەبارەی شیکاری چەمکی کە باسی زمانی سروشتییە، خستەڕوو، هەروەها کەسانی وەکو "فرگە، راسڵ و ڤیتگنشتاین" باوەڕیانوابوو کە تەنها بە جەختکردنەوە لەسەر زمانی سروشتی کارناگاتە ئامانج و دەبێت لە زمانی سروشتییەوە تێپەڕین و بە زمانێکی وێنەیی بگەین لەبەرامبەر زمانی سرشتییەوە تاکو بتوانرێـت مانای زاراوەکان و گوزراەکان چۆن دروستدەبێت و چ تایبەتمەندییەك لەخۆدەگرن. ئەم سوننەتە لە "ئۆکسفۆرد"یشدا دەگیرێتەبەر. فەیلەسوفانیدیکەش پاش "ڤیتگنشتاین" ئەم کارەیان گرتەبەر، قسەی بەناوبانگی "ڤیتگنشتاین"تان لەیاددا لە "لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکان"دا بێت کە دەیوت: (فەلسەفە خەباتێکە دژی تێگەیشتنی ئێمە بەهۆی زمانەوە) دەتوانرێت ئەم رستەیە بە ناونیشان و تابلۆی کاری ئەم فەیلەسوفانە بزانین. لەم پێشەکییەوە دەبێت بوترێت فەیلەسوفانی شیکاری "تحلیلی" لەمڕووەوە سەیری باسی مانای ژیان دەکەن کە مەبەست لە مانای ژیان بەوردی روونبکەنەوە. ئایا مانای ژیان روانینە لە ئامانج و مەبەستی ژیان یان سەیری کاریگەری و جێکەوتی ژیان دەکات؟ ئایا مانای ژیان کەشفدەکەین و دەیدۆزینەوە یان دایدەنێین؟ چ شتێك دەتوانێت جێکەوت و کاریگەری لەسەر ژیان یان ئامانجی ژیان یان بە بەهای ژیان بزانرێت؟ هەوڵ لەسەر ئەوەیە بە روونکردنەوە و کۆڵینەوەی چەمکەکان و روونبوونەوەیان بدرێت و رێگری لە نەزانین و نادیاری و لێڵ و تێکەڵبوونی چەمکەکان بکرێت. دەتوانرێت شتێکیدیکە بۆئەم شتانەش زیادبکرێت و ئەویش ئەوەیە لەبنەڕەتدا ژیان لە جیهانێکی رازئاشکرا و بێڕاز و نهێنیدا وادەکات تاکەکان بیر لە گوتەزای مانای ژیان یان بەدەستەواژەییەکی وردتر وایانلێدەکات بیر لە مانابەخشین بە ژیان بکەنەوە. رەنگە لە جیهانی رابردوودا خەڵکی لە جیهانی رازئامێزدا نقومبووبن و لە جیهانێکی وەك ئێستادا کە دەرودیواری ئاشکرا و دیارە رەنگە پرسیارکردن لە مانای ژیان زۆر گرنگنەبێت، چونکە بەتەواوی لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا تێکەڵە، بەلام کاتێك پەردە"حجاب"کان دێنەکایەوە و نێوان ئێمە و خوونەریتە زیهنییە ئاساییەکانمان دووردەکەونەوە، ئەم پرسیارانە دەردەکەون. کتومت وەکو ئەوکاتەی لەشوێنێکداین کە هەناسەدان

بۆمان سەختدەبێت و ئەوکاتە تازە بۆماندەردەکەوێت کە تاکوئێستا تیایدا نوقمبووین و گومانمانەکردووە کارێکی گرنگبێت. لە دڵی جیهانی رازئامێزی رابردووشدا یان پرسیار لە مانای ژیان نەکراوە یان ئەگەر پرسیارێکیشبکرایە، وەڵام روونبوو. وەکو ئەو وەڵامانەی ئایینە ئیبراهیمییەکان دەیدەنەوە. بۆنموونە: هەماهەنگبوون لەگەڵ ئیرادەی دانەر "شارع" بە مانابەخشی ژیانی دەزانن. لە جیهانی ئێستادا بەتایبەت بە لەبەرچاوگرتنی دوانەی دانان "جعل"و "کەشفکرن "کشف"، گەورەیی و مەزنی پرسیارەکە روونتردەبێتەوە.

**– لە بابەتی وەکو بوونگەرایی "ئەگزیستانسیالیزم"دا باس و بابەتی بوونگەرایی "وجودی" وەکو: دڵەڕاوکێ، بەرپرسیاری، ترس، ئومێد و.. هتد، دەخرێنەڕوو و ئەمجۆرە بابەتانەش لە مانای ژیان لەگەڵ بوونگەرایيدا سەنتەربوونیان هەیە، بەڵام لە فەلسەفی شیکاریدا پەیوەستبوون بە بابەتی لەمجۆرەوە بوونیان نییە، لەمشێوەدا فەیلەسوفانی شیکاری چ نیگا و روانینێکیان بۆ مانای ژیان هەیە؟**

**سروش دەباغ:** دەتوانرێت لەبارەی ئەم چەمکانەوە رێگە و میتۆدی فەیلەسوفانی شیکاری بەکاربهێنین. بەومانایەی فەیلەسوفانی شیکاری دەتوانن لە باسکردنی مانای ژیانیشدا بەشدارییان هەبێت. ئەوەی کە مانای ئامانج و مەبەست یان مەبەستداری و ئامانجداری جیهان چییە، مانا لە رەگەزی کەشفکردن و ئاشکراکردن یان دروستکردن و دانان، ئەمانە ئەوکارانەن کە فەیلەسوفانی شیکاری دەتوانن تیایاندا رابمێنن، بەڵام سەرنجدان لە مانای ژیان بەوشێوەیەی جێگەی سەرنجی فەیلەسوفانی بوونگەرایی "ئەگزیستانسیالیزم"ە، جێگەی سەرنج و بەوشێوەیە نییە لای فەیلەسوفانی شیکاری، هەر بەوجۆرەی لە ناوی ئەم قوتابخانەوە وەردەگیرێت، باس لە حاڵ و دۆخی بوونگەرایی مرۆڤ دەکات، بەڵام فەیلەسوفانی شیکاری لەڕووی مێژووییشەوە لەگەڵ مانای ژیان لەرێگەی ماتماتیك، فیزیای نوێ پەیوەندییەکی بەهێزیان هەبووە. ئەوەی جێگەی سەرنجی فەیلەسوفانی شیکاری بووە ئەوە جێبەجێکردنی ماناکان و روونکردنەوەی چەمکی زاراوەکانە کە لەم مەیدانەدا سوودیانلێوەردەگیرێت. لەبەرئەوە فەیلەسوفانی شیکاری خاڵی لەم باسانەش نییە.

**– دەرکەوتنی زانستە ئەزموونییەکان کاریگەری لەسەر زیهنی مرۆڤ لەم قۆناغەدا هەیە کە تیایدادەژی و ونکردنی مانای ژیان بۆ مرۆڤ بەهەندوەردەگیرێت و دەبێتە شتێکی شێلگیرانە"جدی"، نیگای زانستی والێدەکات بێئامانجبێت. لەڕاستیدا فەیلەسوفانی شیکاری بەبێ زەمینەی پێشتر بەمە نەگەیشتوون. خەریکبوونیان بەم بابەتەوە زەمینەی لە بیرکردنەوەی ئەواندا هەبووە. (رەنگە بەرهەمەکەی، قۆناغی فەلسەفەی شیکاری (زاڵبوونی روانینی زانستی)یە کە ئەم زەمینەیەی ئامادە و سازکردووە.**

**سروش دەباغ:** بەڵێ دەتوانرێت گۆڕانی فیکریدیکە بۆئەم هۆکارانە زیادبکرێت. لە فەلسەفە کیشوەرییەکاندا باسی پووچی جیدیبوو و دەستەواژەی "نیچە" کە باوەڕیوابوو قۆناغی پووچی و کەوتنی بەها مرۆییەکان گەیشتووە. بابەتی ژیان و ژیانکردن لە جیهانی بێزاری و نەبوونی نهێنیدا زۆر گرنگە. لە جیهانی رابردوودا گەلێك لە بابەتەکان روونبوون، بەڵام بە دەرکەوتنی زانستی نوێ و بەرهەمهێنانی سەرچاوەی سەربەخۆی مەعریفی زۆرێك لە کاروبارەکان لە ئاین جیابوونەتەوە و فەیلەسوفانی ئەخلاق لەبارەی جیایی هەبووەکان"هست" لە دەبێت "باید" کان قسەیانکردووە.

**– رەنگە یەکێك لەورێگایانەی کە التفات بە مانای ژیان، سەنجدانبێت لە ژیانی رۆژانە و شیکردنەوە و لایەن و کونج و کەلەبەرەکانی جیاوازەکانی، ئایا فەیلەسوفانی شیکاری هاوچەرخ سەرنجێکی تایبەتیان لە ژیانی رۆژانە و تێگەیشتنی فەلسەفی تایبەتییان لەبارەیەوە هەیە یان نا؟**

**سروش دەباغ:** ئەگەر بتەوێت لەڕووی فەلسەفییەوە لە پەیوەندی ئەمە بزانیت، زۆرباشە ئێمە فەیلەسوفێکی وەکو "جۆرج ئەدوار مۆر"مان هەیە کە تێگەیشتنی ئاسایی لەلای گرنگبوو، بەڵام لێکۆڵینەوە و خەریکبوونی زیاتر بەمبابەتەوە لەلای "ڤیتگنشتاینی دووەم"و فەیلەسوفانی قوتابخانەی "ئۆکسفۆرد" کە لەژێر کاریگەری زمانی سروشتیبوون، بوونی هەیە. پاش ئەمان لە قۆناغی دواتردا "ڤیتگنشتاین" دەبینرێت. پاش کۆچی ئەویش ئەم سوننەتە لە "کامبریج"ەوە بۆ "ئۆکسفۆرد" گوازرایەوە. لەمە تێپەڕین فەیلەسوفێکی وەکو "ڤیتگنشتاین" لەبارەی ژیانەوە قسەیکردووە، بەڵام ئەمکارە زیاتر لە تێڕامانەکانی ئەوەوە سەرچاوەیانگرتووە تاکو ئەوەی لەگەڵ زمانی فەلسەفییەکەیدا گونجاوبن، بۆنموونە: لە کتێبی "فەرهەنگ و بەها"دا چەند ئاماژەیەك بەهۆی بەسیرەتییەوە لەبارەی مانای ژیانەوە، چەند خاڵێك دەبینرێن. گەر لەم فەیلەسوفەش تێپەڕین شتێکی وام لەیادەوەریدا نییە کە فەیلەسوفانیتری شیکاری لە باسی مانای ژیاندا باسێکی سیستەماتیك و رێکخراویان کردبێت، بەڵکو ئەوان زیاتر هەوڵیانداوە ئەم گوتەزایە لەگەڵ کاروباری فەلسەفیان گرێبدەن.

**– بۆ تاکی ئاسایی چۆن و لەژێر چ هەلومەرجێکدا ئەم بابەتە دەخرێتەڕوو، ئایا بەتەواوی باسێکە کە لە ئاستێکی تایبەتی ژیان دێتبەدەممانەوە و دێت بۆلامان یان بۆ خەڵکە ئاساییەکەش وەکو باسێکی جیدی دەخرێتەڕوو؟**

**سروش دەباغ:** بە بۆچوونم ئەم باسە لە هەردوو ئاستی ژیاندا دەخرێتەڕوو، هەڵبەتە بیرمەندێك بابەتەکە روونتردەکاتەوە و هەوڵدەدات بە هەڵوەشاندنەوە سنوور و کونج و کەلەبەرەکانی باسەکە روونتربکاتەوە، بەڵام بۆ تاکێکی ئاسایش بابەتەکە جێگەی تێڕامانە. ئەوەی کە ئێمە بۆچی دەژین و چۆن دەتوانین مانا بە ژیانی خۆمان ببەخشین، چۆن دەتوانرێت ناتەواوی و تاڵییەکانی ژیان مانا بکەین؟ "ڤۆڵتێر" ژیانی پیاوێك باسدەکات کە لە

بومەلەرزەی "لیسبون" هەموو ئەندامانی خێزانەکەی کە (٥) کەس بوون، لەدەستیدابوون و بۆئەوەی جەستەکانیان لەژێر گەرمای خۆردا بۆگەننەبن، ناچاربوو بە دەستەکانی خۆی منداڵەکانی بەخاکبسپێرێت. ئەو پاشان دەڵێت: نازانم چۆن ئەم دەرد و ئازارانەی مرۆڤ روونبکەمەوە. غەم و پەژارە و سەختییە توندەکان دەتوانن ئەم بابەتە لە زیهنی مرۆڤەکاندا بە گشتی جیدیبکەن، زۆرێك لە کاتەکان کاردانەوە لەناکاو و توندەکانی تاکەکان بۆئەم بابەتە دەگەڕێتەوە کە تاك ناتوانێت دژوارییەکانی بەردەمی هەرسبکات و ئەم گوتەزایە وایلێدەکات روانینی بۆ جیهان بگۆڕێت. رەنگە کەسێکی ئاسایی نەتوانێت پۆلێنبەندی ورد و تەواوی بابەتەکە بکات، بەڵام لەڕووی مرۆڤبوونییەوە بیر لە مانای ژیان دەکاتەوە.

**– بەم وەسفە مەبەست لە مانای ژیان بۆ تاکەکان چییە؟ مەبەستی ئێمە لە ماناداربوون و مانادارنەبوونی مانای ژیان چییە؟**

**سروش دەباغ:** ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ دیاریکردنی ئێمە لە مانای ژیان. هەندێجار قسە لەبارەی ئامانجی ژیانەوە دەکرێت و ئەوەی ئێمە مرۆڤەکان چ ئامانجێکمان لە ژیان لەم رووی زەوییەدا هەیە. هەندێجار قسە لە بەهای ژیانە و هەندێجار قسە لەبارەی کاریگەری ژیانە. لە باسکردن لە ئامانجی ژیان ئەم پرسیارە دێتەپێشەوە کە ئایا دەکرێت ئامانجی ژیان دابنرێت و دروستبکرێت یان کەشفبکرێت و بدۆزرێتەوە. زۆربەی ئایینداران لە ئایینە ئیبراهیمییەکاندا باوەڕیانوایە کە دەتوانرێت ئامانجی ژیان کەشفبکرێت و خودای گەورە لەم جیهانەدا لەڕێگەی پێغەمبەرانیەوە ناردوویەتی یان باسیکردووە و بە شوێنکەوتنی "ئەمر"ەکان دەتوانرێت شوێن موراد و مەبەستی خودا بکەوین و بە ئامانجی مەبەستی ژیان کە گەیشتنە بە رەزامەندی خودای گەورە، بگەین. لەم دەربڕینەدا مانای ژیان یەکسانە بە ئامانجی ژیان و ئامانجی ژیانیش شایەنی کەشفکردنە و کەشفدەکرێت. لەلایەکیترەوە هەندێك باوەڕیانوایە کە مانای ژیان یەکسانە و هاوتای ئامانجی ژیانە، بەڵام دەبێت دابنرێت. بێئامانجبوونی ژیانی هاوچەرخ کە "ئیستیس" ئاماژەپێدەکات، لەگەڵ ئەم دیدگایە سازگارە کە دەبێت ئامانج دابنرێت. هەندێك لەوکەسانەی باوەڕیان بە دانانی ئامانجی ژیانە پۆلبەندی دەروونناسی بۆئەم باسە دەکەن، بەو مانایەی دەبێت تاك بەدوای جۆری کەساییەتی خۆیدا بڕوات و ئەو کاروبارانەی لە رەگەزی جۆری دەروونی ئەون خۆی خەریکبکات و گەشە بە خۆی بدات و خۆی بەرەوپێشەوەبەرێت. ئەمە بە مانایەك دانانی مانا و ئامانجی ژیانە. بۆنموونە هەندێك لە تاکەکان ئەهلی یارمەتیدان و هاوکاریکردنی ئەوانیترن. بەم تاکانە و ئەم کەسانە یارمەتیدەر "helper" پێدەوترێت. ئەم کەسانە بە یارمەتیدانی ئەوانیتر و خەریکبوون بەمکارانەوە هەستدەکەن ئامانج و مانایان بە ژیانی خۆیان بەخشیوە. کەسانێك هەن کە ئەهلی کارە تیۆری و هزرییەکانن و شێوەی ئامانجبەخشینیان بە ژیان جیاوازە. خاڵی بنەڕەتی لێرەدا ئەوەیە کە تاك لەسەر بنەمای جۆری کەسایەتی خۆی "تایپۆلۆژی" مانا و ئامانج بۆ ژیان دادەنێت. لەم دەستەواژەییەدا مانای ژیان هەم هاوڕاییە لەگەڵ ئامانجی ژیان و ئامانجی ژیان دەبێت لەلایەن خودی تاکەوە دابنرێت. لێرەدا تاك سەنتەبوون پەیدادەکات. یەکێك لە خاڵە بهێز و تایبەتمەندییەکانی جیهانی نوێ کە "ئەستیس"

ئاماژەپێکرد، ئەم مەبەستە لەخۆدەگرێت کە فەیلەسوفان زیاتر لەوەی بەدوای کەشفکردنی مانای ژیانەوە بن، بەدوای دانانی مانای ژیانەوەن و دەیانەوێت مانا بۆ ژیان دابنێن.

**- لەنێوان رووگە جیاوازەکاندا بۆ بابەتی مانای ژیان - رووگەی دەروونناسی یان کەلامی یان فەلسەفی - چ پەیوەندییەك بوونی هەیە؟**

**سروش دەباغ:** رووگەی فەلسەفی سنوور و کون و کەلەبەرەکانی بابەتەکە دیاریدەکات و یارمەتی ئەوەدەدات کە بزانین مەبەستمان لە مانای ژیان چییە. لەو باسانەی پەیوەندییان بە بابەتە ئەخلاقییەکانەوە هەیە پۆلبەندی فەلسەفی یارمەتی ئەوەدەدات تاکو بۆماندەربکەوێت و بزانین کام بەهایانە دەتوانن بە بەهای ژیان دابنرێن و بەهابن بۆ ژیان. لەهەمانکاتدا دۆزینەوەکانی دەروونناسان دەتوانێت رۆشنکەرەوە بن. لەهەمانکاتدا هەندێك لە یاسا و رێساکانی عاریفانمان لەم نێوەندەدا دەتوانن سوودمەندبن. بۆنموونە "مەولەوی" دەڵێت:

در زمین مردمـــان خـــانه مکن
کار خود کن کار بیگانه مکن
کیست بیگانه تن خـــاکی تو
کز برای اوست غمنـــــاکی تــو

ئەم سەرنجانە لە خود و کۆڵینەوە و پشکنینی حاڵ و دۆخی خود و مووبەموو و والاکردنی تانوپۆی خود و رووتبوونەوەی خود لەبەرامبەردا خوددا و ناسینی خاڵی بەهێز و لاوازی خود، کارێکی دژوارە. کارێك کە بەئاسانی مەیسەرنابێت. مومکینە ئەوانیتر لە ئێمە شتێك ببینن و ئێمە نەتوانین بیانبینین و بدۆزینەوە. لێرەدا پشکنینی خود و خودناسی، بەپێچەوانەی فەلسەفەوە، گرنگی پەیدادەکات. بۆ چوونە ناو ئەم گرنگی و هەستکردن بەم گرنگییە دەبێت بەدوای جۆری کەسایەتی "تایپۆلۆژی"خۆمانەوە بین و هەروەها هەرجۆرێك کەسایەتی ئامانجی خۆی هەیە و گرنگە بە دروستی بیدۆزینەوە و بۆماندەربکەوێت. لە فێرکارییە عیرفانییەکانماندا هاتووە: (الطرق الی اللة بعدد انفس الخلایق)، ئەم دەستەواژەیە جەخت لەسەر جۆری ناوکۆ و زۆریی و فرەیی ئەزموونەکان و رێڕەوەکانی رۆیشتن و سلوك. چ قایل بە کەشفکردنی مانای ژیان بین چ بە دانانی مانای ژیان، ئامۆژگارییەکانی ئایینەکان و مەزهەبەکان لە ئاستی گشتیدا دەستگرۆیان دەکەن. لەهەمانکاتدا ناسینی زیاتری خود دەبێتە هۆی ئەوەی رێنمونییە گشتییەکانی ئایینییەکان بەپێی ئەو ناوکۆ "سیاق"ەی تێیدان و ئەمجۆرە کەسانە و لە رێڕەوی هێنانەدی مانای ژیانی خود هەنگاوهەڵگرن.

**– وەڵامی ئایینەکان بۆ بابەتی مانای ژیان چۆن هەڵدەسەنگێنن. ئایا ئەم وەڵامانە دەتوانن کێشەی مانای ژیان چارەسەربکەن؟ لەڕووی ئەزموونییەوە خەڵکی لە جیهانی نوێدا زیاتر پێشوازی لە وەڵامی ئایینەکان دەکەن یان لەجێگەیەکیتردا بەدوای مانای ژیاندا دەچن؟**

**سروش دەباغ**: لەبارەی مانای ژیان و ئەو دەرکەی کە ئایینەکان لەبارەیەوە هەیانە، دەبێت لە نێوان ئایینە ئیبراهیمییەکان و نائیبراهیمییەکاندا بە جیاکاری قایلبین. ئایینە ئیبراهیمییەکان قایلن بە ئامانجێك بۆئەم ژیانە کە بریتییەلە ئیحراز مەبەستی بەدیهێنەر"خالق" و بەپێی ئەوەش کارکردن و جوولانەوە. لە ئیسلام، مەسیحییەت و یەهودییەت خودا بە سیفەتی مورید حەکیم دەناسرێت. گرنگترین کارێك کە مرۆڤی ئایینی دەتوانێت ئەنجامیبدات بۆ هێنانەدی مانای ژیانی، کەشفکردنی مەبەستی خودا و ئەنجامدانی کردار بەپێی ئەو مەبەستە کەشفکراوە. لەبەرخاتری ئەمەشە ئەم ئایینانە ناودەنێن ئامانجەگەرا، بەلاّم لە ئایینە نائیبراهیمییەکاندا خودای گەورە کۆمەڵە وەسف و سیفەتێکی نییە و حەکیمنەبووە و نەك تەنها مرۆڤئاسا نییە، بەڵکو لە هەندێك لەئایینەکاندا دیاریکراویش نییە. لە ئایینە نائیبراهیمییەکاندا شتەکە ناوەکی و پەیوەندی بە ناخەوە هەیە، لەبەرئەوە بۆئەوان گرنگ پاککردنەوەی نەفس و دەروونە و بەوپێوەرەی تاك بتوانێت بەپێی فێرکارییە بودیزمییەکان خۆی پاکبکاتەوە، ئەوا دەتوانێت مانای ژیانی بهێنێتەدی. بەمشێوەییە لە بۆچوونی دووەمدا بەپێچەوانەی روانگە و بۆچوونی یەکەمەوە ئامانجێك لە دەرەوە بوونی نییە و بەتەواوی رەنگی ناوەکی هەیە.

●●●

**سەرچاوە:**

**سایتی فەرمی دکتۆر سروش دەباغ.**

# لەمەڕ ئەخلاق و عیرفان لای مەولانا

## گفتوگۆ لەگەڵ سروش دەباغ

دیـــــدار: مەهدی بازرگانی
وەرگێڕانی: موسعەب ئەدهەم




سروش دەباغ منداڵی رۆشنبیری ئایینییە، نەك تەنها بەو بەڵگەیەی کوڕی "دکتۆر عەبدولکەریم سروش"ە، بەڵکو ئەگەر کەمێك لەبەردەم قسەکانیدا دابنیشی، بۆتدەردەکەوێت کە زمان، خوێندنی، کەڵکەڵەی، شێوە و شێوازی رەفتاری و مامەڵەی باوکانی فیکری زۆر کاریگەرییان لەسەری هەبووە، وەکو باوکی لە تەمەنی لاویدا چووەتە ئەورووپا و فەلسەفەی خوێندووە و ئێستا خەریکی وانەوتنەوە و لێکۆڵینەوەیە لەفەلسەفەدا. لەبارەی مەولانا و بۆچوونی عاریفانە لەبارەی "ئەخلاق"ەوە قسەمانکرد، کورتەی ئەم گفتوگۆیە لێرەدا دەخەینەڕوو:

**– دەزانین قسەکردن لەبارەی "مولانا" قورسە. کاتێك قسە لەبارەی "مەولانا"وە دەکەین، لەڕاستیدا قسە لەبارەی کەسێکەوە دەکەین کە جێگە و پلەی "فەلسەفەی" زەمکردووە، بەم وەسفانە ئایا "مەولانا" فەیلەسوفە یان دژەفەلسەفە؟**

**سروش دەباغ:** خاڵێکی باشە، سەیرکە ئێمە کاتێك قسە لەسەر فەیلەسوف دەکەین بە مانای زاراوەیی و ئەمرۆیی، واتە ئەوکەسەی کە لە یەکێك لە بابەتە سەرەکییەکانی فەلسەفە خوێندنی تەواوکردبێت و ئەکادیمی بێت. گریمانەی ئەوەبکەن لە سوننەتی ئیسلامیدا، فەلسەفی "سەدرایی" باشدەناسێت یان "ئیشراق"و "مشا" باشدەزانێت یان لە فەلسەفەی رۆژئاواییدا پسپۆڕی فەلسەفەی کلاسیك یان فەلسەفەی یۆنان یان فەلسەفەی هاوچەرخە. لەبەرئەوە گەر ئێوە بەم مانایە قسە لەبارەی فەیلەسوفانەوە دەکەن، بەهیچ "مەولەوی" فەیلەسوف نەبووە. ئەو نەك تەنها فەیلەسوف نەبووە، بەڵکو لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیدا زۆر هاوڕانەبووە. ئەو دەستەواژە بەناوبانگەی "مەولەوی" بهێننەوە یادی خۆتان کە دەیوت:

چون دوم بـــــار ادمیزاد بزاد
پای خود بر فرق عــلتها نهاد
علت اولی نباشـــــد دیـــن او
علت جـــــزوی نـــدارد کین او

ئەم دەستەواژەیە (علت اولی نباشد دین او)، واتە: هۆکاری یەکەم، ئایینی ئەو نییە. ئاماژە بەهەمان ئەو دابەشکارییە دەکات کە لە فەلسەفەی یۆناندا هەیە. بەومانایەی کاتێك دەستەواژەی هۆکاری یەکەمی (علت اولی) باسدەکات، مەبەست هەمان عەقڵی یۆنانییە. عەقڵی یۆنانیش بەرمەبنای ئەوەی عاریفانمان تەرحیانکردووە و باسیانلێوەکردووە، تەنانەت ئەگەر لەبارەی بابەتی سەلماندنی خوداشەوە بتوانێت سوودی هەبێت و هاوتای مەبەستبێت، جارێکیدی تەنها رێگەی دوورخستووەتەوە بووەتە هۆکاری ئەوەی درەنگتر بگەین.
**یەکەم:** عاریفانمان زۆر لەگەڵ فەلسەفەدا خۆشی و مەیلیاننەبووە و باوەڕیانوابووە فەلسەفە پێ واسیتە دەهێنێتەناوەوە. لەکاتێکدا ئێمە هاوڕا بەپێی بۆچوونی عاریفان سەیری فێرکارییەکانی نێردراوان و پێغەمبەران دەکەین پێویستمان بە واسیتە نییە و ئەمە نابینین و بۆماندەرکەوێت کە فەلسەفە تەنها بە سنووردارکردن، جۆرێك رێگە دوورتردەخاتەوە.

ئێمە لە سوننەتی عیرفانیدا لەگەڵ دووجۆر لقی جیاواز سەروکاریمان هەیە. یەکێکیان عیرفانی خۆراسانی و مەکتەبی خۆراسانە و ئەویتریان عیرفانی ناخۆراسانی، کەسانێکی وەکو (ئەبایەزیدی بەستامی، ئەبوسەعید ئەبولخەیر و ئەبولحەسەنی خەرەقانی پەیوەستن بە مەکتەبی خۆراسانەوە. مەبەست لە خۆراسانیش، خۆراسانی گەورەیە و "مەولەوی"یش ئەهلی بەڵخ بوو و بەڵخیش لە شارە گەورەکانی خۆراسانی گەورە. عیرفانی خۆراسانیش، عیرفانی نافەلسەفییە و لەگەڵ بیرکردنەوەی میتافیزیکییانە زۆر مەیل و میهری نییە. هەڵبەتە ناڵێم لەم عیرفانەدا بنەمای میتافیزیکی بوونیان نییە، مەبەستم لەوەیە بە بەراورد لەگەڵ عیرفانی ناخۆراسانیدا کە کەسایەتییەکی گەورەی وەکو "ئیبن عەرەبی" لە لووتکەی ئەو مەکتەبەدایە، ئامادەگی میتافیزیك لە مەکتەبی خۆراسانیدا کەمڕەنگترە، بەڵام عیرفانی ناخۆراسانی عیرفانێکی فەلسەفییە و رەنگێکی فەلسەفی گرتووە. بۆیە ئەم تانەیەی "مەولانا" لە فەلسەفە، رەنگە مەبەستی عیرفانی ناخۆراسانی بێت. قوتابخانەی خۆراسان بەومانایەی کە "ئیبن عەرەبی"و شاگردەکانی باوەڕیانپێیبوو، مەکتەبێکی تیۆری نییە. ئێوە کەسێکی وەکو "سەدرەدینی قونەوی" لەبەرچاوبگرن کە دوای "ئیبن عەرەبی"یە و لەسەر ئەو دەڕوا و کتومت لەهەمان ئەو فەزایەدا هەناسەیدەدا کە "مەولەوی" تیایدائامادەبوو. بەمحاڵەوە، "مەولوی" قایل بەم کاروبار و شتێکی لەوجۆرەوە نەبوو و تیۆرکاری و بەمجۆرە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەمری باڵادا نەبوو. هەڵبەتە مەبەستم ئەوەنییە کە ناکرێت قسەکانی "مەولەوی" لەڕووی فەلسەفییەوە شیبکەینەوە و شیکردنەوەی فەلسەفیان بۆبکەین و زۆرێکیش ویستوویانە کارێکی لەمجۆرە بکەن، بەڵام ئەوەی کە "داستان" گرنگترین هۆکارێکە کە "مەولەوی" بۆ ئەنجامدان و گەیاندنی مەبەستی خۆی هەڵیبژاردووە تاکو نەچێتەناو ئەو بابەت و باسە تیۆرییانەوە و خودی ئەمەش لایەنگری ئەو پیشاندەدات.

**- مەبەستم ئەوەنەبوو، "مەولەوی" لە جێگەیەك لە "مەسنەوی"یدا زەمی عەقڵ دەکات و لەجێگەیەکیتردا دەڵێت:** (**تا چە عالمهاست در سودای عقل**..)

**سروش دەباغ:** ئەم عەقڵە، ئەو عەقڵە ناسراو و دیار و گشتییە نییە، ئەو عەقڵە بەرژەوەندیخواز و فەلسەفییە نییە. بە گوتەی خۆی (عەقڵی عەقڵ و دیدەی ناخن "باطن" بینە:

ازمـــــــــودم عقـــــــل دور اندیش را
بعد از این دیوانه سازم خویش را

واتە: (عەقڵی دووربین و بیرکەرەوە فێربووم، پاش ئەمە خۆم دیوانە بکەم.)
یاخود ئەو جێگەیەی کە دەڵێت:

چون دوم بار ادمیزاد بزاد
پای خود بر فرق علتها نهاد

هەم لە پلەی سووککردن و بەکەمزانینی عەقڵی فەلسەفییە و هەم لە پلەی زەمکردنی عەقڵی ژیانخوازی دووربینی ناسراو و ئەوەی کە هەیە. ئەو عەقڵەی "مەولەوی" لەبارەیەوە قسەدەکات، وەکو فیقهی فیقهە، وەکو نەحوی و نەحوە. روانینێکی لە جۆرە باس لە جۆرێك دیدە و نیگا و روانینی ناوەڕۆکبینە، قسەکردنە لەبارەی راستی "حقایق"ی ئەم جیهانە و پەیبردنە بە نهێنییەکانی ئەم جیهانە. ئاماژەی "مەولەوی" راست بەرامبەر ئەم مانایەی عەقڵە، نەك عەقڵی فەلسەفی و عەقڵی ئامرازی بە دەستەواژەی ئەمڕۆی جیهان، ئەو لەگەڵ هەر دوو دەستەواژەکە لەمەڕ عەقڵ مەیلی نەبووە، واتە عەقڵی فەلسەفی و عەقڵی بەرژەوەندیخواز و ژیانخواز کە ئەهلی لێپرسینەوە و رێکخستنی بۆنە و پەیوەندییە مرۆییەکانە.

**- لەجیهانێکدا کە شایەدی جۆرێك کاڵبوونەوەی ئەخلاق و کەمی ئەخلاق بووین، ئایا گەڕانەوە بۆ "مەولانا" جۆرێك پەیامی گەڕانەوە بۆ ئەخلاقی لە دووتوێی خۆیدا شاردووەتەوە؟**

**سروش دەباغ:** گەڕانەوە بۆ "مەولانا" بەو مانایە نییە کە جیهان ئەخلاقی تێدانەماوە. بە بۆچوونی من گەڕانەوە بۆ "مەولانا" مانایەکی دیاریکراوی هەیە. ئەو مانایەش ئەوەیە کە ئەو مرۆڤەی لە سەردەمی نوێ و بە مانایەك لە سەردەمی پۆستمۆدێرندا ژیان بەسەردەبات، مرۆڤێك کە لە جیهانی نەمانی راز و نهێنیدا - کە ئەگەر بتەوێت دەستەواژەیەکی دروستت لەم جیهانە هەبێت، دەبێت بە جیهانی نەبوونی راز و نهێنی و جیهانێك کە نهێنی تێدانەماوە وەسفبکەین و ناوببەین، نەك جیهانێك کە ئەخلاقی تێدانەمابێت- دەژی، بە هێزێکی زۆر نەبوون و

ونکردنی مانا ئەزموونەکات، هەروەها ئەوە کە بەجۆرێك مانای ژیانی خۆی بکات کە کەمترین دەرد و ئازار و رەنج لەخۆبگرێت بتوانێت بۆنە و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانیتردا، لەگەڵ سەرەتا و بنەمای بوون (هەڵبەتە لە نیگا و روانینی ئەو تاکانەی کە سەرەتا و بنەمایەك بوونی هەبێت) رێبکخات لەم چەند رۆژەی کە لە سەرزەوی خاکیدا ژیان بەسەردەبات و لەگەڵ جۆرەکانی ئازار و دەرد و رەنجەکاندا بتوانێت کەمێك لەم دەرد و ئازارانە کەمبکاتەوە، پیشاندەری هەر ئەم خاڵەیە. بە بۆچوونم بەدەستهات و بەرهەمە عیرفانییەکان لەمڕووەوە گەلێك دەتوانێت یارمەتی کارمان بدەن و یارمەتیدەرمان بدەن.

ئەو ئەخلاقییاتانەی ئاماژەیان پێدەکەن، چەند حاڵەتێکیان هەیە. هەندێکیان لە قاڵبی یاسادان و لە جیهانی نوێشدا بە چاوێکی تایبەت سەیریاندەکرێت و لە ئاستی کۆمەڵگەشدا خەریکی بڵاوکردنەوەیانن. لە حەوزەی تاکەکەسیشدا زۆرێك لە ئەخلاقییاتەکان لە حەوزەی دەروونناسی ئەخلاق باسیانلێوەدەکرێت و تاك دەبێت هەندێکیان فێربێت تاکو بەسەر هەندێك لە لاوازییەکانی خۆیدا زاڵبێت و هەندێك لە فەزیلەتەکان لەخۆیدا جێبکاتەوە. باس و توێژینەوەی تیۆری لەم حەوزەیەدا زۆر پڕرەنگن و بوونیان هەیە، لەئەکادیمییەکاندا زۆرێك لەمبارەوە باسدەکرێت، بەلاّم من بەڵگەیەکم نییە کە کۆمەڵگەی ئێمە لەپێش مۆدێرنەدا بەئەخلاقیتر بزانم تاکو کۆمەڵگەی ئەمڕۆ. لەلایەکیترەوە ئەوەش ناڵێم کە کۆمەڵگەی ئەمڕۆ لەبەرامبەر کۆمەڵگەی پێشمۆدێرن ئەخلاقیتربووە. بەهەرحاڵ مومکینە ئەمڕۆ تەنانەت شتە سەلمێنراو و دانپێدانراوە ئەخلاقییەکانیش گۆڕانکارییان بەسەرداهاتبێت.

عیرفان نەهاتووە تاکو جێگەی ئەخلاق بگرێتەوە. لەلایەکیترەوە بڕیارنییە کە ئەخلاق جێنشین و جێگرەوەی عیرفان بێت. ئەگەر بمانەوێت لە دەستەواژەی لۆژیکی سوودوەرگرین، پەیوەندی ئەخلاق و عیرفان، پەیوەندییەکی گشتی و تایبەتە لەڕوویەکەوە، وەکو چەند بازنەیەکی بەیەکداچوو، نە بەرامبەر یەك، نە یەکسان. چەند بەشێك لە ئەخلاق بەتەواوی لەسەرپێی خۆیان وەستاون، هەروەها چەند بەشێکی عیرفانیش، بەلاّم جۆرێك ئەخلاقی عاریفانەشمان هەیەکە لەنێو کەسانی مام ناوەندیدایە کە دەتوانێت هاونشینی ئەو ئەخلاقە بلاّو دیارەبێت کە ئێمە مەبەستمانە. عاریفانیش لەڕووی ئەخلاقییەوە دەتوانن پێمانبڵێن کە درۆنەکەن،ماڵی کەس نەخۆن، و راستی نەکەنە ناڕاست. لەڕاستیدا کاروباری لەمجۆرە هەم دەتوانرێت روونکردنەوەی عیرفانی و لەڕووی عیرفانییەوە روونبکرێتەوە و هەمیش دەتوانرێت بەپێی ئەو قوتابخانە بەربلاّوە ئەخلاقییانەی کە لە ئەخلاقی رێنوێنیکار "هنجاری"دا باسیانلێوەدەکرێت و روونکردنەوەی ئەخلاقیان بۆبکرێت، واتە لەڕووی ئەخلاقییەوە روونبکرێنەوە.

**– واتە، عیرفان، سەرووتر و بالاّترە لە ئەخلاق؟**

**سروش دەباغ:** پلەیەك بالاّترە لە ئەخلاق. بەتایبەت مەبەستم لە ئەخلاق، ئەخلاقی مۆدێرنە کە رەنگی کۆمەڵایەتی هەیە و ئەرکی رێکخستنی پەیوەندییەکانی لەئەستۆدایە لە مەیدانی کۆمەڵگەدا و زۆر بە ئەخلاقی تاکەکەسییەوە خەریکنابێت. ئەمڕۆ ئەخلاقی تاکەکەسی لە حەوزەی دەروناسی ئەخلاقدا جێگەی خۆی کردووەتەوە، بەلاّم لەلای کەسانی پێش ئێمە ئەخلاق زیاتر رەنگی تاکەکەسی هەبووە. ئەوان باوەڕیانوابوو کە فیقهە لایەنی

ئەندامەکانی مرۆڤی لەئەستۆدایە و ئەخلاقیش روونکەرەوەی هەندێك لە کاروباره و کردارەکانی ئەندامەکانی مرۆڤی لەئەستۆدایە، واتە ئەو کردارانەی پەیوەندییان بە کاروبارەکانی ناوەوە مرۆڤەوە هەیە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەخلاقی مۆدێرن بریتییەلەوەی کە تایبەتمەندی کۆمەلأیەتی هەیە و هەر لەبەرئەمەشە کە زیاتر ئەو باسانەی کە لە ئەخلاقی مۆدێرندا دەخرێنەڕوو لەگەڵ عیرفاندا هاوڕێیەتی و نزیکی نییە. ئێوە دەتوانن تاکێکی بە ئەخلاق بن و لەهەمانکاتدا لە نیگا و روانینی عاریفانەوە سەیری ئەم بابەتە نەکەن. دەتوانن کەسێکی ئەخلاقی بن، بەلأم ژیانتان مانای نەبێت یان بەدوای گەیشتن بە مانای ژیانەوە بن، بەلأم داوای ئەو مانایە لە ئەخلاق نەکەن. دەستەواژەیەك لە "مەسنەوی"دا هەیە کە یارمەتی ئەم باسە دەدات. "مەولانا" دەڵێت:

بعد از این ماه دیده خواهیم از تو بس
تا نپوشد بحـــرا خاشـــــــــاك و خس

یان لەشوێنێکیدیکەدا دەڵێت:

عارفان را سرمەای هست ان بجـــوی
تا که دریا گردد این چشم چو جوی

واتە: (عاریفان سورمەیەکیان هەیە، بەدوایدا بگەڕێ، تاکو ببێتە دەریا، ئەم چاوەی وەکو جۆگەیەك وایە.)

ئەو سورمەیەی کە عاریفان بەچاوەکانیاندا هێناویانە، لەڕاستیدا وەرگرتنی نیگایەکی تێکەڵە بە مانا بۆ جیهان کە دەبێتە هۆی ئاشتی مرۆڤ لەگەڵ ئەو جیهانەی کە تیایدادەژی. جۆرێك پڕبوونی فەزای جیهانە لە مانا بەهۆی کاریگەری رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو ئەمرە بالأیە "امر متعالی". ئەمە هەمان ئەو نیگا عاریفانەیە، هەمان ئەو سورمەیە کە دەبێت بەچاواندابهێنرێت.

### – ئەم ئەخلاقی عاریفانەیەی "مەولانا" چ تایبەتمەندییەکی هەیە؟

**سروش دەباغ:** ئەخلاقی عاریفانە یان ئەو ئەخلاقەی کە عاریفان قسەی لەبارەوە دەکەن، ئەخلاقی دەستەبژێرەکانە، بەلأم عاریفان لەوڕووەی کە عاریفن، قسە و پەندی ئەخلاقیشیان بۆ خەڵکە گشتییەکە و توێژی مامناوەندیش هەیە. دەبێت ئەم دوو خاڵەش لە یەکتری جیابکەینەوە. زۆرێك لەوداستانانەی "مەولەوی" بۆ ئێمەیان دەگوازێتەوە، چەندین خاڵی ئەخلاقی بەربلاّو و دیاری ناوخەڵکیش لەخۆدەگرن و گونجاون بۆ ناو خەڵك، بەلأم لەوجێگایانەی کە زۆربەی خەڵکە مامناوەندییەکە رووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ ئەمری بالأدا نییە، قسە لەبارەی ئەو ئەخلاقە عاریفانەوە کە بەرهەمی رووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ ئەمری بالأدا، سوودینابێت.

**- ئەو ئەخلاقەی کە لە جیهانی نوێدا قسەی لەبارەوە دەکرێت و گەڕانی بۆ دەکرێت، ئەخلاقی کەسانی مامناوەندە یان ئەخلاقی دەستەبژێران؟**

**سروش دەباغ:** ئەم ئەخلاقە، ئەخلاقی کەسانی مامناوەندە. خەڵکی بەدوای مانای ژیانەوەن. ئەمە یانی سەرووتر لە ئەخلاق.

**- ئەمە پێیدەوترێت ئەخلاقی دەستەبژێران؟**

**سروش دەباغ:** نەخێر، دەمەوێت بڵێم مرۆڤ دەتوانێت بەدوای مانای ژیانەوە بێت و لەهەمانکاتدا ئەو ئەزموونە عیرفانییانەشی نەبێت. لەسەرەتادا وتم بیرناکەمەوە لەجیهاندا ئەخلاق نەمابێت، ونبووی خەڵکی لە جیهانی نویَ و مۆدێرندا، مانای ژیانە. خەڵکی بەدوای مانای ژیانەوەن و دەتوانن لەعاریفانەوە وەربیگرن، بەڵام نەك ئەوەی بەپێویست و دەبێت لەگەڵیدا ئەزموونی عاریفانەشیان هەبێت، نەخێر بەوجۆرە نییە. مرۆڤ بەدڵنیاییەوە نابێت عاریف بێت، تاکو ژیانی مانای هەبێت. بەدەستەواژەیەکیتر ، خەڵکە مامناوەندییەکە و توێژەکانی خوارەوە دەتوانن بۆ مانابەخشین بە ژیانیان سوود لە گەنجینە و دەستهاتەکانی عاریفان وەربگرنبە بێئەوەی لە بالاترین ئاستدا بەشدار و خاوەنی ئەو ئەزموونە عیرفانیانە بن.

**- ئەگەر مەبەست لە رێکخستنی بۆنەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، چ پێویست بە "مەولانا" دەکات؟ ئەم قسانە "کانت"یش باسیکردوون؟**

**سروش دەباغ:** خاڵی یەکەم ئەوەیە کە "مەولەوی"و پیاوە گەورەکانیتری وەکو ئەو لەژێر ئایینییە ئیبراهیمییەکاندا قسەیاندەکرد، خۆیان پەیوەست بەم سوننەتە دەزانی، بەڵام "کانت" بەمجۆرە نەبوو. خاڵێکیدیکە ئەوەیە کە فەیلەسوفان لەگەڵ خەڵکیدا قسەناکەن، بەڵکو ئەهلی فەلسەفە بە گوێگری خۆیان دەزانن. بەڵام لەبارەی "مەولەوی" بابەتەکە جیاوازی هەیە. "مەسنەوی" پڕلە حیکایەتە و رووی قسەی ئەم حیکایەتانەش لەگەڵ کەسانی مامناوەندییە. ئەمە واتای ئەوەیە خەڵکی ئاساییش لەم قسانە تێدەگەن. "مەولەوی" ئامۆژگاری ئەخلاقی بۆ خەڵکی هەیە و بیستنی ئەم قسانە لەعاریفێکەوە کە خۆی خاوەنی ئەزموونی سلوکی و رەفتاری بووە، زیاتر بیستراوە. لەسەرووی ئەمەشەوە قسانی لەمجۆرە لەگەڵ کەسانی مامناوەندیدا زۆر ئاسانتر پەیوەندی دروستدەکات تاکو زاراوەی قورس و ئالۆزی فەلسەفی.

●●●

**سەرچاوە:**
**سایتی فەرمی دکتۆر سروش دەباغ.**

# تایبەتمەندییەکانی ئایینی
# " یاری "

نووسینی: د. حسێن خەلیقی

**یەکەم:** وەك ئایینە سامییەکان لەسەر ئەو بڕوایەن، ئیزەدان (خودا)، ئافرێنەری مرۆڤ و گەردوونە، بەڵام سامییەکان، پێیانوایە خودا بەتەنیایی، هەم گەردوونی ئافراندووە و هەمیش بەتەنیایی و بەتواناییەوە، گەردوون هەڵدەسووڕێنێ. یاری و ئایینە کوردییە- کان، بەپێچەوانە، پێیانوایە خودا، بۆ هەڵسووڕاندنی گەردوون، خاوەن چەند بڕواپێکراوێکە کە بە"یاران" ناودێرکراون. وەك باسمکرد، مامۆستا جەمالٚ نەبەز، دەبێژێ "لەمەوە وشەی"یارسان" هاتووە. یار، واتە دۆست و "سان" وشەیەکی کۆنی کوردییە، (پیرۆز) بۆ خودا هاتووە Saeneی ئاڤێستا، نێوی چاکێکە وشەی Saintی لاتین بە واتای پیرۆزە (یارانی خودا). (مامۆستا، پێشوو، ل٣١ )

هەرجۆرێکبێ لەم بۆچوونەوە، دوو شت دەردەکەوێ:

یەکەم، خودا دەستناخاتە نێو کاروباری مرۆڤ و دووەم، کە ئاکامی یەکەمە، ئازادی مرۆڤ لە هەڵبژاردنی رێگا و رێبازدا، دەبینددرێ. بەمجۆرە چارەنووسی مرۆڤ بەپێچەوانەی بیری ئایینەکانی سامی، لەپێشدا نەنووسراوە یان بە ئێرادەی کەسێکەوە نەبەستراوەتەوە و مرۆڤ بۆخۆی ئازادە و ئەمەش مامۆستا (جەمالٚ نەبەز) گوتەنی "بوو بە بەشێك لە بیرۆکەی هەللاج و بایەزیدی بەستامی کە لە چەرخەکانی٧٠٠ تا ٨٠٠ی زایینیدا ژیاون. (هەمان سەرچاوە و هەمان ل).

یارانی خودێ (خودا) یان خاوەنکار، لای یارسانییەکان حەوتن (حەفتەن)و یەکیان سەرکردەیانە (پیر). پیر، کورتەی وشەی "پیرۆز"ە و مەزنترین بوونەوەری پاش خودایە. یەکیان مێینەیە و ناوی دایە "رێزوار"ە. واتە دایکی سوڵتان سەهاك. حەفتەن وێنەی "ئیمشاسپەندان" یان حەوت ئیزەد یان ٧ فریشتە پیرۆزەکەی زەردەشتن. لای زەردەشت، هەرکام لەم حەوتانە، ئەرکێکی لەسەر شانە و لێرەدا "سپەنتامینو" (هۆشی پیرۆز) سەردەستەیانە. ئەوانەی یارسان بریتینلە: پیربنیامین،( پیرخدری شاهۆ)، دایەرێزوار، داود، پیرموسا، مستەفا دەودان، شابرایمی ئێوەت (بۆزەسوار).

بۆزەم کران زین، بۆزەم کران زین
جەنگ یارانەن بۆزەم کران زین
(دەفتەری زولاڵ زولاڵ، زیوەرحەقێقەت).

(بۆزە واتا: شینی ئامالٚ سپی) واتا ئەو ئەسپە بۆزەم بۆ زینبکەن، جەنگی یارانە، بۆزەم بۆ زینبکەن. ئەمانە لە ئاییبی ئیزەدیدا هەن کە "یار" دەکەنە "شێخ". وەك شێخ شەمس (شێخ خۆر) شێخ رۆژ، سەرۆکی ئـەوانـیـترە. مامۆستا جەمالٚ نەبەز. دەبێژێ: "وشەی "شێخ" پێوەندی بە وشەی کورد ـ ئێرانی "خشاوپیا"وە هەیە، بـە واتـای خودا، مەزن، نەك شێخی عەرەبی کە بە واتەی بەساڵداچووە. (هەمان، ل٣٢).

باوا یادگار (یارزەردەبەن) یان یاری زەردەبام. سوڵتان لە ناساندنی حەوتەندا دەبێژێ:

یـــــارزەردەبـــــام، یـــارزەردەبام
یــــادگار یــــار، یــــارزەردەبــــام

بەپێچەوانەی کتێبی دەسنووسی سەرئەنجام کە دواتر باسیدەکەم، زۆربەی یارانی یاری پیبانوایە، مەبەست لـە حەوتەن، حەوت کوڕەکەی خۆدی سوڵتانە کە یەکیکیان، باوایادگارە. پیرمیکائیلی دەودانی ئامۆزای سوڵتان، کچـی خۆی "سارا" دەکاتە خزمەتکاری سوڵتان، بــــە فەرمانی ئـــەو، داردەستی پیرمیکائیل دەچێنن و هـەنـارێك دەگرێ و دەیهێنن بۆ سوڵتان و فەرمانی کۆبوونەوە وەك یەکەم "جەم" دەدا و هەنارەکە بە ناونیشانـی "نـیـاز"ەوە دەخۆن. بە ئاماژەی سوڵتان، دۆعای نیاز بـــەمجۆرە دەخوێنن:

وەئیشارەی شا وەفەرموودەی یار وەشەرت بنیامین پیر سەرقەتار.

هەرجۆرێکبێ، ساری لە خاوێنکرنەوەی شوێنەکەدا، دەنکەهەنارێك دەدۆزێتەوە و دەیخوا و سکی پـڕدەبـێ و دەنگۆی خراپی لێوەپەیدادەبێ. دوایی بە دەم کوڕێکی دەبێ. لە سێ رۆژەیدا، سوڵتان فەرمانیـدا، بـیـخـەنـێـو تەنوورەوە و دوایی خۆی چوو و سەری تەنووری هەڵگرت و ئەو زارۆك، سڵاوی لە سوڵتان کرد:

یادگـــــار یار ئەوسابیش زهـــوور پـــەری نیشانە نیباش نـــەتەنوور
نیباش نە تەنوور ئەو شەرارەی نار فەرما و داود ســــــەرتەنوور بنیار
سێ رۆژ سەبرشکرد داود رەهـبەر نیازش وەرگــــرد ئـــامـــا ئەو نەزەر
فەرما وەداود، نــــەعلەینـــم بـــاوەر وێش ئاما وەسەیر پادشا پردیوەر
فەرما وەداود سەرتەنوور لابەر داود ســـــــــەرتەنوور وەرداشتش ئەولا
یادگار نـــەتـــەنوور وریزا وەپـــا وەلــــەفـــز شیرین ســــەلامدا وەشا
بـەرگ خـۆرەنگی یـادگار پۆشا غـــوڵامان دیشان شا پـەنەش بـەخشا
بـەرگ خۆرەنگی کـــەرد وەخـــەڵاتش کورد و کوردستان دا وەبـەراتش
وەبــــەرگ خۆرەنـــگ خـــەڵاتی شاوە ئای جە پردیوەر ئـــامـــا وەراوە

واتا:یادگار کە یارە، ئەوکاتە سەریهەڵدا، لە بۆ نیشانە نایەنێو تەنوور، نیایە نێوتەنوور کە گڵـپـەی ئـاوری بوو، بە داودی وت، سەری تەنوورەکە بنێتەوە، داودی رێبەر سێ رۆژ چاوەروانیکرد، نیازیوەرگرت و مەبەستـەکـەی هاتەجێ. بە داودی گوت، دەمپایییەکانم بێنە، پاشای پردیوەر، خۆی هات بۆ تماشا. بە داودی وت سەری تەنـوورەکـە لابەرە. داود، سەری تەنوورەکەی خستەئەولاوە. یادگار لە تەنوور، هەستایەسەرپێ، وەزمانی شیرین، سڵاوی لە شـا کرد. یادگار جلوبەرگی خۆرەنگی لەبەرکرد. غوڵامەکان دیتیان شا ئەو جلوبەرگەی پێیبەخشی. جلی خۆرەنگی کردە خەڵاتی کورد و کوردستانی وەك بەرات پێدا. وەبەرگی خۆرەنگی خەڵاتی شاوە، ئای لە پردیوەرەوە هات لەرێگەوە . (کاکەیی، محەممەد ئەمین پێنجوێنی، ل١٥٥-١٥٦).

## دووەم: خودا وەك سەرچاوەی رەوان و رامانی گەڕانی رەوان

سەرچاوەی رەوانی بوونەوەری زیندوو، بەتایبەت مرۆڤ، فوو یان هەناسەی خودایـە (رامـانـی زەردەشـتی). کاتێك تۆ (ئیزەدان) لە سەرەتای پەیدابوونی جیهاندا، "رەوانمان"ت ئـــافراند، لـــە مانی خۆت، هۆشتـدا بـــە ئێمە، ئەوکاتە بە "فوو"، رەوانتکردە لەشی ئێمەوە و پەیامی ئیزەدانی و کرداری چاکت بە ئێمە نواند، بۆئەوە گشت کەسێك ئازادانە ئایین وەرگرێ (گاتەکان).

لەم تێڕامانەوەیە کە یارسانییەکان و ئایینە کوردییەکان، بڕوایان بە مردن نییە. چونکە فووی خودا، مردنـی بۆ نییە. کەوابوو، مردن بریتییەلە گەڕانی رەوان، لە جەستەیەکەوە بۆ لەشێکی دی (جلك گۆڕین) کە یـارسـانـی و ئەلەوی، پێیدەبێژن "دوناودون"و ئیزەدییەکان "کراس گۆڕین"ی پێدەڵێن. دوای ئـەوە رەوان هـەزارانجـار گـەڕا، دەگەڕێتەوە نێو رەوانی ئیزەدان. لای ئەوان مردن وەك ئەوەوایە مراوییەك لەم سەری ئـــــاوێکەوە رۆدەچێ (قووتەکە دەخواتەوە)و لـــــەوسەریەوە وەدەردەکەوێ.

مێردان مەترسن وەی سیاسەتە مردنی مەردان جور قووتەی بەتە.

ئیسلام بڕوای بەم گەڕانە نییە. لەم ئایینەدا، پاش مردن، چارەنووسی رەوان نادیارە. خـــودا لــە سـوورەی ئیسرا ئایەی ٥٤، ئەمەی پشتڕاستکردووەتەوە.(پەروەرندەت لە ئێوە ئاگادارترە، ئەگەر بییەوێ، دەکەونەبەر بەزەیـی ئەو، پێیخوشنەبێ، تووشی جەزرەبەتان دەکا. تۆیشمان (محەممەد) نەناردووە تا لایان بریکاربی.) ئایـەی١٥ و ١٦ی سوورەی مـــریەم، بۆ لـــەدایکبوونی عیسا لـــە مـــریەمی کچ، دوای ئاماژەکردن بـــە باسـەکـە، دەبـێـژێ: "فارسلنا الیها روحنا، فتمثل لها بشرا سویا. واتا: ئێمە رەوانی خۆمان ناردبۆی کە رەوانی ئـێـمـە لـە شـێـوەی مرۆڤێکی نێرینەی تەواو هاتەبەرچاو". ئەم کراسگۆڕینەی رەوان کە لەم ئایەتەدا ئاماژەپێکـراوە، ئـەگـەر بـڕوای بێبەڵگە بەهێزنەبێ، گۆمان لەزەیندا، پێکدێنێ. چونکە رەوان بووەتە مرۆڤ و ئەویش، کارەکەی ئەنجامداوە.

سەبارەت بە ئافراندنی مرۆڤ، دەبێژێ :"ئەوکەسەی کە هەموو شتی (بەوپەڕی رێکی و لەباری) دروستکرد و مرۆڤیشی (لەسەرەتادا) لە ماکی قوڕ وەدیهێنا. لەپاشان نـــەتەوەی ئەمی لە پاڵاوتەی چۆڕەئاوێکی کـەمـبـایـەخ وەدیهێنا. ئەوسا راستەوپاستەی کرد و لە گیانی خۆی فوویپێداکرد، گوێچکە و چاو و دڵیشی داوە بە ئێوە. کامتـان

شوكرانەبژێرن. (ئایەتەكانی ٧، ٨و ٩ی سورەی سوجدە)، هەروەها لەوپێوەندییەدا، ئایەتەكانی٢٩ الحجر،٧٢ی ص،١٤ی ئەنبیا، ١٢ی ئەلتەحریم،١٣ی ئەلمائیدە و.. روونكەرەوەی بابەتەكەن.

**سێیەم: ژیانی رەبەنی**

قەشەكانی دیانەكانی پێش رێنێسانس بەگشتی، ژنمێرییان ناڕەواكرد و دوای چاكسازی ئایینی و سەرهەڵدانی پرۆتستانیزم، بارەكە لای پرۆتستانەكان گۆڕانی بەسەرداهات. لای ئیسلام رەبەنایەتی نەباشە و كوردیش زوو، سەریكرد بە ئالقەی ئەو پێوەندییەوە. بەتایبەتی یارسانییەكان، ژنمێری لەسەریان پێویستە (بڕوانە یاروریا، سەیید محەمەد حسێنی، ل٢١٩). لە دەمی رەسیویدا،(بلۆغ) كوڕگەل و دوێتگەل (كوڕ و دۆێت)، دەچنە جەمخانە.سەییدەكان، كەلامی پیرموسایان بۆ دەخوێنن و پەیمانی هاوسەری دەبەستن. ئەم كەلامە كە هۆنراوەیەكی كوردییە، ئامۆژگاری ئەو جووتە دەكا، رێز لەیەكتر بگرن. بە كوڕ دەڵێ:" بێجگەلە هاوسەرەكەت نابێ لەگەڵ ژنێكیدیكە جووتبی". دەنا سووك و ریسوا دەبی و لە كۆمەڵی یارسان دەردەچی و ئەوجار دوای پیرۆزباییكردن دەبێژێ:

موبارەك بوونی ئەی زاوا و زایی زایی و زەماوەن جەی فانی رایی
واتا: "ئەم زاوایی و بووكییە، پیرۆزبێ، بەرهەمهێنان و زەماوەند لەم ریگا تێپەڕیوەدا بوونی هەیە. ( مەبەست جیهانە).

سوڵتان دەڵێ:
ئەی زاماوزایی، ئەی زاماوزایی موباركشان بۆ ئەی زاماوزایی
وەشادی بژیان چە ئەی دنیایی ئەویەكتر بدان گەرمی و وەفایی
نەوانی جە هەم هەرگیزحاشایی ئەوپای هەم پیربووان نەودێ جیایی

واتا: ئەم پەیمانەتان لێپیرۆزبێ، لەم دنیا، بەخۆشی ژیان تێپەڕبكەن و گەرمی و وەفا بەیەكتربدەن. هیچكات، لەیەكتر حاشامەكەن، پێكەوە پیربن و لێكجیانەبنەوە و.. (پێشوو، ل٢٢٢-٢٢٣).

وەك دەبینین، ئەم قایمكاری و بەرعۆدەكردنە، لە ئایینی دیانیشدا هەیە و لەكاتی بەستنی پەیمانی هاوسەریدا، ئەو ئامۆژگارییە دێتەئاراوە.

كچە سەیدەكانی یارسان، تەنیا دەتوانن لەگەڵ كوڕە سەییدەكان، پەیمانی هاوسەری ببەستن! یاساگەلی پردیوەری، بەتوندی دژی بەستنی پەیمانی هاوسەری سەییدەكانە لەگەڵ ئەندامەكانی خێڵی ناسەیید!

بۆرەپیاوی یەزیدییەكانیش، ناتوانن، ژن لە خێزانە ئایینییەكان بێنن. بەپێچەوانەش وەهایە (شاكرفەتاح، پێشوول٩٣).

سوڵتان، بە سەییدەکان، دەڵێ:

کناچە جە عام، کناچە جە عام هەرگیز مەوازدێ کناجە جە عام
زارۆ لێش مەبۆ نیمە و ناتەمام نە پێیش بواچی، سەیید نە عەوام
کەس نەمەزانۆ و چێش بـچڕدێ و نام تۆم حەرامشان وەیەك بییەن ئیدغام

واتا: کچ لە خێڵی ناسەیید مەخوازن، منداڵی لێیدەبێ، نیوەوناتەواوە، نە دەکرێ پێیبڵێ سەیید و نەشدەکرێ پێیبێژی، عەوام. کەس نازانێ، بەچ ناوێك بانگیبکا، تۆی نارەوایان تێکەڵکردووە!

پیرموسا، دەبێژێ:

بەیعەت مەکەرە پەی عەهد و ئەیام
ئامان سەدئامان، چەنی کناچان عام
کردارکـردت گـردین مــەبــۆ خـام
رەنج ویــەردەت پـاماڵ مەبۆ تەمام

واتا: ئەی سادات یارسانی، نەکا لەگەڵ کچە ناسەییدەکان پەیمانی هاوسەری ببەستن، چونکە هەرکاریك بکەن هەموو، خاو و بێئاکام دەبێ. (بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٩-٢٢١).

لێرەدا، جۆرێك جیاوازی چینایەتی یان رەسەنایەتی و نارەسەنایەتی دەبیندرێ!

هەرجۆریکبێ، بەپێ رامانی ئیزەدییەکان، بنەماڵە شێخەکانیان کە دەچنەوەسەر سێ بنەماڵەی سەرەکی "ئادانی، شەمسانی و قانانی، نابێ لەگەڵ مێینەی یەکتر، پەیمانی هاوسەری ببەستن (بڕوان یەزیدییەکان، پێشوو، ل٨٣)، هەروەها، لەوئایینەدا، پیاو مافی نییە چوارژن بێنێ، بەڵام سەردارەکان دەتوانن، جەند ژنیان هەبێ، بەڵام ناتوانن، لەهیجیان جیاببنەوە، چونکە ژنی سەردارەکانیان، نابی، مێرد بە کەسانیدیکە بکەن، لەبەرئەوە دەبنە دایکی یەزیدییەکان (پێشوو، ل٥٨). ئەمە، لەوانەیە لە فەرمانی پەیامبەری ئیسلام وەرگیرابێ کە ژنەکانی کردووەتە دایکی موسوڵمانەکان و ئەویش ناتوانێ، لەگەڵ دایکی خۆی پەیمانی هاوسەری ببەستێ. بڕوانە ئایەی ٥٣ سورەی ئەحزاب کە دەبێژێ، پەیامبەر ئازارمەدەن، دوای مردنی بۆ هەمیشە، لەگەڵ ژنەکانی پەیمانی هاوسەری مەبەستن، هەروەها ئایەی ٦ی هەمان سورە کە دەبێژێ: پەیامبەر بۆ موسوڵمانەکان لەخۆیانیش فەرزترە و ژنەکانیشی دایکی موسوڵمانەکانن.. (ئیسلام و دێموکراسی، نووسەر، ل١٤٣).

**یەك هاوسەریی**

لەکاتی ئامادەبوونی یارسانییەکان بۆ بەستنی پەیمانی هاوسەری، پێویستە، هاوسەر هەڵبژێرن و لە کوڕی "جەم"دا و بەهۆی سەییدەوە، دۆعای ئەو پەیمانە لەکەلامدا، بخوێندرێ کە کورتەکەی، پاراستنی راستی و پاکی و ئەو پەیمانەیە. یەکەم کەلامی بەوجۆرە لەلایەن پیر موساوە خوێندراوەتەوە و لەدەفتەردا، تاپۆکراوە و بەگشتی ئەم کەلامە، ٦٠ هونراوە لەخۆدەگرێ. پیرموسا ئەیژێ:

نەی جەم وەحەق شەرع، نەی جەم وەحەق شەرع
رای جفت و جامی نەی جەم وەحەق شەرع
حەق و حەقێقەت نەگردین پاکتەر
ئینا واناماان، دۆعای ئەی مەزهەر
دۆعای حەڵاڵی جفت ماددە و نەر
پەی عیشوە و فانی چەی دام وەبەشەر

واتا: لەم جەمەدا، بەڕاستی یاسا، رێگای جووتبوون و کۆبوون، هاتەئاراوە. راستی و راستەقینە لەگشت شتێك پاکترە. ئەوا دۆعای ئەم دیمەنەمان خوێندەوە. دۆعای رەوایی جووتی نێرومێ، بۆ ناز و (بۆ ژیانی) بەرەونەمانچوو لەم داوەی مرۆڤدا (واتا ژیانی ئێستا). کۆرتەی گشت باسەکە بەمجۆرەیە: دوو جامۆڵەی ئاوی کەوسەر و سەرد و گەرمی، نۆشدەکەن، ئەویش لەم کراسگۆڕینەی جیهاندا کە رێگادەبڕین. کراس بەرەونەماندەچێ، رەنگینە و رەنگدەداتەوە، بۆئەوە زاوا و بووك، بەرەو سەردی و گەرمی ژیان ببا. تا هەردوو کوڕ کچ، لەم پردە تێپەڕن، تا زاوا و وەوی (بووك)، ببا بۆ چێشتنی سەردی و گەرمی ژیان. تا پیاوان، لەم سەرەوە، سەرگەردانەبن، تا کەسێك لەخۆی بێئاگانەبێ..لەم کراسەی مرۆڤدا، رێگای جووت و کۆبوون و باسی بازار و سەرکردە (قەیسەر)، بە تۆ ئەیژم. هەم لەم رێگا و درگاوبانە، بەرەو ئەوبەر، تێپەربین، بۆئەوە تۆی پاکی، لەدەفتەردا، تاپۆبکرێ. لە سەراوی هەرمان، لەم مەبەستە بەرەونەمانچووەدا، کە لە موو باریتر و لە جامۆڵە رەنگینترە. لەم تامە و هەنگوێنە کە لە تاموچێژ شیرینترە واتا حەڵاڵ و هاوسەرن بۆ وچە، ئەمانە بۆیە بەخەمبارییەوە ئەیژین کە دەبێ، ئەم پەیمانە، تاسەر بەرێوەبەرن تا لەئێوەوە، تۆمی یاری دەرکەوێ. بێهەڵە و تاوان، سەقامگیربن (خەیانەت بەیەکترنەکەن). بێجگە حەڵاڵی خۆتان تۆخنی حەرام مەکەون. دەنا حەڵاڵیی هاوسەریتان بریندارەبێ. ئەوجار تۆی ئیفلیجتان لێوەبەردێ و هاوسەریتان، بەدناو و باتڵدەبێ. ئەوجار لە دەفتەری تاپۆ و فەرمانی گەورەم (سوڵتان) وەدەردەکەون. چێشتتان بە روالت بێتام دەبێ، لەدەروونیشدا، نانتان، بێدەوامدەبێ. نانونمەکتان لە جەماوەر ناڕەوادەبێ. گیانتان لە ئازارگەیاندن و بریندارکردن، بپارێزن و لەگەڵ تاوان و تاوانباراندا، هەڵسوکەوت مەکەن. بە راگەیاندنی کەلام، بڕوابکەن، بە ئەمری سوڵتان، ناموستان بپارێزن. چوارچێوەی هاوسەریتان بپارێزن، لە سفرەی خۆتان نانی حەڵاڵ بخۆن. هەرکەس لە خوانی خۆی، بخوا، دەس بۆ خوان یان سفرەی خەڵك نابا. ئەگەر دەسببا بۆ سفرەی دراوسێ، نێعمەتی سفرەی خۆیشی،

بەخەساردەچێ.. کاکە دزی لە خوانی یەکتر مەکەن، هامەسریتان لەم "جەم"ەدا، بە حەڵاڵی بەستراوە.. بە وتەی پێشینیان، پەیمانی هاوسەری ببەستن، بۆئەوە ئەم دوانە بۆ یەکتر حەڵاڵبن. بە رەزامەندی دایە و باوە، مارەبکەن. لەم هەردوو دنیا رەزامەندی هاتەخوێندن، بە شایەتی جەم و فەرمانی سوڵتان. لە درێژەی دۆعاکەدا، دەبێژێ:

موبارەك بـوٚنێ ئەی زاماوزایی
زایی و زەماوەن چەی فانی رایی
خەڵات پیر و دەلیـل دڵخواهی
واجبەن پێتان چەی جـەم شاهی

ئەم پێوەندە و گرێبەستە، پیرۆزبێ، لە دایکبوون و شادی لەم دنیا بەرەونەمانچووەدا تێپەڕبووەدا، دانی مارەبڕانە بە پیر و دەلیل بە دڵخوازی خۆتان لەم جەمی سوڵتانییەدا، لەسەرتان پێویستە.. ئەوە نیاز و دۆعامان خوێند، دۆعای هاوسەری لە پشتی پەردەوە. وەفەرمانی دادوەر و بە بڕیاری پاشا، بەرێگادانی"جەم" وەپێنووسی یا، دادوەرمان "بنیام" بۆ یاسا و مارەبڕین، بە رێبەرایەتی دروستی داودی خزمەتکار، وەخزمەت و بەڵێنی "رەمزی سەرین مانگ"، بە رێگادانی پەنجتەن و دووحەفتی دڵخواز، وەشاهێدی ئەم جەمە و بێهەڵە و کەمتەرخەمی، لێکجیانەبنەوە و لەم ژیانە، تێپەڕیوەدا، باریەك هەڵگرن، ئاگایان لە شەرم و حەیای خۆیان بێ، کاری هەرزەکاری نەگرنەپێش، پەردەی خۆپاراست لەبەرکەن و بەیەکتر خەیانەتنەکەن.. نەکا دوارۆژ، لێکجیابنەوە، ئەوکات لەم جەم ویسایە، شەرمەزاربن.. نابێ گرێبەست و قەولیان، لێکبترازێ، نیاز و رەوایی رێگایان، نارەوادەبێ. بێگانە نەچێتەسەر رێگا و شوێنی نووستنیان، چونکە نەقدی رەواییان کاڵەوەدەبێ.. (بڕوانە دیوانە گەورە، ل٦٧٤ـ٦٧٧).

لێرەدا پێویستە بەوڕاستییەش ئاماژەبکەم کە لە ئایینی یاریدا، یەك هاوسەری، پەسندکراوە. سوڵتان دەبێژێ: هیچ یارییەك خاوەن ئەو مافە نییە، هاوکات خاوەن دووژن بێ، هەرکەس، وانەکا، ئەندامێکی بێشەرتە و لە کوڕی جەم، وەدەردەندرێ.

نمەۆ و دوو هاوسـەر کەرۆ نیکایی هەر یاردوو هاوسەر جە یانە یایی
چـە ئایـردۆزەخ نییەنش رەهایی دۆزەخ خـاستەر جـە یانەی یایی

واتا: بۆ یار، دوو هاسەرمارەبڕین، رەوانییە، چونکە لە ئاوری دۆزەخ رزگارنابێ، ئەومالەی کە پیاوەکەی خاوەنی دووژن بێ، لە جەحەندم خراپترە. سەیرلەوەدایە، لەم ئایینەدا، بەهەشت و جەحەندەم نییە و لێرە باسیانکراوە! (بڕوانە، یارویار پێشوو، ل٢٣١-٢٣٢). سوڵتان، دوای ئەوە پیاوان رێنوینیدەکا، یەك هاوسەریان هەبێ، ئامۆژگاری ژنانی یارسانی دەکا کە سەبارەت بە مێردەکانیان، لەهەر بارودۆخێکدا، وەفاداربن. هەربۆیە، روو لە ژنەکانیش دەکا و دەبێژێ:

کەروون حاشایی کـــــەروون حاشایی
ژنـانیش نمــەبـۆ کـــــەروون حاشایی
جە مێردشان بوودێ جـــــۆمە جیایی
ئـەرسەرشان پەتی بـــۆ وەبێ کولاهی
وەرپاشـــــان پەتی بـــــۆ وەبێ پاڵایی
ئەرکراسشان نـــەبۆ سەڵتە و کەوایی
یان پــــەی ژیانشان بـکەروون گیایی
ئەر قوتێو غـەزاشان سێ رۆ یەکجایی
شام و نەهارشـــان بۆ نان چەنی خایی
جە قوومز مێردش بۆ سی رۆدووشایی
ئەر بیکراس بلەرزۆ چـا وەر سەرمایی

واتا: ژنانیش نابێ سەبارەت بە پیاوی خۆیان کەمتەرخەمی نیشان بدەن، نابی لە پیاوەکانین جـودا بـنـەوە، تەنانەت ئەگەر بە دەسکورتی ژیان بەسەربەرن و نەتوانن، خەرجی ژیانی ئاسایی وەك پێڵاو وکراس و کەوا و سەڵتــە، دابینبکەن یان ئەگەر بکەونە دەربووزەگەریی و لەماوەی سێ رۆژدا، ژەمێك بخۆن، فەراوین و شێویان بە ئـەنـدازەی هێلکەیەك لەگەڵ نانێك بێ و داهاتی بنە ماڵە لەڕۆژێکدا دوو شاهی (پارەی کۆنی ئێران) بێ و بێجلوبەرگـی گـەرم لەسەرمادا بلەرزن. (بڕوانە، یارویار،ل٢٣٤). بەمجۆرە، تاوان وەپاڵخستنی کاکەییەکان کە هەمووشتێك لایان رەوایە، نادرۆستە، چونکە ئەم فەرمانەی سوڵتان، ئەوانیش وەبەردەگرێ خەیانەتکردنی ژن و پیاو لەیەکتر، لایان نارەوایـە و تاوان و گـــوناحی گەورەشیان"درۆ"و " فرتوفێڵ"و "دزی"و سوێنی درۆخواردنە. (بڕوانە کاکەیی، ل٣٦)*

بەداخەوە، شاعێری گەورە و ناداری کورد، شێخ رەزا تاڵەبانی، بەنارەوا لـەسـەر کـاکـەیـیـەکـان، زنجیرە هۆنراوەیەکی پڕلەتاوانی بـــڵاوکردووەتەوە و زۆرجــــار، گـــــوێم لێیبــــــــووگـە، پـیـاوە خـوێـنـدەوارەکـان، دەیانــــخوێندەوە و ناسزاییان، بەو هەژارانە دەگوت کە گیان و بیریان لەگەڵ چەمکی ئەو هۆنراوە، ئاشنانییە. هەتا هەنووکەش، نەمزانیوە، کەسێك بە بەڵگەوە، لەبەرانبەر ئەو بۆچوونەی شێخ رەزادا، هەڵوێستبـگـرێ! جـێـیـداخـە، شێخی ناوبراو، چلۆن بێبەڵگە ئەوتاوانەی خستووەتە پاڵ، ئەو هاووڵاتیانە!! شیخ لەونووسراوەیدا، بەکورتی دەبێـژێ: رێبەری ئاییـنی ئەوان، حاشا لە بەهەشت و دۆزەخ دەکا و ئەوجار دەرپێ، ژنان، لـەکـوڕەکـەدا، کـۆدەکـەنـەوە و چرادەکوژێننەوە و پیاوان، پەلاماری دەرپێیەکان دەدەن و دەرپی، هەرکەس، وەچنگیان کەوت، ئـەوکـارەی لـەگـەڵ دەکەن!!!

**چوارەم: زمانی کوردی وەك زمانێکی ئاسمانی و پیرۆز**

زمانی کوردی لای یارسان و وەك باسمکرد، لای ئێزیدییەکانیش، زمانێکی ئیزەدانییە. لـــــە جـێـژنـی سەرساڵی ئێزیدییەکاندا، "ئیزەدان"، سەردانیاندەکا و بە زمانی کوردی سەبارەت بە دابـەشـکـردنـی کـاروبـار و دیاریکردنی بەختی ساڵی تازە، لەگەڵیان دەپەیڤێ. دوای ئەوە یەکێکیان گشت زەوی و ئەوەی لەسەریەتی، بۆ ساڵێك بە"کرێ وەردەگرێ، بە هەرچوار دەوری زەویدا، دەڕوانێ، بۆئەوە بزانێ مرۆڤ لەچی کەمە، بە خەڵکەکـە دەبـێـژێ: "وەك ئەوە ئایینە سامییەکان دەبێژن، خودا، دڵی بە نوێژ و ڕۆژوو و سەرڕاوەشاندن، خۆشنییە. ئەو زیاتر حـەز لـە کاروکرداری باش و چاکەخـوازی دەکـا"( بـڕوانـە Karl Brockelmann: DasNeujahrsfest der: Yezidis, P:388-389).

لە هەردووك ئایینی یاری و ئیزەدییدا، نوێژ و ڕۆژوو، لە پلەی دووەمدان و چاکەکـردن بـۆ مـرۆڤ، پـلـەی یەکەمە. ئەمەش ڕێسایەکی زەردەشتییە. ئیبنو عەرەبی سۆفی موسوڵمان، لەژێر کاریگەری ئەم رامانەدا، دەیـوت: "مرۆڤ دەتوانێ لەباتی نوێژ و ڕۆژوو، کاریدیکە بکا. جونێدی بەغدادی و هەللاجیش، هـەروەهـابـوون و پـەیـڤـی لەوچەشنەیان گوتووە.

کۆڵەکەکانی، ڕەفتاری ئایینی ئیسلام، پێنجن: زەکات، حەج، نوێژ و ڕۆژوو و جیهاد. لەکاتێکدا کۆڵەکەکانی ئایینی یاری: پاکی، ڕاستی، خۆنەویستی یان ونبوون لە زاتی خاوەنکاردا و بەخشـش (ڕەدا) کـە لـە "ڕائـیـتـی" ئاڤێستاوە، وە رگیراوە، ڕۆژوو، بـــۆ یارسانییەکان لە بـــەرا، سێ شـــــەو و سی ڕۆژ بـــــەسەریـــەکەوە بـوو. ئەوان، بێزارییان دەربڕی و خاوەنکار بۆی گۆڕین بە سێ ڕۆژ. ڕۆژووی یەزیدییە-کانیش سێ ڕۆژە کە لـە سـەرەتـای مانگی دوازدەیەمی ڕۆژهەڵاتی (کانوونی یەکەم) سێ ڕۆژ بەڕۆژوودەبن و دوای ئەوە دەیکەن بە جێژن (بڕوانە، شاکیر فەتاح، پێشوو، ل٦٥).

بـەپێی رامانی یارسانییەکان، جبرەئیل، نهێنی نەگوتراوی ئیزەدانی، بـــە زمانی کوردی بەوان ڕاگەیانـدووە (سێڕمەگو). پەیامبەری ئیسلام، لـــــەم نهێنییە ئاگاداربووە، بەڵام بە یارسانییەکانی نەگوتووە (بڕوانە شانـامـەی حەقێقەت، ل٢٠٢، هۆنراوەی٣٨٤١).

ئەمەش ئەو ڕاستییە نیشاندەدا کە گشت نووسراوەکانی یارسانییەکان وەك دەفتەری پردیوەری، دیوانەگەورە، سەرئەنجام، دەورەی باڵوولی زانا و.. بە کوردین و بـــە شێوەزاری گۆرانی، سۆرانی و لـۆڕی و لـە١٢٠٠ سـاڵ لەمەوبەرەوە، دەسپێدەکا. باباتایری هەمەدانی، یەکێك لـــە یارانی بەناونانگی یاری، بـــــە کوردی هـەڵـبـەسـتی دارشتووە.

خانای قوبادی، بە زمانەکەیەوە، شانازیدەکا:

راستەن مـەواچان فارســـــی شەکەرەن
کوردی، جە فارسی بـەس شیرینتەرەن

به لەفزکوردی، کوردستـــان تەمام
پێش بووان مەحـزوز باقی وەسەلام

واتا: راستە دەبێژن، فارسی شەکرە، کوردی، لە فارسی زۆر شیرینترە. گشت خەڵکی کوردستان بە پـەیـوی کوردی، شادبن".

شاوەیس قولی مایدەشتی کە لە ی کۆچیدا لەدایکبووە، لەهۆنراوەیەکدا، دەبێژێ:

ئەسڵ من جە کورد، ئەسڵ من جە کورد
بـــابۆم کوردەنان، ئـــەسڵ من جە کورد
من ئەو شیرەنان، چـــەنی دەستەی گورد
سیلسیلە سوپای، زەحـــــاکم کرد هورد

واتا: ریشە و رەتەوەم لـــە کوردە، باوکم کوردە، ریشەم لە کوردە. من ئەو شێرەم زەنجیری سوپای ئاستیهاکـم وردکرد یان بچڕیم".

ئەم تێڕامانە، واتە ململانێ لەگەڵ سوپای زەحاك، بەری چەواشەکردنی مێژووی کوردە کە دەبێـژن، زەحـاك (ئاستیهاك) مار لـــــەسەر شانی بـــــووگە و مێشکی لاوانی خواردووە و دواتـــــر، کـاوە، دژی راپـەڕیـووە و تەختوبەختی تێکەوەپێچاوە!!!

هەرجۆرێکبێ، زمانی تێکست یان دەقەکان و هەروەها هۆنراوەکانی ئایینی یاری، گەلیك کۆنە و ڤوکابلـەری (مفرەدات)ی ئاوێستایی بـــە رواڵـــەت و واتاوە، لەواندا دەبیندرێ. زاری کۆنی هەورامانی لهۆن، بەسەریاندا زاڵە. ئەوانەی بۆ دەورەی سوڵتان دەگەڕێنەوە وەك دیوانەگەورە و "سەرەنجام"، دەفتەری شنرویێ، لەوچەشنەن. بەڵـام زاری دەفتەری"عابێدینی جاف"، هەورامی جافییە. واتە زاری جافەکانی بناری شارەزووری نزیك بە هەورامان و نـاوچـەی هۆرێن و شێخانە. زمانی تێکستەکان پاراوە. ئەگەر وشەی عەرەبی و فارسیش لەواندا بەکارهاتووە، بەرگی کـوردی لەبەرکراوە. لە دەنگە کوردییە رەسەنەکان، پـارێـزگـاری کـراوە. وەك دەنـگـی "ڤ"و "ژ". رانـاوی"ئـەز" زۆر بەکارهاتووە. بۆوێنە، ئیبراهیم مەرمۆ:

ئیبراهیم هەمدەست، ئیبراهیم هەمدەست
چـــــەنی یادگار هەردوو بیم هــەمدەست

کاکام یادگار نەرووی تـــەخـــت نشست
جەمشید بییانیٚ جــــەم جیهان بـــەست
(ئەز) فەرەیدون بیم، گـا و سەروەدەست
سیلسیلەی سپاه زەحاك دام شـــکـەست

(کەلامی پردیوەری،ل٢٦)

واتا، من(ئیبرایم، لەگەڵ یادگار بووینە هاوکار. کاکە یادگارم نیشتەسـەرتـەخـت، جـەمشـیـدی هـات ، کۆبوونەوەی جیهانی گرێدا. من فەرەیدون بووم گاو (خودا)ی سەروەبان دەست، مـن زنجـیرەی سـوپـای زەهـاکـم تێکشکان. (لێرەشدا، چەواشەکردنی مێژووییە).. لێرەدا، وشەگەلی فارسی "همدست"و "نشست"و "شـکـسـت"ی بەشێوەی کوردی نووسیگە. وشەی""گاو"" لێرەدا، لە دەقی ئاوێستایی بەواتای خودا، گەورە، فەرمانرەر، بـەهـێـز وەرگیراوە. بۆنموونە:

میرمل زەنی، میرمـل زەنی
میرەنانی میر، میرمل زەنی
گاوم سوڵتانا، حسێنم هەنی
بنیامم مەۆۆ نەگەردی بەنی

واتا: من میرم ومیر ملقرتینم و گام سوڵتانە و حسێنیشم هەیە، بنیامین، دەبێتە بەندەی. (بڕوانە دەفـتـەری ئەهلی هەق،ل١٠٣).

**پێنجەم: پاقژی و شوێنی تایبەتی خاوەن بڕواکانی ئایینە کوردییەکان**

پەیڕەوانی ئایینە کوردییـــەکان، وەك موسوڵمانەکان، جۆرێك پیرۆزی و هەڵبـژاردە بـۆخـۆیـان دادەنـێـن. ئێزیدییەکان وادەبێژن کە ئەوان لەکاتی ژنێری ئادەم و حەوادا، لــــــەدایکنەبوون، بەڵکو کاتێك ئەوان پەیدابوون کـە ئادەم، دوو رەگ (Androgynous)بووm. ئیزەدی لە سکی دایکیدا وەك ئیزەدی، دروستدەبێ، ئـەوەی وەك ئەوان لـەدایکنەبووە، ناتوانیٚ کەسێك بکاتە ئیزەدی. هەربۆیە ئەوان کەس بە زۆر یان ئارەزوو، هـــاننادەن بـــــــۆ وەرگرتنی ئایینەکەیان. ئێزیدی ناتوانیٚ ئایینەکەی بگۆڕیٚ، چونکە بە "ئیزەدی" ئافرێندراوە، بەڵام ئیزەدییەکان لـە مێژووی پڕلە کارەساتی خۆیاندا، زۆرجار خەڵکیدیکەیان ناچارکردووە، ببن بە ئیزەدی! (بڕوانە شاکیرفەتاح، پێـشـوو، ل١١٧).

یارسانیش دەبێژێ: "کاکە" وەك یـــەکەمین بوونەوەر، لـــــەلایەن خۆدی خاونکارەوە، ئافرێندراوە. وەك وتم، کاکە یان بە وتەی یارییەکان، پیربنیامین، بۆخۆی لـــەژێر باخەڵی خاوەنکارەوە، هاتووەتەدەرەوە.

**شەشەم: پێوەندی نێوان مرۆڤ و ئیزەدان**

لە رامانە سامییەکاندا، خودا بەدەگمەن خۆی بە مرۆڤ نیشانددەدا. یان وەك وتمان، شۆڕدەبێتــە نـێـولـەشـی مرۆڤەوە. وەك دەبێژن جارێك لە فڕینی پەیامبەری ئیسلامدا بۆ سەرەوە (مێعراج)و جارێکیش خۆی بە مــوسـا و عیسا نیشانداوە. لەقورئاندا هاتووە دەبێژێ: "کاتێك موسا گەیشتە ژوانگە بۆلای ئێمە و پەروەرندەی لەگەڵی کەوتە ئاخاڤتن، گۆتی: ئەی پەروەرندەی من! ئارەزوومە، تۆ ببینم. گۆتی: ناتوانی ببینی کە خۆی بۆ کـەژ و کـێـوەکـە دەرخست، هەربەجارێ کێوەکەی پریشپریش کرد. موسا بە بێهۆشی کەوت. کاتێك هاتەسەرەخـۆ، گـۆتـی: پـاکـی هەربۆتۆیە. من لە خاوەن باوڕاندا یەکەمینم". (الاعراف١٤٣). بەمجۆرە دەبینین، موساش نەیتوانیوە ببینێ.

ئەمەش بەپێچەوانەی ئایینە کوردییەکان، بـــەتایبەت بەپێچەوانەی بیری یارییەکانە. ئەوان وادەزانن، خودا، خـۆی لە مرۆڤ دانابڕێ و پێوەندی لەگەڵ دەگرێ. لەپێشدا گوترا، رەوانی مرۆڤ بەشێکە لە رەوانی خودا. یارسـانـیـیـەکـان دەبێژن: "رەوانی مرۆڤ "فوو"ی هەناسەی خودایە". هەربۆیە لەرێگای گەڕانی رەوانەوە نەك جـۆرێـکـیـتر، خـودا، هەمیشە، خۆی بـــە مـــــرۆڤ نیشانددەدا. بـــەمـــــــەش دەگوتری "دیـــــاردەی ئیـــــــــــزەدانـی" (Manifestation)یان وێنەی دەرکەوتن (بوون بە لەش).

لای ئێزیدییەکان پێش بوون، خودا لە شێوازی"مەلیك"دا بووە بەنێوی "ئەنقەر". یارسانییەکـان دەبـێـژن، ئەوکاتە، لـە شێوەی"بازێك"دا بووە. (شابازی قەڵەندەر) لە نهێنی پیرۆزی خۆی "دۆڕ"ێکی سـپـی وەك یـەکـەم ئافریدراو، خۆلقاندووە کە تەقاندوویەتی، زەریایەکی لێپەیدابووە، دواتر، زەوی و ئاسمانـەکـان ئـافـرێـدراون و لـە پارچەکانی دوورگەش، خۆر و مانگ و هەسارەکان، سەریانهەڵداوە. بەپێی بڕوای ئایینی یاری، بوونـی ئـیـزەدانـی، لەپێش بوونەوە، لەنێو ئەو دۆڕەدا، بووگە.

مارگریت "رۆدینکۆ"ی ئوکرانیایی، دەبێژێ: "لە ئەفسانە ئایینییەکاندا، دۆڕی سپی، ئـــەو شوێنەیە کـە گیانی مرۆڤە باشەکان لـــەکاتی مەترسیدا، خۆیان لـــەنێویدا، دەشارنەوە. (بڕوانە، چیرۆکە گەلەرییەکانی کـورد، مسکۆ، ١٩٧٠).

سوڵتان ئەفەرمێ:

جە داود، باچـە بنیامین بەیو نەدەرگا

تا سـەقـــــام دەرمێ، ئێـقرارم نیـــا

جە مایەی ئەلس، وەرجە هوور و ماە

دنیـــا بەحربـــــــی زەمیـن و سـەما

چـــــە دوڕ زیاتـر نـــەوی هەم سەدا

جـە دڵی دۆڕدا، ئـــــەی جـەمم ناسا

داود وەناز وێت قەسەم، وەرجە ئاووبا
جـەم پردیوەر وەچـەم وێـــم دیـــــا

واتا: داود، بێژە بنیامین، بێتە بارەگا، بۆئەوەی راسوریسی بکەم، ئاراوقارام لێبیراوە. لە ماکەی بێسەرەتادا، بەرلە مانگ و خۆر، جیهان زەریا بوو، ئاسمان و زەوینیش. لە دورِ زیاتر هاودەنگێك نەبوو، من لە دڵی دورِدا، ئـەم "جەمە"م ناسی. داود وەخۆشەویستی خۆت، بەرلە ئاووبا، جەمی پردیوەرم بە چاوی خـۆم دیـت. (دیـوانـەگـەورە، ل٦٦٢).

پیر ئەحمەدی کەرکوکی لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا، دەبێژێ:

ئەز ئـــەحمەدی زێـــرِین بـــەرم
ئـــەز ئەو دورِەی ناو گەوهــەرم
ئـــەرز و سـەمایە لەنـــــگەرم
لە رۆژ حەســــــاو ئەز لە دەرم

واتا: "من ئەحمەدی پێشین زێرِینم، من ئـــەو دورِەی نێوی گەوهەرم، زەوی و ئاسمان منیان راگرتووە و لـە رۆژی لێپرسینەوەشدا، لێمناپرسنەوە."

**یارسانی**

کاتێك کە رەوانی ئیزەدانی بۆ جاری یەکەم لە شێوەی "خاوەنکار"دا خۆی نیشانداوە، تەختی ئیزەدانی، لـە شێوازی دۆرِێکدا بووگە. پیربنیامین وەك یـــەکەمین کەس بـــووە لـــە بن بەخـەڵـی خـاوەنـکـار، دەرهـاتـووە. خاوەنکار، پەیمانی لەگەڵ بەستووە و راستی پیشانداوە و هەردوو جیهانی پێداوە؟ (بروانە مامۆستا جەماڵ نـەبـەز، پێشوو ل٣٩-٤١).

ئەمەش سەر دەکێشێتە لای ئەوەوە کە لەو، کراسگۆرِینەدا، بۆ خودا، شێوە و قاڵب، پەیدابێ. لە ئیسلام و "زەردەشت"یشدا، خودا، تەختی هەیە، بەڵام لەهەموو شوێنێك هـــــەیـە. لای مـێـتـولـۆژیـای کـــــــوردان، بـــەپێچەوانەی بتپەرستان، "ئاهوورامەزدا"، شوێنی هەمیشەیی نییە. هەرچەند لەم تێرِامانەدا، رەوانی ئیـزەدانـی دەچێتە قاپۆرِێکی ماکییەوە، بەڵام بۆ هەتاهەتایە لەوقاپۆرِەدا نامێنێتەوە، بەڵکو قاپۆر، گۆرِانی بـەسـەردادێ. وەك وتمان، ئێزیدییەکان پێیئێژن "کراس گۆرین" و یارسانی و ئارەوی (عـەلـەوی)، پـێـیـدەبـێـژن "دونـاودون". لای یارسانییەکان، رەوانی ئیزەدان وەك تیشکی خۆر و ئاوە، چونکە ئەو تیشکە، دەتوانێ بچێتەنێو گشت دەفرێکـەوە و رەنگی ئەو بگرێ. ئەمەش هەرئەوکاتەیە لەوێدایە. سەرەرِای ئەوە، ئیزەدان و خۆر، یەك شت نین و ئیـزەدان خـودای

خۆره (بیری میترائیزم). کـــورد خۆرپەرستنەبوون و خودایەکیان پەرستشکردووە کـــە خودای رووناهییـــە. ئـەوان، پێش دۆزینەوەی ئاگر، رووناکییان لـــە خۆر و بروسکەدا دیوە و رێزیانلێگرتووە و دوای دۆزینەوەی ئاگر، لەبەرئـەوە رووناکی هەبووە، رێزیان لەویشگرتووە و بە شتێکی پـیرۆزیـان لـە قـەڵـەمـداوە. کـەوابـوو، "ئـاگـرپـەرسـتی" لـــەئارادانەبووە و ئاگر بۆیە خاوەن نرخ بووگە، چونکە هەڵگری رووناکی بووگە.

بەپێی رامانی ئێزیدییەکان کە خودا بە"ئێزی" ناودێردەکەن، رامانی ئیزەدانی، لەشێوازێـکـەوە دەچـێـتـە شێوازێکیدی و هـــەرجارەش بەنێوێك، بەڵام خۆی هـــەر خودای مەزنە:

سوڵتان (ئێزی) بخۆ پاشایە
هـــەزار و ئێك ناڤ لخۆنایە
ناوی مـــەزن هەر خودایە

واتا: "سوڵتان، یان ئێزی خۆی پاشایە و هەزار و یەك ناوی لەخۆی ناوە، ناوی گەورە هەر "خودا"یە."

(بڕوانە، ئیزەدیاتی، لەبەر رۆشناییا هەندێك تێکستی ئیزەدیان، ل١٦، چاپی بەغداد١٩٧٩).

ئەمە نیشاندەدا، ئەوان "خودا"پەرستن نەك وەك هەندێك لـــە موسوڵمانە دەمـارگـرژەکـان دەبـێـــــژن، "شەیتان"پەرستن! بێجگەلەوە، پەیڕەوانی دینەکانیدیکەی ناوچـــە، ئـەمـەیـان سـەپـانـدووە بـــــەسـەریـانـدا! لـــــەکاتێکدا، ئەوان خۆیان بـــە خوداپەرست پێناسەدەکەن. لەم پێوەندییەدا، بەڵگە فراوانە. ئیزەدییەکان، خـاوەن دوو کتێو بە ناوەکانی "جلوە" نووسراوەی شێخ ئادی و "مسحەفاڕەش"ن. لە وتەی "زەبوونی مەیسوور و قـەولـی رازی بەدیهێنانی جیهاندا" سەبارەت بـــە ئافراندن، هاتووە: یائیلاهۆ تۆ ئاغایی، تۆ وەزیری، خاسامیر دەنـاسـە، پادشای دوری کاســـە، کـــره رکنا چقاسی ئەساسە. واتا: خودایا! تـــۆ ســـەرۆك و وەزیـــری، پیـاوی چـاك دەناسی، تۆ پادشای مرواری و پیاڵەیت، ئەو بنەڕەتی هەموو شتێکی دانا.

بەکورتی ئیزەدییەکان، پیانوایـــە، جیهان دەریایەکی تێدایە کـــە مرواری و گەوهـــەری تێدایە. پێویستـە کڕنۆشی بۆبەرن. ئەو بنەڕەتی هەموو شتێکی دانا. مرواریيەکە لـە سامی ئەودا تەقییەوە. رەنگی ئەویگرت. سـوور و سپی و زەردبوو..ئەوکاتە نە زەوی بوو و نە ئاسمان.. (ئەوەش بۆچوونی یارییەکانە). لـــــەنێوان مروارییـەکـەدا، دوو گەوهەر سەریهەڵدا. یەکەمی سەرچاوەیەکە و دووەمی مرۆڤ. کەواتە مرۆڤی ئافراند و یاسای بـۆدانـا. پـاشـا، مرواریيەکەی ئاشکراکرد..پاشای من، پەروەردگاری بێنیازە. سەرەتا فریشتەکانی خولقاند و ئەوسا، بـەهـەشـت و دۆزەخی ئافراند، زەوی ئافراند و ئاسمانەکانی خەمڵاند. لەشی مرۆڤ بێگیان بوو، دەنگێ هات و وتی ئـەی گـیـان! بچۆرە نێولەشیەوە و بیقەڵشینە و خۆتی تێخزێنە. خودایا تـــۆ وەستایەکی بەخشندە و دلۆڤانی، تـۆ درگـاکـانـی تاریکیت کردەوە، تـــۆ مامۆستای هەموو شتیکی. لەدەریادا تەنیا دوڕیك هەبوو، تۆ گیانت بەودا و تیشکی خـۆت

لەودادەرخست. تۆ دورەکەت کردە بنەڕەتی هەموو چشتێك و هێناتەدەر..خودا بەخشندە و دلۆڤانە، لەهەموو شتێك بێنیازە..ئەو شەش فریشتەی ئافراند.( ئەم فریشتانە لــــەئاوێستادا ناویانهاتووە کـە بـریـتـیـنـلـە: بـەهـمـەن، ئەردیبەهەشت، شەهریوەر، سەپەندارمەز، "خورداد"و "ئەمورداد" کە لەگەڵ ئەهـورامـەزدادا، حـەوتـەوانـەیـەك پیکدێنن. هەرکام لەمانە، ئەرکێکی تایبەتی لــەسەرشانە، تا بەوجۆرە کە ئەهورا خۆی دەخوازێ، چـەرخـی کـات هەڵسوورێنن.(بڕوانە بۆرەکەیی، ئیزەدییەکان و ڕێ و رچـــــەکەیان، ل٤٨-٩٦، ساڵی ٢٠٠٢,١) وەك دەبینین، لـەم ئایینەدا، هەموو شتێك لە پاشایەك سەرهەڵدەدا کە داهینەر و بـــەرز و پـــــاکە و گشت شتێك لەژێر دەسەڵـاتـی ئەودایە. ئەم گوتانە کە زۆر درێژن، بـــەرهەمی بـــاب و کوڕێکی جێیباوڕی ئیزەدییەکانن بــــــــە نـاوەکـانـی: ئەبولبەرکاتی هەکاری لەدایکبووی ١١٢٥ی زایینی و شێخ حەسەنی هەکاری کوڕی ئەو، لەدایکبووی ٥٩١ی کۆچی. هەرجۆریکبێ، ئەم تێڕامانە کــــە خودا چووتەنێو دوڕ و مرواریییەکەوە، ماوەیەك لـــەوێ مـاوەتـەوە و دواتـر هاتووەتەدەر و جیهان و مرۆڤی ئافڕاندووە، بەشێکە لە بڕوای بنەڕەتی مانەوییەکان و وەك ئاماژەمـانـپـێـکـردووە، یارییەکانیش خاوەن ئەو بڕوایەن.

●●●

# پارادایم و
# شۆڕشی زانستی لای توماس کون

نووسینی: د. حسن حسێن جەباری[*]

### ١. سروشتی شۆڕشی زانستی

ئەستەمە بتوانین کاتێك بۆ سەرەتای شۆڕشی زانستی دیاریبکەین، چونکە زانست وەك هەر شتێکیتر بەردەوام لە گەشە و پێشکەوتندا بووە، بەتایبەت لەگەڵ هەوڵەکانی "ئەریستۆتیلیس و قۆتابخانەی ئەسکەندرییە و پەیدابوونی زانست لە رۆژئاوا بە رێگای عەرەبەکانەوە، بۆیە ئاسانییە بتونرایێت کاتی شۆڕشی زانستی دیاریبکرێت، بەلاّم گەر بمانەوێ خاڵێك وەك سەرچاوەی دەستپێکردنی شۆڕشی زانستی دیاریبکەین، ئەوە دەکری بۆ دوو سەدەی پێش ئیستا بگەڕێینەوە لەوکاتەی ئەقڵی مرۆڤایەتی کارێگەربووە بە رێنماییەکانی فرنسیس بیکون و چەمکەکانی دیکارت و دۆزینەوەکانی گالیلوە،[١] بەلاّم سەبارەت بە زانست بە سێ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەدا بەدرێژایی مێژوو تێپەڕیوە، لەوانە (پێکدادانی نێوان چینەکان و سەرهەڵدانی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان و هەوڵدانیان بۆ رزگاربوون لەو ناکۆکییە). بزووتنەوەی دووەم بریتیبوولە (تێکوشانی خەڵك لەپێناو بەرهەمهێنان لەبوارەکانی کار و پیشەسازیدا)، بەلاّم بزووتنەوەی سێیەم بریتییەلە (گەڕان بەدوای کاری زانستیدا، تییدا زاڵبوون بەسەر سروشتدا خاڵی گرنگبووە لەپێناو دۆزینەوەی یاساکان و ناسینەوەی پێکهاتە جیاوازەکانی واقیعە..[٢] بۆیە تیورەکەی "توماس کون" خوی لە یەکیك لەم سێ جۆرە بزووتنەوەیە بەرجەستەدەکا ئەوەیش بزووتنەوەی سێیەمە.

توماس کون لەتیورەکەیدا زۆر گرنگیی بەلایەنی کۆمەلایەتی و گۆڕانکارییەکان نەداوە لە دروستبوونی شۆڕشی زانستیدا، تاکە هۆکاریش بۆئەمە، گرنگیدانی توماس کونە بەلایەنی ستراکچەری تیورە زانستییەکان بەتایبەت ئەو گۆڕانکارییانەی لەبواری زانستەکاندا روویاندا وەك "فیزیك" بەتایبەت ئەو گرفت و قەیرانانەی رووبەڕووی ستراکچەری تیورەکە بووەوە. لێرەوە کون گەیشتە چەمکی شۆڕش کاتێ بۆ مێژووی زانست گەڕایەوە و گۆڕانکاری و پیشکەوتنی فیزیای کلاسیك خوێندەوە و شیکردەوە بۆیدەرکەوت کە چون زانست گەشەدەکا.[٣]

شۆڕش پێش هەمووشتێك هەڵویستێکی مرۆڤانەیە، هەموو هەڵویستێك مۆرکێکی خۆی هەیە پەیوەستە بەو رۆڵەی هەموو مرۆڤیك تێیدا ئەنجامیدەدا، بەجۆرە دەکرێ شۆڕش سیاسی یان ئابووری یان هونەری یان هزری بێ، ئەمەش بۆ رۆڵی رابەرەکەی یان بزوێنەرەکەی دەگەڕێتەوە، بۆیە سەرجەم شۆڕشەکانی پێشووتر خزمەتی بە شۆڕشی سیاسی دەگەیان. پێش سەدەی بیست چەمکی شۆڕش وەك چەمکی گەشەکردن "گەشە" ناسراوبوو کە لە ژیانی

---

*) مامۆستای فەلسەفە، زانکۆی راپەڕین.

خەڵكی و كۆمەڵگاكان روویاندەدا ئەمەش بەپێی دواكەوتن و نەزانینی ئەو كۆمەڵگایانە لێكدەدرایەوە، بەڵام سەردەمی ئێمە بە سەردەمی دۆزینەوەی خێرا ناسراوە لەسەرجەم بوارەكاندا، سەردەمی دۆزینەوەكانی وەك خێرایی و موشەك و ئەلكیترۆن و ئەتۆم..، وەك چۆن "غارودی" دەڵێت :"لەم سەردەمەدا مرۆڤ بەسەر بچووكترین شتەكاندا زاڵبووە".. بۆیە ناكرێ چیتر باس لە گەشە بكەین، ئەمە شۆڕشە نەك پێشكەوتن، چونكە گۆڕانكاری ریشەیی لەخۆدەگرێ.

شۆڕش وەك چۆن دەستپێشخەری هەبوو لە راڤەكردنی میژوو شارستانییەت، بەهەمانشیوە ئەو رۆڵی هەیە لە راڤەكردنی میژوو و زانستدا.. بۆیە چەمكی شۆڕش گرنگی و رۆڵی خوی هەبووە لەسەدەی بیستدا لە راڤەكردنی خێرای گشەكردنی زانستدا، ئەمە بۆ خۆی دژبە تیوری كەڵەبوونی زانینی زانستی دەوەستیتەوە.(٤) ئەو تیورەی پێیوایە زانست بەبێ دابڕان گەشەدەكا، زانیارییەكان كەڵەكەدەبن.. بۆیە "یومنی تەریف ئەلخولی" لە پەرتووكی " فەلسەفەی زانست لەسەدەی بیست" دەڵیت :"جاریكیتر دەستپێشخەری پوپەری دەردەكەوی لەوەی كە باسی لە چۆنیەتی گەشەكردنی زانست كردووە لەشێوەی شۆڕش بەبێ ئەوەی بەردەوامی هەبێ لەپێشكەوتنیدا، پیشكەوتن بریتییەلە زنجیرەیەك شۆڕشی یەك بەدووا یەك. هەروەك چۆن هەموو پێشكەوتنێك بریتییەلە بەدرۆخستنەوەی گرێمانەی پێشووتر، ئەمە بۆخۆی شۆڕشە، بە واتای كوتاییهێنان بە خولێك و دەستپێكردنی خولێكی نوێ.(٥)

لێرەدا پوپەر وەك فەیلەسوفێك باسی لە دۆخی شۆڕش كردووە كاتێك گرێمانەكان بەدرۆدەخرێنەوە و تیورە زانستییكان و خودی زانستیش گشەدەكەن وەك هەڵقولاّن وەسفی ئەو گشەیەیكردووە، بەڵام سەبارەت بە بەكارهێنانی چەمكی شۆڕش بەشێوەی راستەوخۆ بۆ راڤەكردنی چۆنیەتی گەشەكردنی زانست بۆ فەیلەسوفی زانست "توماس كون" دەگەڕێتەوە لە پەرتووكی "ستراكچەری شۆڕشە زانستییەكان"، چونكە میژووی زانست لای ئەم بریتییەلە میژووی شۆڕشە زانستییەكان. توماس كون وەك ئامرازێك چەمكی شۆڕشی بەكارهێناوە بۆ راڤەكردنی گەشەی زانستی، پێش "كون" باس لە شۆڕشی زانستی كراوە، بەڵام نەك وەك ئامرازێك فەیلەسوفەكە بۆ راڤەی گەشەكردنی زانست بەكاریهێنابی، بۆیە دەبینین "الكسندر كواریە" لە ساڵی ١٩٣٩ ئەو چەمكەی بەكارهێناوە لە پەرتووكی "دراسات عن گالیلو" وەك ئامرازیك بۆ دروستبوونی زانستی نوێ.(٦) كەواتە بۆچوونەكانی "كواریە" كارێگەری هەیە لەسەر بۆچوونەكانی توماس كون، لەبەر نێزیكی"كواری" لە توماس كونەوە لە زانكۆی هارڤارد، توماس كون ئاماژە بەوەدەكا كە "كواری" كارێگەری هەبووە لەسەر بۆچوونەكانی بەتایبەت لە میتودە فەلسەفییەكەی لەزانستدا، هەروەها دەبینین كە "هربرت باترفیلد" لە چەند وتارێكیدا مژدە بە راڤەی شۆڕش دەدا بۆ سروشتی گەشەكردنی زانستی و پوختەی بۆچوونەكەی بریتییەلەوەی كە زاناكان لە قۆناغیك لە قۆناغەكان گۆڕانكاری لە پلانی بیركردنەوەیان دەكەن سەبارەت بە شتەكان و دەیگۆڕن بۆ پلانی نوێ بەمەبەستی گەیشتن بە بیروكەیەكی نوێ وەك دەروازەیەك بۆ لابردنی كوسپ و ئاستەنگەكان.(٧)

بەڵام لەگەڵ توماس كون و تیورەكەی دەربارەی " شۆڕشە زانستییەكان" بۆ وەڵامدانەوەی چونیەتی گەشەكردنی زانست، توماس كون پەنادەبات بەر میژووی زانست. بە بۆچوونی ئەو تیوری زانستی رەها و چەسپیو نییە، بەڵكو ئەوەی هەیە بریتیەلە تیورێك بەردەوام لەگۆڕاندایە، تیورەكان پیویستیان بە پێداچوونەوە و گۆڕانكاری

هەیە، لێرەدا راستییە گەردوونیەکان تەنها وەك پارادایمی هزرین کە توانای پێداچوونەوە و گۆڕانکاری هەیە لەگەڵ گەشەکردنی زانیاریەکانمان، بەتایبەتی دوای ئەوەی خودی زاناکان دانیان بەو راستییە ناوە کە رۆژێك بێت تیورەکانیان راڤەبکرێت.. بەنموونە دەبینین " نیوتن " لەشوێنێکدا دەڵێت: "هیوامولیە رۆژێك بێت تیوری کێشکردن راڤەبکرێت"،[٨] بەلاّم ئینشتاین لە وەلاّمیکی بۆ یەکیك لە شوێنکەتووانی لە پرسیاری ئەوەی، ئایا دە کەس هەن لە تیوری رێژەیی تێگەیشتوویێتن؟ دوای بیرکردنەوەی قووڵ وتی: "بەڵی بیست کەس هەن، بەلاّم هیچ کەسێ لەوانە ئینشتاین نییە".[٩] بۆیە گومان لەوەنییە کە تیورە زانستییەکان رەها و جەقبەستوو و پیرۆزنین، بەڵکو بەردەوام لە جووڵە و گۆڕانکاری و پێداچوونەوەیادان، ئەمە واتای ئەوەیە هەموو تیورەکان بریتینلە بۆچوون دەربارەی بوون و گەردوون و سروشت نەك حەقیقەتی بوون و گەردوون، هەروەها بۆچوونی توماس کونیش دەربارەی شۆڕشی زانستی زۆر گونجاوە بۆ راڤەکردنی چوونیەتی گەشەکردنی زانست، بەوەی کە هیچ تیوریك راستی رەهای دەربارەی بابەتەکە پێنییە، بەڵکو هەموو گرێمانەکانی بریتینلە بۆچوونی ئەم زانا و ئەو زانا. ئێمە گەر پرسیاریك بکەین، ئایا توماس کون هیچ بەراوردێك لەنێوان شۆڕشی سیاسی و شۆڕشی زانستی ئەنجامدەدا؟

لە وەلاّمدا دەڵێین بەڵی، کون هەوڵیداوە بەراوردێکا لەنێوان شۆڕشی سیاسی و زانستی، کاتێ وەلاّمی ئەم پرسیارە دەداتەوە، بۆچی گۆڕینی پارادایم شۆڕشە؟ چ کاتێك شۆڕش روودەدا؟ کون بۆ وەلاّمی ئەم پرسیارە بەراوردێ لەنێوان شۆڕشی سیاسی و زانستیدا دەکا. کون دەڵێت: "شۆڕشی سیاسی کاتێ روودەدا کە هەستیکی زۆر لای کەسانی سیاسەتمەدار و بەشێکی کۆمەڵگای سیاسی دروستدەبێ دەبارەی بێتوانایی دەزگا سیاسییەکان لە رووبەڕووبونەوەی راستەوخۆیان لەگەڵ گرفت و کیشەکان و چارەسەرنەکردنیان.. بۆیە هەرکاتێك پارادایمی سیاسی فەرمانڕەوا ئەو توانایەی نەبێ، ئەوە پارادایمی پێچەوانەوە دێتەئاراوە و گریمانەی چارەسەری کیشەکان و گرفتەکان دەخاتەبەردەست. لێرەدا ناکۆکی لەنێوان پارادایمی فەرمانڕەوا و پارادایمی دەرەوەی فەرمانڕەوا دروستدەبێ کە لەکۆتاییدا بە قازانجی ئەو پارادایمییە دەکەوێتەوە کە توانای چارەسەری گرفتەکانی هەیە. بەهەمانشێوە شۆڕشە زانستییەکانیش لەڕێگای هەستکردنێکی زۆرەوە دروستدەبێ لەلایەن زاناکان کاتێ گرفت و کیشەیان دێتەپێش، بەهەمانشێوە کۆمەڵگای زاناکانیش بەسەر دوو گرووپدا دابەشدەبێ، کاتێ پارادایمە زانستییەکە لە رۆڵی خۆی دەکەوێ لە دۆرزینەوەی بەشێکی سروشت کە بۆ تێڕوانینی پارادایمەکە دەگەڕێتەوە.[١٠] کەواتە هەستکردن بە خراپی رۆڵی تیورەکان "سیاسی و زانستی" لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکان هۆکاری سەرەکین بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش.
لە روانگەی کونەوە تاکەکان (زانا و سیاسەتمەدار "رووبەڕووی دۆخی قەیران دەبنەوە کاتێ نەتوانن کێشەکان چارەسەربکەن.. بۆیە تاکەکان پابەندن بە بونیادنانی کۆمەڵگا لە چوارچیوەی پارادایمێکی سیاسیتردا (پارادایمێکی نوێ)، لێرەوەیە کۆمەڵگا بۆ چەند بەشێك و لایەنێك و پارتێك دابەشدەبێ، دۆخی کێبڕکێ لەنێوانیان دروستدەبێ، هەندێ لەو پارت و لایانانە بەرگری لە پارادایمە کونەکە دەکەن، بەشیکیتریان هەوڵدەدەن پارادایمێکی نوێ دروستبکەن، لەم دۆخدا پەنابردنەبەر هێز بۆ دوورخستنەوە و پەراوێزکردنی پارتەکانیتر بێسوودە، بۆیە پیویستە پارتە سیاسییەکان لەکۆتاییدا بۆ هونەری گفتگۆ و قەناعەتپێکردن بگەڕێنەوە بۆ دەربازبوون لەو قەیرانە.[١١] هەمان سیناریۆ لەزانستدا دووبارەدەبێتەوە. زاناکان کاتێ دۆخی قەیران دروستدەبێ هەوڵدەدەن جارێکیتر پابەندبن بە

بونیادنانی کۆمەڵگاوە، بۆیە زاناکان بۆ دوو گروپ دابەشدەبن، گروپێك داکوکی لە پارادایمە کۆنەکە دەکا، گروپی دووەم بانگەشە بۆ پارادایمێکی تازەدەکا، دەتوانێ کۆمەڵگا لەو قەیرانە رزگاربکات. دەتوانێ گرفت وکێشەکان چارەسەربکا. بەدەرچوون و رزگاربوون لە دۆخی قەیران دەوترێ شۆڕش.

بەلاّم سەبارەت بە فاکتەر و هۆکارەکانی شۆڕشی زانستی لە بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەلاّیەتی و هزری و ئایینی و تەکنیکی بریتینلەمانەی خوارەوە:

١. لەسەر ئاستی سیاسی خۆی لە دەرکەوتنی هەریم و دەوڵەتی بچووکدا دەبینێتەوە.[١٢] ئەمەش پەیوەندی بەو گۆڕانکارییانەوە هەیە کە لەژینگەدا روویدا، وەك دەرکەوتنی سەرمایەداری لەکۆمەڵگادا دوای ئەوەی لە سەدەکانی ناوەڕاست سەرجەم بوارەکان لەژێر کونترولّی پیاوانی ئاین و دەربەگەکانەوە بووە.. بۆیە سەرجەم سەنتەرەکانی رۆشنبیری لە سەردەمی سەرمایەداریدا بۆ شارەکان گوازترایەوە و بیرکردنەوەی ئاوەزگەرایێ زالّبوو بەسەر هزرینی تاکەکانیەوە.[١٣] ئەمە بۆ خوی شۆڕشە.

٢. لەسەر ئاستی ئابووری خۆی لەگەڕان بەدوای بازاڕی نوێدا دەبینێتەوە و هەروەها فراونکردنی پەیوەندییە بازرگانییەکان بو ناوچە جیاجیاکان و دوورەکان.

٣. لەسەر ئاستی ئایینی ئەوەی لە ئەروپا روویدا لەگەڵ دەرکەوتنی پروتستانت و روودانی جەنگی ئایینی، هەروەها چەسپاندنی جۆری هزرین لەسەر زاناکان لەلایەن پیاوانی کەنیسەوە یەکێکە لە هۆکارەکانی سەرهەلّدانی شۆڕش.

٤. لەسەر ئاستی هزری بو کەشوهەوای هزری لە ئەوروپا دەگەڕێتەوەو ئەو گۆڕانکارییانەی لە زانستە کلاسیکییەکاندا روویاندا بەتایبەت لەبواری کیمیائیدا، بووە هـــۆی گرنگیدان بە کەهرۆموگناتیسی لە ساڵی ١٥٠٠.[١٤]

٥. لەسەر ئاستی کۆمەلاّیەتی خۆی لە وەلاّمدانەوەی پێداویستییە کۆمەلاّیەتییەکانی کۆمەڵگا دەبینێتەوە، بو نموونە لەبواری وزەدا دەبینین کارەکانی "فارادی" بۆ سەلماندنی بوونی پەیوەندی نێوان کارەبا و موگناتیسی، چونکە کۆمەڵگای ئەو سەردەمەی فارادی بەدوای سەرچاوەی نوێی وزەدا دەگەڕان،[١٥] لەگەڵ بوونی هەموو ئەو فاکتەر و هۆکارانە، سەرهەلّدانی شۆڕش پیویستی بەکارامەیی تاك هەیە، توانای زانا هەیە وەك زیرەکی و داهێنەری، وەك ئەوەی زانای گەردووونناسی "هیرشیلّ " لە بینینی کەوکەبی ئۆرانۆسدا ئەنجامیدا،[١٦] کەواتە تاك رۆڵی خوی هەیە لە سەرهەلّدانی شۆڕشدا.

### ٢. شۆڕش بریتییەلە گۆڕان لە بینیندا

توماس کون ئەوەی لەزانستدا روودەدا بۆمانی وەسفدەکا و دەڵێت: "دوای شۆڕش زاناکان شت و دیاردەی نوێیان دەبینی وەك ئەوەی پێیانوابێ لەجیهانیکیتردا بژێن کە جیاوازبێ لە جیهانی پێش شۆڕشەکە.. بۆیە سەرجەم ئامراز و کەلوپەلەکان و زمانی زانستی زاناکان گۆڕا تا لەگەڵ جیهانە نوێیەکەدا بگونجێ، لەگەڵ پارادایمە نوێیەکەدا کە تاك و کۆمەڵگا بەهوێەوە ژیانیکی زانستی نوییان وەرگرت".[١٧] لێرەدا زاناکان دوای جێگێربوونی پارادایمی نوێ

لەگەڵ دیاردە و شتی نوێدا ڕەفتاردەکەن بەپێی بۆچوون و تێڕوانینی نوێ وەك ئەوەی لە بینینی گشتاڵتیە ڕوودەدا، کەواتە گۆڕانی پارادایم بریتییەلە گۆڕانی بینینی زاناکان بۆ جیهان کە تێیدا شتی نوێ دەبینن.

ئەو شۆڕشەی توماس کون باسیدەکا هاوشێوەی گۆڕانی گشتاڵتییە کە لە بینینی زاناکاندا ڕوودەدا، چونکە مرۆڤ کاتێ گۆڕانکاری لەبواری بینینی بۆ وێنەکان و فۆرمەکان ڕوودەدا ئەوە بۆ گۆڕانکارییەکانی ئەزموونە دەروونییەکانی دەگەڕێتەوە وەك ئەوەی کەسێك دەڕوانێتە وێنەیەك یان فۆرمێك لەسەر کاغەزێك بەلاّم بۆ جاری دووەم کاتێ تەماشایدەکاتەوە ئەوە هەمان وێنە یان فۆرم نابینێتەوە، بەڵکو وێنەکە دەگوڕی وەك ئەوەی سەروژێر بووبێتەوە، بۆیە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاری و شۆڕشانە دانپێدانانی زاناکان دەبێ دەربارەی کەموکورتییەکان و هەڵەکانیان لە بیروبۆچوونیان کە داکۆکیان لێدەکرت، بەلاّم دوای شۆڕشە زانستییەکە دان بە بوونی هەڵەکان دەنێن لە بیروبۆچوونیان..[١٨] کەواتە شۆڕش بریتییەلە وەرچەرخانێك لە میتۆدی تەماشاکردنمان بۆ جیهان، بەو واتایێ شۆڕش ئەنجامی گوارنکارییەکی دیاریکراوە کە لەئاگامەندی ئێمەدا بۆ جیهان ڕوودەدا، بەپێچەوانەوەی ئەو بۆچوونەی پێیوایە شۆڕش لە ئەنجامی دۆزینەوەیەکی کەڵەکەبوو بۆ ژمارەیەك لە یاساکانی سروشت ئەژماردەکری، یان بۆ ئەنجامی زانیارییەکانمان دەربارەی گۆڕانکارییە سروشتییەکان و هۆکاری جووڵانەوەیان دەگەڕێتەوە.[١٩]

ئەو گۆارنکارییانەی کە لەبینیندا ڕوودەدەن وەك ئەوەوایە کەسیك چاویلەکەیەك لەچاوبکات و شتەکانی پێببینی، بەلاّم دوای دەرکەوتنی تیورێکی نوێ چاویلکەیەکیتر لەچاودەکا و شتی جیاوازی پێدەبینی.[٢٠] بەمجۆرە زاناکان گرفت و مەتەڵی نوێ دەبینن. ئەو گۆڕانکارییانە لەپارادایمەکاندا ڕوودەدەن کە زاناکان لەژێریدا کاری زانستی خویان ئەنجامدەدا.. بۆیە پارادایمە نوێکەیش دووچاری گۆڕانکاری دەبیتەوە.[٢١] کەواتە شۆڕشی زانستی لە ڕۆانگەی توماس کونەوە بریتییەلەو گۆڕانکارییانەی لە بینین و تێڕوانینی زاناکاندا بەرامبەر بە جیهان ڕوودەدەن، لەهەمانکاتدا لابردنی سیستەمی پێشوترە کە لەڕێگایەوە زاناکان تەماشای جیهانیان پێدەکرت بەنموونە ئەو کەسەی لە چوارچێوەی تیوری میکانیکای کلاسیکی بیردەکاتەوە، ئەوە جیهان لەفۆرمیکدا دەبینێ کە زۆر جیاوازە لەوکەسەی کە جیهان لە چوارچێوەی تیوری ڕێژەییدا دەبینێ گەر ئەو دوو تیورە وەك دوو چاویلکەی جیاواز وەرگرین یەکێکیان ڕەنگی "سەوز"و ئەویتریان ڕەنگی "سوور" بێ، ئەوا زاناکان دوو جیهانی جیاواز دەبینن کە بۆخۆی لەئەسڵدا یەك جیهانە. جارێك جیهانیکی سەوز دەبینن و جارێکیتر جیهانیکی سوور. ئەمە جیاوازییە بۆ بوونی دوو پارادایمی زانستی دەگەڕێتەوە کە لەیەککاتدا باس لە بابەتێك دەکەن.

لێرەدا کون کۆکە لەگەڵ "هانسون" دەربارەی واتای تەماشاکردنی زاناکان بۆ جیهان، چونکە دوو تەماشاکەر هەمانشت نابینن، لەبەرئەوەی لەهەمان پێدراوەوە ناڕواننە بابەتی تەماشاکراو، هەرچەندە ئەوان بەئاگان لەڕووی تەماشاکردنیانەوە بۆ هەمانشت و بابەتی تەماشاکراو.[٢٢] لای "هانسون" تێگەی "بینین" دوو واتای هەیە، واتای یەکەم بریتییەلە تەماشاکردنی زاناکان بۆ هەمانشت "شتەکە وەکو خوی کە هەیە" بە تومارکردنی زانیارییەکان بێ ئەوەی خودی زاناکە هیچ ڕۆڵێکی هەبێ لەو تۆمارکردنە، "هانسون" بەمجۆرە تەماشاکردنە دەڵێت: "تەماشاکردنی بێلایەن".

بەلاّم واتای دووەمی تەماشاکردن بریتییەلەوەی کە خودی زاناکان رۆڵی تەواو دەبینین لە تومارکردنی زانیاری دەبارەی شتەکان.. بۆیە لێرەدا زاناکان هەمانشت وەکو خۆی نابینن بەڵکو ئەوەی هەیە بریتییەلە تێڕامان و بۆچوون و راڤەی خۆیان دەربارەی دیاردەکان. "هانسون" بەجۆرە تەماشاکردنە دەڵێت: "تێڕامان"[٢٣]. لێرەدا هانسون کۆکە لەگەڵ "کون" دەربارەی ئەوەی کە زاناکان لەدوای شۆڕشەوە هەمانشت نابینن، بەڵکو ئەوەی دەیبینن شتێکیترە، کەواتە بە بۆچوونی هەریەك لە "هانسون و کون" ئێمە دەتوانین بگەینە پێدراوی زانستی کە تیوری زانستی نوێی لەسەر بونیادبنێین بەنموونە "کیبلەر و تیکوبراهی" لەهەمان پێدراوەوە دەستیان بە توێژینەوە نەکرد، هەروەها هەمان پرۆسەی تەماشاکردنیان ئەنجامنەدا و هەمانشتیان نەبینی، چونکە زاناکان بە بۆچوونی "کون" کاتێ لە پارادایمی جیاوازەوە کارەکانیان رادەپەڕێنن ئەوا شتی جیاوازیش دەبینن با لەهەمان خاڵ و ئاراستەوە تەماشابکەن.. بۆیە "هانسون" جەخت لەوەدەکاتەوە کە زاناکان شتی جیاواز دەبینن، ئەو پێیوایە کە "دۆخی هەریەك لە (کیبلەر و تیکوبراهی) بەنیسبەت خۆرەوە وەك دۆخی ئێمە وایە بەنیسبەت ئەم فۆرمەوە کاتێ باڵندەیەك دەبینم، ئەوا تۆ ئاسکیك دەبینی"،[٢٤] کەواتە جیاوازی پارادایم هۆکارە بۆ بینینی شتی جیاواز، ئەمەش پەیوەندی بەلایەنی زانستی و کۆمەلاّیەتی و ئایدۆلۆژی هەریەك لەزاناکانەوە هەیە بەنموونە کەسێك وەك پارادایمی مارکسیزم بیربکاتەوە ئەوا کومەڵگا لای ئەو لەناکۆکیدایە، بەلاّم کەسێکیتر وەك پارادایمی سەرمایاداری بیربکاتەوە ئەوا کۆمەڵگا لە دۆخێکی جیاوازتر دەبینێ بە لەهەمانکاتدا بڕواننە کۆمەڵگا.

پێویستە لەسەر زاناکان لەدوای هەموو ئەو گۆڕانکارییانە سەرجەم شتە نوێیەکان و تیڕوانینەکان و پرۆسەکانی راهێنانی زانستی پەسەندبکەن، هەروەها دەبێ زاناکان شوینپێی پارادایمی نوێ کەون بۆ ئەوەی وەك ئەندامێکی ئەو جیهانە نوێیە قبوڵبکرێن بەتایبەتی دوای شۆڕشە زانستییەکە.[٢٥] لێرەوە گرنگی گۆڕانکارییەکانی بواری بینین لە نموونەکانی "توماس کون"دا دەردەکەوێ بەنموونە دۆزینەوەی زانای گەردووناسی "هیرشیل" بۆ کەوکەبی ئۆرانۆس باشترین دۆخە بۆ گۆڕانکاری بینینی لەبواری تیوری زانستیدا. لێرەدا کون روونکردنەوەی زیاتر دەخاتەڕوو دەربارەی چۆنیەتی ئەو دۆزینەوەیە.

کون دەڵێت: "لەنێوان سالأنی ١٦٩٠ بۆ ١٧٨١ لە ١٧ دەرفەتی گونجاودا، ژمارەیەك لە زانایانی گەردووونناسی لەنێوانیاندا هەندێ تەماشاکەری بەناوبانگی ئەورووپی تێدابوو، لە شوێنەکانی خۆیدا هەمان ئەو ئەستێرەیان بینیبوو کە ئێستا ناوی "ئۆرانۆسی" لێنراوە، بەلاّم لەلایەن یەکێك لە چاکترێن تەماشاکەرەکانەوە لە چوار شەوەی بەدوایەکدا هەمان کەوکەبی بینیبوو، هەروەها "هیرشیل" دوای ١٢ ساڵ لەڕێگای تیلسکۆپەوە هەمانشتی بینیبوو. دوای ماندووبوونێکی زۆر لەگەڕان "هیرشیل" "کلکەداریکی" بینیبوو، دوای چەند مانگیك "لاکسل" ئاماژەی بۆئەوەکرد رەنگە خولگەکانی ئەو کلکەدارە هینی کەوکەبێ بێت، کاتێ ئەو پێشنیارەی پەسەندکرد، ژمارەیەکی کەم لە ئەستێرە و زیاتر لە یەك کەوکەب لە جیهانی زانایانی گەردونناسیدا هەبووە. ئەو جەستەیی بۆ زیاتر لە یەك سەدە بینرابوو، ئەوا لە ساڵی ١٧٨١ بەڕێگای جیاواز بینراوبو."[٢٦]

کەواتە دەتوانین بڵێین شۆڕشەکان بریتینلە گۆڕانکاری لەبواری بینیندا کە زانا واهەستدەکا شتی جیاواز و نوێ دەبینین و لە جیهانی جیاواز ژیان بەسەردەبن. نموونەی ئەوان وەك کەسێك وایە لەیەککاتدا لە کۆمەڵێ کاری

جیاوازدا بەتوانایە.. بۆیە هەست بەوەدەکا کە لەچەند جیهانی جیاوازدا بژێیت بەنیسبەت کارە جیاوازەکانەوە.. بۆیە کاتێ مرۆڤەکان تەماشای شتێك یان دیمەنێك دەکەن و دواجار دەگەڕێنەوە بۆ جارێکیتر تەماشادەکەنەوە، شتی نوێ دەبیننەوە.. بۆیە هەست بەوەدەکەن کە لە جیهانی جیاوازدا دەژێن.

لێرەدا دەبینین مێژوونووسی شارستانییەت "توماس بری" دەبارەی کێبرکێی نێوان دوو تیوری زانستی دەڵێت: "هەموو بابەتەکە تەنها بابەتی تەماشاکردنە، ئێمە لەئیستادا ئەو گرفتەی ڕووبەڕوومان بووەتەوە تیڕوانینێکی پەسەندکراومان نییە.. بۆیە نە تیڕوانینە کۆنەکان ڕۆڵی خویان بەباشی ئەنجامداوە، نە ئێمە فێری تیورە نۆێیەکە بووینە".(٢٧) بەجۆرە هەڵبژاردنی تیورێکی چاك لەنێوان تیورەکان، هەڵبژاردنێکی خودییە نەك پێوانەیی، بۆیە تێگەیشتنێکی خودیش بۆ زانست هەیە نەك بابەتی.(٢٨) لێرەدا ئەوەی زاڵدەبی لەکۆتاییدا بەسەر زاناکانەوە ڕێژەی زانیاری و باگڕاوەندی ئایدیالۆژی و سیاسی و ئایینییە کاتێ تیورێك لە تیورەکان هەڵدەبژێرن، ئەم دۆخەیە "کون" ناویناوە "سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان زاناکان".. بۆیە ئێمە بەئاسانی ناتوانین دەستبەرداری تیورێك بین کە بەشێك زۆری کەسایەتی ئێمەی پێکهێناوە، بەردەوام بەرگری لە تیورەکە دەکەێن لەبەرامبەر تیورە نوێیەکەدا. ئەمەیە وا لە زاناکان دەکات هەست بەوەبکەن کە لە جیهانی جیاوازدە دەژێن بەنموونە "کون" باس لەوەدەکا، هەندی پێیانوایە گەردوون تەختە پشتبەستن بە تیورە کۆنەکان، هەندێکیتر پێیانوایە گەردوون چەماوەیە بەپیێ تیوری ڕێژەیی ئینشتاین، هەموو ئەمکارانە لە جیهانە جیاوازەکاندا یەکن.(٢٩)

کەواتە فاکتەری خودی لەبواری تیورە زانستییەکاندا ڕۆڵی گرنگی هەیە لەگۆڕانکارییەکاندا.. بۆیە " کون" دەڵێت: " کەسانی وەك ( گالیلو و دیکارت) لە چوارچیوەی فەلسەفەی ئەریستۆدا راهێنانیکردووە، بەلاّم لەڕێگای داهێنانی میتودی نوێیەوە خوێندنەوەی جیاوازین بۆ دەقەکان کردووە کە بەهۆیەوە بناغەی میکانیکایان لە سەدەی ١٧ وەسفکردووە، ئەو گۆڕانکایریانەی لە فیزیای ئەریستۆدا ڕوویاندا بە پلە یەك بۆ گۆڕان لە تیڕوانینی ئەواندا بۆ سروشت دەگەڕێتەوە، کە جۆرێکی جیاواز لە وزەی هزرین لەخۆدەگری بە بۆچوونی "هربرت باترفیلد"..(٣٠) بۆیە وەرچەرخانەکە بریتینییەلە دارشتنەوە و پێداچوونەوە بە فیزیای کون، بەڵکو بریتییەلە هەڵگەڕانەوە لەبینیندا کە پێدەوترێ "بینینی گەشتالتی".. بەڵگە بۆئەمە بوونی بیرۆکە و بۆچوونی نوێیە لە تیورە نوێیەکاندا کە پێشتر لە تیورە کۆنەکاندا باسینەکراوە. لێرەوەیە هەر گوڕانکارییەکی نوێ لە تیورە زانستییەکان کە ڕوودەدا، زاناکان ناچاردەکات کە ڕەفتار لەگەڵ دیاردە و شتی نوێیدا بکەن بەبێ ئەوەی هیچ ناکۆکییەك دروستببێ، چونکە زانایانی تیورە نوێیەکە لەدوای شۆڕشەکە، بەهیچجۆرێك ناکۆك نین لەگەڵ زانایانی تیورە کلاسیکییەکەدا، هۆکاری ئەمە لە ڕۆانگەی "کونەوە" بۆ زانیاری زاناکان دەگەڕێتەوە، زانینی زانایانی تیورە کلاسیکییەکە تایبەتە بە کات و زەمانی خویان.. بۆیە جیاوازە لەگەڵ زانینی تیورە نوێیەکەدا، بەنموونە ئەو دیاردانەی تیوری کوانتوم باسیانکردووە پێش سەدەی بیست نەزانراو بوون.(٣١)

لێرەدا هەندێ لەوشۆڕشە زانستییانە دەخەێنەڕوو کە لەبوارە جیاجیاکاندا ڕوویانداوە:

١. کۆی ئەو پێشکەوتنانەی لە زانستە جۆراوجۆرەکان ڕوویانداوە پێیدەوترێ " شۆڕشی زانستی" بەنموونە لەبواری گەردووناسی، گۆڕینی سەنتەری گەردوون یان "زەوی سەنتەرە" بە مەزنترین وەرچەرخان لە مێژووی زانستدا دانراوە. توماس کون لە پەرتووکی " شۆڕشی کوبرنیکوسی"دا بەوردی باسیکردووە.
٢. دەرکەوتنی میکانیکا لە فیزیای نوییدا گرنگی تایبەتی هەیە لە مێژووی شۆڕشی زانستیدا، ئەوەی ڕۆڵی لەم شۆڕشەدا بینیوە کارەکانی گالیلو بووە.
٣. هەوڵ و توێژینەوەکان نیوتن لەبواری میکانیکادا، شۆڕشیکی لەبواری "البصریات" بەرجەستەکرد، بەتایبەت خوێندنەوەکانی بۆ تیشك.
٤. لە بواری کیمیادا لەگەڵ کارەکانی "روبرت بویل" شۆڕشی زانستی بەرپابوو.
٥. شۆڕشی زانستی بواری زانستی بیۆلۆجی، کۆمەڵی توێژینەوە و خوێندنەوە دەربارەی ئەم زانستە هەیە لەوانە کارەکانی " جاکوبس و روجیر عیسا و ئارنست مایر " لە زانکۆی هارڤارد.

●●●

## لیستی پەراویزەکان:


١. ایکن، هنري، عصر الایدیولوجیا،ت: محي الدین صبحي، دار الطلیعة- بیروت، ١٩٨٢،ص ٩٣.
٢. العلم نظریاته وتطبیقاته، وقائع الحلقة الدراسیة التي انعقدت في بغداد،١٩٨٠، ترجمة، خلیل ابراهیم الحماش، ١٩٨١، ص ١٩٣-١٩٤.
٣. نفس المصدر، ص ١٩٢.
٤. الخولي، یمنی طریف، فلسفة العلم في القرن العشرین، سلسلة عالم المعرفة،٢٠٠٠، ص ٤٠٢.
٥. نفس المصدر، ص ٤٠٣.
٦. العلم نظریاته وتطبیقاته، وقائع الحلقة الدراسیة التي انعقدت في بغداد،١٩٨٠، ترجمة، خلیل ابراهیم الحماش، ١٩٨١، ص ١٩٣-١٩٤.
٧. الخولي، یمنی طریف، فلسفة العلم في القرن العشرین، مصدر سابق، ص ٤٠٣.
٨. متي، مقادیسي، نظرة في تطور فلسفة الفیزیاء، بغداد،٢٠٠٢،ص ٥٣.
٩. متي، مقادیسي، نظرة في تطور فلسفة الفیزیاء، مصدر سابق، ص ٥٤.
١٠. کون، توماس، بنیة الثورات العلمیة، ترجمة، ماهر عبدالقادر، بیروت، ١٩٨٨، ص١٥٣-١٥٤.
١١. کون، توماس، بنیة الثورات العلمیة، مصدر سابق، ص ١٥٥.
١٢. العمر، عبدالله، ظاهرة العلم الحدیث، عالم المعرفة، ١٩٨٩، ص ٢١.
١٣. نفس المصدر، ص ١٨٢.
١٤. نفس المصدر، ص ٢١.

١٥. ج. برونوسكي، العلم والقيم الانسانية، ترجمة، عدنان خالد، دار المامون للنشر، بغداد، ص ٢٦.
١٦. كون، توماس، بنية الثورات العلمية، مصدر سابق، ص ١٥٥-١٥٧.
١٧. كون، توماس، بنية الثورات العلمية، مصدر سابق، ص ١٩٦.
١٨. كون، توماس، بنية الثورات العلمية، مصدر سابق، ص ١٨٠-١٨٢.
١٩. العظم، صادق جلال، دفاع عن المادية والتاريخ، دار الفكر الجديدة، بيروت، ١٩٩٠، ص ٢٠٨.
٢٠. بريجز، جون، الكون المرأة، ترجمة، نهاد العبيدي، الدار العربية بغداد، ١٩٨٦، ص ١٤.
٢١. كون، توماس، بنية الثورات العلمية، مصدر سابق، ص ١٨٨.
٢٢. عبدالقادر، ماهر، دراسات في فلسفة العلوم، دار المعرفة الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٩، ص ٢٠٠.
٢٣. نفس المصدر، ص ٢٠١.
٢٤. ماهر، عبدالقادر، دراسات في فلسفة العلوم، مصدر سابق، ص ٢٠١. للمزيد ينظر، كون، توماس، بنية الثورات العلمية، ص ١٩٠.
٢٥. كون، توماس، بنية الثورات العلمية، مصدر سابق، ص ١٨٨.
٢٦. كون، توماس، بنية الثورات العلمية، مصدر سابق، ص ١٨٢.
٢٧. روبرت م. اغروس، العلم في منظوره الجديد، ترجمة، كمال الخلايلي، عالم المعرفة، ١٩٨٩، ص ١٥.
٢٨. شالمرز، الان، ماهو العلم، ترجمة، لطيف ديب عربوق، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٧، ص ١٨٧-١٨٨.
٢٩. كون، توماس، بنية الثورات العلمية، مصدر سابق، ص ٢١٦-٢١٧.
٣٠. كون، توماس، الصراع الجوهري، دراسات مختارة في التقليد العلمي والتغيير، ترجمة، فؤاد الكاظمي، دار الشؤون الثقافية، بغداد، ١٩٨٩، ص ١٢.
٣١. كون، توماس، بنية الثورات العلمية، مصدر سابق، ص ١٥٧.

# پێویستی یەکگرتنی کۆمەڵناسی و مێژوو

## تێڕوانینێك لەسەر پەیوەندی تیۆری کۆمەڵایەتی و مێژوو

نووســــــینی: پیتیر بۆرك
وەرگێڕانی: جەلیل مرادی

پیتیربۆرك مامۆستای "مێژووی کلتوری" زانکۆی کمبریجە و ئەندامی لیژنەی زانستی "ئیمانویەل کالێج" کە بەدرێژایی سی ساڵی رابردوو سەبارەت بە تیۆرە کۆمەڵایەتییەکان و بەکارهێنانیان لە خانەی مێژوودا و هــەروەهــا سەبارەت بە مێژووی کلتوری ئەوروپا لەنێوان سەدەکانی شازدەیەم بۆ نۆزدەیەمی زایینی کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیــەکی بەربلاوی بەئەنجامگەیاندووە.

ئەوەی لە نووسینی ئەم باسەدا وەك تێڕوانین یان بەرژەوەندی سەرەکی لەقەڵەمدەدرێت، وەك "فرناندبرودێــڵ" دەڵێت "مێژووی گشتی" یان "مێژووی بەکۆمەڵ"ە، مێژوویەك کە تەنها کار لەسەر شرۆڤەی وردبینانەی وردەکــاری رووداو و پێشهاتەکانی رابردوو ناکات، بەڵکو پێداگریشدەکا لەسەر پەیوەندی نێوان لق و خانە جیاوازەکانی چالاکییە مرۆییەکان. لەمبوارەدا نووسەر وێڕای تێڕوانینێکی کورت بۆ پێشینە و زەمینەی باسگەلی پەیوەندیدار بە مێــژوو و تیۆری کۆمەڵایەتی "بەتایبەت کۆمەڵناسی" پرۆسەی دووری و نزیکی ئەم دوو بەشە لە سەدەی هــەژدە بــەمــلاوە تاوتوێدەکات و دوژمنایەتی و دژایەتییەکانی بەرێوەبەرانی ئەم دوو لقە دەخاتەڕوو، لەهەندێ شوێنیشدا ئــامــاژەدەدا بەپێویستبوونی هاوکاری ئەم دوو بوارە و سوود و دەستکەوتەکانیان بۆیەکتری.

بورك لەو بڕوایەدایە نووسینی مێژووی رەسەن و باوەڕپێکراو بەبێ پاڵپشتی تیۆری و هەڵکۆڵینی پــانــتــایــی بیرۆکە کۆمەڵایەتییەکان ئەگەر نەڵێین نەگونجاوە کارێکی ئەستەم و دژوارە. لەلایەکیدیکەوە بەدیهێنانی بــیرۆکــە و تیۆرییە کۆمەڵایەتییە نوێکان و گەشە و بایەخی هەرچی زۆرتری کۆمەڵناسی و تێڕوانینی قووڵ لــەبــواری تــیــۆری کۆمەڵایەتی، بەبێ بوونی داتا بەنرخە مێژووییەکان و بەبێ کەڵکوەرگرتن لە دوکۆمێنت و بەڵگەنامە و ســەرچــاوەی سەلمێنراوی مێژوویی، کارێکی ئەوەندە زانستی و چڕ نابێ. ئەم باسەی خوارەوە راڤەکارانە ئەم بۆچوونە شیدەکاتەوە: لەڕاستیدا ئەم باسە هەوڵ و تێکۆشانێکە بۆ وێناکردنی دەرفەت و زەمینە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانی تەبایــی و ناتەبایی یان دووری و نزیکی نێوان مێژوو و تیۆری کۆمەڵایەتی، هەروەها هێنانەئاراوەی ئەم دوو پرسیارە بەڕواڵــەت سادەیەیە کە: تیۆری کۆمەڵایەتی چ سوودێکی هەیە بۆ مێژوونووسان و بەکەڵکبوونی مێژوو بۆ داڕێژەرانــی تــیــۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەچیدایە؟

هەنووکە مێژوونووسانی جیاواز، بیروڕا جیاوازەکان لە سۆنگەیەکی تایبەتدا بەکەڵکدەزانن.

برێك لە مێژوونووسان تیۆری وەك چوارچێوەیەکی گشتگیر سەیردەکەن و برێکیتر تیۆری وەك رێگاچارەیەك دەزانن بۆ چارەسەرکردنی گرفتە تایبەتەکان.(١)

هەڵبەت هەر لەسەرەتاوە بەگرنگی دەزانم ئەم خاڵە وەبیربخەمەوە کە دەبێت لەنێوان بیرۆکە (theory)، چەمك (concept)و هێما (model) جیاوازی دابنێین و بەجیا لەیەك لەقەڵەمیانبدەین، چونکە تیۆری هەم لەگەڵ مۆدێل و هەم لەگەڵ چەمك جیاوازی بنەڕەتی هەیە.. کەمتر مێژوونووسێك هەیە کە لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانیدا، بەواتا وردبینانەکەی لە (تیۆری) کەڵکوەربگرێت، بەڵام لەهەمانکاتدا زۆربەی مێژوونووسەکان دەستێکی باڵایان هەیە لەبەکارهێنانی مۆدێل "هێما"، وێرای ئەوە کە سوودوەرگرتن لە چەمکیش بەتەواوەتی پێویستە.(٢)

جیاوازی نێوان تیۆری و پراکتیك وەك جیاوازی نێوان "مێژوو و کۆمەڵناسی" یان بەشەکانیتری وەك ئەنترۆپۆلۆژی "خەڵکناسی" کۆمەڵایەتی، جوگرافیا، سیاسەت یان ئابووری نییە. برێك لە خوێندکاران و قوتابیانی ئەم بەشانە گرنگی بە لێکۆڵینەوە تەوەرییەکان دەدەن کە لەناویاندا تیۆری رۆڵێکی ئەوتۆی نییە. لەلایەکیدیکەی بابەتەکەوە هەندێك لە مێژوونووسان، بەتایبەت مێژوونووسە مارکسییەکان، بەتوندی و بەرفراوانی باس لە بابە تیۆرییکان دەکەن، تەنانەت ئەودەمەی کە بەهۆی نەبوونی ئەم چەشنە بابەتانە گلەیی و گازندەیان هەیە، بۆنموونە مێژوونووسێکی بەناوبانگی وەك "ئێدوارد تامپسۆن" کە لە باسێکی بەنرخ و ورووژێنەری خۆیدا رەخنەیەکی توندوتیژ دەگرێ لە هەژاریی تیۆری.(٣)

بەگشتی دوو چەمکی سەرەکی کە لەچەند ساڵی رابردوودا لە کۆمەڵناسی، خەڵکناسی "ئەنترۆپۆلۆژی"و لێکۆڵینەوە سیاسییەکاندا کاریگەرییەکی دیاریکەریان هەبووە، زۆرتر لەلایەن مێژوونووسە مارکسییەکانی بەریتانیاوە هاتوونەتەئاراوە: چەمکی "ئابووری ئەخلاقی" کە ئێدوارد تامپسۆن ئافرێنەرەکەی بوو و چەمکی "داهێنانی کلاسیك یان نەریت" لە ئەریك هۆبزبام.(٤)

بەڵام بەشێوازێکی گشتی کاربەدەستانی بەشە ناوبراوەکان زۆرتر لە مێژوونووسان کەڵکوەردەگرن لە چەمك و بیرۆکەکان، بەشێوازێکی دیارتر و چڕتر و لەهەمانکاتیشدا بەشانازییەکی زۆرترەوە.

لەڕاستیدا ئەم ناتەباییە کە لەجۆری تێڕوانین بۆسەر تیۆری بەرهەمدێت، هۆکاری سەرەکی زۆربەی دژایەتی و لێکتێنەگەیشتنەکانی نێوان مێژوونووسان و تیۆریزان و بیردۆزەکانە.

### وتووێژی گوێنەبیستان

مێژوونووسان و بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان "بەتایبەت کۆمەڵناسان"، هیچکات بەتەواوەتی لەسەر بابەتێك هاوڕا و تەبانەبوون و لەم روانگەوە ئەوەندە دراوسێیەکی چاکنین بۆیەکتری. لەکاتێکدا ئەم دوو رەوتە بێگومان خاڵی هاوبەش و نزیکی "فیکری - تیۆریکی" زۆریان پێکەوەهەیە، بەتایبەت کە فێرخوازان، لێکۆڵەران، خوێندکاران و کاربەدەستانی هەردوو ئەم بەشانە کۆمەڵگا و کرداری مرۆڤەکان بەبابەتی سەرەکی خۆیان لەقەڵەمدەدەن وەك گشتییەتێك، بەجۆرێك کە لێکۆڵینەوە لەم دوو بوارەیان بردووەتەناو چەقی تۆژینەوەکەیان. بەمپێیە کاتێك لەم

سۆنگەوە چاو لە کێشەکە دەکەین بۆماندەردەکەوێت ئەوان جیاوازن لە ئابوورزانەکان، جوگرافیزانەکان یان پسپۆڕانی لێکۆڵینەوە سیاسی و ئایینییەکان. بگرە بتوانرێت کۆمەڵناسی بەمجۆرە پێناسەبکرێت کە: لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی کۆمەڵگای مرۆییە بەپشتبەستن بە بڕیارە گشتییەکانی سەبارەت بە پێکهاتە و بەرهەم و رەوتی گەشە و وەرچەرخانەکەی. باشترین پێناسەش بۆ مێژوو ئەوەیە کە: مێژوو لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی کۆمەڵگا مرۆییەکانە بەگشتی و جەختکردنەسەر جیاوازییەکانیان و هەروەها گۆڕانکاری و وەرچەرخانەکانیانە کە لەهەر کۆمەڵگایەکدا بەدرێژایی مێژوو روویانداوە.

ئەم دوو روانگەیە هەندێکجار وەك کۆمەڵە تێڕوانینێکی دژبەیەك ناسراون لەکاتێکدا باشترە ئەو دوو روانگە بەتەواوکەری یەکتر بزانین. تەنیا لەڕێگەی بەراوردکردنی کۆمەڵگایەك لەگەڵ گۆمەڵگاکانیترا کە دەتوانین ئەوە بخەینەڕوو کە هەر کۆمەڵگایەك لە کام بوار لەجۆری خۆیدا تایبەتمەند و تاقانەیە. گۆڕانکارییەکان شێوازی داڕشتنی پێکهاتەیی لەخۆدەگرن و پێکهاتەکانیش رووبەڕووی گۆڕانکاری دەبنەوە. لەڕاستیدا پرۆسەی بەپێکهاتن (structuration)، بەڕای هەندێك لە کۆمەڵناسان لەم سالأنەدا وەك ناوەندێك سەرنجراکێشبووە.[٥]

مێژوونووسان و بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان ئەم دەرفەتەیان لەبەردەستدایە کە خۆیان دەربازبکەن لە کۆتوبەندی داخراوی هزری، دەمارگرژی و بیرکردنەوەی دۆگم و چەقبەستوو. مێژوونووسان تاڕادەیەك بەواتا راستەقینەکەی لە مەترسی ئەم دۆگمبوون و چەقبەستوییە فکرییەدان، چونکە زۆرجار پسپۆڕبوونیان لەبوارێکی تایبەتدا وایانلێدەکات واتێبگەن کە پانتایی چالاکییەکان و سنووری لێکۆڵینەوەکانیان رەوتێکی تەواو تاقانە و تایبەتمەندە، نەك ئەوەی ئەمە بەلێکدراوێکی تایبەتمەند لە کۆمەڵە توخمێك بزانن کە نموونە هاوبەشەکانی لەشوێنەکانیتریشدا بوونی هەیە.

لەبەرانبەر ئەمەشدا، بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکانیش بەچەشنێکیتر رووبەڕوودەکەنە چەقبەستوویی هزری و بیرکردنەوەی دەمارگرژانە، واتە: کاتێك کە لەلێکدانەوە گشتییەکانیان سەبارەت بە کۆمەڵگا تەنها بەپشتبەستن بە ئەزموون و بەبێ رەچاوکردنی پرۆسە درێژخایەنەکان هەڵدەستن بە شرۆڤەکردنی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، لەڕووی زەمەنییەوە " نەك شوێنی" دەکەونەبەر هەڕەشەی جۆرێك لەداخراوی هزری.

بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان "بەتایبەت کۆمەڵناسان"و مێژوونووسان چاوی دیتنی یەکتریان نییە، بەداخەوە هەرکامیان هەوڵدەدا ئەویتر لە چوارچێوەی چەقبەستوویەکی کاڵ و پێنەگەیشتوو ببینێت. بۆنموونە لانیکەم لە بەریتانیا، تا ئەو شوێنەی کە دەردەکەوێت، زۆربەی مێژوونووسەکان هێشتا، کۆمەڵناس و بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان بە کەسانێك دەزانن کە شتە سەلمێنراو و دیارەکان لە چوارچێوەی لیکدانەوە و دەستەواژانێکی ئەستوور، کاڵ، هەستپێنەکراو و زەینی و ناڕوون و ئاڵۆز دەخەنەڕوو: ئەوان بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان وەك کەسانێك دەزانن کە دوورن لەهەر چەشنە هەستێکی زەمەنی و شوێنی کە مرۆڤەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵە بابەتێکی وشك و رەق و ناسازگار تێکدەشکێنن، وێڕای ئەمانەش هەموو ئەم کارانە بە مۆرکی "زانستیبوون" دەسەپێنن بەسەر خەڵکدا. لەلایەکیتریشەوە کۆمەڵناس و بیردۆزە کۆمەڵایەتییەکانیش بە بێکار دانەنیشتوون و لەبەرانبەردا ئەوانیش هەڵوێستیان گرتووە. ئەوان دەمێکبوو مێژوونووسانیان بەهەندێك کەسی رووداونووسی کۆکەری زانیاری و

ئاماتورگەلێکی " شپرزە" دەزانێ کە هیچجۆرە سیستەم یان میتۆد و شێوازێکی زانستییان پێنییە و هەڵەبوونی بنەمای داتا و زانیارییەکانیان لەڕاستیدا نیشاندەری ئەوەیە کە لە راڤە و شیکردنەوەیان لێهاتوونین. بەکورتی وێڕای بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە تاك و رەوتە دوو زمانییەکان کە لەدرێژەی بابەتەکە قسەیان لەسەردەکەین، هێشتا کۆمەڵناسان و مێژوونووسان نەیانتوانیوە بگەن بەڕێککەوتنێك سەبارەت بە زمانێکی یەکگرتوو و هەرکام لەمانە بە زمانی تایبەت بەخۆیان قسەدەکەن وەکو فەرناند برۆدێل مێژوونووسی فەرەنسی دەڵێت وتوویژی ئەوان، زۆرجار وتووێژی " گوێنەبیستەکانە"، کە بەهیچ چەشنێك دەنگی یەکترنابیستن لە قسەی یەکتریش تێناگەن.[٦] لە روانگەی مێژووییەوە شتێکی سەلمینراوە کە هەردوو لایەن تووشی هەڵەی مێژوویی هاتوون و لەمبارەیەوە تاوانبارن. تا ئەم دواییە، بە بۆچوونی زۆربەی بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان، مێژوونووسان کەسانێك بوون کە دەڵێی جگەلە گێرانەوەی رووداوە سیاسییەکان کارێکیتر پەیڕەوناکەن و تەنها روانگەی زاڵ بەسەر بواری مێژوونووسی هەر ئەو روانگەیە کە "لیوپۆڵد ڤۆند رانکە " مێژوونووسی بەناوبانگی سەدەی (١٩ز) دایهێنابوو، بەپێی ئەم رێڕەوە هەندێك لە مێژوونووسانیش بەجۆرێك قسەدەکەن سەبارەت بە کۆمەڵناسی کە گوایە ئەم بەشە خۆی گرێداوە بە سەردەمی "ئۆگۆست کۆنت"و لێکدانەوە گشتێتییەکانی قۆناغی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە و دوور لەهەر چەشنە لێکۆڵینەوەیەکی ئەزموونی رێکوپێك.

پرسیارێك کە لێرەدا دێتەئاراوە ئەمەیە کە چۆن و بۆچی لەنێوان مێژوو و کۆمەڵناسی یان بەگشتی لەنێوان مێژوو و تیۆریدا، دژبەیەکییەکی لەم چەشنە هاتەئاراوە؟ چۆن، بۆچی و تاچ رادەیەك ئەم دژبەیەکییە توانیویەتی خۆی بسەپێنێت؟ ئەمانە کۆمەڵە پرسیارگەلێکی مێژووین و پێویستیان بە وەڵامی مێژوویی هەیە کە بەڕای من دەبێ بەلەبەرچاوگرتنی سێ قۆناغی گرنگ لە مێژووی هزری رۆژئاوا سەبارەت بەکۆمەڵگادا، ئەم جوابانە بدۆزێنەوە: نیوەی سەدەی هەژدەیەم، نیوەی سەدەی نۆزدەیەم، ساڵەکانی دەیەی ١٩٢٠و پاشتر.

## لێککردنەوەی مێژوو و تیۆری

لە سەدەی هەژدەیەم تەنها بەهۆی کارێکی سادە و روون لەنێو کۆمەڵناسان و مێژوونووسان هیچچەشنە دژبەیەکێك یان شەڕێك بوونی نەبوو. کۆمەڵناسی وەك بەشێکی سەربەخۆ لەئارادانەبوو. "شارڵ دۆ مۆنتەسکیۆ"ی فەرەنسی بیرمەندی بواری ماف، ئادام فەرگۆسەن و جان میلار لە فەیلەسوفە ئەخلاقییەکانی سکاتلەند، بەردەوام لەلایەن کۆمەڵناسان و خەڵکناسانەوە "ئەنترۆپۆلۆجی" وەکو بەڵگە دەهێنرانەوە و ئاماژەیان پێدەکرا و هەرکام لەو رەوتانە لایخۆیەوە پێیوابوو کە ئەو بیرمەندانە سەربەوانن.[٧]

لەڕاستیدا هەندێك کەس ئەوان بە بنتیاتنەری دێرینی کۆمەڵناسی دەزانن، بەلاّم بابەتی ئاماژەپێکراو ئەم کاریگەرییە سەرلێشێونەی پێوەدیارە کە گوایە ئەم کەسانە بنیاتنەری لقێکی نوێن، کارێك کە ئەوان هیچکات ئاماژەیان پێنەدابوو. ئەم خاڵە دەتوانێت سەبارەت بە بنیاتنەری سیاسەتی ئابووریش واتە ئادەم سمیس بێتەبەر باس کە هاوئاست لەگەڵ فەرگسۆن و میلار هەنگاویهەڵێنا.

بگرە باشتر وابێت ئەم چوار یارەی سەرەوە بە بیرمەندی کۆمەڵایەتی ناوزەدبکەین، چونکە هەرکامیان بەش بەحاڵی خۆی بەشێوازێکی رێکوپێك هەروەك چۆن لە ئەفلاتوونەوە هەتاکو لاك دەوڵەتیان خستووەبەر باس و

لێکۆڵینەوە، ئەمانیش سەبارەت بە " کۆمەڵگای مەدەنی" قسەیانکردووە. بەرهەمانێکی وەکو گیانی یاساکان "روح قوانین" ١٧٤٨ بەرهەمی مۆنتسکیۆ، وتارێك لەسەر مێژووی کۆمەڵگای مەدەنی ١٧٦٧بەرهەمی فەرگۆسەن، دیمانەیەك سەبارەت بە جیاوازی پلەوپایەیکان ١٧٧١ لە میلار، سامانی نەتەوەکان ١٧٧٦ لە ئادەم سمیس، هەموویان کاریان لەسەر تیۆری گشتی یان هەروەکو میلار دەڵێ فەلسەفەی کۆمەڵگا، دەکرد. نووسەرانی ئەم بەرهەمانە، سیستەمە ئابووری و کۆمەلاَیەتییەکانیان دەخستە بەرباس و تاوتوێیاندەکرد بۆ نموونە تاوتوێکردنی "سیستەمی فیدراڵی" لە چاخی سەدەکانی ناوەڕاست کە "پەرتەوازی دەسەڵات و لامەرکەزییەت لەتایبەتمەندییە زەق و بەرچاوەکانی بوو" یان "سیستەمەی مێرکانتێلیستی" لەبەرانبەر "سیستەمی کشتوکاڵی" لە کتێبەکەی ئادەم سمیس. هەرکام لەمانە بەپێی پێوەرێکی ڕەچاوکراوی خۆیان سەبارەت بەشێوازە سەرەکییەکانی ژیان، چوار جۆرە کۆمەڵگایان لێکجیاکردووەتەوە: راو، ئاژەڵداری، کشتوکاڵ و بازرگانی. ئەم چەمکە دەتوانێت لە کتێبەکەی تۆماس ماڵتۆسیشیدا واتە "وتارێك لەسەر بنەماکانی حەشیمەت" ١٧٩٦ ڕەچاوبکرێت کە تێیدا لە تیۆرێکی بەناوبانگدا ئاماژەدەکا بە بەرزبوونەوەی حەشیمەت تا دواقۆناغی گەشەی کەرەستەکانی ژیان.

بگرە ئەم بیرمەندە کۆمەلاَیەتییانە بکرێت بە راڤەکار وەسفبکرێن، یان بەکەڵکوەرگرتن لە دەستەواژەی باو لە سەدەی هەژدەیەم بە مێژوونووسانی فەلسەفی ناولێبنرێن. سێیەمین کتێب واتە "سامانی نەتەوەکان"ی ئادەم سمیس کە باس لە بابەتی ڕەوتی بەهێزبوون و فرەیی سەروەت و سامان دەکات، لەڕاستیدا کورتە مێژوویەکی ئابووری ئەوروپایە، هەروەها مۆنتسکیۆ باسێکی مێژوویی نووسی سەبارەت بە هۆکاری شکۆمەندی و داڕووخانی ڕۆما، فەرگۆسەن سەبارەت بە گەشە و نەمانی کۆماری ڕۆما کتێبی نووسیوە.(٨)

هەروەها میلار بابەتێکی هەیە سەبارەت بە پەیوەندی دەسەلاَت و کۆمەڵگا لە سەردەمی ئەنگلۆ-سەکسۆنییەکان هەتا پاشایەتی شاژن ئەلیزابت. ماڵتۆسیش وەکو مۆنتسکیۆ و هیوم، گرنگی بە مێژووی حەشیمەتی جیهان دەدا، لەوڕۆژگارەدا تەنانەت ئەو لێکۆڵەر و توێژەرانەیش کە کەمتر بایەخیان بە تیۆری دەدا، ماندووببوون لە باسکردنی بابەتە کلاسیکە مێژوویی، سیاسی و جەنگییەکان و لەباتی ئەوە پەنایان بۆ لێکۆڵینەوە لەبواری مێژووی کۆمەلاَیەتی دەبرد یان بەواتایەکیتر پەنایان بۆ توێژینە و خوێندنەوە لەبواری هونەر، کلتور، شارستانییەت، ماف و دابونەریت .. دەبرد، بۆنموونە ڤۆڵتەر لە نامیلکەیەك لەژێر ناوی "وتارێك لەسەر دابونەریت و ڕەوشتەکان" ١٧٥٦، هەڵدەستێت بە تاوتوێکردنی شێوازە کردارییەکان، دابونەریت و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی خەڵکی ئەوروپا لە ژیانی کۆمەلاَیەتیدا لە سەردەمی شارلەمان بەولاوە. ئەم نامیلکەیە ڕاستەوخۆ بە سەرچاوەکان پشتینەبەستبوو، بەڵکو کارێکی لەوجۆرە بە نوێگەرییەکی بوێرانە و بەرهەمێکی ڕەسەن هەژماردەکرا و لەڕاستیدا بناغەی شتێك بوو کە بۆ یەکەمجار ڤۆڵتەر بە "فەلسەفەی مێژوو" ناویلێدەبا. لەلایەکیتریشەوە کتێبی مێژووی ئوزنابروك(٩) ١٧٦٨، نووسینی یۆستۆس موزەر (Justes Mser) لەڕاستیدا مێژوویەکی ئەهلی بوو کە بەپاڵپشتی بەڵگەنامە و دیکۆمێنتە سەرەکییەکان نووسرابوو، بەلاَم ئەم بەرهەمەش لەجۆری خۆیدا نموونەیەك بوو لە یەکەمین هاوکارییەکانی تیۆری کۆمەلاَیەتی لەگەڵ ڕاڤەی مێژوویی.

بێگومان موزەر خوێندنەوەی لەسەر بەرهەمەکانی مۆنتیسکۆ هەبوو، ئەم خوێندنەوانە بوون کە بوونە پاڵنەر و هاندەرێك بۆ تاوتوێکردنی پەیوەندی نێوان رێکخراوەکانی ڤیستڤالیا[10] و ژینگە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکەیان.[11] هەروەها بەرهەمە بەناوبانگەکەی گیبۆنیش واتە "هەرەسهێنان و رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆما (١٧٧٦-١٧٨٨)".[12] لەجێی خۆیدا هەم مێژوویەکی کۆمەڵایەتی بوو، هەمیش مێژوویەکی سیاسی. گیبۆن لەچەند بەشێك لەکتێبەکەیدا کە تایبەتە بە تاوتوێی هۆزە هێرشبەرەکانی هۆن و هۆزە دڕندەکانیتر و جەخت لە تایبەتمەندییە گشتییە کرداری و دابونەریتییەکانی کۆمەڵگا "شوانییەکان" دەکاتەوە و بەتەواوەتی رادەی کاریگەری بیروڕا و تیۆرییەکانی "فێرگۆسەن"و "ئادەم سمیس" بەسەر نووسەردا نیشاندەدا و دەریدەخات کە نووسەر لەمبارەوە چەندە قەرزداری ئەوانە.[13]

گیبۆن، شیاوی و لێهاتویی و توانای درکپێکردن و دیتن و دەرهێنانی بابەتە گشتییەکان لەناو دڵی بابەتە تایبەتەکان لە تایبەتمەندییەکانی کەسێکی پسپۆڕ لەئەژماردەدا کە ئەو بە مێژوونووسی "فەلسەفی" پێناسەیدەکا. سەد ساڵ دواتر، پەیوەندی نێوان مێژوو و تیۆری کۆمەڵایەتی، تاڕادەیەك کەمتر لە سەردەمی رۆشنگەری پەیوەندییەکی دوولایەنە بووو بە واتایەکیتر خوێندنەوە هاوبەشەکانی نێوانیان کەمتربوو لە سەردەمی رۆشنگەریز. مێژوونووسەکان نەك تەنیا خۆیان دووردەخستەوە لە تیۆری کۆمەڵایەتی، بەڵکو لەهەمانکاتیشدا خۆیان لە مێژووی کۆمەڵایەتی دووردەخستەوە. لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا لیۆپۆڵد ڤۆن رانکە بەرێزترین مێژوونووسی ئەوروپا بوو، رانکە هەڵنەستا بەرەتکردنەوەی مێژووی کۆمەڵایەتی بەتەواوەتی، بەڵام بەرهەمەکانی بەگشتی لەسەر دەوڵەت چڕدەبوونەوە. لە سەردەمی رانکە و لایەنگرەکانی کە لە خۆدی رانکە دەمارگرژتربوون" وەك چۆن نەریتی لایەنگریی هەمیشە هەروایە "سەرلەنوێ مێژووی سیاسی پێگە بەهێزەکەی خۆی بەدەستهێنایەوە.[14]

هۆکاری ئەم پاشگەزبوونەوە لە تیۆری کۆمەڵایەتی دەتوانێ رەهەندی جۆراوجۆر لەخۆبگرێت، لە هەنگاوی یەکەمدا لەم سەردەمەدا بوو کە دەسەڵاتە ئەوروپییەکان ئاوڕیان لە مێژوو دایەوە وەك کەرەستەیەك بۆ گەشەسەندن و پەرەپێدانی یەکگرتنی نەتەوەیی، پەروەردەکردنی شارۆمەندی، چاودێریکەرێکی بێلایەن و هەروەها وەك ئامرازێك لە خزمەتی پروپاگەندە نەتەوەییەکان. لەکاتێکدا کە دەوڵەتانێکی نوێ وەك ئەڵمانیا و ئیتالیا و دەوڵەتە کۆنترەکانی وەك فەرەنسا و ئیسپانیا بەردەوام بەهۆی نەریتە ناوچەییەکانی خۆیان تووشی ناتەبایی و پەرتەوازەیی ببوون، فێرکردنی مێژووی نەتەوەیی لە قوتابخانە و زانکۆکان بوو بە پاڵنەرێك بۆ هاندان بو یەکرێزی و یەکگرتنی سیاسی. ئەوجۆرە مێژوویەك کە دەسەڵاتەکان ئامادەبوون لەپێناویدا هەموو هەزینەیەك بدەن، دیارە مێژووی دەوڵەت بوو. پەیوەندی نێوان مێژوونووسان و دەسەڵات بەتایبەت لە ئەڵمانیا لەگشت شوێنەکانیتری ئەوروپا بەهێزتر و چروپڕتربوو.[15]

دووەمین لێکدانەوە بۆ تاوتوێکردنی هۆکارەکانی ئەم پاشەکشەیە لە کۆمەڵگا و گەڕانەوە بۆ لای سیاسەت، بۆ هۆکاری هزری و بیرۆکەیی دەگەڕێتەوە. شۆڕشە مێژووییەکەی رانکە پێش هەموو شتێك شۆڕشێك لە سەرچاوە و شێوازەکان بوو، و جۆرێك لەجێگۆڕکێ و خۆدوورخستنەوە بوو لە مێژووە کۆنەکان یان "رووداونووسی"و هەنگاونانێك بوو بەرەو کەڵکوەرگرتن لە دوکۆمێنت و بەڵگەنامەکان و گوزارشە فەرمییەکانی دەسەڵاتەکان.

لێرەوەبوو کە مێژوونووسان روویانکردە ناوەندەکانی ئەرشیفی دەوڵەتی و ئەهلی بۆ بەڵگەنامە و دوکیۆمەنتەکان بەشێوازێکی ڕێکوپێك و بەردەوام، ئەوان بەکاری ڕێکوپێك و وردبینانە پاش کەمێك توانیان کۆمەڵە شێوازێکی ئاڵۆز و دژوار بەدیبهێنن بۆ هەڵسەنگاندنی رادەی وردبینی، راستی و جێمتمانەبوونی ئەم بەڵگەنامانە و هەروەها باوەڕپێکراوبوونی سەرچاوەکانیان. بەمهۆیەوە پێیانوابوو ئەو مێژووانەی کە لەلایەن ئەوانەوە بەمچەشنە دەنووسرایەوە راستەقینەتر و زانستیتر لەومێژووانە بوو کە لەلایەن پێشینانەوە دەنووسرا. گەشە و پەرەسەندنی ئامانجە هزری و بیرۆکەییەکان هاوکات بوو لەگەڵ پرۆسەی تایبەتمەندکردنی بەشە جیاجیاکان لە سەدەی نۆزدەیەمدا کە تێبدا یەکەمین رێخراوەکانی لێکۆڵینەوە، گۆڤارە تایبەتەکان، ناوەند و بەشە جۆراوجۆرە زانکۆییەکان بنیاتنرابوون.[١٦]

بەرهەمی مێژوونووسە کۆمەڵایەتییەکان لە بەراورد لەگەڵ بەرهەمی مێژوونووسانی سەربە رێبازی رانکە سەبارەت بە دەوڵەت، بەرهەمانێکی ناپسپۆڕانە و ناتەکنیکی دەهاتنەبەرچاو. "مێژووی کۆمەڵایەتی" لەڕاستیدا لێکدانەوەیەکی زۆر وردبینانەیە لە بابەتێك کە لەپراکتیکدا وەکو پاشماوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا. پێناسە نابەجێکەی جی. ئێم. ترێڤێلیان لەژێر ناوی "مێژووی نەتەوەیەك کە سیاسەتی لێقرتاوە"، بەرهەمێکی نەبوو جگەلەوەی گریمانەیەکی کرد بە راڤەیەکی راست و راشکاو.[١٦] بەشێکی بەناوبانگ کە تی. بی. مکاڤیلی ئاماژەی پێدابوو لەکتێبەکەیدا واتە کتێبی "مێژووی بەریتانیا(١٨٤٨)"، سەبارەت بە کۆمەڵگای کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەیەم، لەلایەن یەکێك لە رەخنەگرە هاوچەرخەکانیەوە بەشێوازێکی بێرەحمانە، بەلاّم نەك زۆر ناداد پەروەرانە و دوورلە ویژدان، وەك "دوکانێکی سەرنجراکێشی کۆن" وەسفکرابوو: هۆکارەکەی ئەوەبوو مکاڤیلی لەم بەشە لەکتێبەکەیدا قسەی لەسەر هەندێك بابەت و تەوەرەی پەرتەوازە و جۆراوجۆر کردووە لە رێگاوبان و شەقامەکان بگرە تاکو پێکهێنانی ژیانی هاوسەری، رۆژنامە و گۆڤارەکان شتی لەوبابەتە کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕێکوپێکییەکی دیاریکراو، یەك بەدوای یەك ریزبەندی کرابوون.[١٧]

بەهەرچەشن مێژووی سیاسی "لانیکەم لە چوارچێوەی پیشەیەك" راستەقینەتر و پێداگرانەتر لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگا یان کلتور لەئەژماردەدرا. پاش بلاّوکردنەوەی کتێبی "کورتە مێژووی خەڵکی ئینگلیز" لە ساڵی (١٨٧٤) لە جی. ئار. گرین، کە لەباتی گێڕانەوە و شیکردنەوەی جەنگ و رێکەوتننامەکان لێکۆڵینەوەی لەسەر ژیانی رۆژانەی کۆمەڵگای ئینگلیز کردبوو، مامۆستایەکی رابردووی خۆی بەناوی "ئەی. ئی. فریمان" وتبووی ئەگەر گرین هەموو ئەو "قسە بێکەڵکە کۆمەلاّیەتییانەی" لەکتێبەکەیدا باسنەکردبایە، دەیتوانی چاکترین کتێب بنووسێت سەبارەت بە مێژووی ئینگلیز.[١٨]

ئەمچەشنە دەمارگرژی و توندڕەوییانە تەنها تایبەت بە ئینگلیزەکان نەبوو لە جیهانی ئەڵمانی زمانیشدا باسەکەی "یاکوب بورکهات" سەبارەت بە "شارستانییەتی رێنیسانس لە ئیتالیا"(١٨٦٠) کە دواجار چووە ریزی بەرهەمە کلاسیکەکانەوە، لە سەردەمی بلاّوکردنیدا پێشوازییەکی ئەوتۆی لێنەکرا، بگرە هۆکارەکەی ئەوەبوو کە لەباتی ئەوەی خۆی بە گوزارش و نووسراوە فەرمی و دەوڵەتییەکانەوە هەڵواسێت، زۆرتر بە سەرچاوە ئەدەبییەکانەوە پشتئەستوور کرابوو. بگرە تەنها بابەتێکی دەگمەن کە لەلایەن هاوکارە پرۆفیشناڵ و بەئەزموونەکانیەوە

بەهەندوەرگیرابێت، مێژوونووسی فەرەنسی "نۆما دێنیس فۆستەل دۆکۆلانژ" بوویێت کە بەرهەمە بەناوبانگەکەی زۆرتر بابەتی بنەماڵەی تاوتوێکردبوو لە یۆنان و رۆمای کۆندا. ئەمە لەکاتێکدا بوو کە دۆکۆلانژ بەچڕی داکۆکی لەسەر ئەوەدەکرد کە مێژوو بەمانای زانستی راستییە کۆمەڵایەتییەکانە، واتە هەمان کۆمەڵناسی راستەقینە.

کۆی وتەکان ئەمەیە کە شۆڕشی مێژووی رانکە، کۆمەڵە دەرەنجام و ئاکامی زۆر گرنگ و پێشبینینەکراوی بەدواوەبوو. بەهۆی ئەوەی تێڕوانینی "بەڵگەیی" لە نووسینی مێژووی سیاسی کلاسیکدا گرنگیپێدراوە و سوودمەندتر دەزانرا، بەکارهێنانی ئەمجۆرە تێڕوانینە لەلایەن مێژوونووسانی سەدەی نۆزدەیەمەوە، هۆکارێك بوو بۆئەوەی ئەم گرووپە لە مێژوونووسان لە هەڵبژاردنی بابەت و هەروەها شیکردنەوە و راڤەکردنیدا، لە پێشینیانی سەدەی هەژدەیەمی خۆیان زۆر بەپارێز و داخراوانەتر و بەواتایەك کۆنەپەرستانەتر هەڵسوکەوتبکەن. هەندێکیان لەبەرئەوە مێژووی کۆمەڵایەتییان رەتدەکردەوە کە نەدەکرا بەچەشنێکی "زانستی" بخرێتەبەر لێکۆڵینەوە و تاوتوێبکرێت. بەپێچەوانەوە هەندێکیتر لە مێژوونووسان هۆکاری رەتکردن و پەسەندنەکردنی کۆمەڵناسییان بۆئەوە دەگەڕاندەوە کە لەڕادەبەدەر بە زانستیان دەزانی، واتە کۆمەڵناسییان بە رەوتێکی گشتیی دەزانی کە لەتوانایدانەبوو پێشبینییبکات یان تایبەتمەندبوونی تاکەکان و رووداوەکان لەبەرچاوبگرێت.

ئەم نکوڵیکردنەی کۆمەڵناسی بەشێوازێکی دیار لە بەرهەمەکانی بڕێك لە فەیلەسوفانی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم، بەتایبەت "ویلهێلم و دیلتای"دا ئاماژەپێکراوە. دیلتای کە سەبارەت بە مێژووی کلتوری و هەروەها فەلسەفە کۆمەڵە بابەتێکی نووسی پێیوابوو کە کۆمەڵناسی کونت و سپەنسەر "وەك دەروونناسی ئەزموونی هێرمان ئێبینگهاوس" نیمچە زانستی بوو، بەهۆی ئەوەی کە لێکدانەوە هۆکارییەکانی دەخستەروو. دیلتای هێڵێکی دیاریکەری بەناوبانگی داناوە لەنێوان زانستەکان کە مەبەستیان وەسفکردنە لەدەرەوە، هەروەها زانستە مرۆڤایەتییەکان، لەوانە مێژوو کە مەبەستیان دەرککردنە لەناوەوە.

خوێندکارانی زانستە سروشتییەکان لەلێکۆڵینەوەکانیاندا "زمانی هۆکار" بەکاردەبەن لەکاتێکدا خوێندکارانی زانستە مرۆڤایەتییەکان دەبێ باس لە "زمانی ئەزموون" بکەن.[١٩]

بێنێدێتۆ کرۆچەی ئیتالی کە زۆرتر وەك فەیلەسوف ناسراوە و لەهەمانکاتیشدا یەکێکە لە مێژوونووسە بەناوبەنگەکانی سەردەمی خۆی، هەڵوێستێکی لەوچەشنەی گرتووەتەپێش. ئەو لەساڵی (١٩٠٦) لایەنگری نەکرد لە بنیاتنانی بەشی کۆمەڵناسی لە زانکۆی "ناپل"، چونکە پێیوابوو کۆمەڵناسی تەنها نیمچە زانستێکە. لەلایەکیترەوە بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکانیش بەش بەحاڵی خۆیان هەڵوێستی توند و رەخنەگرانەیان هەڵگرتووە لەبەرانبەر مێژوونووساندا و دژایەتیاندەکردن، لەهەمانکاتیشدا وازیان لە خوێندن و لێکۆڵینەوەی مێژوویی نەهێنا. بەرهەمە بەناوبانگەکەی "ئەلەکسی دۆتۆکۆڤیل" واتە سیستەمی کۆن و شۆڕشی فەرەنسا، بلاوکراوە(١٨٥٦ز) لە سەرەکیترین بەرهەمەکانی بواری مێژوویی بوو کە بەپێی بنەمای بەڵگە و دوکیومێنتی متمانەپێکراو بەدیهاتبوو، لەهەمانکاتیشدا خاڵێکی وەرچەرخێنەربوو لە تیۆری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا و هەروەها کتێبی سەرمایەی مارکس کە لە ساڵی (١٨٦٧) بلاوکرایەوە - وەك سامانی نەتەوەکان - بەرهەمی ئادەم سمیس رۆڵێکی مەزن و دیاریکەری نواند لە مێژووی ئابووری و بەهەمانچەشن لە تیۆری ئابووریشدا و بووە هۆی گۆڕینی رێوشوێنیان. مارکس لەم

کتێبەدا سەبارەت بە یاساکانی کار، گواستنەوە لە پیشە و کاری دەستی ناوماڵ بۆ پیشەی بەرهەمهێنەرەکان، لابردنی خاوەنداریەتی لە جوتیاران و باسی لەو چەشنە دەدوێت.[٢٠]

ئەگەرچی مێژوونووسانی سەدەی نۆزدەیەم ئەم بەرهەمەیان نەخستەبەرچاو و گرنگیانپێنەدا، بەلاّم ئەم کتێبە کاریگەری سەرسووڕهێنەری بووە لەسەر پێکهاتەی مێژووی سەردەمی ئێمەدا، هەروەها سەبارەت بە گوستاڤ شمولەر، وەك کەسایەتییەکی دیاری ڕێبازی مێژوویی، لە ئابووری سیاسیدا، دەبێ بڵێین کە ئەویش زۆرتر وەك مێژوونووس ناسراوە نە وەك ئابوویزان.

تۆکۆڤیل، مارکس و شمولەر لەڕووی تێکەڵاوکردنی تیوری لەگەڵ جۆرێك لە بەپەرۆشبوون بۆ وردەکارییەکانی بارودۆخی دیاری مێژوویی، تارادەیەك لەگەڵ هاوسەردەمانی خۆیان جیاوازن، ئەوەی کە لەناو هەندێك لقی تازە دەرکەوتوو لە زانکۆکان لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا وەك لایەنێکی گشتی و هاوبەش دەهاتەبەرچاو، گرنگیدانبوو بە رەوتە درێژخایەنەکان، بەتایبەت ئەو بابەتەی کە هاوسەردەمەکان پێیاندەوت: "گەشەی کۆمەلاّیەتی"، هەروەها کۆنت پێیوابوو کە مێژووی کۆمەلاّیەتی یان بەبۆچونی خۆی "مێژووی بێناوی تاکەکان و تەنانەت ناوی نەتەوەکان "، بۆ کاری تیۆری "کە ئەو یەکەم کەس بوو کە ناوی کۆمەڵناسی لێنا " پێویست و حاشاهەڵنەگرە. بەرهەمە گرنگەکەی ئەو دەتوانێت بەجۆرێك "فەلسەفەی مێژووی" وەسفبکرێت، بە واتایەك کە لەبناغەدا جۆرێکبوو لە دابەشکردنی رابردوو بە سێ سەردەم: سەردەمی ئایین، سەردەمی میتافیزیا و سەردەمی زانست، هەروەها شێوازی بەراوردکاری - کە دروشمێکیتری ئەو سەردەمە بوو - بە شێوازێکی مێژوویی لەئەژماردەدرا، چوونکە هەر کۆمەڵگایەك "لەڕاستیدا هەر نەرێت، داب یان بەرهەمێکی هونەری" لە قۆناغ و پلەیەك لە پەیژەی گەشەدا دەسنیشاندەکات.[٢١]

یاساکانی گەشە وەك رەمزێك بوون بەهۆی پێکەوەگرێدانی لقە جۆراوجۆرەکان. ئابووریزانەکان هەستان بە وەسفکردن و شیکردنەوەی چۆنیەتی جوولاّن لە "ئابووری سرووشتی" بەرەو "ئابووری دراو". مافناسەکان وەك "سێر هەنری ماینەر" لە کتێبی "مافەکانی سەردەمی کۆن" (١٨٧٢)، وەرچەرخانی کۆمەلاّیەتییان بەشێوازە گەشەییەکەی لە "دڕندەگەریەوە" بۆ "شارستانییەت" گەڵاڵەکرد. هێربەرت سپەنسەری کۆمەڵناس بەکەڵکوەرگرتن لەنموونە مێژووییەکان لە میسری کۆنەوە بۆ روسیای پتری مەزن هەوڵیدا بۆ وێناکردنی پرۆسەی گەشەی کۆمەڵگاکان لە کۆمەڵگای "سەربازیەوە" بۆ "کۆمەڵگای پیشەیی".[٢٢]

هەروەها فریدریش راتزل (Friedriech Ratzel)ی جوگرافیزان و ویلهێلم ونت (Wilhelm Wundt) دەروونناس، خوێندنەوەیەکی هاوشێوەیان ئەنجامدا سەبارەت بە "خەڵکانی سروشتی"، راتزل گرنگیدا بەچۆنیەتی پێکەوەژیان و خۆگونجاندنیان لەگەڵ ژینگەی سرووشتیدا، ونت هەستا بە تاوتوێی زەینییەتە گشتییەکانیان. بابەتی سەرەکی دوو کتێبی لقی زێڕین (١٨٩٠) لە جیمز فریزەر و زەینییەتی دەشتەکی (١٩٢٢) لە لوسین لۆڤی- برۆدێل، شرۆڤەکردنی پرۆسەی گەشەی بیرۆکە و هزر بوو لەجادوگەرییەوە بۆ ئایین و لە شێوازی دەشتەکی دواکەوتووەوە بۆ شێوازێکی شارستانییەتی پێشکەتوو. دوانموونەی ئەم نەریتە گەشەییە، زیگموند فروید بوو لەبەر جەختکردنی لەسەر بوون و مانەوەی توخمە دەشتەکییەکان لە دەروونی پیاوان و ژنانی گەشەسەندوودا.

بۆئەم بانگەشەیە باسەکانی "توتم و تابۆ" (١٩١٣)و داهاتووی تێگەیشتنێك (١٩٢٧) وەك نموونە ئاماژەیانپێدەدرێت.

**ئەڵبەت لەم باسانەدا تارادەیەکی زۆر لە بیروراکانی فریزەر ئیلهامیوەرگرتووە**

بەگشتی - بەلاّم نەك هەمیشە- گەشە بە مانای گۆڕانێك بوو بەرەو باشبوون. کتێبە بەناوبانگەکەی "فەردیناند تونیز" کۆمەڵناسی ئەڵمانی، لەژێر ناوی کۆمەڵ و کۆمەڵگا (١٨٨٧) Community & Society) کە تێکەڵە لەگەڵ جۆرێك لە بێتاقەتی و جیایی "نووستالۆژیا" باس لەتێپەڕبوون دەکا لە کۆمەڵگای خاوەن ناونیشانی کلاسیکییەوە بەرەو کۆمەڵگای بێشوناسی مۆدێرن، وێرای ئەمە راشکاوانەترین بەرهەمێکە کە دڵگرانە سەبارەت بە رێکوپێکی کۆن و هەروەها راڤەی هۆکار و فاکتەرەکانی لەناوچوونی دەکات.(٢٣)

تیۆریزانەکان پیشتر، گرنگیاندەدا بە رابردوو، بەلاّم زۆربەیان رێزێکی کەمیان بۆ مێژوونووسان دادەنا. بۆنموونە کۆنت بە زمانێکی پڕلە سووکایەتییەوە دەڵێت "کۆمەڵە وردەکارییەکی بێنرخ کە بەوردبینییەکی ناعەقلانەی نووسەرە کوێرەکانی چیرۆکە بێنرخەکان کە بەشێوازێکی ناشارەزایانە رێکخراون".(٢٤)

سپەنسەر رایگەیاند کە کۆمەڵناسی هەستا بە داکوکی و پشتگیریکردن لە مێژوو "وەك چۆن کۆڵەکە و بنەماکانی بینایەکی گەورە پەیوەندی بە کۆمەڵە بەرد و خشتە کەڵەکەکراوەکانی دەوروبەریەوە هەیە"و هەروەها ئەو بابەتەی کە "گرنگترین ئەرکێك کە مێژوونووس دەتوانێ لە ئەستۆی بگرێ، باس و گێرانەوەی بەسەرهاتی نەتەوەکانە، تا بەمجۆرە داتا و کەرەستەی پێویست بۆ کۆمەڵناسی بەراورد دابینبکات".

لەباشترین حاڵەتدا مێژوونووسان بە کۆکەرەوەی کەرەستەی خاو بۆ کۆمەڵناسی ناوزەددەکران و لەخراپترین حاڵەتیشدا بێەڵك و بێسوود لەئەژماردەدران، چونکە تەنانەت کەرەستەی پێویست و لەباریان بۆ وەستاکارەکان دابیننەدەکرد. باشتروایە دووبارە وتەیەکی سپەنسەر بگێڕینەوە: "بەسەرهاتی پاشا و سولتانەکان (مەگەر منالآنی ئێمە جگەلەمانە شتێکیتر فێردەبن) ئەمانە بەدەگمەن بەکەڵکدێن بۆ گەشاندنی زانستە کۆمەلاّیەتییەکان".(٢٥) کەمتر مێژوونووسانێك بوون کە نەکەوتنەبەر ئەم ئیدانەکردنانە و رزگاریانبوو لە دوورخستنەوە و نەفرەتی گشتی، لەسەرووی هەموواندا "فوستەڵ دوکولانژ" بوو کە پێشتر ئاماژەمانکرد بە لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە "شاری کۆن"و هەروەها ف. دبلیو میتلند مێژوونووسی بواری یاسای بەریتانیا کە کۆی بیروڕاکانی سەبارەت بە پێکهاتە کۆمەلاّیەتییەکان وەك کۆمەڵە پەیوەندییەکانی نێوان تاك و گرووپەکان، بەپێی یاسا و بەرپرسیارییەتییەکان، کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبووە لەسەر لێکۆڵینەوەکانی خەڵکناسی کۆمەلاّیەتی بەریتانیا.(٢٦)

بەهەرچەشن تێکەلاّوکردنی حەز لەگەڵ مێژوو بەدوور لەتێڕوانینی مێژوونووسان، تایبەتمەندی سەرەکی زۆربەی بیردۆزە کۆمەلاّیەتییەکان بوو لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا. هەندێکیان، بۆنموونە جوگرافیزانی فەرەنسی "پول ویدا دێلابلاشە"، کۆمەڵناسی ئەڵمانی "فردیناند تونیز" و خەڵکناسی سکاتلەندی "جیمز فریزەر" وەك مێژوونووس بەتایبەت مێژوونووسی دنیای کۆن کاری خۆیان دەستپێکرد. هەندێکیتریان هەوڵیاندا تا خوێندنەوە لەسەر دۆخی رابردوو و ئێستای کلتورێکی تایبەت تێکەڵبکەن. فرانتس بوئازی خەڵکناس ئەم کارەی سەبارەت بە

پێست سوورەکانی کواکی یوتەل کە نیشتەجێی ناوچەی ڤەنکوڤەرن بەئەنجامگەیاند، لەکاتێکدا ئاندرە زیگفریدی جوگرافیزانیش کارێکی هاوشێوەی ئەنجامدا لە بەرهەمە بەناوبانگەکەی خۆیدا واتە "وێنەی سیاسی رۆژئاوای فەرەنسا"، ئەو لەم بەرهەمەدا وێرای شرۆڤەی پێوەندی نێوان ژینگەی ئەهلی و باوەڕە ئایینی و سیاسییەکانی دانیشتووانی ناوچەکە، پێیوایە: "هەر بەوجۆرەی کە لەم کۆمەڵە ژینگەیەدا ناوچەی زەمیننناسی یان ئابووری بوونیان هەیە، بەهەمانچەشنیش ناوچەی سیاسیش بوونی هەیە" پاشان رەمزەکانی هەڵبژاردن و دەنگدان بەراوردەکات لەگەڵ پەیوەندییە ئاینییەکان و خاوەندارێتی زەمین.(٢٧)

سێ کەس لە بەناوبانگترین کۆمەڵناسەکانی ئەم سەردەمە "ویلفرێد دو پارەتۆ، ئەمیل دورکهایم و ماکس ڤێبەر" هەموویان کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەکی پڕبایەخیان ئەنجامداوە لە خانەی مێژوودا. کتێبەکەی پارەتۆ بەناوی "نامیلکەیەك لەسەر کۆمەڵناسی گشتی" (١٩١٦)، بە تێروتەسەلی بابەتی ئاتێن و ئێسپارت و رۆمای لە چاخی کۆن شیکردووەتەوە، هەروەها لە مێژووی ئیتالیای سەدەکانی ناوەراستیش کۆمەڵە نمونەیەك دێنێتەوە، ئێمیل دورکهامیش کە پێداگربوو لە دیاریکردنی سنوورێك بۆ بەشی تازە دەرکەوتوی کۆمەڵناسی بە- لێکجیاکردنەوەی لە مێژوو، فەلسەفە و دەروونناسی، لەلای فوستەل دوکولانژ بەشێوازێکی تایبەت هەستابوو بۆئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی چڕوپڕ لەسەر مێژوو. ئەو یەکێك لە کتێبەکانی پێشکەش بە فوستەل کردووە، دورکهایم نامیلکەیەکی نووسیوە سەبارەت بە مێژووی پەروەردە و فێربوون لە فەرەنسا و هەروەها ئەو سیاسەتی گۆڤارەکەی خۆی تەرخانکردبوو بۆ رەخنە و شیکردنەوەی کتێبە مێژووییەکان، بەمەرجێك کە خۆیان بەرتەسکنەکردبێتەوە بە نووسینەوەی رووداوەکان و خستنەرووی پرسە بێبناغە و روتینییەکانی مێژوو.(٢٨)

سەبارەت بە ماکس ڤێبەر دەبێت دانبەوەدابنرێت کە هەم بەربلاوی و هەم قووڵی زانستی مێژووییەکەی بەراستی سەرسووڕهێنەر و بێنموونە بوو. ئەو پێش نووسینی بەرهەمە بەناوبانگەکەی خۆی واتە "ئەخلاقی پرۆتستانی و گیانی سەرمایەداری" ١٩٠٤-١٩٠٥، کۆمەڵە بەرهەمێکی نووسی سەبارەت بە کۆمپانیا بازرگانییەکانی سەدەکانی ناوەراست و مێژووی کشتوکاڵی رۆمای کۆن، تیودۆر مامسەن لێکۆڵەر و توێژەری مەزنی کلاسیك، ڤێبەری بە نەوەیەکی شیاو و پڕبایەخ دەزانی، ڤێبەر تەنانەت ئەوکاتەی کە سەرنجی بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی ڕاکێشرا و زۆرترین بایەخی بە تیۆری کۆمەلایەتی دەدا، وازینەهێنا لە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی رابردوو.

وێرای گرنگیدان بە مێژوو بەمەبەستی دەرکردنی داتای پێویست، بۆوەرگرتنی چەمك و بۆچوونە پێویستەکان سەردانی مێژوونووسەکانی دەکرد، بۆنموونە تیۆرییە بەناوبانگەکەی ڤێبەر واتە "کاریزما"، بەرهەمی باس و وتوێژەکانی ئەوبوو لەگەڵ مێژوونووسی ئایینی "رودوڤۆلف زوم" سەبارەت بە سیستەمی کاریزمایی کلیسا سەرەتاییەکان.(٢٩) کارێك کە ڤێبەر ئەنجامیدا ئەمەبوو کە بە رەپاڵخستنی لایەنێکی نائایینی بۆئەم چەمکە بەشێوازێکی گشتگیرتر برەوپێیدا، پێشهاتوابوو کە مێژوویی روانترین کۆمەڵناس لەنێوان کۆمەڵناسە مەزنەکانی سەدەی بیستەم، لە شوێنێك دەرکەوێت کە لەوسەردەمە مێژوویی روانترین کلتور لەئەژماردەدرا لەئەورووپادا، ئەڵبەت ڤێبەر بەدەگمەن خۆی بە کۆمەڵناس دەزانی و لەکۆتایی ژیانی خۆیدا، کاتێك وتنەوەی ئەم بەشەی لە زانکۆی مونیخ

لەئەستۆگرت، بە زمانێکی وشك وتی: "هەنووکە بەسەرنج لەسەر فەرمانی دامەزراندنەکەم بۆ وتنەوەی وانـەی ئـەم بابەتە، لەناکاودا بووم بە کۆمەڵناس" بەمپێیە ڤێبەر خۆی یان بە پسپۆڕی ئابووری سیاسـی یـان بـە پسـپـۆڕی مێژوونووسی بەراوردکاری لەقەڵەمدەدا.[٣٠]

•••

١. Man, ١٩٨۶.
٢. Leys, ١٩٥٩.
٣. Thompson, ١٩٧٨.
٤. Thompson, ١٩٧١, hobzbawn & Ranger, ١٩٨٣.
٥. Giddens, ١٩٧٩, ١٩٨٤.
٦. Braudel, ١٩٥٨.
٧. Aron, ١٩٦٥, ١٧-٦٢, hawthorm, ١٩٧٦, meek, ١٩٧٦.
٨. Progress and termination of the roman republic.
٩. Osnabruc

**.١٠ پاشایەتی ڤیستڤاڵیا، لە ساڵی ١٨١٥ دیسانەوە کرایەوە بە بەشێك لە هانۆڤەر و لە جەنگی دووەمی جیهانی بۆردومانێکی زۆر کرا. ئۆزنا بروك لە شارە پیشییەکانی ئەڵمانیا لە ناوچەی ساکۆنی خواروو لە ساڵی ١٨٠٤ز لەلایەن شارلەمانەوە دامەزرا، وەك شوێنێك بۆ ئۆسقۆفەکان لە ١٧١١ بوو بە شار، لە ١٦٤٣ دانوستانەکانی "رێکەوتننامەی ڤیستڤاڵیا" لەم شارە بەڕێوەچوو لە ١٨٠٣ بوو بە بەشێك لە هانۆڤەر.**

١١. Knuden, ١٩٨٨, ٩٤-١١١.
١٢. Decline and Fall of the roman empire.
١٣. Pocock, ١٩٨١.
١٤. Bruke,١٩٨٨.
١٥. Moses, ١٩٧٥.
١٦. Gilbert, ١٩٦٥.
١٧. Trerelyan, ١٩٤٢, vii.
١٨. Burrow, ١٩٨١, ١٧٩-٨٠.
١٩. Dilthey, ١٩٨٣.
٢٠. cohen (١٩٧٨).
٢١. aron (١٩٦٥) ٦٣-١١ , burrow (١٩٦٥) , nisbet (١٩٦٩) , ch.٦.
٢٢. Peel (١٩٧١).
٢٣. nisbet (١٩۶۶), cf hawthom (١٩٧۶) .
٢٤. comte (١٨۶٩) , lecture ٥٢ .
٢٥. SPENCER(١٩٠٤), ٢٦-٢٩:PEEL(١٩٧١), ١٥٨-٦٣.
٢٦. POLLOCK AND MAITLAND (١٨٩٥).
٢٧. BOAS(١٩٦٦),SIGFRIED(١٩١٣).٧٠
٢٨. BELLAH(١٩٥٩),MOMIGLIANO(١٩٧٠),LUKES(١٩٧٣).CH٢
٢٩WEBER(١٩٢٠), ٣ ,١١١١-٥٧,BUHLER(١٩٦٥) , ١٥٠FF.
٣٠. BENEDIX(١٩٦٠), MOMM SEN(١٩٧٤),ROTH(١٩٧٦).

**سەرچاوە:**


١. Peter burke, Histori & Social Theory, “( Cambridge, Polity Press, ١٩٩٦), ch “Theorists, and Historyans, “ pp. ١-٢١.

**٢. مجله، تاريخ معاصر ايران، س١، ش٢، تهران، تابستان ١٣٧٦.**

# سەرهەڵدانی بزوتنەوەی مورجیئە لە مێژووی ئیسلامدا

نووسینی: خالید ئیسماعیل محەممەد(*)

ئەگەر چاوێك بە مێژووی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا بخشێنین دەبینین چەندین گروپی داهێنەر سەریانهەڵداوە، وەك پێغەمبەر (د.خ) ئاماژەدەکات، حەفتا و دوو گروپی سەرلێشێواو لە ئوممەتەکەی سەرهەڵدەدات، تەنها یەك گروپیان ڕێگەی ڕاستیان گرتووە و ڕزگاردەبن ئەوانیتر سەرلێشێواون و هەندێ لەو گروپانە بە دەرچوو لە ئایین و بێباوەڕیان نەزانیون و هەندێکتریان بە دەرچوو لە ئایین و بێباوەڕیان ناوزەندکردوون، چەند گروپ و دەستەیەك لەبنچینەدا موسوڵمان بوون، بەڵام شوێن کەسانێك کەوتن کە داوای پێغەمبەرایەتییان دەکرد بەشێوەیەکی درۆ و ناڕاستی. لەوبارەوە پێغەمبەر (د.خ) هەواڵیداوە لەبارەی پەیدابوونی چەند کەسانێك لە ئوممەتەکەی کە داوای پێغەمبەرایەتی درۆیینە دەکەن تاوەکو کەسانێك بوون شوێن کەسایەتییەك کەوتوون کە پڕوپاگەندەی خوایەتییان کردووە، هەموو ئەو گروپە بێبڕوایانە دەچنە ریزی ئەو حەفتا و دوو گروپەوە، هەندێ لەو گروپانەش بەلای ئیسلامدا دەشکێنەوە بەڵام دووچاری گومڕایی و سەرلێشێواوی بوون یان لەڕێگەی ڕاست لایانداوە هەندێ لەو گروپە سەرەکییانەش کە زانایان کۆدەنگن لەسەر گومڕابوونیان وەکو خەواریج و موعتەزیلە و مورجیئە، بەڵام ئایا ئەو گومڕاییە بەسەر هەموویاندا دەچەسپێت؟ لەبەرئەو خاڵە نووسەرانی گروپە کۆنەکان لەنووسینەکانیاندا باسیان لە نزیکەی حەفتا و دوو گروپ کردووە و لەکاتێکدا ئاماژەیان بەوەکردووە کە گروپیتریش لەداهاتودا سەرهەڵدەدەن.

گەربێتو بەدواداچوون بکەین لەبارەی ئەوانەی پڕوپاگەندەی خوایەتی یاخود پێغەمبەرێتیان کردووە یان ئەو پێشەوایانەی کە دووچاری گومڕایی بوون چی وایکرد گومڕابن، ئەگەر ئاماژە بەچەند کەسایەتیەك بکەین لە سەرەتای مێژووی ئیسلامدا داوای پێغەمبەرایەتییان کردووە پڕوپاگەندەی ئەوەیان کردووە کە نوێنەری خوان لەسەر زەوی وەك موسەیلەمەی درۆزن و سەجاح و (الاسود العنسی).. هتد، یاخود ئەو گروپانەی شوێنکەوتەی گومڕایی و بێباوەڕیبوون یا ئەوانەی پڕوپاگەندەی خوایەتی و پێغەمبەرایەتییان کردووە و یان شوێنکەوتەی ئایینە بێبڕواکان بوون و یاخود زۆر ڕۆچووبوون لە پێداهەڵدان و خۆشویستنی بنەماڵە و خانەوادەی پێغەمبەر (د.خ)و یا هەستاو ن بە تەئویلی کوێرانەی نازانستی، یاخود هەستاون بە پێچواندنی خوا بە دروستکراوەکانی و چەندین گومڕابوونیتر کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان کرد بە چەند دەستە و تاقمێکی گومڕا وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆکردن وەك خەواریج موعتەزیلە و مورجیئە.

---

(*) زانکۆی ئورومییە.

دەوڵەتی ئیسلامی لەدوای جەنگی سەفین دەبینین گروپێك سەریانهەڵدا بەناوی خەواریجەوە کە یەکەمین گروپ بوون لە سەدەی یەکەمی هیجری سەریانهەڵدا کە نە باوەڕیان بە خیلافەتی ئیمام عەلی و نە خیلافەتی معاویە هەبوو، بەڵکو باوەڕیان بە تەحکیم هەبوو کە دەیانووت حوکم تەنها بۆ خوایە.. بۆیە یەکێك لەم گروپانە بەناوی عەبدولرەحمان کوڕی مەلجەم هەستا بە شەهیدکردنی ئیمام عەلی خوا لێیڕازیبێت دواتر حەسەنی کوڕی بۆ ماوەی شەش مانگ خیلافەتی گرتەدەست و دواتر سپاردنی خیلافەت بە موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان لە ساڵی ٤١ی کۆچی.. بۆیە ئەگەر چاوێك بە مێژووی دەوڵەتی خیلافەتی ئەمەوی بخشێنین لە ماوەی نەوەد و یەك ساڵی تەمەنیدا ئارامی بەخۆوە نەبینیوە تەنها لەچەند کاتێکی کەمدا نەبێت لەماوەی خیلافەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا، ئەو سیاسەتەش ناونرابوو توندوتیژی و دژایەتی و خوێنڕێژی، یەکەمین ئەو شۆڕشانەی کە دژی دەوڵەتی ئەمەوی سەریهەڵداوە شۆڕشەکەی ئیمام حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو کە شۆڕشەکەی بانگەشە بوو بۆ دینی خوای گەورە، لەدوای ئەوە شۆڕشەکەی عەبدوڵلای کوڕی زوبێر و موسعەبی برای بوو، پاشان بزووتنەوەی تەوابین و بزووتنەوەی خەواریج و مورجیئەبوو کە ئەم هەموو بزووتنەوانە فاکتەرێك بوون بۆ تەمەنکورتی و لەناوچوونی خیلافەتی ئەمەوییەکان، لەو بزووتنەوە بەرهەڵستکارانەش بزووتنەوەی مورجیئە بوو کە ئەم بزووتنەوەیە لە نیوەی دووەمی سەدەی یەکەمی هیجری لەژێر کاریگەری ئاڕاستە فکرییە مەسیحییەکان لە دیمەشق دەرکەوتن.

### سەرهەڵدان و هۆکاری دەرکەوتنییان لە مێژووی ئیسلامدا

دەرکەوتنی خەواریجەکان کارگیەرییەکی گەورەیان بینی لە سەرهەڵدانی ڕووداو و ئاژاوەگێڕی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا، هەروەکو چۆن دەرکەوتنی خەواریجەکان لە مێژووی ئیسلامدا دەرکەوتنێکی سیاسی بوو بۆ ململانێ لەسەر دەسەڵات، بەهەمانشێوەش دەرکەوتنی مورجیئە دەرکەوتنێکی سیاسی و پەیوەندی هەبووە بە کاروباری سیاسیەوە چی ڕاستەوخۆ کە پەیوەندی بە خیلافەتەوە هەبێت چی وەکو پەیوەستبوون بە هەڵوێستی دەوڵەتی ئەمەوییەوە بەرامبەر بە نەتەوە ناعەرەبەکان بێت کە هاتبوونە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە. هەر لە دوای گواستنەوەی خیلافەت بۆ ئەمەوییەکان کۆمەڵە کەسانێك کە ناسرابوون بە (السواد الاعظم) گروپێکی تازەیان دامەزراند بەناوی مورجیئە لەبەرامبەر خەواریجدا کە باوەڕیان نە بە ئیمامەتی عەلی نە بە خیلافەتی معاویە هەبوو. ئەسڵی ئەم وشەیەش کە (ارجاء)یە واتا دواخستن. ئەمانە لەبەرامبەر خەواریجدا دەرکەوتن کە خەواریجەکان خاوەنی گوناهە گەورەکانیان بەبێ باوەڕ دەزانن و هیچیان لە دەروونی مرۆڤ نەدەزانی و جیاوازی نێوان موسوڵمان و فاسقیان نەدەکرد.

وەکو گوتمان سەرهەڵدانی مورجیئە پەرچەکردارێك بوو بۆ بزووتنەوەی خەواریج و لە زۆربەی بیدعەت و داهێناندا لە کاردانەوەی یەکتربوون کە خەواریجەکان باوەڕیانوابوو هەرکەسێك گوناهێکی گەورە بکات پێیبێباوەڕدەبێت و لە دین دەردەچێت، بەڵام مورجیئە لە کاردانەوەی خەواریجدا باوەڕیانوابوو مرۆڤ هەرچەندە گوناهبکات باوەڕەکەی زەرەرناهێنێ، جا خەواریج وەك پێشتر باسمانکرد بۆیە پێیاندەوترا خەواریج چونکە لە فەرمانی ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەرچوون، بەڵام مورجیئە بۆیە پێیاندەوترا مورجیئە چونکە کردەوەیان لە

ئیمان دوادەخست، دەیانگوت باوەڕ بەبێ کردەوەش هەر ئیمانە، لەگەڵ باوەڕی کەسێك کە یەك گوناه ناکات هیچ جیاوازی نییە، بۆیە ناونران مورجیئە چونکە (اخروا العمل عن الایمان، و وارجئوا العمل عن الایمان)و گوتییان، باوەڕ هیچ پەیوەندی بە کردەوە و (طاعة)ەوە نییە و هیچ پەیوەندی بە گوناهەوە نییە کە بێگومان ئەمە بیدعە و داهێنانە، ئەوەی (خەواریج)یش هەر بیدعە و داهێنانە کە دەڵێ: هەر کەسێك گوناهبکات پێی (کافر) دەبێت. واتە هەم بیرۆکەی (مورجیئە) داهێنان و بیدعەتە کە دەڵێ هەرچەندە مرۆڤ زۆر گوناهبکات پێی (کافر) نابێت و باوەڕی زەرەر ناهێنێت و هەم ئەوەی (خەواریج)یش کە دەڵێ: بە گوناهێك مرۆڤ (کافر) دەبێت. ئەم دوو کۆمەڵەیە بنچینەی پەیدابوونی بیدعەت و داهێنان بوون لە مەسەلەی باوەڕدا، پێڕ و تاقمەکانیتر زۆربەیان لەژێر کاریگەری بیروبۆچوونەکانی ئەم دوو تاقمەیەدا بوون.

### مورجیئە لەڕووی چەمك و زمانەوانییەوە

لەڕووی چەمکەوە:

تەبەری دەڵێت: هەموو ئەو کەسانەن کە وتویانە باوەڕ وتەیە بەبێ کردەوە، دەستەیەکیان دەڵێت کە شەریعەت بەشێك نییە لە باوەڕ، بەڵکو باوەڕ تەنها پەسەندکردنیەتی بە وتە بەبێ کردەوە.

ئیبن ئەسیر دەڵێت: هەموو ئەو دەستانەن کە باوەڕیانوایە سەرپێچیکردن هیچ زیانی بۆ باوەڕ نییە و هەروەها سەرپێچینەکردنیش هیچ زیانی بۆ بێباوەڕ نییە. ئەوانەش دابەشدەکرێن بۆ سێ گروپ:

**مورجیئەی یەکەمین:** هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە پەیڕەوی لە وتە و کاروکردەوەکانی (ئیمامی عوسمان و ئیمامی عەلی) دەکەن و خۆیان بە شوێنکەوتەی ئەو دوو ئیمامە دەزانن. ئەوانە دژی کەسانێکن کە ئەم دوو ئیمامە بە بێباوەڕ دەزانن یان زیادەڕەویدەکەن.

**مورجیئەی زانایان (الفقها و):** هەموو ئەوانەن کە دەڵێن باوەڕ دوو روکن لە خۆدەگرێت، پەسەندکردن بە دڵ و بڕیاردان بە زمان کە نە لێیزیاددەبێت و نە لێیکەمدەبێت و نە لێیجیادەبێتەوە. لە بەناوبانگترین ئەو کەسانەی کە نوێنەرایەتی ئەم مەزهەبە دەکەن زانایانی حەنەفین کە پابەندن بە بیروباوەڕی سەلەف، ئەوانەش کە باوەڕیان بەم مەسەلە نییە (أبو جعفر طحاوی)یە لەگەڵ دەستەیەك لە مورجیئەکان.

**مورجیئە و زیادەڕەوی لەگوتارەکانیاندا وەکو جەهمییەکان:** ئەوانە کە دەڵێن کە باوەڕ تەنها بە دل دەبێت ئەوەش پەسەندکردنی بە دڵ بەتەنها ئەوەش وادەکات نزیکی بکاتەوە لە ئاستەنگی ناشیاوی. ئەوانەش کە نوێنەری ئەم گروپە دەکەن بریتینلە ئەشعەرییەکان.

### مورجیئە لەڕووی زمانەوانییەوە

لە (ارجاء)ەوە هاتووە لەزمانەوانیدا بەچەند واتایەکی جیاواز هاتووە کە گرنگترینیان دواخستنە (گەڕانەوە)، ئیبن ئەسیر باسی ئەم بابەتەی کردووە ئەو حەدیسەمان بۆدەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: (وأرجأ رسول الله (ص) أمرنا) یا (أخره) واتا پێغەمبەر (د.خ) کاری ئێمەی دواخست. لە قورئانی پیرۆزیشدا وتەی (مرجئون) لە ئایەتی (١٠٦)ی

سورەتی تەوبە بەکارهاتووە. واتایەکیتری (ارجاء) ئەوەیە (اعطاء الرجاء)ەیە واتە هیوابەخش، پێویستە سەرنجبدەینە ئەم خاڵە جیاوازانەی کە بۆ مورجیئە بەکارهاتوون دەبینین هەموویان پەیوەندییەکی نزیکیان بەیەکەوە هەیە، بەوشێوەیە کە (ارجاء) بە واتای دواخستن یا گەڕانەوە بێت، ئەوە لە سێ خاڵدا دەتوانین چڕیبکەینەوە.

**شێوەی یەکەم:** ئەوەیە کە دەربارەی ئەشکەنجە و لێبوردن بێت، کەسێ کە تاوانی گەورەی ئەنجامدابێت تاوانەکەی تا رۆژی دوایی دەمێنێتەوە و واتا رۆژی دوایی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت. هەر بەمشێوەیەش (ابن منظور) ناوینان (مورجیئە)، چونکە باوەڕیانوایە خوا سزای ئەو کەسانەی دواخستووە کە تاوان ئەنجامدەدەن. لە دیدی شەهرەستانییەوە (ارجاء) بەواتای ((دواخستنی حوکم دێت بۆئەو کەسانەی تاوانیان ئەنجامداوە بۆ رۆژی دوایی)).

**شێوەی دووەم:** ئەوەیە کە وشەی (ارجاء) واتای دواخستنە دەتوانرێت لە چەمکی (مورجیئە)دا چڕبکرێتەوە.

**شێوەی سێیەم:** بەدواخستنی پلەی ئیمام (عەلی) دێت کە لەدوای هەر سێ خەلیفەی راشدین بوو، بەشێوەیەك (ارجاء) بەواتای (اعطاء الرجاء) دێت کە (ارجاء) بەواتای (اعطاء الرجاء) بێت بەواتای هیوابەخشینە کە ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان بە هیوای بەخشینی خوداین، لەمەوە بۆماندەردەکەوێت کە مورجیئە دەستەیەك بوون کە تاوانی گەورە ئەنجامدەدەن بە هیوای بەخشینی خودای گەورەن.

**هزری مورجیئە**

مورجیئەکان بەهۆی کاریگەری هەندێك هۆکارەوە کە لەژێر سەری مەسیحییەکانەوە بووە لە دیمەشقی پایتەختی ئەمەوییەکاندا دەرکەوتن. بنچینەی باوەڕەکەشیان لەسەر ئەوە بەندبوو کەوا پێویستە حوکمی ئەو موسوڵمانانەی سەرپێچیکەر و تاوانکارن هەڵبگیرێت بۆ رۆژی دوایی و نابێت هیچ موسوڵمانێکیش تۆمەتباربکرێت و سزابدرێت بەچاوپۆشین لەوەی هەر گوناهێکیشی کردبێت.

مورجیئەکان دەیانگوت تاوان و سەرپێچیکردن لەپاڵ باوەڕداریدا زیانی نییە هەروەکو چۆن ملکەچی و گوێڕایەڵیش لەپاڵ بێباوەڕیدا کەڵکی نییە، بۆیە ئەگەر مرۆڤ هەر سەرپێچی و گوناهیش بکات ئەوا ناتوانرێت بە بێباوەڕ ناوزەندبکرێت مادام ئیسلام بووە و دوو گەواهییەکەشی (أشهد أن لا اله الا الله و أشهد أن محمد رسول الله) بەسەر زاردا هاتووە، بۆیە سزا و پاداشتدانەوەی تەنها بۆ یەزدان هەڵدەگیرێت، شتێکی سروشتی بوو بیروباوەڕێکی لەوجۆرە پاڵ بە هەڵگرانیەوە بنێت واز لە ئەرکەکانی نوێژ و زەکاتدان و رۆژووگرتن بێنن کەوا ئایینی پیرۆزی ئیسلام پێویستیکردووە لەسەر موسوڵمانان.

**لەگرنگترین بیروڕاکانی پەیڕەوانی مورجیئە**

**پێشەوایەتی:** ئەمانە پێیانوابوو کە لەسەر موسوڵمانان پێویستە پەیڕەوی لە پێشەوا و خەلیفەکانی سەردەم بکەن کە مەبەستی ئەوان لە پەیڕەو و ملکەچکردن بووە بۆ سیستەمی خیلافەتی ئومەوی، بەوپێیەی درێژەپێدەری دەوڵەتی خیلافەتی راشدی بوون. دوای نیو سەدەش لە دەرکەوتنیان هەندێك لە پەیڕەوانیان پێیانوابوو کە دەکرێت خیلافەت لە هۆزی قورەیش دەربچێت بەمەرجێك پەیڕەوی لە قورئان و سوننەت بکات.

**تاوانی گەورە:** ئەمان پێیانوابوو ئەوانەی تاوانی گەورە ئەنجامدەدەن بێباوەڕ نین، بەڵکو بۆ مرۆڤ و موسوڵمانان نییە بڕیار لەسەر بێباوەڕبوونیان بدات،، بەڵکو خودای گەورە خۆی لە رۆژی دواییدا بڕیار لەسەر پاداشت و سزا دەدات. دیارە مەبەستی ئەمان لە باوەڕ ئەوەبووە کە پاکانە بۆ خەلیفەکانی ئومەوی بەتایبەت موعاویە بهێننەوە کە زەوتکەری سیستەمی خیلافەت نەبووە و نەبوون، بەڵکو ئەو کار و رووداوانە ویستی خودایان لەسەربووە و هەر خوداش خۆی لە رۆژی دواییدا بڕیار لەسەر ئایینەیان دەدات.

**دادوەری:** ئەمانە پێیانوابووە کە پەروەردگار دادوەرە و لە هەموو کەس بەخشندەترە، بۆیە خودا لە رۆژی دواییدا بە دادوەری و بەخشندەیی مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، نەوەك بە سزادانی بێلێپرسینەوە و لەخۆڕا.
خۆپارێزی: ئەم کۆمەڵە باوەڕیان بە خۆپارێزی هەبوو واتە باوەڕیانوابوو کە هەر موسوڵمانێك دەبێت لەکاتی نائاسایی و دەسەڵاتدارێتی فەرمانڕەوایی زۆردار یان مەسیحی و یان جو و یان بێباوەڕ خۆڕاگربێت و خۆی نەدات بەدەستیانەوە، بەڵکو ملکەچی داوا و فەرمانەکانی ئەوان بێت تا بارودۆخی موسوڵمانان ئاسایی دەبێتەوە و ئەو ستەمەیان لەسەر لادەچێت، ئەوکاتە دەتوانن باوەڕی خۆیان ئاشکرابکەن و خەباتی بۆبکەن.

**گەڕانەوە:** ئەمان باوەڕیان بەگەڕانەوە هەبووە، واتە پێیانوابووە کە موسوڵمانە پاك و خواناسەکان لە رۆژی دواییدا هەمان پایەی دنیایان دەبێت و جارێکیتر پێدەگەنەوە.

**قەزا و قەدەر:** ئەمانە باوەڕیان بە قەزا و قەدەر هەبوو، واتە پێیانوابووە هەموو رووداو و بڕیار و چارەنووسەکانی مرۆڤ رەزامەندی و ویستی خودایی لەسەرە، هەروەها لە رۆژی دواییدا پەروەردگار بەگەورەیی و بەخشندەیی خۆی پاداشت و سزای بەندەکانی دەدات.
پەیمان و بەڵێنەکان: ئەمانە پێیانوابووە کە پەیمانەکانی پەروەردگار راستن و مرۆڤ بەری چاکە و خراپەکانی وەردەگرێت، واتە بە چاکەکانی بەبەهەشت دەگات و بە خراپەکانی دەچێتە دۆزەخەوە.

**دانانی قورئان:** ئەم کۆمەڵە پێیانوابووە کە قورئان کۆن و ئەزەلی نییە، بەڵکو لە سەردەمی (٢٣) ساڵی پێغەمبەرایەتیدا پەروەردگار دایناوە و بووەتە سەرچاوەی یەکەم و بنەڕەتی موسوڵمانان و ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

**هەڵەکانی مورجیئە لە تێگەیشنی باوەڕدا**

ئەو سێ دەستەیەی مورجیئە کە دەڵێن باوەڕ تەنها لەدڵدایە، پاشان کاروکردەوەی دڵ باوەڕ دروستدەکات، ئەوەش بە رای زۆری مورجیئە هەروەکو (أبو الحسن الأشعري) لە پەرتوکەکەیدا باسیدەکات، هەروەها لەوتەکانیاندا ئەوەشیان خستووەتەڕوو کە کاروکردەوەکانیش باوەڕ دروستناکەن وەکو (جەهم)و شوێنکەوتووەکانی وەکو (صالحی)و ئەوەی ئەوەشیان خستووەتەڕوو زۆربەی هاوەڵەکانی بوون، لە وتەی دووەمدا دەڵێت: باوەڕ تەنها وتنە بە زمان کە ئەوەش هیچ کەسێك نایزانێ و بۆیڕووننابێتەوە. سێیەمیان پەسەندکردنیەتی بە دڵ و وتنیەتی بە زمان کە ئەوەش روونە لای ئەهلی زانایان و شوێنەکەوتوانیان. ئەوانەش لەمبارەیەوە کەوتوونەتە هەڵەوە:

**یەکەمیان:** گومانیانوابوو کە ئەو باوەڕەی کە خوا پێویستیکردووە لەسەر بەندەکانی وەکو یەکە بۆ هەموو بەندەکانی و ئەو باوەڕەی کە پێویستکراوە لەسەر کەسێك بەهەمانشێوەش پێویستکراوە لەسەر هەموو کەسەکان. کارەکە بەمشێوەیە نییە، خوای گەورە باوەڕی پێویستنەدەکرد لەسەر شوێنکەوتووە لەپێشینەکانی پێغەمبەران، ئەگەر پێویستی نەکردبایە لەسەر ئوممەتی محمد پێغەمبەرمان (د.خ) ئەگەر پێویستی نەکردبایە لەسەر کەسانیتر، واتا ئەو باوەڕەی کە پێویستبوو لەسەر بەندەکانی خوای گەورە پێش دابەزینی هەموو قورئان وەکو ئەو باوەڕە نەبوو کە پێویستبوو لەسەر بەندەکانی خوای گەورە دوای دابەزینی قورئان، ئەو باوەڕەی کە پێویستبوو کە هەموو کەس بیزانێت و پێغەمبەر (د.خ) پێیگەیاندین جیاوازبوو، وەکو ئەو باوەڕە نەبوو کە پێشتر پێماندرابوو، ئەوەش کە پێویستە لەو باوەڕەی کە هەمانە بریتییەلە پەسەندکردنی وتەکانی پێغەمبەر (د.خ)، بەڵام هەرکەسێك وتەکانی پێغەمبەر (د.خ) بە راست بزانێ و پەسەندیبکات دوای ئەو کەسە مرد باوەڕی بەپێویستبوون نەبووە تەنها پەسەندکردنی قسەکانی نەبێت، بەڵام ئەگەر قورئان و فەرموودەکانی راگەیاندنی جیایان هەبوایە لەبارەی باوەڕەوە پێویستە بە جیاوازیش پەسەندبکرێت.

ئەوەی پێویستە لەسەر باوەڕێکی دامەزراوی بە مردنی پێش ئەوەی کەشێکیتر رابگەیەنێت، هەروەها ئەگەر قەدەر وایکرد ئەو کەسە ژیا ئەوا لەسەر هیچ یەکێك بەگشتی پێویستنابێت کە هەموو ئەو شتانە بزانێ کە پێغەمبەر (د.خ) فەرمانیپێکردووە و نەهیلێکردووە و هەواڵیپێداوە، بەڵکو تەنها پێویستە لەسەری کە ئەوەندە بزانێ چی حەڵاڵە لەسەری و چی حەرامە لەسەری، ئەگەر کەسێك ماڵی نەبوو پێویستناکات کە فەرمانە جۆراوجۆرەکان و کارە جیاوازەکانی زەکاتدان بزانێ، ئەگەر توانای حەجی نەبوو پێویستناکات لەسەری بزانێ و فەرمانە جۆراوجۆرەکانی تایبەت بە بەجێهێنانی حەج بزانێ، ئەوەی ژن نەهێنێ هیچی لەسەر نییە کە بزانێ چی پێویستە بۆ ژنهێنانی بەمەش باوەڕ پەیوەستدەبێت بە پەسەندکردنی و بە کاروکردەوە لەسەر کەسەکان و پێویستنابێت لەسەر کەسانیتر. بەمشێوەیە وەڵام بۆ وتەکانی مورجیئەکان دەردەکەوێت کە ئەوان باسی باوەڕیان کردووە پێش کاروکردەوە و ئیبن تەیمییە دەڵێت: ئەوەی وتووتانە وانییە، چونکە ئەوان وتەیان کردووە بە باوەڕ پێش پێویستبوونی ئەم کاروکردەوانە، ئیبن تەیمییە دەڵێت: پێویستە کاروکردەوە ئەنجامبدرێت ئەگەر باوەڕیشی لەگەڵ نەبێت. ئەگەر ئەوان باوەڕداربن ئەوە خوای گەورە باوەڕی پێویستکردووە پێش ئەوەی ئەوان قسەی لەبارەوە بکەن، کاتێ کە قورئان

هاتەخوارەوە ئەگەر بڕیارنەدەن بە پێویستبوونی ئەوە باوەڕدارنین، بۆیە خوای گـــەورە لە سورەتی (آل عمران) ئایەتی (٩٧) دەفەرمویێت: (خوا لەسەر خەڵکی پێویستکردووە سەردانی ماڵی خوا بکەن هەرکەسێك توانای هەبێت، هەرکەسێك توانای هەبێت و نەچێت ئەوە بەڕاستی خوای گەورە بێنیازە لەهەموو جیهانیان). لەبەرئەوە باسکردنی حەج زۆرتر لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا باسنەکراوە و زۆرترین باس تێیدا دەربارەی باوەڕ و ئیسلامە وەکو فەرمودەی (وفد عبدالقیس)و باسکردنی حەج هاتووە لە فەرمودەی (ابن عمر و جبریل). لەبەرئەوەش چونکە حەج کۆتا شت بوو کە خوای گەورە پێویستیکرد و لە پێنج ئەرکانەکانە پێش پێویستبوونی لە بازنەی ئیمان و ئیسلامدا نەبووە، بەڵام کاتێك کە پێویستبوو پێغەمبەر (د.خ) خستیەپاڵ ئیمانەوە ئەگەر بەتەنیاش بکرێت خستیەپاڵ ئیسلامەوە، هەروەها لەوتەکانیدا هاتووە، هەرکەسێك باوەڕیهێنا و مرد پێش پێویستبوونی کاروکردەوەکان ئەوە ئەو کەسەیە بە باوەڕداری مردووە. ئەوە راستە چونکە ئەو کەسە بەباوەڕەوە هاتووە و پێویستکراوە لەسەری، بەڵام کاروکردەوەکانی لەدوای ئەوە لەسەری پێویستنەکراوە، لێرەدا پێویستە ئەوە بزانرێت کە ئەو گومانەی لابردووە کە خرابوونەسەر ئەم دوو کۆمەڵەیە. ئەگەر بگوترێت کاروکردەوەکان پێویستن لەسەر باوەڕدار ئەوا باوەڕ جۆراوجۆر دەبێت و تەنها یەك شت نییە بۆ هەموو خەڵك. ئەهلی سونە و فەرمودەکان دەڵێن: هەموو کاروکردەوە باشەکان پێویستدەکرێت و بەباشی پەسەنددەکرێن لەئیماندا، واتە لەباوەڕیکدا بەتەواوی پەسەنددەکرێت، نەك تەنها لە باوەڕێکی پێویستکراودا بەڵکو جیاوازیدەکرێت لەنێوان باوەڕێك کە پێویستە و لەنێوان باوەڕێکی تەواودا هەروەکو زانایان دەڵێن: شوشتن دابەشدەبێت بۆ بەشبەش و بۆ تەواوەتی. بەشبەش واتە تەنها ئەوانەی کە پێویستن، بەلام تەواوی واتە بەباشی پەسەنددەکرێت و جێبەجێدەکرێت، وشەی تەواوی هەر بەو بەشەش بەپێی هەموو کارە پێویستەکان بەتەواوی کە مەبەست پێی جێبەجێکردنی تەواوەتی و پەسەندکردنیەتی، بەڵام بە گوتەی ئەوان خوای گەروە باوەڕ و کردەوەی لێکجیاکردۆتەوە، لە چەند بابەتێکدا ئەوە راستە ئەوە لێرەدا روونده‌بێتەوە ئەگەر باوەڕ هەبوو ئەوا خوای گەورە کاروکردەوەی دەخاتەناوەوە و فەرمانپێیدەکات و نزیکدەبێتە لە کاروکردەوە وەکو باسمانکرد کە بۆچونەکان بۆ ئەم بابەتە زۆرن، ئەوەش لەبەرئەوەیە چونکە لەبنچینەدا باوەڕ ئەو شتەیە کە لەدڵدا هەیە و کاروکردەوەکان دیار و پێویستن بۆئەوە، باوەڕی پێویستکرا و لەدڵدا دروستنابێت ئەگەر کاروکردەوەی لەگەڵدا نەبێت، بەڵکو هەرکاتێك کاروکردەوە دیارەکان بەرەو لاوازی چوون ئەوە باوەڕیش لەدڵدا لاوازدەبێت، بۆیە باوەڕ دەبێتە پێویستکراو و پێویستکەر ئەگەر بنچینەکەی لەدڵدا بێت.. بۆیە باوەڕ تەنها بە باوەڕی دڵ پەیوەستنییە، بەڵکو دەبێت کاروکردەوەی باشی لەگەڵدابێت، یەکەمجار سۆز دەچێتەسەر ئەو کەسەی کە سۆزی بەرامبەر دەکرێت یەکەمجار، پاشان بە ناوێکی تایبەتەوە باسدەکرێت بۆئەوەی گومانەبات کە یەکەمجار ناچێتە ناوییەوە، گوتیان ئەوەی سۆزی تایبەتی دەربڕیوە بۆ هەموو کەسێکە بەگشتی وەکو فەرمودەی خوای گەورە لە ئایەتی (٩٨) سورەتی بەقەرە و ئایەتی (٧) سورەتی ئەحزاب و ئایەتی (١٢) سورەتی محەمەد و ئایەتی (٢٣٨) سورەتی بەقەرە و ئایەتی (٥) سورەتی ئەلبەیینە. ئەوا هەمووی مەبەستی پێی پەرستنی یەك خودایە و بەتەنیا و هیچیتر کە فەرمانیکردووە بە ئەنجامدانی نوێژ و زەکات بۆئەوەی بزانرێت کە ئەمانە دوو پێویستن ئەنجامبدرێت بە پەرستیشی رەها و پوختەکرا و دانانرێت بەبێ ئەم دووپایانە.

هەروەها یەکەمجار باوەڕ باسدەکات، چونکە یەکەم بنچینەیە کە پێویستە هەبێت پاشان باسی کاروکردەوەی باش دەکات کە ئەوەش بە تەواوکاری دین دانراوە، بۆئەوەی گومان بەو گوماننەبات کە بەتەنها باوەڕ پێویستە ئەگەر کاروکردەوەی چاکی لەگەڵدا نەبێت، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت (ئەم کتێبە کە قورئانە هیچ گومانێکی تێدانییە بە رێنوێنی و رێنیشاندەرە بۆ پارێزگاران و لە خواترسان، جا ئەوانەی بە پەنهانی باوەڕیانهێناوە و نوێژەکانیان ئەنجامدەدەن و لەم رزق و رۆزییەش دەبەخشن کە پێمانداون، ئەوانەی باوەڕیانهێناوە بەو شتەی (ئەی محەممەد) کە بۆ تۆ نێردراوە و ئەوەش کە بۆ پێش خۆت نێردراوە، باوەڕیان هەیە بە رۆژی دوایی، ئەوانە باوەڕێکی راستەقینە و دڵنیاییکەرەوەیان هەیە، ئەوانە لەلایەن پەروەدگاریانەوە رێنوێنیکراون و سەرفرازدەبن (البقرە) ئایەتی (١ – ٥)، دەڵێ هەموو ئەوانە لە ئەهلی کتاب بوون (جوولەکە و مەسیحی) کە باوەڕیانهێنا بەوەی کە بۆسەر تۆ دابەزیبوو و ئەوەی بۆ پێش تۆ دابەزیبوو، هەروەها لە سورەتی (البقرە)دا کە سورەتێکی پایەبەرزە لەقورئاندا یەکەم سورەت بوو کە لەمەدینەدا دابەزی و خوای گەورە بە چوار ئایەت دەستپێکردووە کە باسی رەوشتی بڕوادارانی دەکات، دوو ئایەتیش باسی رەوشتی بێبڕوایان دەکات و دوو ئایەت باسی رەوشتی دووڕووەکان دەکات کە ئەوکاتە پێغەمبەر (د.خ) کۆچیکرد بۆ مەدینە خەڵکان بوون بە سێ گروپەوە (بڕوادار، بێبڕوا یان دووڕوو) بەپێچەوانەی ئەو کاتەی کە لە مەککە بوو کە ئەوکات دووڕوو نەبوون، لەبەرئەوە (ئەحمەدی کوری حەنبەل و ئەوانیتر) دەڵێن: کۆچبەرەکان دووڕوو نەبوون، بەڵکو ئەم دیاردەیە لە تیرە و هۆزە پشتیوانەکاندا پەیدابوو، چونکە لە شاری مەککەدا بێبڕواکان دەستیان بەسەرداگرتبوو ئەوەی کۆچیکرد بڕواداربوو و تەنها کەسی بڕوادار کۆچیکرد، دەڵێن: بەڵکو کاروکردەوەکان لەبنچینەدا لە باوەڕەوە نین، بەڵکو بنچینەی باوەڕ ئەوەیە کە لەدڵدایە، چونکە دڵ پێویستی بە باوەڕە، هەروەها قسەی پێغەمبەر (د. خ) دەخەنەڕوو بەوەی کە ئەو باوەڕەی لەدڵدایە بێ کاروکردەوە پێویستە، بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەر (د. خ) باسیکردووە تایبەتە و دڵنیایی لەسەرکراوەتەوە بۆئەوەی بزانرێت کە پەیمانی پاداشتیان پێدراوە کە لە رۆژی دواییدا کە بە هەشتە بەبێ ئەشکەنجە بۆ هیچ کەسێك نییە تەنها بۆئەوانە نەبێت کە باوەڕیاننەهێناوە و کاروکردەوەی باشیان ئەنجامنەداوە. بۆ کەسێك نییە کە پڕوپاگەندەی باوەڕدەکات، بەڵام کارپێناکات، هەروەها خوای گەورە لەئایەتێکدا روونیدەکاتەوە کە بەڕاست زانین و پەسەندکردنی وتەکانی باوەڕ کە پێویستە هەڵبستێ بەئەنجامدانی پێوستەکان (واجیبەکان) ئەمەش بەڵگەیە لەسەر رەتکردنەوەی باوەڕ بەبێ کردەوە، جەهمیەکان پرسیاریانکرد لە (ئەبو لحەسەن) لە پەرتوکی (الموجز) کە باسیدەکات و دەڵێت: قورئان باوەڕ رەتدەکاتەوە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت (بەڕاستی باوەڕداران ئەو کەسانەن کە یادی خوا دەکەنەوە و دڵەکانیان پێڕوون و گەشدەبێتەوە).. نەیفەرمووە کە ئەوکارانە لە باوەڕەوەن، گوتیان ئێمەش دەڵێین: هەرکەسێك کاروکردەوەی چاك ئەنجامەنەدات باوەڕدارنییە، چونکە رەتکردنەوەی کاروکردەوە واتای نەبوونی زانست و زانیارییە لەدڵیدا. ئیبن تەیمیە لە کتێبی (الایمان)دا وەڵامی ئەم دەستە و گروپە بەمجۆرە دەداتەوە: یەکەمیان/ ئێوە سەلمانتان کە کاروکردەوە پێویستە بۆ باوەڕی دڵ، ئەگەر رەتبکرێتەوە هیچ باوەڕی لەدڵدا نامێنێت، ئەوە وتەیەکی رەوایە، لەدوای دروستبوونی پێویستە یان دەبێتە قەیرانێك یان بەشێك لە قەیرانی وشەیی.

**دووەمیان:** بەڕاستی دەقەکان ئەوەیان خستووەتەڕوو کە باوەڕ پشك و بەشێکە وەکو دەفەرموێت: (باوەڕ شەست و چەند بەشێکە و یا حەفتا و چەند بەشێکە).

**سێیەمیان:** ئەگەر ئێوە گوتووتانە هەرکەسێك ئەو یاسا و کارانە رەتبکاتەوە ئەوا بێباوەڕ و خاڵییە لەهەموو جۆرە باوەڕێك، بەڵام وتەکانتان وتەی (خەواریجەکان) ئێوە لایەکن و خەواریجەکان لایەکیترن چۆن بڕواتانپێدەکرێت و لەم فەرمانانەش کە نوێژ و زەکات و رۆژ و تێکۆشان کە خوا و پێغەمبەرەکەی (د. خ) پێویستیانکردوون لەسەر موسوڵمانان بە وازلێهێنانیان کەس پێیبێبڕوانابێت، ئەگەر بێباوەڕیانبکەن ئەوە وتەی خەواریجەکانە.

**چوارەمیان:** گوتووتانە کە رەتکردنەوەی هەندێك لەم کاروکردەوانە لەسەر مرۆڤ پێویستدەبێت ئەگەر دڵی مرۆڤ هیچ شتێکی پەسەندنەکردبێت بەوەی بڵێی خوا حەقە و راستە وتەیەکە کە دەزانرێت کە خراپییەکەی چۆنە و ئەمجۆرە وتانە بۆ شێواندنە.

**پێنجەمیان:** ئەگەر ئەوە لەهەموو پێویستییەکاندا چەسپێنرا ئەو کێشە واتاییە بەرزدەبێتەوە.

**رووی دووەم:** یەکێك لەو هەڵانەی مورجیئە تێیکەوتوون ئەوەیە کە گومانیانبردووە کە ئەو شتەی لەناو دڵدا هەیە کە باوەرە هیچ نییە تەنها پەسەنکردن (تصدیق) نەبێت بەبێ کاروکردەوەی دڵ، هەروەکو چۆن لەلایەن جەهمییە و مورجیئەوە خراوەتەڕوو.

**سێیەم:** گومانیانبردووە کە ئەو باوەڕەی لەدڵدایە تەواوە و بەبێ ئەنجامدانی هیچ شتێك لە کاروکردەوەکان، هەر لەبەرئەوەشە کاروکردەوەکان دەبن بە بەرهەمی باوەڕ واتە هۆکارێك دەبێت هەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەو شتەی کە دەیەوێت و نەیانکردووە بە شتێکی پێویست بۆی، هەروەها باوەڕی دڵ تەواوە و پێویستی بە کاروکردەوەی دیارە بەپێی بۆچوونی ئەوان، بەڵام شتێك نییە کە هەبێت و قەدەغەی ئەوەیان کردووە کە باوەڕی دل تەواوبێت بەبێ کاری دیار و روون و هەندێك باس دەهێننەئاراوە کە قەدەغەی روودانی دەکات لەبەر نەبوونی ئەو پەیوەندییەی کە لەنێوان لاشە و دڵدا هەیە بۆ نموونە دەڵێت: پیاوێك دڵی باوەڕی تێدایە هەروەك چۆن لە دڵی ئەبوبەکر و عومەردا هەیە، ئەگەر ئەو کەسە سوجدەشی بۆ خوا نەبردبێت و رۆژووی رەمەزانی نەگرتبێت و زینا لەگەل دایك و خوشکیدا بکات و مەیبخواتەوە بە رۆژی رەمەزان، دەڵێت ئەو کەسە باوەڕی تەواوە، بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە هەموو ئیمانداران سەرزەنشتی ئەوەدەکەن. (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) دەڵێت: خەڵەفی کوڕی حەییان بۆیگێڕاینەوە لەگەڵ مەعقەل کوڕی عوبەیدوڵڵا گوتی: (سالم الافطس) قسەی بۆکردین لەسەر شێوەی مورجیئەکان هەموو هاوەڵەکانمان رایانکرد بە راکردنێکی زۆر خێرا.

**دەستە و گروپەکانی مورجیئە**

گروپە سەرەکییەکانی مورجیئە دەکرێن بە سێ دەستەوە، گروپێکیان دەڵێن (دواخستن) لەباوەڕدا لەسەر مەزهەبی قەدەرییە و موعتەزیلە دامەزراوە، لەوانە ئەبی شەمەر و محەممەدی کوڕی شەبیبی بەسراییە.

گروپێکیتریان دەڵێن (دواخستن) لەباوەڕدا زۆریکردنە لە کاروکردەوە لەسەر مەزهەبی (جەهم بن سەفوان)ە.

گروپی سێیەمیان لە دەرەوەی جەبرییە و قەدەرییەن کە لەنێوانیاندا پێنج گروپ دەردەکەون لەوانە (الیونسیة، الغسانیة، الثوبانیة، التومنیة و المرسیة)، ئەوانە ناونران مورجیئە لەبەرئەوەی ئەوان کردەوەیان لە ئیمان دوادەخست.

لای شەهرستانی خاوەن کتێبی (الملل و النحل) مورجیئە دەکاتە چوار گروپەوە لەوانە:

مورجیئەی خەواریج

مورجیئەی قەدەرییە

مورجیئەی جەبرییە

مورجیئەی خالیسە.

هەروەها خەوارزمیش مورجیئە دەکاتە شەش بەشەوە:

غەیلانییە: خاوەنی غەیلان کوڕی خرشەی زەبییە

سالحییە: خاوەنی سالح کوڕی عەبدوڵڵایە

خاوەنی رەئی: خاوەنی ئەبی حەنیفە نەعمان کوڕی سابت بەزاز

شەبیبە: خاوەنی محەممەدی کوڕی شەبیبە

شەمەرییە: رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەبی شەمەر سالم کوڕی شەمەر

جەحدرییە: خاوەنی جەحدر کوڕی محەممەد تەمیمییە.

بەڵام ئەبولحەسەن ئەلئەشعەری گروپەکانی مورجیئە دەکاتە دوانزە گروپەوە لەوانە:

جەهمییە: خاوەنی جەهم کوڕی سەفوانە

سالحییە: خاوەنی ئەبو حوسەین سالحییە

شەمەرییە: خاوەنی ئەبی شەمەر یونسە

یونسییە: خاوەنی یونس سەمەرییە

سەوبانییە: خاوەنی ئەبی سەوبانە

نجارییە: خاوەنی حوسەین کوڕی محەممەد نەجارە

غەیەلانییە: خاوەنی غەیلانە

شەبیبە: خاوەنی محەممەد کوڕی شەبیبە

حەنەفییە: خاوەنی ئەبی حەنیفەیە

معازییە لتومنییە: خاوەنی ئەبی مەعاز التومنییە

مەریسییە: خاوەنی بیشر مەریسییە

کەرامییە: خاوەنی محەممەد کوڕی کەرامە.

لەکۆتایدا ئەگەر باس لە دیدوبۆچوونی هەر یەکێك لەم گروپانە بکەین چەندین وتار لە خۆدەگرێت، بۆیە لەکۆتاییدا ئەم حەدیسەی پێغەمبەرمان محەممەد (د.خ) کە دەفەرموێت: (لعنت المورجيئة على لسان سبعين نبيا) وتیان مورجیئە کێن ئەی نێردراوی خوا، فەرموی ئەوانەن کە دەڵێن: (باوەڕ وتەیە) واتە باوەڕ تەنها بڕیاردانە بەبێ کردەوە (ان اليمان هو الأقرار وحده دون غيره).

•••

**سەرچاوەکان**


١. سلیمان مەزهەر، چیرۆکی ئایینەکان، وەرگێرانی: لوقمانی حاجی قادر، چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٢. عەلی باپیر، ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی، بەرگی یەکەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر،٢٠٠٦.

٣. کەیوان ئازاد ئەنوەر، مێژووی ئایینەکان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، چاپی دووەم، سلێمانی،٢٠١٢.

٤. عبدالقاهير البغدادى، الفرق بين الفرق، الطبعة الاولى، دار ابن حزم، بيروت.

٥. محمد عمارة، الخلافة والنشاة الاحزاب السلامية، الطبعة الاولى، مؤسس العربية لدراسات والنشر، بيروت،١٩٧٧.

٧. ابى المظفر الاسفراييني، التبصير فى الدين، الطبعة الاولى، دار ابن حزم، بيروت،٢٠٠٨.

٨. سليم الياس، الموسوعة الكبرى للمزاهب والفرق و الاديان، الطبعة الاولى، مركز الشرق الاوسط الثقافي، بيروت،٢٠٠٨.

٩. الموسوعة الاديان فى العالم، الفرق السلامية.

١٠. ابن التيمية، الايمان، دار الكتاب العربى، بيروت،٢٠٠٥.

١١. ابى القاسم الاجرى، الشريعة، المجلد الاول، الطبعة الرابعة، دار الفضيلة، الرياض،٢٠١٠.

١٢. عبد عون الروضان، الموسوعة التاريخ العرب، المجلد الثانى، الطبعة الاولى، الاهلية، اردن،٢٠٠٤.

١٣. سعيد حواء، العقائد السلامية، الطبعة الرابعة، المجلد الاول، دار السلام، ٢٠٠٧.

١٤. اللواء حسن صادق، الفرق الاسلامية، الطبعة الرابعة، مكتب مدبولى، ٢٠٠٢.

١٥. رسول جعفريان، مورجيئة تاريخ وانديشة، نشر خرم،١٣٧١.

# پارادایم دەتوانێ ئێمە لە شێواوی فیکری و زانستی رزگار بکات؟

## دیدار لەگەڵ د. ئەحمەد محەممەد پوور(*)

چاوپێکەوتن: هەرێم عوسمان

**لەم دیدارەدا لەگەڵ د. ئەحمەد محەممەد پوور پسپۆڕی بواری کۆمەڵناسی و بەتایبەتیش میتۆدناسی، چەندین پرسیاری نوێ ئاوڕیلێدراوەتەوە، دەتوانم بڵێم نەك پرسیارەکان بەڵکو ئەو بابەتەی وتووێژمان لەسەریکردووە، بەتەواوی بۆ خوێنەری کورد نوێیە. لەبەرئەوە خوێنەر پێویستی بە وریاییەکی زیاتر هەیە لەخوێندنەوەیدا. ئەو بوارەش پەیوەستە بە پارادایم، میتۆد و پرسی میتۆد و پارادایم لای توێژەرانی کورد کە تاچەند نووسەری کورد میتۆدیانە بیردەکاتەوە و دەنووسێت. هاوکات پرسیار لە توانای مرۆڤ بۆ تێگەیشتن و ئەو درزەی مرۆڤ لە زانین و ئیرادەیدا کە بەردەوام وادەکات، فریای شتەکان نەکەوێت. واتە سرکی مەعریفەیە لەبەرامبەر خاوی مرۆڤدا بۆ زانین یان مرۆڤ نازانێت چۆن شتەکان بزانێت.**

**- پارادایم چییە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** پارادایم چوارچێوەیەکی فیکرییە کە کۆمەڵێك پرسیار سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ، راستی، راستەقینە، جیهان، بەها، مەبەست لە توێژینەوە و ئاکار دەپرسێت. ئەم پرسیارانە لە سێ دەستەی پرسیارە بوونناسیەکان، پرسیارە مەعریفەناسییەکان و پرسیارە میتۆدناسیەکاندا پۆلێن‌بەندی دەکات. هەروەها وڵامەکانی ئەم پرسیارانەش بەشێوەیەکی یەکگرتوو و لۆژیکی دەداتەوە. دەبێت ئاماژە بەوەشبکەین کە شەش پارادایمی سەرەکی لە زانستە مرۆییەکاندا هەن کە بریتینلە پۆزیتیڤیزم، تەفسیری/ پێکهێنانخوازی، رەخنەیی، فێمینیزم، پاشمۆدێرنیزم و پراگماتیزم.. هەرکام لەم پارادایمانە کۆمەڵێك ژێرپارادایم یان تیۆری و روانگە لەخۆدەگرن، بۆنموونە پارادایمی تەفسیری/ پێکهێنانخوازی روانگەکانی ئێگزیستانسیالیزم، تەفسیرخوازی، هێرمێنۆتیك، دیاردەناسی، زماناسی، میتۆدناسی خەڵکی، کارلێکخوازی سیمبۆلیکی و چەند رەهەندێکی فکریدیکە لەخۆدەگرێت. پارادایمەکانیدیکەش هەر بەمشێوەیەن.

*) پسپۆڕ لە بواری کۆمەڵناسی.

**– پارادایم دەتوانێت چیبکات؟ چۆن هەبوونی پارادایم لەنەبوونی جیابکەینەوە؟ ئایا پارادایم تەنیا پرسیارکەرە یان رێگەیەکیشە بۆ وەڵامدانەوەیە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** پارادایم دەتوانێ ئێمە لە شێواویی فیکری و زانستی رزگاربکات. بیرۆکەکانی ئێمە رێکوپێکبکات و یارمەتیمانبدات پرۆسەی توێژینەوە یان تەنانەت بیرکردنەوە بەشێوازێکی مەنتیقی و مەبەستدار بەرێوەبچێت. لەراستیدا هەروەك چۆن ئەندازیاری بۆ دروستکردنی بینایەك پێویستە، پارادایمیش بۆ دروستکردنی بیرۆکەکانی ئیمە کلیلییە. پارادایم تەنیا پرسیار ناپرسێت، بەڵکو رێگایەکیش دیاریدەکات و پرۆسە و رەوتی گەیشتن بە زانست لەبوارێکی تایبەتدا روووندەکاتەوە. دیارە پارادایم هەموو وردەبیرۆکەکان لەخۆناگرێت و تەنیا لەسەر رەهەند و چەمکە هزرییە درشتەکانی تیۆریەکان داکۆکیدەکات، بەڵام هاوکات دەتوانێت مێشکی ئێمە بە سیستەماتیك بکات و چوارچێوەیەکی دیاریکراو و رێدۆزێکی روونمان لە بەردەم دابنێت. بەواتە پارادایم، دەتوانێت رێچار و رێناس بێت، بەرچاوڕوونیمان بداتێ، بتوانین بەباشی توێژینەوە ئەنجامبدەین، بەبێئەوەی هەڵەی مەعریفی تێدابکەین.

**– مەبەست لە روونکردنەوەی هەڵوێستی پارادایم چییە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** مەبەست ئەوەیە کە پێناسەی خۆمان بۆ جیهان، مرۆڤ، زانست، بەها یان راستی روونبکەینەوە، واتە وەڵامی بووناسانە، مەعریفەناسانە و میتۆدناسانەی ئێمە چییە. ئەگەر ئێمە لەسەر بنەمای روانگەیەکی رەخنەیی یان پاشمۆدێرن توێژنەوەدەکەین هەرکام لەم روانگەیانە وڵامی تایبەتی خۆیان هەیە و هەڵوێستێکی دیاریکراویان بەرامبەر بە دیاردەکان هەیە کە لەوانەیە زۆرجاران لەگەڵ هەڵوێستی روانگەکانیتر جیاواز یان تەنانەت دژ بەیەکبن. بۆنموونە پارادایمی رەخنەیی راستی وەکو ئۆبژەیەك پێناسە دەکات کە لەژێر کاریگەری هێز و ئایدۆلوژیدایە و توێژەر پێویستە رەنگاڵی هێز و دەسەڵات و ئایدولوژی لێسرێتەوە تا راستی ناڕاستەقینە ئاشکراکرێت، لەحاڵێکدا پاشمۆدێرنەکان راستی وەك گەمەی زمانی پێناسەدەکەن کە خاوەن هیچ شۆناسێکی راستەقینە نییە. لێرەدایە کە گرینگی هەڵوێستە پارادیمەکان دەردەکەوێت.

**– ئەو هەماهەنگییە چییە بۆ پارادایم لەنێوان زانستی سروشتی و مرۆیی کە یەکدی رەدناکەنەوە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** مەبەست ئەوەیە کە لە زانستە سروشتییەکاندا پارادایمەکان زۆرتر یەکترڕەتدەدەنەوە و ناکرێت زۆرجاران بەیەکەوەبن. بۆنموونە وەختێك پارادایمی خۆرسەنتەری جێگەی زەویسەنتەری گرتووە، خۆناکرێت هەم زەوی و هەم خۆر پێکەوە سەنتەر بن یان کەشفکرا کە بارانبارین بەهۆی خۆلێکوانی هەورەکان لە کات و شوێنی خۆیدا روودەدات نەك لەسەر بنەمای شەڕی نێوان خوایەکان یان هێزە مێتافیزیکەکان، بەڵام لە زانستە مرۆییەکاندا جۆرێکیترە. بۆنموونە پارادایمی رەخنەیی ناتوانێت پارادایمی تەفسیر رەتداتەوە ئەگەرچی دەتوانێت هەندێ خاڵ و تەوەری هزری و فیکری ئەم بگۆڕێت، بەڵام هەم پارادایمی تەفسیر و هەم رەخنەیی تاڕادەیەك راستدەکەن و دەتوانن ژیانی کۆمەڵایەتی لێکبدەنەوە. هەڵبەت ئەم یاسایە گشتی نییە چۆن لە زانستە

سروشتییەکانیشدا جاریوایە پارادایمەکان بەیەکەوە هەڵدەکەن. بۆنموونە ئەگەرچی تیۆری رێژەیی ئەنشتاین، تیۆری کوانتۆمی نیۆتونی رەتدایەوە، بەڵام ئێستایش تیۆری کوانتۆمی نیۆتۆن هەر تارادەیەك ئیشدەکات. لە زانستە مرۆییەکانیشدا جاریوایە پارادایمێکی تایبەت رەتدەبێتەوە. بۆنموونە پارادایمی رەگەزخوازانە ئێستا هیچ بایەخێکی نەماوە.

**- ئێوە دەڵێن توێژەر فەیلەسوفە.. ئەمە هەستناکەیت وەسفێکی گرانبێت یان ئەوە توێژەری زۆر دەگمەنە کە ئێوە بە فەیلەسوفی دادەنێین؟ بۆیە خراپنییە بپرسم توێژەر یان فەیلەسوف چییە، کێیە؟ پەیوەندی میتۆد و فەلسەفە لەچیدایە؟ ئایا دەکرێ میتۆد لە فەلسەفە جیابکرێتەوە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** بەڵێ وایە. مەبەستم ئەوەیە کە توێژەر نابێ روانگەیەکی ئامێری و کەرەسەیی هەبێت بەرامبەر بە توێژینەوە و فەیلەسوفیش نابێت خۆی لە چوارچێوەی بیر و هزری ئەبستراکت ببەستێتەوە. پێویستە توێژینەوە و فەلسەفاندن چاویانلەیەکتربێت. من دەزانم ئەرك و ئیشی فەیلەسوف و توێژەر جیاوازە، بەڵام بەداخەوە لە کۆمەڵگای ئێمە بەگشتی توێژینەوە بووە بە ئیشێکی ئاماری، ئاوازخواز و میکانیکی و فەلسەفەش بووەتە قسەی خۆش و شیعر و شاعیریی. توێژینەوە و فەلسەفاندن لەیەکجیانین.

**- دەکرێت بڵێن کارە پراکتیکییەکەی ئێوە لەوکتێبانەتاندا کە بە فارسی نووسیوتانە لەسەر میتۆد چیبووە؟ بەواتا ئایا ئێوە کە تارادەیەك رەخنەی ئەو نووسین و وەرگێڕانە بێبەرنامانە دەکەن. بەرنامە و مەبەستی ئێوە چیبووە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** من خۆم چەن توێژینەوەیەکی مەیدانیم لە کوردستانی رۆژهەڵات کردووە لە ناوچەی سەردەشت، بانە، مەهاباد، ئورومییە و هەورامان. لە ئەزموونی ئەم توێژینەوانە بۆ نووسینی کتێبەکانم کەڵکموەرگرتووە، بەڵام مەبەستی من شتێکیترە. کوردستانی ئێمە ئێستا لەدۆخێکدا دەژێت کە پێویستی بەهەندێ ئیشی بنەڕەتی هەیە. لە نووسین، لە وەرگێڕان، لە گەشە و ئاوەدانی، لەهەمەوو بوارێکدا. لەبواری نووسین و وەرگێڕاندا ئێوە خۆتان ئاگادارن کە ئێستا رێکخراوەیەکی فەرمی یان غەیری فەرمیمان نییە کە پرۆسەی نووسین و وەرگێڕان بخاتە ژێر چاوەدێری یان راوێژکاری. گەرچی دەیان و سەدان رۆژنامە و گۆڤارمان هەیە، بەڵام هێشتا پێداویستییەکانمان لەڕووی داهێنانی زانست و ئاوەدانی هزری و نووسین و وەرگێڕانی ئەم دەق و کتێبانەی کە لە کەشی ئاکادیمی و زانکۆییدا پێویستن دیارینەکردوون. هەرکەس لەبەرخۆی هەرشتێك وەك تاکەکەسی حەزیلێبکا دەینووسێ یان وەریدەگێڕێت. زۆربەی ئەم بەرهەمانەش پێداویستییەکانی فیکری و زانستی کۆمەڵگای ئێمە لەبەرچاوناگرن. بەم شارەزاییەی کە خۆم بەتایبەت لە فەلسەفە و کۆمەڵناسی کوردستانی باشوورم بەدەستهێناوە، ئێستا هەست بە قەیرانێکی زۆر مەترسیدار و بەربڵاو دەکەم کە پەیتاپەیتا خەریکە ژیانی فیکری و کۆمەڵایەتی ئێمە دەخاتەژێر سێبەری تاریك و تەڵەمی خۆی.

**– "کاتێ ئێوە باوەڕتان بە ڕەسەنایەتی پێکهاتە بێت، هەستێکی تایبەتت بەرامبەر بە ڕاستی هەیە؟ چۆن دەکرێ هەست بە ڕەسەنایەتی پێکهاتە بکەین؟ مەبەستت لە پێکهاتە و ڕەسەنایەتی چییە، چۆن باوەڕی پێدەکرێ گەر تاقینەکرێتەوە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** باوەڕ بە ڕەسەنایەتی پێکهاتە واتە ئەم بیرۆکەیە کە پێیوایە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، ئۆبژەکان، مێژوو و جیهانی ژیانی کۆمەڵایەتی لەپێش دیاریکراو، و مرۆڤ هێزی گۆڕینی ئەوانی نییە. ڕەسەنایەتی پێکهاتە یەکێکە لە گریمانەکانی پارادایمی پۆزیتیڤیزم. سیاسەت و کولتوری جیهانی ئیمڕۆ بەگشتی لەسەر ئەم بنەمایە وەستاوە. لەبەرامبەردا، ڕوانگەی ڕەسەنایەتی مرۆڤ بەپێچەوانە باوەڕی بە توانایی گوڕانکاری و چالاکبوونی مرۆڤ هەیە و پێیوایە مێژوو چارەنووسی نییە و بە دەستی خەڵك دروستدەکرێت و دەگۆڕدرێت. هەروەك دەزانی ئێستا شەڕی نێوان ئەم دوو ڕوانگەیە هەم لە پانتایی بیری فەلسەفی و هەم لە سیاسەت و کولتوری جیهانی ئەمڕۆ دەبینرێت و تاقیدەکرێتەوە.

**– کەمتوانایی مرۆڤە کە ناتوانێت دەستی بە مەعریفە بگات یان مەعریفە خۆی سرکە و مرۆڤ خاوە.. واتە مەعریفە خێرایە و مرۆڤ فریایناکەوێت؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** کەمتوانایی مرۆڤە کە ناتوانێت بە مەعریفە بگات. جا ئەگەر بیتوانیبایە بە مەعریفەی دروست و ڕاستەقینە بگات هەزاران ساڵ بوو کێشەکانی چارەسەرکرابوون، مرۆڤ لەڕووی بیر و هزر بەوتواناییەوە سنوورێکی هەیە ناتوانێت لێیتێپەڕێت. ئێستا کێشە ئەوەیە کە مەعریفەی مرۆڤ بە ئۆبژە بچووکەکانیش پڕلەهەڵەیە چ بگات بە ئۆبژە گەورەکان و پرسیارە بنەرەتییەکان.

**– کێشەی مرۆڤ کێشەی تێگەیشتنە یان کێشەی نەزانینی شێوازی تێگەیشتنە.. ئێمە نازانین چۆن بزانین یان ناتوانین بەتەواوی بزانین؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** هەردووکیانە.. هەم سنوورێکی دیاریکراوی هەیە بۆ تێگەیشتن و هەم هەڵەی ئێجگار زۆری هەیە لە هەڵبژاردن و بەکارهێنانی شێواز و ئامێرەکانی گەیشتن بە تێگەیشتن و زانست. بەڕاستی مرۆڤ بوونەوەرێکی سەرلێشێواوە و نە چاك دەزانێت کە چۆن بزانێت و نە دەتوانێت بەتەواوی بزانێت. کێشەی زانست و توانایی زانست بەردەوام مرۆڤ بە هەڵە دەبات، بەڵام هەر ئەم دوو کێشەیەشە کە مرۆڤ بەرەو زانست و لێکۆڵینەوە دەجوولێنێت یارمەتیدەدات.

**– ئایا مرۆڤ بۆ ناتوانێت لە ئەزموونەکانی خۆی تێبگات.. واتە ئێمە کارێکدەکەین، بەڵام نازانین بۆئەوە دەکەین؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** وڵامی ئەم پرسیارە پێویستی بە باس و توێژینەوەیەکی دوورودرێژ هەیە، بەڵام بەکورتی هۆی تێنەگەیشتنی ئێمە لە ئەزموونەکانمان دەگەڕێتەوەسەر زۆرشت وەکو سنوورداربوونی توانایی ئۆنتیکی مرۆڤ، ماهییەتی کاتیی و مێژووییبوون، کێشەی کات و شوێن، ژیانی روو لەمردنی ئێمە، دۆخ و مەرجی سیاسەت و کولتور و دەیان هۆکاریدیکە.

**– نەگەیشتن بە دڵنیایی چ دۆخێکی بۆ مرۆڤ سازکردووە؟ ئایا ئێوە کە هۆشیارن بەمەی کە بەردەوام لە گەڕاندان و بەردەوامیش هەستدەکەن شتێك هەیە نەتاندۆزیوەتەوە.. ئەمە بێئومێدیە یان پێویستی بەردوامی ژیانە؟ چی وا لە مرۆڤ دەکات بەردەوامبێت، ماندوونەبی؟ ئایا ئەمە قەدەری مرۆڤە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** نەگەیشتن بە دڵنیایی هاوکات هەم بووەتە هۆی سەرلێشێواوی مرۆڤ و قەیرانی مەعریفە و هەم هۆکاری جووڵانەوە و هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە زانستی دڵنیا. ئەگەر بە روانگەی ژاك لاکان لێبکۆڵینەوە مرۆڤ پێویستە و ناچارە دڵنیانەبێت، گەیشتن بە دڵنیایی هاوکاتە و بەرامبەرە لەگەڵ کۆتاییهاتن بە سروشتی ئۆنتیك و بووناسانەی مرۆڤ. تێنەگەیشتن و نەگەیشتن بە ئاستی دڵنیایی هەم هۆکاری ژیانە و هەم سنوور و مەرجی ژیان. هەڵبەت پێویستە ئاماژەبکەین کە مرۆڤ بەردەوام لەسەر هێڵی دڵنیایی و نادڵنیایی لەجووڵانەوەدایە و لەهەر بابەت و ئۆبژێك ئاڕادەیەك تێدەگات و تێناگات. مەعریفە و هزری مرۆڤ پڕە لە بۆشایی و کەلێن. بەردەوامدەبێت پڕیانبکاتەوە. بە پڕبوونەوەی هەر بۆشاییەك بۆشایەکیتر خۆی دەردەخات. ئەم دۆخە قەدەری مرۆڤ نییە، بەڵکو مەرج و سنووری ژیانە، گەرچی لەوانەیە بە روانگەیەك ئایینی پێبڵێن قەدەر یان بە روانگەیەك زانستی پێیبڵێن ویستی زانست یان بە روانگەیەکی دژەئایینی و نیهێلیستی ناویبنێن چارەنووسێکی پووچ.

**– " زانست سەبارەت بە بوون ماهیەتێکی پێشهاتوویی و دۆخی هەیە" – مەبەستتان لەمە چییە؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** ماهییەتی پێشهاتویی و دۆخی زۆرتر وشەیەکی رۆرتییە. واتا زانست و مەعریفە و بوونی مرۆڤ بەندە بە دۆخ و هەلومەرج و کات و شوێن. لەهەر سەردەمێکی تایبەت، مرۆڤ بەرەوڕووی هەندێ کێشە دەبێتەوە و وڵامیاندەداتەوە. وڵامەکان لەوانەیە بەپێی گۆڕانی دۆخ و بەستێنەکان کەموکورتی پەیدابکەن. هەربۆیە هەوڵدەدرێت وڵامی نوێ ئاراستەبکەین، هەروەها پرسیاری نوێیش دەخولقێنین. وڵامی ئەم پرسیارانە دیسان بۆ کات و شوێنێکیدیکە تووشی قەیران و ناسازگاری دەبن. ئەم جۆرە روانینە تایبەت بە روانگەی نوێ پراگماتیزمی رۆرتییە کە راستەقینە وەکو دیاردە کردە یان ئۆبژەیەك پێناسەدەکات کە بۆ ژیانی ئێمە لە کات و شوێنی دیاریکراودا سوودمەندە و بەکەڵکدێت. ماهییەتی پێشهاتوویی و دۆخی زانست دژ بەم روانگە پۆزیتیڤیستی و جیهانگیرانەیە کە وادەزانن زانست ئەوپەڕ کات و شوێنە.

**– پێتوایە ئەو توێژینەوانەش کە پەیوەندییان نییە بە فەلسەفەوە هەر لەسەر بنەمای فەلسەفی وەستاون؟**

**د. ئەحمەد محەممەد پوور:** ئەو توێژینەوانەی کە لە پانایی زانستە مرۆییەکاندان بەشێوەیەکی گشتی یان تایبەت پێوەندییان بە فەلسەفەوە هەیە. بۆنموونە ئەگەر توێژەرێك لەسەر دەقێکی مێژوویی ئیشدەکات پێویستە جیهانبینی و روانگە پارادایمییەکەی خۆی روونبکاتەوە یان کەسێك کە لەسەر بابەتێکی ئەدەبی توێژینەوەدەکات هەر بەمشێوەیە پێویستی بە دیاریکردنی هەڵوێستی هزری خۆی هەیە. لە زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا پێوەندیەکی ئاشکرا بە بنەما فەلسەفییەکان و هەستپێدەکرێ، بەڵام لە زانستە مرۆییەکاندا ئەم پێوەندییە لەوانەیە ناراستەوخۆبێت. ئەنجا هەڵوێستی پارادایمی و هزری تەنیا رەوتێکی فەلسەفی نییە، بەڵکۆ رەوتێکی مرۆیی هەیە. واتە چۆن ئێمە مرۆڤین بڵێی یا نەڵێی خاوەن هەڵوێستین.

**– باشە دکتۆر مەبەستان لە ژێرخانی هزری چییە؟**

**د.ئەحمەد محەممەد پوور:** ژێرخانی هزری واتە ئەم بنەمای فیکری، فەلسەفی، جیهانناسی و گەردووونناسییە کە ئێمە ژیانی تاکەکەسی یان کۆمەڵایەتی خۆمانی لەسەر بینادەکەین. هەرکام لە ئێمە خاوەنی ژێرخانێکی هزرین کە جاریوایە لەگەڵ ژێرخانە هزرییەکانی کەسانیتر هاوبەشە ئەم خاڵە هاوبەشە هزرییانەیە کە دەرفەت و هەلی ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ ئێمە دەرەخسێنێ. ژێرخانی هزری خۆی رەگوریشەی لە مێژووی نەتەوەیی، کولتور، ئەزموونی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی ئێمەدایە و لەوانەیە بەدرێژایی کات و شوێن و ئەزموون بگۆڕدرێت یان بڕووخێت یان جۆرێکیتر سەرهەڵبداتەوە.

**– باشە پێتوایە ئەو توێژینەوانەش کە پەیوەندییان نییە بە فەلسەفەوە هەر لەسەر بنەمای فەلسەفی وەستاون؟**

**د.ئەحمەد محەممەد پوور:** بێگومان ئەو توێژینەو انەشی کە لە پانتایی زانستە مرۆییەکاندان بەشێوەیەکی گشتی یان تایبەت پێوەندییان بە فەلسەفەوە هەیە" تەنانەت لە زانستە سروشتییەکانیشدا روانگەی فەلسەفی - پارادایمی هەر ئامادەیە، لە فیزیا لەئەستێرەناسیدا، لە کیمیا و زۆربەی زانستە سروشتییەکانیدیکە. ئەوانیش لەبنەڕەتەوە تیۆریکین و پەیوەندییان هەیە بە تاقیکردنەوەی گریمانەکانیان" خۆی ئەو روانگە گریمانەییە - پێوانەییە لەپاشان دەبێتە بنچینەیەك بۆ دانانی پارادایم و هەڵوێستی فەلسەفی تایبەت بەخۆی" هیچ توێژینەوەیەك نییە لەهیچ زانستێکدا کە بێنیاز بێت لە فەلسەفە" چۆن فەلسەفە چ وەك بیروڕای مرۆیی و چ وەك رێدۆز و جیهانبینی زانستی بنەمای هەر هەموجۆرە مەعریفەناسییەکە. لە زانستە مرۆییەکاندا، پلە و پێگەی فەلسەفە پتر دیارە" ئەوەش دیسان بەپێی جۆری زانستەکە جیاوازە. کۆمەڵناسی بۆوێنە رەنگ و بۆنی فەلسەفەی زۆرتر پێوەدیارە.

لەبوارە زانستییەکانیدیکەشدا ناکرێ بنەما فەلسەفییەکان لە بەرچاونەگیردرێن. بۆنموونە ئەگەر توێژەرێك لەسەر دەقێکی مێژوویی ئیشدەکات پێویستە جیهانبینی و روانگە پارادایمییەکەی خۆی روونبکاتەوە یان کەسێك کە لەسەر بابەتێکی ئەدەبی توێژینەوەدەکات هەر بەمشێوەیە پێویستی بە دیاریکردنی هەڵوێستی هزری خۆی هەیە. لە زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا پێوەندیەکی ئاشکرا بە بنەما فەلسەفییەکانە و هەستیپێدەکرێ، بەڵام لە زانستە سروشتییەکاندا ئەم پێوەندییە لەوانەیە ناراستەوخۆبێت، دەنا هەر هەیە. پاشان هەڵوێستی پارادایمی و هزری تەنیا رەوتێکی فەلسەفی نییە، بەڵکو رەوتێکی مرۆیی هەیە. واتە چۆن ئیمە مرۆڤین بڵێی یا نەڵێی خاوەن هەڵوێستین.

**- وەك کۆتا پرسیار دەکرێت باسی ئەو کێشە و قەیرانە سەرکییانە بکەن، تایبەت بە فەلسەفە لەکوروستاندا؟ واتە کێشە و گرفتەکانی فەلسەفە لەکوردستاندا چین، دەزانم پرسیارێکی گشتییە و چەندین پرسیار لەنێویدا حەشاردراوە، بەڵام بە هیوام لەکاتیتردا بتوانین بەوردی ئاوڕ لەم باسە بدەینەوە بەشێوەی سەربەخۆ.**

**د.ئەحمەد محەممەد پوور:** بەڵێ بێگومان راستە پرسیارەکە لەو چەشنەیە، بەڵام پرسیارێکی باشە، من هەوڵدەدەم هەندێك لەو گرفتانە باسبکەم. لەبەرئەوە دەبێت سەرەتا بەشەکانی کوردستان لەیەکجیابکەینەوە. بۆنموونە کوردوستانی رۆژهەڵات لە زۆربەی ئەو کێشانەی کە لە باشووردا هەن بەدوورە" واتە، کوردوستانی باشوور بارودۆخێکی ئەزموونکردووە و هیشتاش هەر ئەزموونیدەکات لە کوردوستانی رۆژهەڵاتدا بوونیان نییە. لەوانەیە باکوور و رۆژئاواش کێشە و تایبەتمەندی خۆیانیان هەبێت.

بەڵام تایبەت بە باشوور بە درێژایی سێ دەیەی رابردوودا ئەزموونی تاڵ و ناخۆشی وەکو ئەنفال و ئاوارەبوون و داڕووخانی زۆربەی ژێرخانە بۆرۆکراسییەکان و ئیدارییەکانی بەخۆیەوەبینیوە. نەوەی پێشوو هەر لە سەرقاڵی خەبات و ئاوارەیی و کێشەی سیاسیی و کۆمەڵایەتی بووە. بۆیە دابڕان و داپچکرانێکی قووڵ و بەربڵاوی لێکەوتووەتەوە و کۆمەڵگای کوردی تا پێش کوشتنی سەددام هەر نەحەساوەتەوە و بەردەوام گیرۆدەی کێشەی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی بووەتەوە. لەومەودایەدا، زۆربەی بنەما ئیداری و رێکخراوەیی و دامەزراوەییەکان رووخان یان ئەوەی کە ئەوەندە لاوازبوون کە هیچ کاردانەوەیەکی ئەوتۆیان نەبووە. بۆیە، دەبێت گەشەی زانستی فەلسەفی و گشت زانستەکان لەو بەستێن و کەشەدا ببیندرێت. دیارە بەو ئەزموونە مێژووییەی کە خەڵکی باشوور دیویەتی، ناکرێت زۆر چاوەڕوانی گەشە و پەرەسەندنی هزری بین، لانیکەم بەم خێراییە. بێگومان باشوور کاتی خۆی سەرچاوەی ئەدەب و شێعر و نووسین و بەرهەمهێنان بووە و ئێستاش ئەو دەورەی هەرهەیە، بەڵام بەربەست و لەمپەرەکانی چەند دەیەی پێشوو ئەم وڵاتەی لە خێرایی خستووە و پێشی بە زۆر شت گرتووە. ئێستاش رۆژ نییە کێشەیەکی سیاسیی یان کۆمەڵایەتیی و ئابووری سازنەکرێت یان سازنەبێت.. بۆیە زانست لە کۆمەڵگا کانی پاش شەڕ بە سەغڵەتی بەرهەمدێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ دۆخێکی نۆرماڵ. ئەوە لایەنێکی کێشەی فەلسەفەیە لەباشووردا، کە وەك بوارە زانستییەکانیدیکە تووشی هەندێ چەم و خەم بووەتەوە. لایەنێکیدیکەی قەیرانی فەلسەفە ئەوەیە کە فەلسەفە لەگەڵ

شێعر و ڕۆمان و ئەدەبیات و ئایین و ئەمجۆرە بوارانەدا تێکەڵکراوە. دیارە بێگومان فەلسەفە لەم دیاردانە جیاوازنییە، بەڵام سنووری تایبەت بە خۆشی هەیە و دەبێ بپارێزدرێت. مەبەستم ئەوەیە کە فەلسەفە ئەوجۆرەی کە شیاوە نەبووەتە زانستێکی ئاکادێمیك وەکو بوارەکانیدیکە لە زانستە مرۆییەکاندا. ئەو کەسانەی کە هەڵگری ئەرك و بەرپرسیاریەتی فەلسەفەن نەیانتوانیوە سنوورەکەی دیاریبکەن، هەر چەند کە هەوڵێکی زۆریانداوە، بەڵام هێشتا ڕێگایەکی دوور و درێژیان لەبەرە. خاڵی سێیەم ئەوەیە کە دەقی فەلسەفی چاك و بنەڕەتییمان لەبەردەستدانین، نە لەڕووی وەرگێڕان، نە لەڕووی نووسین. هەندێ دەقی فەلسەفی کۆن و نوێ وەرگێڕدراون، بەڵام بەشێوەیەکی ناهاوسەنگ و بەشێوەیەکی هەڵبژاردراو" واتە هەر وەرگێر، نووسەر یان مامۆستایەك دەقێکی تایبەتی بەشێوەی تاکەکەسی پێخۆشبووە و نووسیویەتی یان وەرگێڕانیکردووە.. بۆیە پلانێکی دیاریکراو بوونی نییە و بڕیاریش نییە کە دابندرێت بۆئەوەی کە بەپێی پێداویستییەکانی خوێندکاری فەلسەفە دەق و کتێبی فەلسەفی بەرهەمبێنێت. لەڕاستیدا، کتێبخانەی بەشی فەلسەفە لەباشووردا ئێجگار لاوازە" لە زۆر بوار و وانەدا هەرهیچ دەقێکی ئەوتۆمان نییە. لە فەلسەفەی هاوچەرخەوە بگرە تا فەلسەفەی هەنووکە. زۆربەی دەقەکان یان لەسەر فەلسەفەی کلاسیکن یان لە ١٩٦٠کان تێنەپەڕیوون" ئەوانیش کۆیانبکەینەوە لەوانەیە ١٠ دەقی بنەڕەتییان تێدانییە.ئەگەر دەقی نوێیش هەبن، ئەوا ژمارەیان ناگاتە چەند دانەیەك. گەرچی هەوڵی زۆر دراوە و کەسانێك زەحمەتی زۆریان کێشاوە تا ئەو بەشە رابگرن، بەڵام پێویستە ئەوجۆرە هەوڵانە بەشێوەی گرووپی و لەسەر بنەمای بەرنامە و پلانی داهاتووبین بەڕێوەبچن.

باشوور شوێنێکە کە دەیان ڕۆژنامە و گۆڤاری لێبڵاودەبێتەوە. زۆربەی گۆڤارەکان بەردەوام داوای وتاری هزری و فەلسەفی دەکەن" وتاری ڕەنگاوڕەنگ لە ئەفلاتوونەوە تادەگاتە ڤیریلو و ژیژەك، بەڵام ئەوە شتێکی زۆر سەیرە کە لەبری ئەو هەموو چاپەمەنی و فەلسەفەنووسینەوە، ڕەنگ و بۆنی فەلسەفەی زۆر پێوەدیارنییە" وەك ئەوەی وایە کە هەرهیچ شتێك بڵاونەکرابێتەوە و نەنووسرابێت. هۆکاری ئەم دۆخە لە تاقەتی ئەم موقابەلەیەدا نییە، بەڵام خۆی کێشەیەکی بنەڕەتییە کە بۆ لە وڵاتێکی پڕلە فەلسەفەنووسین، کەمکەس هەن کە فەلسەفی بیربکەنەوە.

ئەمن پێموایە کە قەیرانی فەلسەفە لە باشوور و لەکوردەواریدا بەگشتی لە قەیرانی هزر و عەقڵییەتی کورد پەیڕۆدەکات و دیاردەیەکی مێژوویی و کولتورییە. زۆرجاران دەگەمە ئەو رادەیەی کە بڵێم کورد جارێ وەختی فەلسەفە و هزری فەلسەفی نەهاتووە" ئەوەی کە هەیە کۆمەڵێك نووسراوە و چاپەمەنین کە بڵاوکردنەوەیان هیچ هونەرێکی تایبەتی ناوێت" بۆیە بەڕای من، فەلسەفە لەکوردەواریدا تەنیا تووشی قەیران نەبووەتەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی دڵتەزین کوژراوە یان بەکوشتچووە هەروەك چۆن زۆر بوار و چەمکیدیکەی وەك سیاسەت، عەقڵانییەت، نەتەوەخوازی و گەشەی کۆمەڵایەتی و کولتوری ئەو بەسەرهاتەیان بەخۆوەدیوە.

•••

# نووسەر

**هەرگیز کاری ئەوانە نییە پێتبڵێن چۆن فێرببیت و بنووسیت، بەڵام دەبێت وایانپیشانبدەیت بەوشێوەیە لەدایکبوویت.**
**ئەرنست هەمینگوای**

**نووسینی: مەجید عەزیز**

لەم چەند دێڕەی خوارەدا، بەخێرایی دەمەوێت ئاماژە بە نووسەر و هەروەها نووسینیش بکەم چەند بتوانم و چەند پێمبکرێت.

لێرەدا ئەگەر وەکو خۆم سەبارەت بەم بابەتە بنووسم، ئەوا پێموایە: نووسەر و نووسینیش هەردووکیان وەکو پرۆژە وان و هەمیشە لەناو کاریگەری و کارکردن و پیاداچوونەوە و گۆڕانکارییەکاندا خۆیان دەبیننەوە. پێموایە، نووسەر ئەوکەسە نییە وەکو حوکمێکی هەتاهەتایی خۆی بەسەر نووسینەکانەوە ببینێت، نووسینیشە بێجگەلەوەی هەڵگری چەندین و مانا و توێغی جیاوازی هەیە، لەگەڵ کات و سەردەمە جیاوازەکاندا هەمیشە خوێندنەوەی جیاوازمان بۆدروستدەکات.

بۆنموونە، کاتێك بابەتێ، وتارێك یان کتێبێك دەنووسێت، لەدوای ماوەیەکی زۆر کە ئەو نووسەرە زیاتر لەناو خۆقاڵکردن و کاریگەری و گۆڕانەکاندا خۆی دەبینێتەوە، ئەوکاتە ئەگەر هەمان بەرهەمی خۆی تەماشابکات، ببینێت و بخوێنێتەوە، هەندێکجار وەکو خۆی بەخاوەنی نەزانێت. دیارە ئەمە نەوەك لەبەرئەوەی، پێیشەرمبێت یان پێیناخۆشبێت یان دەیەوێت، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو بەرهەمانەی دەیاننووسێت لەوکاتەی نووسیونی لەژێر کاریگەری فیکری و هەستی و فەلسەفی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو وەختەدا بووە، کاتێکیش ئەو هەلومەرجانە تێدەپەڕێنێت و خۆی لەناو حاڵەتە جیاوازەکان و دواییش لەناو جۆرە هەلومەرجێکی رۆشنبیریتردا دەبینێتەوە، ئارەزوویەکیتری هەیە کە هەستدەکات خاوەنی ئەو بەرهەمانە نییە بەجۆرێك لەجۆرەکان. دواییش راستییەکی زۆر لەمەدا هەیە، چونکە کاتێك لەدەرفەتێکدا شتێك دەنووسین، بەڵام لەدەرفەتێکیتردا زۆر بەجیاوازی لەهەمان نووسین دەڕوانین و وەکو بە موڵکی خۆمانی نەزانین وایە. ئەگەر ئەو نووسەرەی ئەو نووسینەی نووسیبێت، لەوکاتەدا وەکو مردوویەك ئاماژەی بۆبکرێت مانای خۆی هەیە، چونکە لەکاتێکیتردا هەمان نووسەر تەماشای هەمان بابەتی خۆی ناکات وەکو چۆن لە چرکەساتی یەکەمدا بەرهەمیهێناوە.

بەلای منەوە، نووسەر کاتێك لەناو دونیای نووسیندا خۆی دەبینێتەوە، دیارە بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان بێت ئارەزوویەك هەیە لە پاڵپێوەنانی خودێتی خۆی، ئەویش مانیفێستکردنەکەیەتی لەناو تەعبیرکردن لەخۆیو یان

ئەوبابەتەی دەیەوێت لەسەری بنووسێت، بەڵام هەم نووسەرەکە و هەم نووسینەکەشی هەرگیز لە خودی زمانەکە گەورەترنین، بەڵکو لەناو ئەو زمان و کەلتوورەدان.

دیارە کاتێك باسی نووسەر دەکەین، دیارە کتێبمان بیردەکەوێتەوە، واتە نووسەری ئەو کتێبەی بەچاپیدەگەیەنێت، بەڵام نووسەر دەتوانێت لە گۆڤار و مەگەزینەکانیشدا بەرهەمەکانی خۆی بڵاوبکاتەوە. کەواتە دەڵێین نووسەر، دیارە لەبەرئەوەی دەنووسێت، کاری نووسینیشی دەیکات بە نووسەر. لێرەدا مەرج نییە، هەموو نووسەرێك وەکو یەکبێت، واتە هەندێك هەن بژێوی خۆیان لەسەر نووسین پەیدادەکەن، بەڵام هەندێکیتر هەن بەوشێوەیە نین. دیارە نووسین ئارەزووی قووڵی نووسەرەکەیەتی لەناو کەناڵەکانی زمان و کەلتور و رۆشنبیریدا.

پرسیاری سادەش لە خۆمانی بکەین، دیارە ئەوەیە، ئایا نووسەرەکان چۆن و چی دەنووسن؟ ئایا ئەوەی دەینووسن بەهەمووو شێوەیەك بەرهەمی ناو مێشك و هەستی خۆیانە بەتەنیا؟ واتە ئەو بەرهەمانەی بەرهەمیدێنن سەربەخۆیە لە کاریگەرییەکان و خوێندنەوە و رامانەکانی ناو مێژووی ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستیدایە تیاندایە، وەکو کتێب، گۆڤارە چاپکراوەکان؟ نەخێر.

بەدوای ئەو پرسیارانەدا، گرنگە لەخۆمان بپرسین: ئایا شتێك هەیە سەربەخۆبێت لەناوخۆیدا؟ ئایا نووسەرێك هەیە بەوشێوەیە تێکست بەرهەمبهێنێت بەبێ هیچ کاریگەرییەك لەدەرەوەی خۆی؟ نەخێر.

نووسەر، دیارە لەهەر ژانرێکدا بنووسبێت، هەمیشە لەناو کاریگەری و خوێندنەوە و تێڕامان و وروژانەکاندایە. هیچجارێك بەبێ ئەمە نووسین ناتوانێت بژی و نووسەریش ناتوانێت خاوەنی بەرهەم و شاکارە گەورەکانی بێت. نووسەر رەنگە هەمیشە لەخۆی بپرسێت، چۆن چۆنی لەژێر کاریگەرییەکانیدا بچێتەدەرەوە و هەوڵی زۆر جیدی ئەوەبدات ستایڵ و شێوازێکی تایبەتی بەخۆی هەبێت لەنووسیندا؟ دیارە بۆئەوەی دەنگ و ستایڵی (ناوی) بناسرێت. بەمەبێتە نووسەر بۆخۆی وەکو جۆرە پرۆژەیەك وایە لە دۆزینەوەی خۆی، بەڵام بوونی نووسەر لەناو پرۆسەی نووسیندا هەمیشە لکاوە بەوانیترەوە، هەرگیز جۆرە بوونەوەرێك نییە لەناو نووسیندا سەربەخۆبێت وەکو خودی خۆی. بەمانایەکیتر، نووسین و نووسەر هەمیشە لەناو زماندان تاوەکو لەناو خودگەرایەتییەکی زۆر سەربەخۆدابن.

باسکردن لە نووسەر و نووسین، دیارە خودی ئەو کەسەی نووسینەکە دەنووسێت و ئەو نووسینەی بە بەرهەمێکی ئەدەبی، فەلسەفی، سیاسی یان هەرکایەیەکیدیکە ناوبرێت لە جیهانی بەرهەمهێنانی نووسیندا.

دیارە باسکردن لەتەواوی ئەدەبی شوێنێك یان ئەدەبی کوردی کە لە نازمانی کوردیدایە، فرەویی و مەزنییەکی زۆر گەورەتری تیادایە لە بەراوردکردنی لەبەتەنیا نووسینێکدا یان نووسەرێکی ناو ئەو ئەدەبەدا.

ئەگەر نووسەر وەکو هەموو یەکێکیتر لەناو ژیاندا بێت، بەڵام خولیا و ئارەزوو و داهێنانەکانی وایلێبکات جیاوازییکات لەگەڵ ئەوانیدیکەدا، واتە پرۆژەی نووسین جۆرە پرۆژەیەکی خودگەرایە لەو ئاستەوەی کە مرۆڤ وەکو نووسەرێك مانیفێستی نووسینەکانی خۆی پێدەکات، بەڵام ئەوەی دەینووسێت و بەرهەمیدێنێت، تەنیا لەناو خودی خۆیدا نییە، بەڵکو لەناو کۆمەڵگاکەدایە کە تیایدا دەژی. بەمانایەکی زۆر سادەکارییەوە، نووسەر بەبێ ئەوانیتر و کۆمەڵگایەکەی ناتوانێت هیچ شتێکی ئەوتۆ بەرهەمبهێنێت، لەبەرئەوە زمانیش لەسەروو دەنگێکی شازو تاکەوەیە.

کەوابێت، نووسین تەنیا حاڵەتێکی سەربەخۆی وانییە ئەوەی نووسەر دەینووسێت و بەرهەمیدەهێنێت، ئەمەش وابکات و وابزانین، ئەو نووسەرەی بەرهەمەکە بەرهەمدێنێت بەهەموو شێوەیەك بەرهەمی سەربەخۆی ئەوتاکە کەسە بێت، واتە نووسەرەکە وەکو خۆی، بەڵکو خودی کۆکراوەیی و ئەرشیفەکانی ناو زمان و کەلتورە.

زمان تێکرژانی تەواوی هەموو ئەو شتانەیە وامانلێدەکات بەکاریبهێنین، لەبەرئەوەشە لەناو زماندا پرۆژەی بەرهەمهێنان وەکو جۆرە وزەیەکی ناڕاوەستانی هەیە و تیادایە. لێرەدا مانای ناڕاوەستان، واتە شتێکی هەمیشە زیندوو، گۆڕاوەتە تەور، کاریگەر، وەکو خودی بوون و ژیانیش دەگەیەنێت بەلای منەوە، ژیان و بوونێك هەموومانی تیادایین و تەنیا موڵکی تاکێك یان گروپێك نییە، بەڵکو تێکرژانێی فرە و جیاوازە (مەڵتیپڵیستی). خوێندنەوەی بیرمەندێکی وەکو گیلز دولوز و گوتاری، دەتوانێت خۆراکی زۆرمان بداتێ بۆئەم دیدگایە بۆ بوون و ژیان.

ئەمەش دەڵێین، بەڵام خودی نووسەر یان کاتێك ناوی نووسەرێك دەهێنین، بۆخۆی ئاماژەکردنێکیشە بە خودگەراییەتی ئەوکەسە وەکو نووسەرێك، بەڵام ئەوکەسە، ئەو نووسەرە، هەرگیز لەدەرەوەی زمانەوە قسەناکات. وەکو سامۆئیل بیکیت لە زاری فۆکۆوە، ئاماژەی بۆکردووە، دەڵێت: ئایا چی گرنگییەکی هەیە کێ قسەندەکات. دیارە ئەمە بەمانای ئەوەی هەمووومان دەتوانین لەناو زماندا قسانبکەین، یان ئەوە زمانە قساندەکات. ئەوەی بەناوبانگە و فۆکۆ ئاماژەی بۆدەکات، گوایا نووسەر لەدوای تێکستەکەی دەمرێت. کاتێك لە بەرهەمێك تەواودەبین، وەکو کۆتاییمان پێبێت لەئاستی ئەو پرۆژەیەدا وایە.

بەکورتی رۆڵی کارکردنی نووسەر و نووسین، لەوەدایە کە زیاتر بەناو تەوژمە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکەیدایەتی، هەرکاتێککیش ئەم تەوژمە گۆڕانی بەسەردادێت خودی نووسین و نووسەریش بەهەمانشێوە گۆڕانیان بەسەردادێت. بەمانایەکیتر، ئەوەی نووسین و نووسەر بەرهەمدەهێنێت خودی تەوژمەکانی وەکو کەلتور و ناو کەناڵی زمانە.

لەبەرئەوەی نووسین بەناو هەموو کەناڵەکانی زمان و کەلتور و هەموو ئەو جموجووڵانەی ناو هەستە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و شەخسی و سیاسییەکاندا دەڕوات، ئیدی نووسین ئەمەندەی لەناو زماندایە ئەمەندەی ئەوە لەناو نووسەرەکاندا نییە بەوشێوەیە .

بۆنموونە بەڕای رۆڵاند بارت، لەپێش فۆکۆدا، لە مەرگی نووسەردا، ١٩٦٨، دەڵێت: ئەوەی دەئاخڤێت خودی زمانەکەیە، نەوەك خودی نووسەرەکە.

زمان کایەیەکی باڵاتر و فرەتر و مەزنترە لەو ئاگاییەی یان کایەی نووسەر کە هەیەتی و کاتێك دێتەسەر نووسین و بەرهەمهێنان، چونکە نووسەر بەبێ زمان و ئەو مێژووەی لێوەیدێت ناتوانێت نووسین بەرهەمبهێنێت. بەکورتی لێردا کایەی زمان کایەیەکی گەورەترە لە کایەی خودی نووسەرێك وەکو خودێك کە ئۆتۆریتەیەکی هەیە لەسەر بەرهەمەکەوە، وەکو ناوی نووسەر.

پێموایە بۆ بارت، وشە، رستە و تەواوی زمانەکە دەتوانێت و لەتوانایدا هەیە بەرهەمبهێنێت و نووسەرایەتی لە سیاقی شەخسیدا درووستبکات، نەوەك بەرپرسیاری ئەو قانوونییەتەی نووسەرێك وەکو موتڵەق بناسێت. بۆ بارت سەرچاوەی تەواوی نووسین (بەرهەمهێنانی تێکست) حاڵەتی تایبەتی و شاز و تەنانەت ئەساڵەتیش نییە، چونکە

هەموو شتەکان بەناو کەناڵەکانی کەلتور و زماندا تێدەپەڕن. دەڵێت: تێکست وەکو دیوەکانی ماسولکە (تیشیو) وایە بۆ وەرگرتنەکان (مەقولەکان) کە بەناو چەندین کەناڵی کەلتوریدا ڕۆشتوە. بەمانایەکیتریش، ئەگەروابێت هیچ تێکستێك ئەسڵی نییە، تەنیا ڕەنگدانەوە و کاریگەری ناو زمانە کە لە تێکستەکانیترەوە هاتووە.

بارت دەیەوێت پێمانبڵێت، لەبەرئەوەی نووسین بەرهەمی ناو کایەی زمانە و بەهەموو شێوەیەکیش پەیوەندی جەوهەری بە کەلتور و هەلومەرجەکانەوە هەیە، ئیدی نووسەر وەکو کاتی خۆی، موتڵەقایەتی بەسەر تێکستەکەوە نییە، ناوی لادەبرێت و لە هەستە گەردوونییەکەیدا لادەچێت و دەسڕێتەوە.

بەمجۆرە تێفکرینە، دەتوانین خودی ئایینەکانیش بەهەمانشێوە بخوێنینەوە، دیدی هەڵوەشاندنەوەی دیریدایی و تەنانەت هیرمیونتیکی گادیمێری هەمان نزیکایەتییان هەیە بۆ خوێندنەوە. بۆنموونە ئەگەر تەماشای هەرسێك لە کتێبەکانی ئایینە ئاسمانییەکان بکەین، زۆر بەئاسانی ئەوە دەخوێننەوە و لەوەش تێدەگەین کە هەریەك لەم ئایینانە هیچیان لەدەرەوەی یەکتریدا نین، هەریەکەیان کاریگەری و ڕەخنەئامێزی و بەناویەکتریدا چوون. ئەگەرچی ئایینی جوولەکە سەرچاوەی یەکەمیانە، بەڵام تەواوی ئەم ئایینە لەناو چیرۆك و میتۆلۆجییە میسرییە کۆنەکاندا دەبیندرێت، واتە بەهەمانشێوە ئەسالەتی ئەو ئایینەش (جوولەکە) گەڕانەوەیە بۆ ترادیسیۆن و چیرۆکەکانی پێش خۆی، کتێبەکەی فرۆید لەسەر مووسا دەبێتە سەرچاوەیەکی باش لێرەدا بۆ ئاماژەپێکردن.

زیاتریش لەمە، ئەگەر ئەو ئایینانە هەموو لەناو وەرگرتن و کاریگەری و هەڵوەشاندنەوەی یەکترییەوە لەدایکبووبن، ئایا چۆن بتوانین تاقە نووسەرێکی وەکو خواوەند بکەین بە خاوەنی هەرهەموویان؟ ئەگەر کاری ئەعجووبەیە و تەواو، ئەوکاتە خودی ڕامان و دایەلۆگکردن دەمرێت. بەحوکمی ئەو خوێندنەوانەی سەرەوە، خاوەنی ڕەسەنی ئەو ئایینانەیە، خودی مێژووی دەوڵەمەندی مرۆڤایەتییە لەبەرهەمهێنانیاندا و نووسەرایەتییەکی موتڵەقایەتییەکیش بەسەریاندا ناسەپێندرێت.

نووسەری نووسین لەبەرئەوەی پرۆژەی مەزنی فێربوون و پراکتیس و داهێنان و بەرهەمهێنانە، لەبەرئەوە خودێتی نووسەرایەتی وەکو موتڵەقگەرایەکی هەتاهەتایی نابیندرێت، بەڵام بەشێکە لە خودی زمانەکە، چونکە ئەو نووسین و زمانە، شتێك نییە راوەستاوبێت و هیچ کاریگەری و ئاڵوگۆڕێکی بەسەرەوەنەبێت.

هاوکێشەکە بۆ ئەرنیست هەمینگواییش تاوەکوڕادەیەك هەمان بینینە، بەلام نەوەك بەوشێوە زۆر جیاوازەی ئاماژە بە مەرگی نووسەر دەکرێت لە زمانێکی پۆست- مۆدێرنانەدا، بۆنموونە، هەمینگوای پێیوایە، نووسین لەدەرەوەی فێربوون و پراکتیسدا نییە، فێربوون و پراکتیسیش هەمیشە لەگەڵ هەلوومەرجە جیاوازەکاندا گۆڕانی بەسەردادێت، بەڵام هەمینگوای باوەڕی بە وەستایەتی نووسەر هەیە، بۆیە پێیوایە، دەبێت لەڕێگای ئەو فێربوون و داهێنانەوە بۆ نووسین، کارێکی وابکەین، ئەمەندە وەستابین لەنووسیندا، تاوەکو بتوانین بەوانیتر بڵێین لەگەڵ ئەو وەستایەتی و داهێنانەماندا لەدایکبووین.

•••

# کەلتور وەك
# چەمك، تیۆر، گوتار

نووسینی: کازم جەباری

## چەمکی کەلتور

(چەمك)[*]ی کەلتور لە زمانی ئینگلیزیدا لەبنەڕەتدا لە "وشەی (culture)وە وەرگیراوە کە هاوواتای وشەی (الثقافة)ی عەرەبییە، لە زمانی فارسیشدا بە (فرهنگ) نادەبریت کە ماناکەی لە فراژووبوون (الانما)دا خۆی دەبینێتەوە، سەرەتا بە پەیوەندی (communecation) نێوان کشتوکاڵ (agriculture) و فراژوبوون (ئاڵوگۆڕکردن) وتراوە"[١]، مرۆڤ لەکۆندا زۆرتر بە کێڵان و کشتوکال و پیشەگەلی سەرەتاییەوە خەریکبووە و ژیانێکی تاڕادەییەك سەرەتایی گوزەراندووە، ئەو کۆمەڵگایانەش کە مرۆڤی تێداژیاوە زۆرتر کۆمەڵگەییەکی سەرتاییبووە، بە تاقە (وزەی بازوو)ی مرۆیی خۆیان پشتیان بە رەگەزە سروشتی و جوگرافییەکانی وەك ئاو هەوای گونجاو، سوودوەرگرتن لە زەوی و رووبار و چاندن و کشتوکاڵ و رەگی رووەکەکان و گەڵای دارەکان و.. هتد، بەستووە لەپێناو دابینکردنی پێویستییەکانی ژیان، ئەمەش یەکێك بووە لە ئادگارەکانی مرۆڤی کۆن.

لەبەرئەوەی کشتوکاڵ ناسراوترین و بەردەسترین پیشەبووە لەکۆندا کە مرۆڤ ناسیبێتی، بۆیە مرۆڤ هەمیشە بیری لەوەکردووەتەوە نەوە لەدوای نەوە بەردەوام لە بیر (thought)ی پێشکەوتن و گەشەکردن و پەروەردەکردن و فراژوبونی ئەم پیشەیەدابێت، ئەمەش سەرنجمان بۆلای بابەتێك رادەکێشێت کە پێدەچێت لە دەرەنجامی کارلێکی نێوان قۆناغە یەك لەدوای یەکەکانی ژیانی مرۆڤ لەگەڵ سروشت و ژینگە و رەگەزە جوگرافییەکان بەرهەمهێنەری چەمکیك بیت بەناوی (جوگرافیای کەلتوری) کە لەهەمان جیهانبینی و نمایندەی بیری مرۆڤەوە سەریهەڵدابێت، وەك لە سیاقە مێژوییەکەشدا وشەی کەلتور لە رەگی وشە یۆنانییەکەیدا بە واتای نزیك لە کشتوکاڵ کە "کێڵان یان (گەشەسەندن) هاتووە لە سەرەتاوە مەبەست لەم وشەیە بەتایبەت لەڕووی ریزمانی و زمانەوانییەوە تەنها وەبەرهێنان و گەشەپێدانی زەوی و بەربووم بووە، بەلاَم لە سەردەمی سەرەتاکانی شۆڕشی فەرەنسی واتا لە سەدەی هەژدەهەمدا چەند فەیلەسوف و بیرمەندێکی وەکو (ڤۆڵتێر) وشەی کەلتوریان بە واتای گەشەپێدانی عەقڵ و رەوشت بەکارهێناوە پاشان بەهەمان مانای گەشەپێدانی عەقڵ ئەم وشەیە گوازراوەتەوە بۆ ئەڵمانیا و چەند شوێنێکیتر".[٢]

بەپێی تێپەڕبوونی قۆناغەکانی ژیانکردن، چەمکی کەلتور خوێندنەوەی جۆراوجۆری بۆکراوە و لێکۆڵەران و بیرمەندانی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە و سەرنجی کەلتورناسان و سۆسیۆلۆژستان و ئەنترۆپۆلۆشتەکانی بەلای خۆیدا راکێشاوە، هەر لەساتی سەرهەڵدانییەوە بەتایبەت دوای ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ئەنجامی پەرەسەندن و

پێشکەوتنی کۆمەڵگەی مرۆڤایییەتدا هاتووەتەکایەوە، بەشێوەییەك "هیچ زانستێك بەبێ گەشەکردنی کەلتوری داهینانی فیکری رەوتی دەوڵەمەندی رێنسانسی رۆشنبیری نەهاتووەتەگەشەکردن".[٣]

مێژووی بیری مرۆڤایییەتی مێژوویەکی ئاڵۆز و فرەڕەهەندە و هەرچەشنە را جیایەك لە گوزارشتکردنی مرۆڤ بۆ چەمکە مێژوییەکان دەچێتە چوارچێوە و سیاقە مێژوییەکەی بەریەککەوتنی بیری مرۆڤ لەگەڵ رووداوەکان و چۆنیەتی تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ چەمکەکان و دیاردەکان، مێژووی چەمکی کەلتور بەو شێوەییەیی ئەمڕۆ لەزانستدا بەکاردەبرێت، باس لە سەرهەڵدانی چەمکێکی نوێ دەکات لەنێو کۆمەڵە واژەیەکی جۆربەجۆردا رەگوڕیشەی واژەی کەلتوریش دەچێتەوەسەر "زمانی کلاسیك لەوانەیە لە زمانی پێشکلاسیکی لاتینییەوە هاتبێت لەبنەڕەتدا مانای کشتوکاڵ یان پەروەردەکردن بدات، ئەم واتایە هێشتا لە واژەکانی (agriculture) وەرزێری (horticulture) باخەوانی و (cult)و(cult us) ئایین لەجێی خۆیداییە و لە فۆرمی تازەی وەك (bee culture) بەخێوکردنی مێشەهەنگ (oyster culture) بەرهەمهێنانی گوێچکەماسی (pearl culture) بەرهەمهێنانی مـــرواری (bacillus culture) بەرهەمهێنانی باسیل، هەر بە هەمان مانا بەکاردەبرێت واژەی کەلتور بۆ یەکەمجار لە پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگە مرۆییەکاندا لە ساڵی ١٧٥٠ز، لە زمانی ئەڵمانیدا بەو مانایە بەکاربراوە.

زمانە (رۆمیکییەکان)[*] و زمانی ئینگلیزی تاماوەیەکی زۆر واژەی (civilization) شاری ئایینی یان ژیاریان لەبری (culture) بەکارهێناوە مەبەستیان لە بەکاربردنی ئەو واژەیەش (education)پەروەردەکردن، چاکسازی (reform)، پێشخستن یان پێشکەوتنی کۆمەلایەتی بووە.. پێدەچێت ئەم واژەیە لە سەردەمی رێنسانسەوە سەریهەڵدابێت، ئەگەری ئەوەش هەیە کە فەرەنسی بێت و لە کرداری civilizer بە مانای وەرگرتنی دابونەریتی خەڵکی شارنشین هاتبێت"[٤]

چەمکی کەلتوریش وەك پێدراوێکی مرۆیی و "چرکەساتی دوای حاڵەتی سروشتی.. مانا بە ژیان دەبەخشێت، ئەوە کەلتورە دەبێتە قۆناغی ئیدراککردنی شتەکان و زانین لەبارەیانەوە، ئەوە زانین و ئیدراککردنە لەمیانی بەرهەمهێنان و دروستکردنی وینەی زەینی لەبارەی شتەکانەوە تیکەڵبەیەکدەبیت، وێنەی زەینیش دێت و مانا بەشت و دیاردەکان دەبەخشێت پێوەری تازە دادەهێنێت بۆ تێگەیشتن و رێکخستنی توخمەکان".[٥].

لەگەڵ سەرهەڵدانی سەردەمی نوێ و پێشکەوتنی زانست و دەرکەوتنی زانستەکانی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی مرۆیی لەژێر ناوی زانستەمرۆییەکانی وەك سۆسۆلۆژیا و ئەنترۆپۆلۆژیا و ئیکۆلۆژی و ئارکیۆلۆژی و.. هتد، چەمکی کەلتورناسیش وەك بابەتێکی زانستێکی نوێ و سەربەخۆ لەپاڵ زانستی ئەنترۆپۆلۆژیا دەرکەوت.

(ئیدوارد بارنت تایلەر)ی بەریتانیش "لە سەدەی نۆزەهەم و لە ساڵی ١٨٧١ز دەستپێشخەریدەکات لە ناسینی چەمکی کەلتور و لە یەکەمین بەشی کتیبەکەیدا (کەلتوری سەرەتایی)، primitive cultre کەلتور بە موزاییکێکی پێکهاتوو لە مەعریفە، دین، هەنەر، یاسا، مۆراڵ و هەرچەشنە توانایی و خووخدەییەك کە مرۆڤ وەك ئەندامێکی کۆمەڵگە بەدەستیدەهێنێت"دەناسێنێت.[٦] بەمەش دەتوانین بڵێین لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی چەند قۆناغێکی مێژوویی ئەم چەمکە گەشەکردنی بەخۆوەبینیوە بەوپێیەی کەلتور لە زەمینەی سەرخان و ژێرخانی مرۆیی پێکدێت کە خۆی "لەژێرخانێکی روحی و سەرخانێکی زەینی بۆماوەییدا دەبینێتەوە"[٧].

هەموو کۆکەلگەیەکیش بەبێ کەلتور تویکلێکی ناوەڕۆك بەتاڵیبێ ئیدراکە و گشتێتی ڕەهەند و توخمەکانی کەلتور لەدەستدەدات، مانایەك بۆ بەها و پێوەر و سەرخان و ژێرخانی مرۆیی ناهێڵێتەوە وەك ئەوەی کەلتور لە چوارچێوە گشتییەکەیدا بەوەناسراوە کە "گشتێکی ئالۆزە، توخم و ڕەگەز، ستراکچەر (پێکهات)ەییەکی جیاواز و دژبەیەکی وەکو دابونەریت، بەها و پێوەر زانست، یاسا زۆر لایەنی ماتریاڵی وەك جلوبەرگ، خانوبەرەی لەخۆگرتووە".[٨]

(ئەنتۆنیۆ گیدنز) سۆسۆلۆژستی بەریتانی کەلتور بە چەمکی کۆمەڵگاوە دەبەستێت و بەپێداگری لە ژیانی کۆمەلاٚییەتیدا لەسەر ئەو ڕایەشە کە چەمکی کەلتور (لەو بەهایانە پێکدێت کە ئەندامانی گرۆپێکی دیاریکراو هەیانە، لەو ئاکارانەی پەیڕەویلێدەکەن و ئەو کالاٚ مادییانەی کە بەرهەمیدەهێنن).[٩]

بەلاٚم هەندێکیتر لە زانایان چەمکی کەلتور لەگەڵ چەمکگەلێکی وەك سروشت ناودەبەن، وەلێ قسەکردن لە سروشت لە چوارچێوەی کەلتوردا ئاماژەییەکی بەربلاٚوترمان پێدەدات کاتێك (سروشت وەك یەکەمین لانکەی مرۆڤایەتی) دەرگیربێت لەگەل کەلتور، کلتوریش سەرجەمی بەرهەمی مرۆیی بێت بەرامبەر پرۆسەی بەرهەمهێنانی سروشت، بەمپێیەش سروشت دەبێتە بەشێك لە کەلتور، کلادیۆشتراوس ئەنترۆپۆلۆجیکی بونیادگەر پێیوایە "جیاکاری لەنێوان کەلتور و سروشت جیاکارییەکی کورتبڕە.. هەروەك هەموو بۆچوونیك دەربارەی سروت، بۆچونێکی کەلتوری و مرۆییە و هەربۆیەش دەتوانین بڵێین تەنانەت زانستی سروشتیش، زانستی مرۆیی و کەلتورین".[١٠]

ڕەنگە لێرەوە بگەینە ئەوەی کە پەیوەندی نیوان سروشت و کەلتور پەیوەندییەکی ئیشکالاوی بیت، جۆریك دژیەکی (ناوکۆك) لە چەمکی کەلتوردا ئەفراندبیت، دوالیزمی کەلتوری لەگەڵ سروشدا دروستکردبیت، بەوپێیەی کەلتور گشتێکی ئالۆزە لە کۆمەڵێك ستراکچەری جیاواز پێکدێت، ئەمەش وای لە (جاك دریدا) داهێنەری تیۆری هەلوەشاننەوە (deconstruction)* کرد، دوای جیابوونەوەی لە بونیادگەرەکان، وەك داهینەری چەمکی هەلوەشانەوە، لەمیانی تیۆرەکەیدا خوێندنەوەی تایبەتی هەبێت بۆ پەیوەندی دوالیزمی نێوان سروشت و کەلتور، میتافیزیکش وەك توخمێکی بان مرۆیی و مەعنەوی بهێنێتە بەرباس و بیکات بە دەسکەلای خۆی و تیۆرەکەی لەسەردابرێژێت، پێیوابێت "چەمکی سروشت و کەلتور بەرهەمهێنەری ئەو دژکارییە کە لە چرکەساتی لەدایکبوونی میتافیزیکدا هاتووتەبوون، ئەو دژکارییەش بەردەوام لەسەر زنجیرەیەکی یەکلەدواییەکی بێکۆتای گۆڕینی سێنتەرێك بە سێنتەرێکیدی دامەزراوە، ئەوەش بەردەوام ئەوەمان دێنێتەوەیاد کە سێنتەرێك لەنێو چەمکی سروشتدا دێتەبوون، لەبەرامبەر ئەوەشدا سێنتەرێکیدی لەشێوەی دەزگای هونەری و یاسایی لە سایەی زنجیرەیەکی مێژوویی ناکۆتا دادەمەزرێت".[١١]

لە ئەنجامی شیکار و خوێندنەوەی جۆراوجۆر و ڕەخنەئامێز بەتایبەت لەدوای سەدەی بیستەم، چەمکی کەلتور بەرەوپێشڤەچونی باشی بەخۆوەبینی و ئەمەش بووە هۆی سەرهەلٚدانی ئەدەبیاتێکی فرەچەشنی بەربلاٚو، بەمەش زیاد لە هۆکار و پالٚنەرێك کاریگەریان لەسەر بەرەوپێشڤەچوونی چەمکی کەلتوردا بینی بۆ نموونە:

**یەکەم:** لە ئەنجامی کۆچی بەربلاٚو پێکدادان (لێککەوتن)و پەیوەندی کەلتوری بووەتەهۆی دەرکەوتنی کەلتوری جیاواز و جیاوازی لەنێوان کەلتورەکان.

**دووەم:** لـــە ولاّتانی رۆژئاوا شانۆی کەلتوری لـــە بنچینەوە وەرچـــەرخانی بەخۆوەبینی پیشەسازی کەلتوری (industry culture) جۆرە تێکەلاّویەکی لەنێوان بازرگانی و کەلتوردا دروستکرد.

**سێیەم:** بەدەرکەوتنی تۆڕەکانی پەیوەندی لەئاستی جیهانیدا وایکرد میدیاکان دەورێکی گەورە لە بلاّوکردنەوەی کەلتوری مۆدێرنەدا بگێرن.

**چوارەم:** فرەڕەنگی کەلتورەکان بوو بەهۆی کەلتوری جەماوەری (massesculture)، کەلتوری گەنجان، کەلتوری ئەتنی، کەلتوری پۆستمۆدێرنە.

**پێنجەم:** دوایەمین شتیش پرۆسەی بە جیهانی بوونی کەلتورە کە هەندێك دژەکردەوەی بەرەنگاریکاری گرژکـــردەوە هەرئەمـــەش بووە هۆکارێك بۆ لێکدانەوەی پەیوەندی لەنێوان (کەلتور و هێز)، لەئاستی نێونەتەوەیدا".[۱۲]، بەرمەبنای ئەمە چەندین تێوری وەك پێکدادانی کەلتورەکان (cultureclash) ئەوەی (کارل پۆپەر)* باسیدەکات یان وەك ئەوەی (سامیۆل هانتنگتۆن) بە (پێگدادانی شارستانییەکانیەکان) گوزارشتیلێدەکات دێتەکایەوە. لێرەدا کەلتورەکان لەسەر بنەمای هێز، دەبن بە کۆنکرێت و کار لەسەر سڕینەوەی یەکتردەکەن لەپێناو مانەوەیاندا، خۆیان بەسەریەکتردا فەرزدەکەن. وەك بلاتفۆرمێکیش چەمکی شوناس و کەلتوری نەتەوەیی دەردەکەوێت، دەبێتە ئەلتەرناتیڤێکی فۆرمەڵەبوو لە ئەنجامی ئەو پەرچەکردارانە قوتدەبیتەوە و شەرعییەت وەردەگرێت.

### پێناسەی کەلتور

کەلتور وەك ئەوەی، چەمکێکی ئالۆز و فرەڕەهەندە و دەتوانرێت لە چەندین رەهەندی فیکری و مێژوویی و سۆسیۆلۆژی و ئەسنرۆپۆلۆژی و تەنانەت سایکۆلۆژیشەوە پێناسی جۆراوجۆری بۆبکرێت، نەسکدار بکرێت. (ئیدوارد تایلۆر) tylor یەکەم کەس بوو کە لەکتیبەکەیدا (کەلتوری سەرەتایی) پێناسەی کەلتوری کرد بەوەی "کەلتور بریتییەلە پێکهاتەییەکی ئالۆز لە مەعریفە و بیروباوەڕ و هونەر و یاسا و ترادسیۆنەکان.. هەرتاکێك وەك ئەندامێك لە کۆمەڵگەوە فێریاندەبیت، هەرئەو تایبەتمەندییانەش مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە، (ئیبن خەلدون)یش پێیوایە مرۆڤ بەهۆی توخمە مرۆییەکانیەوە لە ئاژەڵ جیادەکرێتەوە"[۱۳]

"هەرچەندە لەڕابردوودا وشەی کەلتور بەشێوەیەکی ئاوەڵناو بەکاردەهێنرا بۆ نموونە دەیانگوت (فلاّنەکەس مـــرۆڤێکی خاوەن فەرهەنگە)[*] هەندێکجاریدیکەش بە مـــانای مەعاریف یان ئەدەب تەنانەت فێرکاری بەکاردەبرا"[۱٤].

لە دیدی کۆمەڵناسیشدا هەموو مرۆڤێکی پێگەیشتوی ئاسایی خاوەن کەلتورە، بەوەی" کەلتور کۆمەڵێك تایبەتمەندی رەفتار و بیروباوەڕی بەدەسهاتووی ئەندامانی کۆمەڵگایەکی تایبەتە"[۱٥]

لیرەوە کەلتور شتێکی بەدەسهاتووی پاشخانی دەوڵەمەندی فیکری و مێژووی مرۆڤایەتی بە جیاوازی جڤاك و رەفتارەکانیان، زمان و نەریت و ئاینەکانیان، لەدەستپێکی سەدەی بیستەمدا زۆر بەتۆخی جەخت لەسەر ئەم گوتەزایە کرایەوە، کەلتور"بە کەلتوری نەتەوەکان و کەلتوری خەڵك و کەلتورە بۆماوەکان، پێناسکرا، لەوێدا نووسەر

و ئەکادیمییە بۆرژوازییەکان باسیان لە فراژان و ریسکانی کەلتوری ژیاریان کرد بەمەش هەولیاندا کەلتوری جڤاك و نەتەوە بیانییەکان و غەیرە رۆژئاواییەکان بە دواکەوتوو سەرەتایی پێناسەبکەن"[١٦].

(فەرهەنگ)*ە، جۆربەجۆرەکانیش رۆڵ دەبینن لە ناساندنی ئەم چەمکە، لە فەرهەنگی نوێدا پێناسی کەلتور بەستراوە بە هەردوو رەهەندی ماددی و مەعنەوی لەسەر بنەڕەتی پەیدابوونی مێژوویی تێیداهاتووە "کەلتور بریتییەلە کۆمەڵە بەهایەکی ماددی و مەعنەوی کۆمەڵگەی ئادەمیزاد، لە ئەنجامی گۆڕینی کۆمەڵایەتی و مێژویی پەیدادەبێت، کەلتور هەموو چالاکییە بونیادنەرەکانی ئادەمیزاد دەگرێتەوە هەمیشە هەردوو لایەنی بەیەکەوە پەیوەندیداری هەمیشەیی، کەلتوری ماددی و مەعنەوی دەگرێتەوە. کەلتوری ماددیش بریتییەلە کۆمەڵە هۆیەکی بەرهەمهێنان، تەکنیك، تاقیکردنەوەی بەرهەمهێنان، بەهەموو بەها ماددییەکانیتری کۆمەڵ لەهەر قۆناغێکی پێگەیشتنی مێژوویی خۆیدا بەخۆیەوە دەگرێ و هەرچی کەلتوری مەعنەوییە کۆمەڵە دەسکەوتێکی زانستی و هونەری و رەوشتی و فەلسەفەی کۆمەڵە"[١٧] زۆرجار لە ناوەندە فکری و زانستییەکاندا لەبری وشەی کەلتور وشەی رۆشنبیر بەکاردەهێنرێت کە ئەمەش هەڵەیەکی زانستی گەورەیە، چونکە خودی کەلتور جۆرێك لە گشتێتی تێدایە لەماناداو کەچی وشەی رۆشنبیر تەنها کارە زیهنییەکانی مرۆڤە لەگەڵ بەشێك لە کایە مەعنەوییەکان، بەمەش کەلتور دەشێت ماددی بێت یان ناماددی یاخود زیهنی"هەرچی وشەی کەلتورە لە زمانە ئەوروپییەکاندا دابڕاوەلە وشەی (intellectual) کە بەرامبەر وشەی رۆشنبیر بەکاردەهێنرێت، ئەم وشەی رۆشنبیرە واتایەکی هاوبەشی نییە لەگەڵ وشەی کەلتوردا لە یەك ریشەی زمانەوانیدا" [١٨]. سەرەڕای ئەمەش "کەلتور لایەنی روحی(spiritual) و لایەنی ماددی (material)ی هەیە کە هەردوو پێکەوە بەشێك لە پێکهاتەی عەقڵ و عەقڵییەت و کەلەپوری نەتەوە پێکدەهێنن".[١٩]

لێرەوە دەتوانین بڵێین "چالاکییەکانی رۆشنبیری هۆکارێکی گرنگە بۆ زەمینەسازی کەلتوری یان لایەنیکەم گرنگترین هۆکارە بۆ سەرهەڵدانی، بەلاّم گشتێتی کەلتوری بەدەستناهێنێت" [٢٠]

لە فەرهەنگی سیاسیدایشدا، جگەلە توخمی ماددی و ناماددی، رێکخراو(ئۆرگان)ە کۆمەلاّیەتییەکانیش باسکراوە و"کەلتور بە کۆمەڵێك توخمی ماددی و ناماددی رێکخراوە کۆمەلاّیەتییەکان دەگوترێت کە لە جیلێکەوە بۆ جیلێکیدیکە دەگوێزرێتەوە".[٢١]

بیریارێکی وەکو(محەممەد عابد ئەلجابری)، کەلتور بە دەمامکێك بۆ پاراستنی شوناسی ژیاری ناودەبات و پێیوایە"کەلتور تێکەڵەیەکی فرەڕەگەزە لەو یادەوەری و ئایدیا و بەها و نیشانە ( symble) و دەربڕین و داهێنانانەی بۆ هەرکۆمەڵێکی ئادەمیزاد، لە شێوەی میللەت یان هاوماناکەی شوناسی ژیاری دەپارێزێت".[٢٢]

(ماك ئەیفر) پێناسەی کەلتور دەبەستێتەوە بە گۆڕانکاری لە شێوازەکانی ژیان و پێیوایە" کەلتور پەیوەستەبە گۆڕانکاری لە شیوازەکانی ژیان (expression de lavie) لەڕووی بیروباوەڕ (ئایدۆلۆژیا)، دین، ئەدەب.. هتد". [٢٣]

کاتیك کەلتور دەبیت بە بەرهەمی بیرکردنەوە چەمکی گۆڕانکاری دیتەکایەوە، قۆناغ دوای قۆناغ بەرەوبالاّبوون هەنگاودەنیت. لێرەدا کەلتور ناوزەنددەکریت بە"بەرهەمی بیرکردنەوە و تیکۆشانی مادی و مەعنەوی

مرۆڤە، ئەو بەرهەم و بابەتەیە کە لەگەڵ گۆڕانی مرۆڤ و پێداویستییەکانیدا دەگۆڕێت و نوێدەبێتەوە و گەشەدەکات، قۆناغ دوای قۆناغ دەبڕێت و لە بالآبوونێکی بەردەوامدا"[٢٤]

هەندێکجار پێناسی کەلتور لە زانستی (ئەنسرۆپۆلۆژیایی کەلتوری)* وەك یەکێك لە بەشەکانی مەعریفەی مرۆڤ وێنادەکریت لەپاڵ کۆمەڵێك چەمکی مەعریفیدا دەرگیربوونی ژیانی تێدادەئاخێنرێت. لەکاتێك" فەلسەفە و ئەخـــلاق و ئەدەبیات، لایەنی چاك و گەورەتری لەخۆگرت، وەك ناسینی بەهاکان و یاساکۆمەلآیەتییەکان و.. هتد"[٢٥]

ئەمانەش وەك ڕەگەزانێکی گرنگ هەمان گوزارشتگای کەلتورین کە جۆرێك لە گشتگیری بە پێناس و کۆنسێپتی کەلتوری دەدەن وەك ئەوەی کە کەلتور بریتیبێتلە: "دەستەیەك لە کردەوەکان، بیروباوەڕەکان، ئەدەب و رەوشتی تاك یان بنەماڵەی نەتەوەك، پابەندییان بەو چەمکانە، کەلوپەلی جیابووەوەیان لەگەڵ نەتەوە و هۆزەکانیتر دەردەخات، کەلتور وەك دەستە بیروباوەڕێکی تاکی یان گروپی تایبەتی و لەبەرئەوەی کە بیروباوەڕەکانی زەینین..، بۆیە کەلتور فێری مرۆڤ دەکرێت"[٢٦]

ئەگەر دابەشکارییەك لە چەمکی کەلتوردا بکەین، بەپێی ریزبەندی قۆناغە مێژووییەکان دابەشیبکەین ئەوا کەلتور بریتیدەبیت لە " (قۆناغی سەرەتایی و پێش کات و دوای کات و هاوچەرخ)، هەروەك دەبینین پێش لەدایکبوونی کەلتور قۆناغێك هەیە ناویلێنراوە (پێش کەلتوری) ئەویش ئەو ماوە زەمەنییەیە کە لەڕووی کات و شوێنەوە دەکەوێتەنێوان دوو کەلتوری جیاوازەوە، لەو قۆناغەدا خەڵکی دەژین و کاردەکەن، بەلآم سیستەمی کۆمەڵگا سیستەمێکی ڕێکوپێك و ڕێکخراو (تۆکمە) بەخۆوەنابینیٚ، بۆیە هیچ ئایینێك یان هونەرێك یاخود زانستێك بەرهەمناهێنێت"[٢٧]. ئەم ئاماژەیەش شتێکمان پێدەڵێت بە گوزارشتە مەعریفییەکەی (چەقبەستنی کەلتوری) پێدەڵێن کە تێیدا ژیانی مرۆڤایەتی جۆرێك لە مەنگی بەخۆییەوە دەبینێت چالاکییەکان مرۆڤ بەرەوپووکانەوە پەکدەخرێت.

گرنگە ئاماژە بۆ ئەو پێناسەیە بکەین کە بژاردەی ڕێکخراوی یونسکۆیە، لە ساڵی ١٩٨١ لە کۆنفرانسی جیهانی لە شاری میکزیکۆدا پێناسێکی پەسەندکرد کە هەڵگری گشت توخمە کەلتورییەکان و خاڵە هاوبەشەکانی ئەو پێناسانە بوو کە لەوەوپێش بۆ کەلتور کرا، بەگوێرەی ئەم پێناسەیە. کەلتور "بریتییەلەو خەسڵەتە مەعنەوی و مادی و فیکری و سۆزمەندییانەی شوناس دەبەخشێتە گروپێکی کۆمەلآیەتی یاخود کۆمەڵگەیەك. ئەم کەلتورە هونەر و وێژە و باوەڕ و شێوازی پێکەوەژیان و مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ لەخۆدەگرێت".[٢٨] ئەم پێناسەش تاکوئیستا بە پێناسێکی هەمەگیر و گشتگیر دێتەگۆ کە تێیدا کۆدەنگییەکی ئۆرگانی لەسەربێت. وەك دوایەمین داهێنانی دەستەجەمعی لە ناساندنی کەلتوردا ستانداردی خۆی پاراستوە.

•••

*) مەبەست لە چەمك (comprehension): کۆمەڵێك سیفەت و چوارچێوەبەندە کە مانایەکی هەمەکی یان گشتی دەستەواژەیەك ڕووندەکاتەوە لەسەر بنەڕەتی ئەو پێناسە و پۆلێنکردنەی کە ئەنجامدەدرێت، لەڕووی فەلسەفیشەوە چەمك ناسینی شتێکە بەو شێوەیەی خۆی هەیە.

١. سەروەر محەمەد عبدوڵڵا، لێکۆڵینەوەیەك لەسەر کۆسپەکانی کەلتوری بەشداریکردن، گۆڤاری هێشتا، ژمارە(٧بۆ٨) ساڵی ٢٠٠٦لاپەڕە(٦)
٢. چالاك عەلی، لێکۆڵینەوەیەك لەسەر (کورتەیەك دەربارەی کەلتور)، گۆڤاری متمانە، ژمارە (٨) ساڵی ٢٠٠٥لاپەڕە(٨)
٣. د. فازل جاف، وتارێك لەسەر (سیاسەتی کەلتوری)، رۆژنـــــــامەی هەولێر، ژمارە (١١٧٤)، لاپەڕەی فەرهەنگ لاپەڕە (١٥).
*) romance languages ئەو زمانانەن کە لە زمانانی ولاّتان جیابوونەتەوە وەك زمانی پورتوگالی و ئیسپانی و فەرەنسی و ئیتالی و رۆمانی.
٤. داریوش ئاشوری، کەلتور چەمك و پێناسەکان. وەرگێڕانی کۆسار فتاحی، چاپی یەکەم، سلیمانی ٢٠٠٨ لاپەڕە١٣ـــ١٤.
٥. رێبین رەسوڵ ئیسماعیل، لێکۆڵینەوەییەك لەسەر (بەها وەك پێدراوێکی کەلتوری)، گۆڤاری کۆمەڵناسی، ژمارە (٣ـــ٤)، لاپەڕە (٨٦).
٦. داریوش ئاشوری، سەرچاوەی پێشوو.
٧. بەختیار عەلی، کەناڵی NRT، شەوی ٥/١٢/٢٠١١.
٨. هیوا حاجی دێلۆیی، وتاریك لەژێر ناوی (پێناسەکردنەوەی کەلتوری)، گۆڤاری کۆمەڵناسی، ژمارە (١) لاپەڕە (١٣).
٩. ئەنتۆنیۆ گیدز، کۆمەڵناسی، و: حەسەن ئەحمەد، چاپخانەی ئاراس، چاپی یەکەم هەولێر٢٠٠٩، لاپەڕە (٦٤).
١٠. د. حەسەن بەشیرییە. تیۆری کەلتوری. وەرگێڕانی مەنســـــور تەیفوری. چاپخانەی بینایی چاپی ییەکەم ٢٠٠٦ لاپەڕە (٤ــ٥).
*) تیۆری هەڵوەشاندنەوە لەبنەڕەتدا لەسەر بنەمای دژیەکی و بەرهەمهێنانی پرسیار هاتووەتەکایەوە، کاتیك قودرەتی پرسیار گومان لە پرنسیپەکانی پرۆسەی دامەزراوەیەکی میتافیزیکی دروستدەکات، وەلاّمدانەوەی پرسیارەکان دەکەوێتە ئەستۆی میتافیزیکا، کاتێکیش میتافیزیکا ناتوانێت وەلاّم بۆ پرسیارەکان دابنێت، لەناوخۆیدا دووچاری دژیەکی دەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە جاك دریدا دێت تیۆری هەڵوەشانەوە رادەگەیینێت.
١١. رێبین رەسوڵ ئیسماعیل، جاك دریدا و هەڵوەشاندنەوە. چاپخانەی کەمال، سلێمانی٢٠١٠، لاپەڕە ٨٤.
١٢. د. حەسەن بەشیرییە، سەرچاوەی پێشوو.
*) کارل پۆپیەر زانا و فەیلەسوفی بەڕەگەز نەمساویی - بەریتانییە.لە بیست و پێنجەمین ساڵیادی پەیمانی دەوڵەتی نەمسا لە ڤییەنای پایتەخت وتارێکی لەژێر ناوی (دەربارەی پێکدادانی کەلتورەکان) پێشکەشکرد بۆ یەکەمینجار وتارەکە لە ساڵی ١٩٨١ بلاّوکرایەوە. بڕوانە گۆڤاری سەردەم ژمارە (٥٠)ی نیسانی ٢٠٠٧ز. لاپەڕە (٨٦)
١٣. فواد بەعلی، ئیبن خەلدون و کۆمەڵناسی نوێ، وەرگێڕانی زیرەك ئەحمەد و سنور عەبدوڵڵا. چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی ییەکەم، هەولێر ٢٠٠٦ لاپەڕە (٦٠)
*) لە زمانی فارسیدا وشەی فەرهەنگ لەبری کەلتور بەکاردەهێنن، وەك ئەوەی عەرەبەکان وشەی (**الثقافة**) بەکاردەهێنن. کە واتا وشەی فەرهەنگ هەمان مانای وشەی کەلتورە.
١٤. هەڤپەیڤینێك لەنێوان جەمشیدی بێهنام و رامینی جیهانبەگلوو. ژیار و تازەگەری، وەرگێڕانی هیوا عەزیزی، چاپخانەی روون، چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٦لاپەڕە (٦٤).
١٥. بروس کۆهین، سەرەتایەك بۆ کۆمەڵناسی، وەرگێڕانی هێمن شـــەریف، چاپخانەی چوارچرا، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠١٠. لاپەڕە (٤١).

١٦. هەندرێن. زمان ئاسۆیەکە لەنێوان ئاسمان و زەویدا، چاپخانەی بابان، سلێمانی ٢٠١٠، ل(١٩٠).
*) فەرهەنگ لێرەدا بە واتای قاموس یان مەوسوعە دێت، لە زمانی ئینگلیزیدا بە (dictionary) ناودەبرێت جیاییە لە کەلتور.
١٧. داریـــۆش ئاشوری و د. بەهادین پازارگاد، فەرهەنگی نویٚ، و: لە فارسییەوە بورهان قانع، چاپی چوارەم،سلێمانی ٢٠١١، ل(١٢٨)
١٨. عەلی کەریم محەمەد، عەقڵی کوردی و گۆڕان، چاپی یەکەم، ٢٠٠٣، چاپخانەی سیما، لاپەڕە (١٥٥).
١٩. سەلام ناوخۆش، زەردەشتییەتی نویٚ لەنێوان کەلتور و ئایین و نەتەوەدا (خوێندنەوەیەك بۆ چەند بابەتێکی کەلتوری و دژەکەلتوری ناو کۆمەڵگەی کوردی)، چاپخانەی منارە، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠١٠، ل(١٥٩).
٢٠. بابەکی ئەحمەدی، لەمەڕ رۆشنبیر، (هەوڵێك بۆ شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی کاری رۆشنبیر و کەسێتی و ئەرکی رۆشنبیر) وەرگێڕانی ئەحمەد حوسێن، رۆژنامەی یەکگرتوو، بەشی سیٚ بیەم، لاپەڕە (١٤).
*) چەمکی مرۆڤناسی کەلتوری شانبەشانی زانستی کۆمەڵناسی تایبەتمەندی خۆی وەرگرت کە بایەخ بە لێکۆڵینەوە لە تایبەتمەندییە سروشتییەکان و رەفتارە کۆمەلاٚیەتی و فەرهەنگی و کەلتورییەکانی هۆزە جیاوازەکان و تاکەکان دەدات هەوڵدەدات کەسێتی مرۆڤ بەرەو ئاقارێك بەرێت بە مەبەستی بەرەوباشترکردنی ژیان، کاری سەرەکی مرۆڤناسی کەلتوری خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی سەرهەڵدان و گۆڕانکاری و کاریگەری کەلتورە لە ژیانی مرۆڤدا.
٢١. زاهیر محەمەدی و یـــاسین حاجی زادە، ئامادەکراو، فەرهەنگی سیاسی، چاپخانەی رۆژهەلاٚت، هەولێر ٢٠٠٦، ل(٥٤٠ بۆ ٥٤١).
٢٢. د. محمد عابد الجابري، المسالة الثقافية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٤ ص(١٨).
٢٣. د. سعدي ضاوي، مدخل الي علم اجماع الادب، دارالفكر العربي بيروت، ١٩٩٤ص (١٩٧).
٢٤. خەسرەو میراودەلی، ئایین و کەلتور، رۆژنامەی چاودێر لاپەرە (٤)، لاپەرەی روانگە و رەخنە ژمارە (٧٣).
٢٥. دکتۆر ئیبراهیم قاسم پالاٚنی، پێکدادانی شارستانییەتەکان لای هانتنگتۆن، لێکۆڵینەوەیەکی جۆپۆلەتیك، وەرگێڕانی مستەفا سەعید، چاپی بییەکەم ٢٠١٢. سلێمانی. چاپخانەی چوارچرا، لاپەڕە (١٤).
٢٦. جەواد یوسفیان، کاریگەری کەلتور لەسەر چەمکی مرۆڤناسی، وتار، وەرگێڕانی دێرین ئادەم، رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە (٨٧١) لاپەڕە (١٤).
٢٧. حوسێن جەوادی، مرۆڤ بۆ شارستانییەت، شارستانییەت بۆ مرۆڤ، وەرگێڕانی عومەر قادری، چاپخانەی رۆشنبیر، چاپی بییەکەم هەولێر ٢٠١١. لاپەڕە (٨٤)
٢٨. (ژیار و تازەگەری، هەڤپەیڤینێك لەنێوان جەمشیدی بێهنامی و رامینی جیهان بەگلۆ)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# فرەژنی لە یاسای شارستانی وڵاتانی ئیسلامیدا

**نووسینی: فاتمە کەریمی**

**وەرگێڕانی: کەریم قادرپوور**

فرەژنی لەنێوان موسوڵمانانندا زۆر باونییە و تەنیا لەسەدا ٥ی خێزانە ئەلجەزایرییەکان و لە سەدا ٣ی خێزانە مەڕاکشییەکان دەگرێتەخۆ. نەریتی فرەژنی کە ساڵی ١٩٥٦ لە تونس قەدەغەکرا هەڵوەشایەوە. لەو سەردەمەدا تەنیا لەسەدا ٢ی خێزانە تونسییەکان فرەژنی بوون و هەر بەمپێیە، ئەم نەریتە لە سێ وڵاتی باکووری ئەفریقاش بەرەودابەزینە هەرچەن هەتائێستا لە ئەلجەزایر و مەڕاکش لەئاستی یاساییدا قەدەغەنەکراوە، لەگەڵ سنووردایەتی قورسدا بەرەوڕووە.

بەواتایەکیتر لەکردەوەدا، تاك هاوسەری ڕێسایەکی باوە هەرچەن لە گوتاری کۆمەڵایەتیدا بەرگری لەم نەریتە هەتائێستاش بەشێوەی ئەبستراکی بەرچاودەکەوێ. لەتوێژینەوەیەکدا کە لەلایەن گروپی ٩٥ لە ئەلجەزایەر بەڕێوەچوو زۆربەی زۆری ژنان و زیاتر لە سەدای ٥٠ی پیاوان پەیڕەوی لەم نەریتە ناکەن هەرچەن کە ڕێژەیەکی کەم خوازیاری هەڵوەشانەوەی فەرمی ئەم نەریتەن. لە مەڕاکش بە بڕوای ٥٣ لە سەدی خەڵك، پیاوێك، ئەگەر بێتو توانستیماڵیشی بێ، نابێ لە ژنێك زیاتری هەبێ (مافی ژنانی ئەفریقا). وڵاتانی ئیسلامی هەرکامیان بەپێی کولتوری تایبەت بەخۆیان، یاساگەلێکیان بۆ سنووردارکردنی دووبارە ژنهێنانەوە داناوە کە ئاماژە بە تاقمێکیان دەدرێ:

**ئەفغانستان**

یاسای شارستانی ئەفغانستان بابەتی فرەژنی بەشێوەی خوارەوە داڕشتووە:

ماددەی ٨٦: هاوسەگیری لەگەڵ زیاتر لە ژنێك لەو نموونانەی خوارەوەدا دەکرێ بێتەبواری جێبەجێکردنەوە:

١. لەکاتێکدا ترس لە نادادپەروەری لەنێوان ژنەکاندا لەئارادانەبێ.

٢. لەکاتێکدا ئەوکەسە توانایی دابینکردنی نەفەقەی ژنەکانی وەك خواردن، جلوبەرگ، شوێنی نیشتەجێبوونی شیاوی هەبێ .

٣. لەکاتێکدا کە راستی و دروستییەکی شەرعی وەك نەزۆکی ژنی یەکەم یا تووشبوونی بە نەخۆشی چارەسەرنەکراو لەئارادابێ .

ماددەی ٨٧: ئەگەر مێرد بەپێچەوانەی مەرجە باسکراوەکان، هەستێ بە هێنانی ژنی دووهەم، ژنی یەکەم مافی ئەوەی هەیە بەپێی ئەو حوکمانەی لە ماددەی ١٨٣ یاسای شارستانیدا هاتوون لە دادگا بۆ وەرگرتنی غەرامە، داوا تۆماربکات (سارم، ١٣٨٣: ١٣).

### تونس

لەنێوان وڵاتانی موسوڵماندا، تونس، تەنیا وڵاتێکە کە فرەژنی قەدەغەکردووە و وەك تاوان سەیریدەکات. ماددەی ١٨ یاسای "احوال شخصیة"ی ئەم وڵاتە، هاوسەرگیری دووبارەی بە سزای یەك ساڵ بەندیخانە و ٢٤٠ هەزار فرانك غەرامە لە ریزی تاوانە پێناسەکراوەکاندا دانا بەپێی ماددەی ٢١ی هەمان یاسا ژنهێنانی دووهەم کە بەبێ هەڵوەشانەوەی هاوسەگیری یەکەم جێبەجێدەکرێ، هەڵوەشاوەیە (مهر پور، ١٣٨٤: ١٠٦).

### لیبی

دووبارە ژنهێنانەوە لەم وڵاتەدا بەهێندێك مەرجەوە رێگەپێدراوە. لە ماددەی ١ی یاسای نوێی ئەم وڵاتەدا هاتووە: "پیاو بۆی هەیە لەگەڵ ژنێکیتردا هاوسەرگیریبکات ئەگەر هۆکاری بەهێزی هەبێ و ئەگەر یەکێك لەو دوو مەرجەی ژێرەوەی هەبێ:

١. راگەیاندنی رازیبوونی ژنەکەی لە دادگا لە بەشی تایبەتدا.

٢. دەرکردنی حوکمی دادگا بۆ مارەبڕینی ژنی دوایی لە بەشی تایبەتی دادگا لە داوایەك کە لەسەر ویستی ژن سازدەدرێ." گەرەنتی جێبەجێکردنی ئەم یاسایە هەڵوەشانەوەی زەواجە و ژنی یەکەم مافی تۆمارکردنی سکاڵای لەم بوارەدا هەیە (محمد الشریف العالم، ١٩٩٨: ٣٧٩ ـ ٣٧٨).

### یەمەن

لە ماددەی ١٢ یاسای "احوال شخصیة"ی ئەم وڵاتەدا هاتووە: ((بۆ پیاو رێژەی ژنهێنان هەتا چوار ژن رێگەپێدراوە بە جێبەجێکردنی چوار مەرج:

١. تواناى جێبەجێکردنی دادپەروەری هەبێ ئەگینا دەبێ بە ژنێك رازیبێ.

٢. هاوسەر توانای ئیدارەی خێزانی هەبێ.

٣. ژنی دووهەم ئاگاداربێ کە مێردەکەی لەگەڵ کەسێکی جیا لەو هاوسەرگیریکردووە. (سەرچاوەی پێشوو، ٥).

### ئێراق

لە ماددەی ٣ یاسای "احوال شخصیة"ی ئەم وڵاتە بڕگەی ٤دا هاتووە کە: "هاوسەرگیری لەگەڵ زیاتر لە ژنێك رەوانییە مەگەر بە ئیزنی دادوەر و بۆ ئیزنوەرگرتن و جێبەجێکردنی دوو مەرجیتر پێویستە:

١. هاوسەر پێویستە ئەو توانایيە ماڵیەی هەبێ کە بتوانێ نەفەقەی زیاتر لە ژنێك بدات.

٢. بەرژەوەندیەکی شەرعی دەبێ لەئارادابێ.

بڕگەی ٥: "ئەگەر پیاو ترسی هەبوو لە جێبەجێکردنی دادپەروەری چەن ژنی رەوانییە".

بڕگەی ٦: " هەرکەس لەگەڵ زیاتر لە ژنێك هاوسەرگیریبکات بەپێچەوانەی ئەوەی لە بڕگەکانی ٤ و ٥ ی ماددەکەدا

هاتووه به زیندانیکردنی زیاتر له سالێك یا جەریمەیەك كه زیاتر له ١٠٠ دینار بێت یا بەهەردووكیان مەحكومدەكرێ." (بەرزنجی، ١٩٨٠).

**سوریا**

یاسای "احوال شخصیة"ی سووریا، فرەژنی بەڕەوا دەزانێ، بەڵام رێگای به دادوەر داوه ئەگەرهاتو بۆیدەركەوت پیاو ناتوانێ نەفەقەی ژنێك بدات رێگەنەدات دووباره ژنبێنێتەوه. (مهرپور، ١٣٨٤: ١٠٧).

**مالیزیا**

وڵاتی مالزیا لەهێندێك له هەرێمەكانیدا فرەژنی بەئیزنوەرگرتنی پێشوو له دادگا یا له ئەنجوومەنی زانایان گرێداوه. هەڵبەت هێندێك هەرێمیش لەم وڵاتەدا هەن كه له یاساكانی خۆیاندا ئەمجۆره سنووردارییەیان بۆ فرەژنی نییه (سەرچاوەی پێشوو، ١٠٧).

**لوبنان**

له لوبنان یاسایەك كه فرەژنی قەدەغه یا مەرجداربكات بۆ سوننه و شیعەكانی جەعفەری لەئارادانییه و تەنیا ماددەی ١٠ی خێڵی دروزی، فرەژنی قەدەغەكردووه (گرجی، ١٣٨٤: ١٣٢).

**ئەلجەزایر**

له ئەلجەزایریش له یاسای شارستانی ئەم وڵاتەدا فرەژنی بەلەبەرچاوگرتنی پێودانگەكانی شەریعەت و جێبەجێكردنی دادپەروەری بەبێ سەردانی دادگا رێگەپێدراوه، بەڵام یاسا ئەو مافەی هەم به ژنی پێشوو هەم به ژنی تازه داوه ئەگەر مێرد درۆی پێوتوون دەتوانن سەردانی دادگا بكەن و داوای تەڵاقبكەن (مهرپور، ١٣٨٤: ١٠٧).

**مەراكش**

له یاسای "احوال شخصیه"ی ماددەی ٣١دا هاتووه: "ئەم مافه بۆ هاوسەر پارێزراوه كه مەرجی ئەوه دانێ پیاوەكەی ژنیتر نەهێنێ و لەوەها بارودۆخێكدا ئەگەرهاتو پیاوەكه ژنیتری هێنا ژنەكەی مافی ئەوەی هەیه داوای هەڵوەشانەوەی پەیوەندی ژن و مێردایەتی بكات". هەروەها له ماددەی ٣٠دا هاتووه: پیاو ئەركی سەرشانییەتی كاتێك دەیهەوێ ژنێكیتر بێنێ به ژنی یەكەمی رابگەیەنێ و به ژنی دووهەمیش بڵێ كه ژنێكیتری هەیه و بۆ ژن ئەو مافه پارێزراوه كه مەرجی ئەوەدانێ مێردەكەی ژنیتر نەهێنێ و ئەگەر پیاو كارێكی وایكرد كەوایه درێژەی ژیان بەدەست ژنه، ئەگەربێتو ژن وەها مەرجێكی دانەنابێ دەتوانێ له لای دادوەر سكاڵا تۆماربكات هەتا دادوەر لەسەر ئەو زیانەی بۆئەو هاتووەتەپێش، بڕیاربدا و هەرچۆنێكبێ، ئەگەر دادوەر ترسی له جێبەجێكردنی دادپەروەری لەنێوان ژنەكانی بۆ ئاشكرابێ رێگه به چەن ژنی نادات. (مجموعه الوثائق و النصوص القانونیه المتعلقه بوضعیه المرة، ٢٠٠١ م: ١٧٢ به گێڕانەوە له بوداغی، ١٣٨٧).

**میسر**

هیچ بەربەستێك تەنانەت لە یاسای نوێی ئەم وڵاتەدا بۆ دووبارە ژنهێنانەوە نییە (شبلی، ١٣٩٧ ق: صص ٢٤٥ ـ ٢٤٤ بە گێڕانەوە لە بوداغی، ١٣٨٧).

لە بەشی شەشەمی جاڕنامەی مافی خێزان پەسەندکراوی ئەنجومەنی "ژنانی ڕێکخراوی بانگەشە و یارمەتی ئیسلامی" لە قاهیرە پەسەندکراوی ٢٠٠٧ م. چوار ماددەی تەرخانکردووە بۆ دووبارە ژنهێنانەوە:
ماددەی ٧٩ ڕێسا و یاسای ژنهێنانەوە: "هاوسەرگیری دووبارە تەنیا لە چوارچێوەی لەوەپێش دیاریکراو بەپێی شەرع و تەنیا بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی شەرع و کۆمەڵگا و بەمەبەستی توانایی مێرد بۆ وەئەستۆ خەرجییەکانی هەموو ژن و منداڵەکانی و پاراستنی دادپەروەری لەنێوانیاندا لەبواری شوێنی نیشتەجێبوون، خواردن و جلوبەرگ و هەموو کەلوپەلی ژیان ئیمکانی هەیە".

ماددەی ٨٠ لەبواری جیاوازینەکردن لەنێوان ژنەکاندا: "شەرع راسپاردەدەکات بە راگرتنی هاوسەنگی رۆحی و ئەوین دەرنەبڕین و مەیلی رۆحی بەرامبەر بە یەکێك لە هاوسەرەکان."

ماددەی ٨١ لەبواری مەرجی دووبارە زەواجنەکردن: "ژنێك دەتوانێ بۆ هاوسەرەکەی ئەو مەرجە دانێ کە مافی ژنهێنانەوەی نییە و سزای هەرجۆرە سەرپێچییەك لەم بوارەدا خۆی دیاریدەکات."

ماددەی ٨١ لەبارەی مافی تەڵاقی هاوسەری یەکەمەوە دەڵێ: "ئەگەر پیاو بەبێ سەرنجدان بە ڕێساکانی هاوسەرگیری دووبارە، ژنێکیتر بێنێ و ژنی یەکەم زیانێك بەرۆکی بگرێ، لەمکاتەدا ژن دەتوانێ تەڵاقی لێوەرگرێ و ئەگەر پیاو ملی بەم ویستە نەدا ژن دەتوانێ بەسەردانی بۆ لای دادوەر داوای تەڵاق بکات".

**عوممان**

لە ماددەی ٣٧ یاسای "احوال شخصیة"ی عوممانیش بە مەرجی دادپەروەری لەنێوان ژنەکاندا، لەگەڵ ئەوەدا مافی ژن بەسەر پیاودا روونکراوەتەوە، هەروەها لە ماددەی ٥٩دا دیاریکراوە: "پیاو ناتوانێ ژنەکان ناچاربکات کە لەگەڵ ژنی دووهەمی لەماڵێکدا وەمێنێ، مەگەر ژن رازیبووبێ و ئەگەر ژن رازیبوو، لەدوای ئەوەش تووشی زەرەربوو دەتوانێ لە رازیبوونی خۆی پاشگەزوەبێ." (بوداغی، ١٣٨٧).

**یاسای هاوسەرگیری دووبارە لە تاقمێك لە وەڵاتانی ئیسلامیدا بەشێوەی خوارەوەیە:**

خشتەی ژمارە (١): یاسای دووبارە ژنهێنانەوە لە تاقمێك لە وەڵاتانی ئیسلامیدا

| وەڵات | حوکمی | زەواج | بارودۆخ | گەرەنتی جێبەجێ کردن |
|---|---|---|---|---|
| ئێران | قەدەغە، | مەگەر بەمەرج | دادپەروەری و ئیزنی دادگا | جێگیری ماددی |

هۆکارە دیاریکراوەکانی وەك رازیبوونی ژن، ملکەچنەبوونی ژن، زیندانیبوونی ژن و.. ـ مەرجدانان لەکاتی مارەبڕیندا بۆ قەدەغەکردنی مێرد لە دووبارە ژنهێنانەوە و مافی تەڵاق بۆ ژنی یەکەم.

| | | | |
|---|---|---|---|
| **تونس** | قەدەغەکردنی رەها | تاوان | زیندانی + جەریمەی نەخت |
| **سوریە** | رەوا، بەڵام بەدانانی مەرج | | مەسڵەحەت و ئیزنوەرگرتنی شەرعی |

- توانایی نەفەقەی دوو هاوسەر
- ئیزنی دادگا

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئێراق | ئیجازەنەدانی دادگا | مەگەر لەهێندێك نموونە و دۆخی تایبەتدا | ئیجازەنامەی دادگا |

- توانستی دارایی بۆ نەفەقەی دوو ژن.
- بوونی مەسڵەحەتی شەرعی.
- جێبەجێکردنی دادگا زیندانی + جەریمەی نەخت.

| | | | |
|---|---|---|---|
| **عوممان** | رەوا، | بەڵام بەمەرجەوە | دانی نەفەقە |

- جێبەجێکردنی دادپەروەری
- شوێنی نیشتەجێبوونی جیا

| | | | |
|---|---|---|---|
| **لیبیا** | رەوا | بەڵام بەمەرجەوە | رازیبوونی ژن لەبەردەم دادگادا |

- دەرکردنی حوکمی دادگا لەداخوازییەکدا بە ئامادەبوونی ژنەکان.
- هەڵوەشانەوەی زەواجی دووهەم بە ویستی ژنی یەکەم.

| | | | |
|---|---|---|---|
| **مەراکش** | رەوا، | بەڵام بەمەرجەوە | ئیجازەی دادگا |

- ئاگادارکردنەوەی ژنی یەکەم.
- نەبوونی مەرجی مارەنەکردن لەگەڵ ژنێکیتردا لەگەڵ مارەیی ژنی یەکەمدا.
- هەڵوەشانەوەی مارەیی ئەگەرهاتو حەق بە ژنی یەکەم بوو.
- داوای تەڵاق لە دادگا بۆ ژنی یەکەم ئەگەربێتو زیانی پێبگات.

**میسر** ڕەوا بەڵام بەمەرجەوە دادپەروەری

ـ وەئەستۆگرتنی هەموو تێچوونەکان
ـ بەرژەوەندی شەرعی و کۆمەڵایەتی ـ مەرجدانان لەکاتی مارەبڕیندا بۆ ڕێگری پیاو لە مارەکردنی ژنی دووهەم و دیاریکردنی گەرەنتی پابەندبوون
ـ مافی تەڵاق بۆ ژنی یەکەم ئەگەرهاتو دادپەروەری جێبەجێنەکرا

**یەمەن** ڕەوا بەڵام بەمەرجەوە توانای جێبەجێکردنی دادپەروەری

ـ توانای ئیدارەکردنی خێزان و ئاگاداربوونی ژنی یەکەم لەسەر ژنی دووهەم.

•••

# کورتەیەك دەربارەی مێژووی راگواستن و تەعریب لە کوردستانی باشووردا



نووسینی: رەحیم حەمید عەبدولکەریم

بابەتەکەمان تایبەتە بە ناوچەیەك کە بەپێی شوێنی جوگرافی کەوتووەتە سنوری باشوری کوردستان کە ئێستا بەشێکە لە دەوڵەتی عیراقی، ئاشکرایە کە (وشەی عیراق) بە بەشەکانی خوارووی دۆڵی رافیدەین دەوترا ئەمەش لەبەر تەختیی خاکەکەی و نەبوونی چیا و نشێوییەکان[١]، هەروەها لە نەخشەی ئەم گەریدەانە: (ئەلبەلغی، ئەستەخری، ئیبن حەوقەل، مەقدیسی)دا هاتووە کە ئەو شوێنە جوگرافیەی عیراق دەینوێنێت :لە لای باکورەوە لە (تکریت)ی سەر رووباری دیجلەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە بەسرە ودەریای فارسی لە لای باشوورەوە[٢]، لەدوای هاتنی ئایینی ئیسلام وردەوردە دەستیانکرد بە بلاوبوونەوە و بێگومان عەرەب وەکو نەتەوە توانییان ئایینی پیرۆزی ئیسلام بقۆزنەوە بۆ بلاوبوونەوەی نەتەوەیی خۆیان و دروستبوونی شار و شارۆچکەی جۆراوجۆر لەسەر خاکی عیراق و دواتریش لە سەرەتاکانی هەرێمی شاخ کە دەکاتە خاکی کوردستان[٣]، بۆ نمونە بنیاتنانی شارێك بەناوی (واسیت) واتە شاری (کوت)ی ئێستا کە شوێنێکی قامیشەلان بوو هەربۆیە ناونرا بە (واسیتی قامیشەلان) ئەویش لە سەردەمی خەلافەتی ئەمەویدا لەلایەن ئەلحەجاج (الحجاج)ەوە سەرپەرشتیدەکرا، (یاقوتی حەمەوی) دەڵێت: (ئەو شارە لە ساڵی ٨٤ کۆچی دەستپێکرد ولە ساڵی ٨٦ کۆچی تەواوبوو و دانیشتوانەکەی تێکەڵەیەکبوون لە عەرەب و عەجەم)[٤]و شاری (کوفە) لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب و بە سەرپەرشتی (سەعدی کوری وەقاس) دروستکراوە و هەروەها شاری موسڵ کە ئەوکات ناونراوە و پێشتر ناوی (خولان) بووە و بۆیە موسڵمانەکان ناویانناوە (موسڵ) چونکە لەوکاتەدا گەیشتوونەتە ئەو شارە و فەتحیانکردووە و هەروەها شوێنێکە کەوتووەتە نێوان عیراق و جەزیرەوە،[٥] هێرش و تەوژمی جێنشینبوونی عەرەبی لە سایەی فتوحاتی ئسلامی لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا بە مەزنترین کاریگەریی لەسەر پێکهێنانی رەگەزی بۆ دانیشتوانی عیراق پێکدەهێنێت، چونکە بەسرە و بەغدا و موسڵیان جێنشینکرد و چەندین شاری نوێیان دروستکرد و بە درێژایی مێژوو بوونە پێگەگەلێك بۆ هاتنی خەڵکانێکیتر و ئەو تەوژمەی کۆچی عەرەبییە بۆ عیراق بەرزتربووەتەوە تاوەکو لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا (سیانزەهەمی زایینی) گەیشتووەتە ترۆپکی گەشەسەندنی.[٦] (مێژوونووسەکان جەختدەکەنەوە لەسەرئەوەی کە شتێك نەبووە ئاماژەبکات بە بوونی عەرەب لەعیراقدا تا هەزارەی یەکەمی پێشزایین و زاراوەی (ئەلعەرەب) هاوتابووە بۆ وشەی (بیابان- بادیە) لە زمانە سامییەکاندا، (جورجی زیدان) وادەبینێت کە عەرەب پێشئیسلام مەبەستلێی دانیشتوانی دوورگەی عەرەبی بووە بەتەنها و تەوژمی بەعەرەبکردن لە سەردەمی عەباسییەکاندا

بەتوندی بەردەوامبووە)،[٧] دەستپێکردنی هێرشەکانی هێزەکانی ئیسلام بۆ ناوچەکانی کوردستان بێگومان لە ناوچە باشورییەکانی کوردستانەوە دەستیانپێکردووە و گەورەترین شەڕی ئەو ناوچەیە شەڕی (جەلەولا) بووە کە لە سەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتاب بووە لە ساڵی ١٦ی کۆچی،[٨] هەواڵەکانی نەتەوەی کورد کە لەسەر زاری مێژوونووس و گەڕیدە موسڵمانەکان لە کورد و عەرەب و فارس وەکو (ئەلەمدائینی و بەلازەری و ئەحمەد ئەلکوفی دینەوری و یەعقوبی و ئیبن فەقیە و تەبەری و ئیبنوئەسیر و ئیبنوکەسیر و ئیبن خەلدون و ئەستەخری و یەعقوبی و مەقدیسی و ئیبن مەسکویە) هەموویان جەخت لەسەرئەوەدەکەنەوە کە کورد لە سەردەمی سەرەتای بلاۆبوونەوەی ئایینی ئیسلام رووبەرووی فیکری داگیرکاریی عەرەبی بوونەتەوە دژی حوکمی کۆلۆنیالیی ئەمەوی و عەباسییەکان، هەموو ئەو نووسەرانە باس لە چەندین بەسەرهاتی شەڕی نێوان کورد و عەرەب دەگێڕنەوە لە وڵاتی شاخ و زەوی جەزیرە و فارس و حەلوان و دیناوەر و هەمەدان و شەهرەزوور و گرنگترینیان شەڕی شازادە (دیسم کوڕی ئیبراهیمی کوردی) بووە وەکو ئەوەی کە (ئیبنوئەسیر و ئیبن خەلدون) باسیانکردووە و ئەمەویەکان دەستی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیان والاکردبوو بۆ لەناوبردنی خەواریج و ئەو کوردانەی کە لەگەڵیاندا بوون ئەویش هێزی شامیی ناردبوو بۆ شەڕی کوردەکان و هەروەها (محەممەد ئیبن ئەلقەسیمە)ی وەکو حاکمی هەرێمی فارسی دانابوو بۆ هێناوەی هۆزە کوردەکان بۆ ژێر رکێفی خۆیان،[٩] هەروەها ئیبنولئەسیر (ابن الاثیر) لەکتێبەکەیدا ئەلکامیل (الکامل/ بەرگی سێیەم/ لاپەڕە :٢٩) باس لە هێرشی (عومەر عەزرە بن قەیس) بۆسەر شارەزوور دەکات، بەلاّم نەیتوانی و دواتر بە کوشتار و شەڕ (عەتبە ئبن فەرقەد) چووە شارەزورەوە، ئەو شەڕ و هێرش و نەبەردییانەی کە بەدرێژایی مێژوو بەناوی ئایینی ئیسلامەوە دژی میللەتی کورد ئەنجامدراوە ئەوەند زۆرن کە ناکرێت ئێمە لێرەدا باسیبکەین و ئەو نووسەرانەی کە ئاماژەمانپێدان گەواهی ئەو راستییەن و ئەوە بێگومان چەندین کاردانەوەی خۆی هەبووە لەسەر دانیشتوانانی کوردستان و تێکەڵبوونی عەرەب و هاوردەکردنیان بۆنێو خاکی کوردستان بەچەندین هۆکار کە کاریانکردووەتەسەر کەڵەکەبوونی دانیشتوانانی غەیرە کورد لەکوردستاندا، (دەستبەسەراگرتنی رەگەزی عەرەبی بەسەر ناوچەکانی دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەبیدا، تەنها لەڕووی سەربازییەوە نەبووە، بەڵکو لەڕووی مرۆییشەوە ئەنجامدراوە و تەنانەت زۆر لە هۆز و تیرەی جەنگاوەرەکان لەکاتی جەنگدا خێزانەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد)[١٠] و کاریانکردووەتەسەر زمان و ئەدەب و شێوەی نووسین و.. هتد.[١١]،

لە سەدەی حەڤدەهەمی زایینیدا چەندین پێشهات روویاندا کە پەیوەندییان هەبوو بە پێگەی هۆزەکان لە دابەشبوونیان و بلاۆبوونەوەیاندا و ئەوەش بووە هۆی گۆڕانکاری لە نەخشەی عەشایری عیراقیدا ولە ناوەڕاستی ئەو سەدەیەدا کۆچی عەشایری گەورە روویدا لە ناوچەی جەزیرەی رۆژئاوای فورات لەوانە هۆزەکانی شەممەر و لە ساڵی ١٦٤٠ زایینیدا چەندین کۆمەڵە بارکردن و کۆچکردنیان دەستیپێکرد لە (نەجد)ەوە بۆ (عیراق) وەکو هۆزەکانی (شەممەر و دلێم و زوبێد) و (شەممەر توقە) بۆ ناوچەکانی (کوت و دیالا)و هەروەها هۆزەکانی (زۆبەع و ئەلبوحامید وحەدیدی و تەی و عوبێد)و.. هتد.[١٢] لە سەردەمی دەستەلاّتدارێتی عوسمانیدا (مەدحەت پاشا) هەوڵێکی دیاریداوە بۆ جێنشینکردنی هۆزە عەرەبییەکان لەسەر ئەو زەوییانەی کە سەربە دەوڵەت بوون و لەوانە هۆزەکانی (شەممەر و عەنزە و دلێم و کەعب).[١٣]

جگەلەو چەندینجۆر لە دوورخستنەوە و راگواستن بەدرێژایی مێژوو ئەنجامدراوە دژی هۆزە کوردییەکان لەوانە و لە سەردەمی دەستەلاَتداریتی عوسمانییەکاندا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئەویش راگواستنی عەشیرەتی (هەمەوەند)[١٤] بوو، بۆ (تەرابلوس)ی لیبیا دوای ئەوەی کە دەستەلاَتداریتیی عوسمانی چەندینجار بەرانبەر شۆڕشەکانی ئەو عەشیرەتە بوونەتەوە بەناردنی لەشکری گەورە و زۆرجار تووشی شکست بوونەتەوە و بەتایبەتی لە راپەڕینەکەی ساڵی ١٨٩٠ز، راگواستنی هۆزی هەمەوەند لە سەردەمی ویلایەتی (ئەحمەد راسم پاشا ١٨٨٢ز - ١٨٩٦ز) ئەنجامدراوە کە لەو سەردەمەدا والیی تەرابلوس بووە [١٥]، هەروەها کۆمەڵێکیتریان رەوانەی (بەنغازی) کران.[١٦]

بەپێی بەڵگە مێژووییەکان بەدرێژایی مێژوو کوردستان لە کیانێك نەبووە کە ناوی عیراق بێت و بەدرێژایی جەنگی یەکەمی جیهانی و هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانی و داگیرکردنی بەغدا لە لایەن بریتانیاوە و گەیشتنی سوپای بریتانی بۆ نێو بەغدا لە ١٩١٧/٣/١١ و کۆنترۆڵکردنی لە لایەن بریتانیاوە[١٧]و بێگومان لەچەندین شوێنیشدا شەر و پێکدادانی قورسیش روویداوە بە رووی سوپای بریتانیدا[١٨]و بڕیاردانی ئیدارەی بریتانی کە حکومەتێکی عیراقی کاتیی دابمەزرێنرێت بە سەرۆکایەتی (عەبدولرەحمن ئەلنەقیب)و بەشێوەیەکی رەسمی ئەم حکومەتە لە ١٩٢٠/١١/١١ راگەیەنرا[١٩]و دواتریش دامەزراندنی مەملەکەتی عیراقی و دانانی شا فەیسەلی یەکەم وەکو مەلیکی ئەو مەملەکەتە لە ١٩٢١/٨/٢٣دا کە هیچ نوێنەرێکی کورد لە پارێزگاکانی سلێمانی و کەرکوك لە ئاهەنگی دانانیدا ئامادەنەبوون،[٢٠] پێشنیارکردنی مەلیك فەیسەڵ دوای ئەوە هات کە لە ٢٤ی ئاداری ساڵی ١٩٢١دا لە کۆنگرەی قاهیرە ئامادەکاری بۆ کرا[٢١]و هەروەها لەلایەن ئەنجومەن وەزیرانی عیراقەوە (عەبدولرەحمان ئەلنەقیب) لە ١١تەموزی هەمانساڵ داوایانکردبوو کە (فەیسەڵ) بکرێتە مەلیکی عیراق بەمەرجێك کە حکومەتێ بێت پابەندبێت بە دابی پەرلەمانی و دیموکراتی بەندکرابێت بە یاسا،[٢٢] بێگومان تاوەکو ئەوکاتە کوردستان بەشێکنەبووە لەو کیانە و (ویلایەتی موسڵ) کە زۆربەی خاکی کوردستان باشووری گرتەوە جێگای ملململانێ بوو لەنێوان تورکیا و عیراقدا و دواتر کێشەکە خرایەبەردەستی کۆمەڵەی گەلان ئەویش لە ١٩٢٤/٩/٣٠بڕیاری بێکهێنانی لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی دا بۆ لێکۆڵینەوە و پێشکەشکردنی پێشنیاری چارەسەرکردن بۆ کێشەی موسڵ،[٢٣] (لە چوارچێوەی دەرەنجامەکانی ئەو لیژنەیە زۆر بە روونی ئاماژەدەکات بە بوونی سێ ناوچەی جیاواز لەناوچەکەدا هەن کە ئەوانەش عیراقی عەرەبی، جەزیرە، کوردستان و سنووری عیراقی عەرەبی لە باکوورەوە لە هیت و تکریت یاخود چیای حەمرین تێپەڕناکات هەروەها ئەدەبیاتی جوگرافیا لە فتوحاتی ئیسلامەوە تا مێژووی لێکۆڵینەوەکە ١٩٢٥ نە باسکراوە ونە دەردەکەوێت کە ویلایەتی موسڵ (باشووری کوردستان) رۆژێ لە رۆژان بەشێ بووبێت لە عیراق)[٢٤]و دەربارەی پێشنیاری ئەو لیژنەیە ئەوا پێشنیاری ئەوەیانکردبوو (کە ئەگەر رەهەندی ئیتنۆگرافی بەهەند بگیرێت، ئەوا پێویستە دەوڵەتێك بۆ کوردەکان دروستبکرێت، بەڵام ئەگەر رەهەندی ئابوری بەهەند بگیرێت ئەوا دەبێت بلکێنرێت بە عیراقەوە)[٢٥]و لەوکاتە کۆمەڵەی گەلان بڕیاریدا بە لکاندنی باشوری کوردستان بە عیراقەوە بە مەرجێك مافی نەتەوەیی و رۆشنبیری و.. هتد، دانیشتوانەکەی بپارێزرێت، بەمشێوەیە کوردستانی باشوور خرایەسەر عیراقی عەرەبی و لە ١٩٢٥/١٢/١٦ تورکیا بڕیارەکەی پەسەندکرد و لە

١٩٣٢/١/٢٨ ئەوکات عیراق وەکو ئەندامێکی سەقامگیری کۆمەڵەی گەلان وەرگیرا.[٢٦] لەدوای ئەم بڕیارەوە کوردستان وەکو بەشێکی نامۆ کەوتەسەر لاشەی عیراقی تازە دروستکراوی نێودەوڵتی پشتئەستور بە بڕیارێك کە بەرژەوەندی ئابووری زلهێزەکان وایکرد کە بلکێندرێت بەو عیراقەوە، هەربۆیە دەستەلاٌتدارانی یەك لە دوای یەکی عیراق هیچکات درێغیاننەکردووە لەگرتنەبەری ڕێوشوێنگەلێکی زۆر بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد و کەمکردنەوەی پانتایی بلاٌوبوونەوەیان لەو خاکەدا بەو ئومێدەی کە بتوانن ڕەگەزی عەرەب زۆرینە بێت لەناوچەکەدا و خاکی کورد تا بتوانن کورتبکرێتەوە و دیارە ئەم ئامانجە هەروا بەئاسانی نایەتەدی بۆیە لە چەندین ڕێگاوە هەوڵیانداوە بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە، بەلاٌم ئەوەی پەیوەندی بە باسە سەرەکییەکەمانەوە هەیە دوو پرۆسەی سەرەکین کە لەڕاستیدا کاریانکردووەتەسەر بوونی کورد لەناوچەکەدا و بەتایبەتی لە ناوچەکانی جێی ململانێ و سنوورییەکاندا لەگەڵ عیراقی عەرەبی،[٢٧] ئەو دوو پرۆسەیە (ڕاگواستن و بەعەرەبکردن)ە کە بە (تەعریب و تەرحیل) ناوزەدکراون و کارێکی زۆر خراپیان کردووەتەسەر بوونی ڕەگەزی کورد لە ناوچەکەدا[٢٨]و لەهەموو ڕوویەکەوە کارکراوە بۆ سڕینەوەی مۆرکی کۆنی شار و شوێنەکان (بڕوانە خشتەی ژمارە/١[٢٩])و پرۆسەی ڕاگواستن و تەعریب بەچەندین قۆناغدا تێپەڕیوە هەر لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عیراقەوە تاوەکو ئەمڕۆ ئەو پرۆسەیە بەردەوام بوونی هەیە، بەلاٌم بەشێوازی جۆراوجۆر هەر لە هێنانی خێزانی عەرەب بۆ ناوچە سنوورییەکان تاوەکو ڕاگواستنی گوندە سنوورییەکانی کوردستان و تەسفیرکردنی کوردە فەیلیەکان و ڕاگواستنی ناوچەکانی ململانێ لەدوای هەرەسی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ بە دوو جۆر ئەوەی کە بەشداری شۆڕشی کردبوو (عائدون) دەنێردران بۆ خوارووی عیراق و ئەو گوندانەی دەوروبەری ناوچەکانی جێی ململانێبوون لەگەڵ ئەواندا ڕاگوێزران بۆ خوارووی عیراق و ڕاگواستنی ٥٠٠٠ گوندی ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨و ڕاگواستنی بارزانییەکان و ڕاگواستنی ناوچەکانی جەنگی عیراق-ئێران و.. هتد. د.مارف عومەرگوڵ لەکتێبەکەیدا جینۆسایدی گەلی کورد دەڵێت: (تاوەکو ساڵی ١٩٧٩ژمارەی ڕاگوێزراوان لە هەرێمی کوردستان گەیشتە ٧٠٠ هەزار کەس و ئەو ڕاگواستن و پەلاماردانە ١٢٢٢ گوندی گرتەوە لە ناوچەکانی دیالا و سلێمانی و هەولێر و کەرکوك و دهۆك و موسڵ سەرباری ئەوەی کە گوندە سنوورییەکانی عیراق-ئێران وێرانکران)،[٣٠] هەموو یاساکانی زەویوزاری کشتوکاڵی بەدرێژایی حوکمڕانییە جیاوازەکانی عیراق هەردەم وا داڕێژراوە کە دەرەنجامی جێبەجێکردنی ببێتە فاکتەرێك بۆ ڕاگواستن و تەعریبی کوردستان بۆ نموونە لە ساڵی١٩٣٢ بڕیاری ژمارە (٥٠)ی تایبەت بە مافی زەویوزاری کشتوکاڵی دەرکرا و دواتر لە ١٩٣٨دا گۆڕدرا بە یاسای ژمارە (٢٩)ی تایبەت بە هەمان مەبەست و بەپێی ئەم یاسایە (اللزمە) مافی خاوەندارێتی بەڕەسمی درا بەو هۆز و بنەمالاٌنەی کە لەسەر ئەو زەوییانە نیشتەجێبوون و بەمشێوەیە چەندین هۆز و عەشیرەتی عەرەب کە هاتبوونە ناوچە کوردنشینیەکان و نیشتەجێکران و هێنرانەسەر زەوی کورد سوودیان لەو یاسایە وەرگرت و هەر بۆ هەمان مەبەست لە ساڵی ١٩٥١ یاسای ژمارە(٤٣)ی تایبەت بە ئاوەدانکردنەوە و وەبەرهێنانی زەوییەکانی میری داڕێژرا و ساڵی ١٩٥٢چەند تەعدیلێکی تێداکرا و بەتایبەتی لە خاڵی چوارەم و پێنجەمدا ئاماژەکانی بەعەرەبکردن تیایدا بەئاشکرا نیشاندەدەن،[٣١] دواتریش لە چوارچێوەی یاساکانی (٣٠) ساڵی ١٩٥٨و ژمارە (١١٧)ی ساڵی ١٩٧٠و ژمارە (٩٠)ی ساڵی ١٩٧٥ هەموویان وا داڕێژراون کە هاوردە عەرەبەکان بتوانن ببنە خاوەن زەویی کشتوکاڵی و

بێگومان لەپشتەوەش مرامەکەی تەعریب بووە.[٣٢]

راگواستن و تەعریب بێگومان دوانەیەکی تەواکەری یەکتربوونە بۆئەو مەرامەی کە باسمانکرد و تەعریب بە مانای: (دامەزراندنی شوێنی نیشتەجێبوون بۆ کۆمەڵ و هۆزەکانی عەرەب و گۆڕینی ناوی گوند و شار و ناوچەکانی وڵاتی کورد و رێگەخۆشکردن بۆ پەڵاوێشتنی زمانی عەرەبی و چەسپاندنی وەك نەتەوە و ئایین و دەوڵەت)[٣٣]و بەدرێژایی سالآنی دەستەلآتی دەوڵەتی عیراقی کاریانکردووە بۆ کەمکردنەوەی دانیشتوانانی رەگەزی کوردی لەو دەوڵەتەدا بەهەموو شێوازەکان و بۆئەوەش توانیویانە تاڕادەیەك ئامانجەکانیان بپێکن بۆ نموونە لەنێوان سالآنی ١٩٤٧ تاوەکو ساڵی ١٩٩٧کە بەپێی سەرژمێرییەکانی ئەو سالآنە دەرکەوتووە کە ژمارەی کورد زۆر کەمیکردووە لە رێژەی ٣٠,٤٪ لە ساڵی١٩٤٧ەوە تاوەکو گەیشتۆتە رێژەی ١٤,٦٪ لە ساڵی ١٩٩٧دا و ئەمەش بۆ خۆی رێژەیەکی بەرچاوە[٣٤]و زۆرترین ئەم دابەزینە لە ناوچەی دیالا روویداوە (بڕوانە خشتەی ژمارە٢ وخشتەی ژمارە ٣).[٣٥]

تەعریب و راگواستن دوو هۆی سەرەکی بوون بۆ سنووردارکردنی جوگرافیای هەرێمی کوردستان دەنا (رووبەری هەرێمی فیدرالی دەگاتە ٧٨٧٣٦کم٢، رێژەی ١٨٪ی رووبەری عیراق پێکدەهێنێت، دانیشتوانەکەی ٢٢,٤٪ کۆی گشتیی دانیشتوانانی عیراقە).[٣٦] ئەوەی کە گومانی تێدانییە کە سەردەمی دەستەلآتداریی حیزبی بەعس دڕندەترین و سەختترین و خوێناویترین قۆناغ بووە کە دژ بە گەلی کورد ئەنجامدراوە لە راگواستن و تەعریبدا و بێگومان ئەویش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئایدیای حیزبەکە ئاراستەکەی بەو شێوەیە بووە کە دروشمەکەی (ئومەتێکی عەرەبی یەکپارچە بە پەیامێکی زیندووەوە - امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة- ئەو ئاراستەیە دەگەیەنێت و خودی دامەزرێنەری حیزبەکە کە (میشیل عەفلەق) بووە وتوویەتی:(گەلی کورد بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب)و ئەمەش جەختکردنە لەسەر فەوتاندنی گەلی کوردی لەپرۆگرامیدا هەربۆیە لەپراکتیکدا هەموو هەوڵێکیداوە کورد وەکو نەتەوەیەکی سەربەخۆ نەمێنیّ و کوردستان لە کورد دابڕیّ و بیکاتە نشینگەی عەرەب،[٣٧] (عەبدولسەلام مەحەمەد عارف) یەکەمین سەرۆککۆماری عیراق لەچەندینجاردا بەئاشکرا دژایەتی بوونی کوردی کردووە بۆ نموونە لە زمانی مەهداوییەوە گێڕاویەتییەوە کە عەبدولسەلام بەرانبەر بە کورد وتوویەتی (چیمان داوە لە ئێوە و ئێوەش چیتان داوە لە ئێمە، ئێمە جیاین و ئێوە جیان)، لەشوێنێکیتردا کاتێك کە ئامادەکاریانکردووە بۆ شۆڕشی ١٩٥٨و لە شەوی ١٤ی تەمووزدا وتوویەتی دوای ئەگەر شۆڕشەکەمان سەرکەوتوویێت سیّ کۆمەڵ هەیە پێویستە قڕیانبکەین ئەوانیش کورد و مەسیحی و شیعەن.[٣٨] بەهەمانشێوە و بەهەمان بیرکردنەوە لە یەکەمین رۆژی دروستبوونی کیانی عیراقەوە تاوەکو حوکمی سەدام حسەین کە دڕندەترینیان بووە لەسەر هەمان رێچکە کاریانکردووە دژ بە بوونی کورد، لەدوای رووخانی رژێمی سەدام و دروستبوونی دەوڵەتی نوێی عیراق بە دەستورێکی نوێوە و بە سیستەمێکی فیدرالییەوە، بەلآم هێشتا چەندین کێشە ماون بۆ چارەسەرکردن و لەسەررووی هەموویانەوە ناوچەکانی جێی ململانێیە و تاوەکو ئەمڕۆ هێرشی ناسیۆنالیستی عەرەبیش بە شێوازی جۆراوجۆرەوە و بە بەکارهێنانی هەمان شێوازی بەرجەستەکردنی بنەماکانی ئیسلام وەکو داردەست بۆ راگواستن و تەعریبکردن لە

ناوچەکانی ژێر دەستەلأتی حکومەتی ناوەند بەتایبەتی هەر بەردەوامە و کاری خۆی کردووەتــەســەر ئـاوارەبــوونـی هەزارەها خێزانی کورد لە ناوچەکانی ململانێ.

•••

## خشتەکان:

### خشتەی ژمارە(۱)

### ناوی ئەو قەزا وناحیانەی کە بەمەبەستی بەعەرەبکردن گۆڕاون

| ز | ناوی کۆن | ناوی تەعریبکراوی نوێ |
|---|---|---|
| ١ | قەزای خوراسان | بعقوبه |
| ٢ | قەزای شارەبان | المقداديه |
| ٣ | قەزای دێلتاوا | الخالص |
| ٤ | ناحیەی دەلی عەباس | المنصوريه |
| ٥ | ناحیەی قزلڕبات | السعديه |
| ٦ | ناحیەی قەرەهەنجیر | الربيع |
| ٧ | ناحیەی سەرگەڕان | القدس |

خشتەی ژمارە(٢)

ڕێژەی کورد لە عیراقدا لە ساڵی ١٩٤٧ەوە تاوەکو ١٩٩٧ز

| ساڵ | ڕێژەی سەدی کورد لەعیراقدا٪ |
|---|---|
| ١٩٤٧ | ٪٣٠,٤ |
| ١٩٥٧ | ٪٢٣,٤ |
| ١٩٧٠ | ٪٢٢,٩ |
| ١٩٧٧ | ٪٢٢,٤ |
| ١٩٨٧ | ٪٢١,٢ |
| ١٩٩٧ | ٪١٤,٦ |

خشتەی ژمارە(٣)

ڕێژەی گۆڕانی ساڵانەی دانیشتوانانی هەندێ لە پارێزگاکانی کوردنشینی لە ١٩٤٧ تا ١٩٧٧

| پارێزگا | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ڕێژەی گۆڕانی ساڵانە لە ١٩٤٧ تا ١٩٧٧ |
|---|---|---|---|---|
| دهۆك | | ٨٣,٢ | ٧٦ | - ٧,٢ |
| موسڵ | ٣٥,٤ | ٢٦,١ | ١٣,٣ | - ٢٢,١ |
| سلێمانی | ٩٨,٤ | ٩٨,٤ | ٩٣,٩ | - ٤,٥ |
| هەولێر | ٩١,٣ | ٨٩ | ٨٦ | - ٥,٣ |
| کەرکوك | ٥٣ | ٤٨,٢ | ٣٧,٦ | - ١٥,٤ |
| دیالا | ٢٦,٦ | ١٨,٦ | ١٠,٧ | - ١٥,٩ |

**پەراوێزەکان:**

١. د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد/ و: لە عەرەبییەوە: عەبدولاّ رەشید حسێن/ کێشەی کورد لە عیراق، کێشەی سنوورە یان بوون/ چاپی یەکەم/ هەولێر ٢٠١٠/ لا: ١٧.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ل١٧.

٣. لە سەردەمی سولّتانی سەلجوقی (سنجر)ەوە کە لە سالّی ١١٥٧ زایینیدا مردووە، هەرێمی شاخەکان (اقلیم الجبال) لەوکاتەوە بە کوردستان نێوەزەدکراوە – سەرچاوە: د.جمال رشید أحمد/ ظهور الكرد في التاريخ/ الجزء الاول/ الطبعة الاولى/اربيل ٢٠٠٣:ص: ٣١٤

٤. د. علي حسن الخربوطلي/ تاريخ العراق في ظل الحكم الاموي/ مصر:١٩٥٩/ص٣٠٣.

٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو /لا: ٢٩٥ ، ٢٩٩.

٦. د. خليل اسماعيل محمد/ اقليم كردستان العراق/ دراسات في التكوين القومي للسكان/ الطبعة الثالثة/ اربيل ١٩٩٩/ ص٨٢.

٧. د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد/و: عەبدولاّ رەشید حسێن/ کێشەی کورد لە عیراق، کێشەی سنوورە یان بوون/ چاپی یەکەم/ هەولێر ٢٠١٠/ لا:٧٠-٧١.

٨. محمد جميل بندى الروزبياني/ مدن كردية قديمة / الطبعة الاولى/١٩٩٩/ ص ٢٥٧.

٩. د. جمال رشيد أحمد/ ظهور الكورد في التاريخ/ الجزء الاول/ الطبعة الاولى/ اربيل ٢٠٠٣/ ص: ١٠٥-١٠٦.

١٠. رەحیم ئەحمەد ئەمین/ بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینیەکاندا ٦٣٧-٨٤٧ز/ سلێمانی/ لا:١٤.

١١. (لە سەردەمی شەشەمی پێشزایینیدا جۆرە پیتێك داهاتووە پێیدەوترا (پیتی ئوستانی) تا دەرکەوتنی ئایینی ئیسلام، کورد لەنووسیندا بەکاریانهێناوە و پێیاننوسیووە و لەهەمانکاتدا نووسینی ئارامی و لاتینییان بەکارهێناوە، بەلاّم لەپاش سەپاندنی ئایینی ئیسلام لەناوچەکەدا وازیان لەم پیتانە هێناوە و بە پیتی کوفی عەرەبی نووسیویانە) سەرچاوە: رەحیم ئەحمەد ئەمین/ بەعەرەبکردن لە هەرێمە کوردنشینیەکاندا٦٣٧ -٨٤٧ز/ سلێمانی/ لا:٤٣.

١٢. د. خليل اسماعيل محمد/ اقليم كردستان العراق/ دراسة في التكوين القومي للسكان/ الطبعة الثالثة/ اربيل١٩٩٩/ ص: ٨٣.

١٣. د. خليل اسماعيل محمد/ اقليم كردستان العراق/ دراسات في التكوين القومي للسكان/ الطبعة الثالثة/ اربيل١٩٩٩/ ص٤٤.

١٤. هەمەوەند عەشیرەتێکی گەورەی کوردە زۆرتر لە ناوچەکانی چەمچەماڵ و شوان دەژێن و لەچەند تیرەیەك پێکهاتوون لەوانە: (بەگزادە، رەشەوەند، رەمەوەند، سەفەروەند، سیتەبەسار)، دەگێڕنەوە کە ئەم عەشیرەتە لە سەدەی ١٨هەمی زایینیدا لە ئێرانەوە هاتوونەتە ناوچەکە و رۆڵی گرنگیان بینیوە لە مێژووی کورددا وەکو هاوکاریکردنی بابانییەکان و بەرەنگکاربوونەوەی تورکەکان و دەستەلاّتگرتنەدەست لە زەهاو و هاوکاریکردنی شێخی نەمر).

١٥. د. جرجيس فتح الله/ يقظة الكرد/ تاريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥/ اربيل٢٠٠٢/ دار اراس للطباعة والنشر/ ص٦١-٦٣.

١٦. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە (رحيم حميد عبد الكريم /لاپەڕەیەك لە مێژووی راگواستن لەكوردستاندا/ گۆڤاری بانەڕۆژ/ ژمارە٧/ ساڵ٢٠٠٤/ لا:١٢-١٣.

١٧. العراق في الوثائق البريطانية١٩٠٥-١٩٣٠ / ت.فؤاد قزانجي/ تقديم عبد الرزاق الحسني/ ص٢٧.

١٨. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.كمال مظهر احمد/ كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى/ ترجمة محمد الملا كريم/ بغداد / مطبعة المجمع العلمي الكردي/ ص١٨٥

١٩. د.محمد مظهر الادهمي/ الملك فيصل الاول/ بغداد/١٩٩١/ ص ٥٤-٥٥.

٢٠. د.سروة اسعد صابر/ كوردستان الجنوبية١٩٢٦-١٩٣٩/ دراسة تاريخية-سياسية/ الطبعة الاولى/٢٠٠٦/ السليمانية/ ص:٢٤.

٢١. د. محمد مظهر الادهمي/ الملك فيصل الاول/ بغداد/١٩٩١/ لا ٢١.

٢٢. د. علي الوردي/ لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث/ من عام ١٩٢٠-١٩٢٤/ مطبعة المعارف/ بغداد/ ص٨٠.

٢٣. د. فاضل حسين/ مشكلة الموصل، دراسة في الدبلوماسية العراقية والانجليزية والتركية/ بغداد ١٩٧٧/ ص١٢٠.

٢٤. فەرمان عەبدولڕەحمان/ پاكتاوكردنی رەگەزی كورد لە كوردستانی عیراقدا/ دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی / ٢٠٠٦/ سلێمانی/ لا ٢١-٢٢.

٢٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو / لا٢٠.

٢٦. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی كاری لیژنەكەی كۆمەڵی گەلان بۆ چارەسەركردنی كێشەی موسڵ كە ئەوكات هەموو ناوچەكانی هەولێر و سلێمانی و كەركوك و موسڵی لەخۆگرتبوو و زانینی وردەكاری ئەو لیژنەیە و دەركەوتنی زۆرینەیی كورد لەباشوردا بڕوانە: د.جرجيس فتح الله/ يقظة الكرد، تاريخ سياسي١٩٠٠-١٩٢٥م/ اربيل ٢٠٠٢/ ص:٥٣٥.

٢٧. عیراقی عەرەبی هەر لە كۆنەوە بە (ارض السواد) ناوبراوە و مارودی بەمشێوەیە باسی (ارض السواد) دەكات: بەدرێژایی حەدیپە وموسلەوە تا دەگاتە عەبادان و پانییەكەی لە قادسیەوە تاوەكو حەلوانە، بەجۆرە درێژییەكەی ١٦٠ فەرسەخە رووی بەری سەواد رووی بەری عیراقە، بەڵام درێژییەكەی هەندێك كەمترە) سەرچاوە: د. علی حسن الخربوطلي/ العراق في ظل الحكم الاموي/ ١٩٥٩ مصر/ ص: ٣٤٨.

٢٨. پێوانەی خاكی كوردستانی بندەستی عیراق دەگاتە ٨٦ هەزار كم٢ واتە ١٩,٦٢٪ خاكی عیراق پێكدێنێت و زیاتر لە ٣٦٦٨٤ كم٢ بەر شاڵاوی راگواستن كەوتووە كە دەكاتە ٤٢,٦٦٪ خاكی كوردستانی عیراق، لەلایەكیترەوە ئەو ناوچانەی كە بەپێی یاسای ئۆتۆنۆمی لە ١١/٣/١٩٧٠دا دیاریكراوە رووبەرەكەی دەگاتە ٣٦٣٤٧ كم٢و بەوپێیە ٤٢,٢٦٪ خاكی كوردستانی عیراق پێكدەهێنێت و ٥٣,٧٤٪ی لێدابڕاوە بۆ دەستەڵاتی مەركەزی (سەرچاوە: ئەمین قادر مینە/ ئەمنی ستراتیجی عیراق و سێكوچكەی بەعسیان تەرحیل، تەعریب، تەبعیس/ سلێمانی/ ١٩٩٩/ لا:

١٤٩).

٢٩. فەرمان عەبدولڕەحمان/ پاکتاوکردنی ڕەگەزی کورد لە کوردستانی عیراقدا/ دەزگای چاپ و بەخشی حەمدی/ سلێمانی ٢٠٠٦/ لا:١٠٩.

٣٠. د.مارف عومەرگوڵ / جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر رۆشنایی یاسای نێودەوڵەتیدا/ چاپی چوارەم/ هەولێر ٢٠٠٧/ لا:٣٥.

٣١. فەرمان عەبدولڕەحمان/ پاکتاوکردنی ڕەگەزی کورد لە کوردستانی عیراقدا/ دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی/ ٢٠٠٦/ سلێمانی/ لا :٦٠-٦١.

٣٢. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: بەختیار مستەفا محەمەد/ خاوەندارێتی زەویوزاری کشتوکاڵی/ گۆڤاری بژوێن/ ژمارە٦و٧/ ساڵی ٢٠٠٠/ سلێمانی/ لا١١٨-١٣١.

٣٣. د. خليل اسماعيل محمد/ مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في اقليم كردستان العراق/مكتب الفكر والتوعية للاتحاد الوطني الكردستاني/ السليمانية٢٠٠٣/ ص:٩.

٣٤. د. خليل اسماعيل محمد/ اقليم كردستان العراق،دراسات في تكوين القوى للسكان/اربيل/١٩٩٨/ص٤٦.

٣٥. د. خەلیل ئیسماعیا محمەد/ کورد لە سەرژمێریە ڕەسمییەکانی عیراقدا/ گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی/ ژمارە ٢٢ساڵی شەشەم/ مانگی١٩٩٨/٥/ لا:١٢.

٣٦. د. خەلیل ئیسماعیا محەمەد/ و: عەبدوڵلا ڕەشید حسێن/ کێشەی کورد لە عیراق، کێشەی سنوورە یان بوون/ چاپی یەکەم/ هەولێر ٢٠١٠/ لا:٥٨.

٣٧. د. مارف عومەر گوڵ / جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر رۆشنایی یاسای نێودەوڵەتیدا/ چاپی چوارەم / هەولێر٢٠٠٧/ لا:٣٣.

٣٨. احمد فوزي/ عبد السلام محمد عارف، سيرته، محاكمته، مصرعه/ الطبعة الاولى/ بغداد ١٩٨٩/ ص: ٦٣ و ١٣٩.

# شوێنەواری دزکەرە (دسکەرە) لە روانگەی شارستانییەتدا

نووسینی: کەمال نووری مەعروف

## پێشدەستی

لەزووەوە بیرم لەوە دەکردەوە سەردانی گوندی (دزکەرە) یان (دسکەرە) بکەم تا لەنزیکەوە لە سروشتی ئەو قەڵایە تێبگەم کە بەپێی سەردەم پاشماوە دێرینەکانی بۆ کام شارستانییەت لە قۆناغەکانی مێژوو دەگەڕێتەوە. دیارە لە ماوەی تەمەنی کارکردنمدا لە شوێنەوار ئەو دەرفەتەم بۆ نەرەخسا، ئەوەش بەشێکی پەیوەندی بە بارودۆخەکەوە هەبووە و بەشەکەیتریش پەیوەندی بە دوورخستنەوە و گوێزانەوەم بوو بۆ دایەرەیەکیتر کە پەیوەندی بە پسپۆرییەکەمەوە نەبوو، بەڵام دوای خانەنشینکردنم لە ١٦ / ٣ / ٢٠١٤ ئەو سەردانەم کرد لەگەڵ برایان (ئەحمەد محەمەد)و (عەزیز حەمەلاو) بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەری بە ئامانجی ئامادەکردنی نووسینێك لەسەری.

## سەرەتایەك

دەشتی شارەزوور کە لە ناوەندی شوێنەواریدا ناسراوە و دەوڵەمەندە بە پاشماوەی دێرینی چاخە کۆنەکان. بە سەیرکردنێکی دەشتەکە بۆتدەردەکەوێت ئەو بەشەی کە دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای دەشتەکە ناسراوە بە تانجەرۆ بەشێك بووە لە دەشتی شارەزوور لەکۆندا، بەڵام بڕینی ڕێگایەك بەناوی عەربەت- دەربەندیخان ئەو دەشتەی کردووە بە دوو بەشەوە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئەو بەشە بە تانجەرۆ ناسراوە هەروەکو ئاماژەماندا.

گەڕانێك بەو بەشەدا دەرکەوت بە پێتوبەرەکەتی زەویوزارەکەی هەمان سیفاتی پێکهاتەی دەشتی بەناو شارەزووری هەیە کە پڕە لە کەرەسەی عوزوی و مەعدەنی، ئاووهەوای دەشتەکەش بەگشتی لەبارە بۆ کشتوکاڵ بەهۆی بارانی زۆریەوە لە وەرزی بارانباریندا. گوندەکەش هەر لەکۆنەوە ئاوەدانبووە بەهۆی بوونی سەرچاوەی ئاو بۆ ژیانی رۆژانەی دانیشتووانەکەی لەوانە چاوگی باوەسمایل (ئیسماعیل) کە کارێزێکە دەکەوێتە گردی(ماران) کە باکووری خۆرهەڵاتی گوندەکەی گرتووە. دانیشتووانەکەش لەماڵەکانیاندا پەنایانبردووەتەبەر هەڵکەندنی بیر کە کاری رۆژانەی خۆیانی پێمەیسەردەکەن.

### رێگای گەیشتن

رێگای گەیشتن بە گوندی دزکەرە بە ئوتومبێل، رێگای عەربەت- دەربەندیخانی بۆ دەگرین لە لاڕێیەك نزیك بە کۆمەڵگای نەسری کۆن، جادەیەکی قیرتاو دەتگەیەنێت بە ناو گوندەکە و قەڵای دزکەر(دسکەرە)ش کەوتووەتە ناو ماڵەکانی گوندەکە و بەشێك لە خانووەکانی چواردەوریانداوە کە هەندێکیان کەوتوونەتە ناو پشتێنەکەی یان لە بڕینی زەوییەکەیدا خانوو دروستکراوە.

### ناولێنانی گوندەکە

گوندەکە بەناوی قەڵاکەوە ناونراوە (دزکەرە) یان (دسکەرە) ناوی بڵاوبووەتەوە و بووەتە نازناو بۆ هەردوکیان. گەلێك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا گەڕام بۆئەوەی لەوەتێبگەم ناوەکە و رەگوریشەی لەچییەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام بۆم ساخنەبووەوە، هەروەها لە کتێبەکەی مامۆستا جەمال بابان بەناوی (اصول اسماء المدن و المواقع العراقية . ج ١ بغداد. ١٩٨٩) گەڕانم بۆ کرد، بەڵام زانیاریم لەوبارەیەوە دەستگیرنەبوو. بە بۆچوونی من ناوی (دزکەرە) یان (دسکەرە) بە شیکردنەوەی بڕگەی یەکەم (دز) یان (دس) هەر مانای (دز) دەبەخشێت کە بنەچەکەی لە (دژ)ەوە هاتووە بە مانای قەڵا دێت، بە لێکدانی هەردوو بڕگەکە بە قەڵای دەستکرد راڤەی لێدەکرێت. لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا دانیشتووانی گوندەکە قەڵاکە بە تورەکەڕێژ ناویدەبەن کە لەزوودا دانیشتووانەکەی دروستیانکردبێت. بەڵام ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە و راستییەکەی بەرزبوونەوەی گردەکە لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی چینی نیشتەجێبووەکانی قەڵاکە دروستبووە، لەوانەشە نازناوەکە لە (دز کوردەوە) وەرگیرابێت کە مانای قەڵای کورد دەبەخشێت کە دوایی بە وتنەوەی لەسەر زمان بووبێتە (دز) یان (دسکەرە) کە بەلای منەوە ئەگەر بۆچوونەکەم لەشوێنی خۆیدا بێت مانای ئەوەبدات کوردی کۆچەر کە بەنای کورد و گۆران هاتووە لەو ناوچەیە دەواریان هەڵدابێت و بەناوی ئەوانەوە بووبێتە نازناو بۆ گوندەکە و قەڵاکەش. ئەمەش بەڵگەیەکیترمان پێدەدات کە پێمووایە گوندەکە لەکۆنەوە بووبێتە شوێنی مانەوەی عەشایەری کۆچەر و هەر ئەوانیش بە هەرهۆیەك بووبێت بەردەوام مابنەوە و ژیانیان بەرەوپێشبردبێت لەگوندەکەدا. بەڵگەی زیندووش بۆئەو بۆچوونە بوونی نازناوەکەیە کە نوێیە و پەیوەندی بە پاشماوەی قەڵا شوێنەوارییەکەوە نییە. بۆچوونێکیتر سەبارەت بە ساخکردنەوەی نازناوەکە، پێدەچێت لە (دزکورە) وەرگیرابێت کە لەسەر زمان بە وتنەوەی بووبێتە (دزکەرە) (دسکەرە) وشەی (کور (kur-) لە زمانە کۆنەکاندا بە شاخ دەوترێت کە بە لێکدانی هەردوو بڕگەکە قەڵای شاخ دەگرێتەوە کە شوێنی لەدەشتەکەدا دیارە و لەدوورەوە دەبینرێت. نموونەی بەرچاویش بۆ وشەی (دز) وشەی (رەواندز)ەکە بەناوی قەڵای عەشرەت دیاریکراوە.

### قەڵای دزکەرە یان (دسکەرە)

قەڵای ناوبراو شوێنەوارێکی دێرینی ناو گوندەکەیە و لەهەموو لایەکیەوە بە خانوو دەوردراوە و لە قەڵاکەی بۆ براوە بە ئامانجی پەیداکردنی زەوی بۆ دروستکردنی خانوو لەلایەن دانیشتووانەکەیەوە. ئەو بڕینانەش لە قەڵاکەکراوە وایکردووە زیانێکی زۆری بە چینەکانی ناوی گەیاندووە لەهەمانکاتیشدا رووبەری قەڵاکەی بەشێوەیەك

بچکۆلە کردووەتەوە ئەگەر بەوجۆرە دانیشتووانی گوندەکە بەردەوامبن لە قەڵاکە ببڕن لە ماوەیەکی کەمیتردا شوێنی لەسەر رووبەری ناوچەکە نامێنێت، بەوەش لاپەڕەیەك لە مێژووی دێرینی ناوچەکە بۆئەو سەردەمە زووەی شارستانییەت گومناو دەبێت کە پاشماوەکانی لە ئاسەوار بەڵگەن بۆ دێرینی ناوچەکە.

قەڵای دزکەر لەکۆندا شێوەیەکی نیمچە بازنەیی لەخۆگرتووە کە هاوشێوەی (گردەرەش)ی گوندی باریکەی تانجەرۆیە، بەڵام بەرزتر لەو .

شوێنی قەڵاکە لە باکورییەوە جادەی عەربەت - دەربەندیخان دێت و لە باشووری خۆرهەڵاتیشەوە چەمی تانجەرۆ و لە خۆرهەڵاتیەوە زەرایەن و لە خۆرئاواشەوە دەربەند فەقەرە و شەمە و وێلەکەیە. لە رۆژگاری ئیستاماندا ئەوەی ماوەتەوە لە شوێنەوارەکە شێوەکەی لاکێشەییە و پانییەکەی لەناوڕاستیدا (١٠٠) مەترە و بەرزییەکەی لەخۆرئاوایدا (٦٠) مەترە و لەباکووریدا لەنێوان (٣٠ - ٣٥) مەترە.

بەشێوەیەکی گشتی قەڵای ناوبراو لەشێوەیدا دەچێتەوەسەر قەڵای شیروانەی کەلار کە بەشی سەرەوەی لەناوڕاستیدا لەشێوەی مێزەرێکی قوچ دێتەبەرچاو. ئەوەی لە لەتەگۆزە و گڵێنەی هەمەجۆر و شێوە دیارە لەسەر قەڵاکە و دەوروبەری بەڵگەن بۆ سەردەمەکانی بەرلەمێژوو مێژووی کە لاپەڕەیەکی پرشنگدارن بۆ رۆژگارە زووەکەی و خەڵکەکەی بەرەو شارستانییەت هەنگاویان بۆناوە.

**تەمەنی قەڵای دزکەرە (دسکەرە) لەڕووی سەردەمەوە**

قەڵای دزکەرە لەڕووی سەردەمەوە بەپێی لەتەگۆزە و گڵێنەکانی کە بڵاوبووەتەوە و بەهەرلایەکی شوێنەوارەکەدا برۆی بەرچاودەکەون. لەوگەڕانەمدا بەشوێنەوارەکەدا توانیم ژمارەیەکی زۆر لەوبابەتانە بدۆزمەوە کە بوونە بەڵگە بۆ دیاریکردنی سەردەمی شوێنەوارەکە کە بەهۆیانەوە دیاریدەکەن لەوانە:

١. دەمی لەتەگۆزەیەك لە قوڕێکی مەیلەو خۆڵەمێشی و دەڕوانێت بەسەر زەردا و بەشێکە لە کووپەیەکی گەورە، دوو هێڵی پشتێنەیی نەخشکراو بە ملی دەمەکەیەوە دیارە کە بە پەنجە نەخشراون. دەمی لەتەگۆزەکەش بۆ دەرەوە بەشێوەیەکی نیوەبازنەیی کراوەتەوە. لەوپاشماوانەیە کە بۆ چاخی ساسانی دەگەڕێتەوە (٢٢٧ - ٦٥١ ز)لەوشێوەیەش لە سەردەمی ئیسلامیدا بەردەوامی هەبووە، (٦٥١ ؟ ز)و چەرخ لە دروستکردنیدا بەکارهێنراوە

٢. لەتەدیزەیەکی رەشباوی تەنك رەنگەکەی بەسەر خۆڵەمێشیدا دەڕوانێت دەمەکەی بۆ دەرەوە کراوەتەوە. پێوەی دیارە لە رۆژگاری خۆیدا بۆ چێشتلێنان بەکارهێنراوە، چونکە بە دیوی ناوەکەیەوە توێژێکی رەشباو بەرچاودەکەوێت، وەکو سەردەم بۆ چاخی ئاشوری دوایی دەگەڕێتەوە واتە (٩٠٠ - ٦١٢پ .ز) لەدروستکردنیشیدا چەرخ بەکارهێنراوە و سووکراوەتەوە.

٣. بنکی لەتەسواڵەتێکی درێژکۆلەی ساکار، لە قوڕێکی سورباو دروستکراوە و سوورکراوەتەوە کە بەلای زەردا دەڕوانێت، لەدروستکردنیدا چەرخ بەکارنەهێنراوە و قوڕەکەشی پاکنییە تێکەڵاوە لە وردەلم و گەردیلەی گەچ، وەکو سەردەم بۆ چاخی وەرکا دەگەڕێتەوە واتە هەزارەی چوارەمی پ.ز.

٤. دولێکی بەردینی ناوخڕی توێکڵ ئەستوری مەیلەو سپی کە لە حەوشەی ماڵێکی تەنیشت گردەکە بەرچاومکەوت، درێژییەکەی ٨ سم و بەرزییەکەی ١٥ سم، پێدەچێت بۆ کوتاندنی دانەوێڵە بەکاریانهێنابێت یان بۆ پێداویستییەکانیتری وەکو هاڕینی رەنگەکان سوودیانلێبینیبێت کە بەپێی شێوەی دەمەکەی بۆ سەردەمی (وەرکا) دەگەڕێتەوە بەشێوەیەکی نارێکیش دروستکراوە.

٥. بە بڕینی قەڵاکە لەلاکانیەوە پاشماوەی گۆڕی زۆر بەرچاودەکەون، لەهەندێکیاندا ئیسقان یان کاسەی سەرمان دییەوە کە لە گۆڕی ئاساییدا دیارن نێژراون بەوشێوەی کە باوبووە لەناویاندا و بەشێکیان بچکۆلەبوون لە هی منالْ دەچوون. واتە بەشێوەی کۆکراوەبوون. قاچ و دەستیان بۆسەر سنگیان هاتوونەتەوە. ئەوەش بەڵگەیە لایان مردووەکە خەوتبێت. هاتووەتە بەرچاویان. بەچینەکانەوە دیاربوون لەژێر چینی ژوورەکاندا نێژرابوون ئەوەش بەڵگەی خۆشەویستییانە بۆیان کە لە خۆیان جیانەکردووەتەوە، چونکە لایانوابووە بەئاگاهاتنەوەیان بووە، وەکو سەردەم بۆ چاخی وەرکا دەگەڕێتەوە کە ژیانی دانیشتووەکە بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە بەرێوەچووە.

٦. هێلکە شەیتانۆکە یان ناسراو بە قاقلە جنۆکە بە ژمارەی زۆر بە چینەکانی خوارەوەی شوێنەوارەکەوە دیارن کە بۆچاخی وەرکا دەگەڕێنەوە. مرۆخی قەڵاکەش بۆ ژەمەخواردن دوای گەرمکردنی بەکاریهێناوە. ئەو دیاردەیە لە گردی (قالیج ئاغا) لە هەولێر و گردەڕەش لە گوندی باریکەی نزیك عەربەتیش بەرچاودەکەون، بەڵام دەرکەوتووە قاقلەجنۆکە لە سەردەمی بەردینی دواییدا کە ئاووهەوا بەرەوخۆشبوون چووە و شێداربووە بەتایبەتی لە بەردەمی ئەشکەوتی زەرزی لە چەمی رێزان بەپێی رای (خاتوو گاڕود) نەخوراوە، هەروەکو دەڵێ بەڵگەیەکمان بەدەستەوەنییە کە مرۆخی زەرزی بەکارهێنابێت.

٧. ئەگەر کاری کنەوپشکنین لەوقەڵایەدا بکرێت پێدەچێت لە چینەکانی خوارەوەیدا سەردەمەکانی عوبێد و کۆنتریش دەربکەون واتە بەرلە هەزارەی چوارەم کە هاوتەمەن دەوەستێتەوە لەگەڵ گردی حەسونەی ناوچەی موسڵ.. لەئیستادا لەبەرئەوەی قەڵاکە بە گژوگیا داپۆشرابوو گەڕانپێیدا گرانبوو بۆ دەستخستنی زانیاریتر ئەگەر بەوشێوەیە نەبوایە دەمانتوانی بەردەئەستێو بەڵگەیتریش لە پاشماوەکانی ئاسەوار بەرچاوبخەین تاوەکو زیاتر سنووری شارستانییەتەکەی دیاریبکەین.

٨. بۆئەوەی قەڵاکە لەوەزیاتر چواردەورەکەی نەبڕێت یان خانوو تەنگی پێهەڵنەچنێت، بەپێویستی دەزانم دیوارێکی بەردین بە چواردەوری دیاریبکرێت. یاخود تەلبەنگ بکرێت بۆ مانەوەی لە دەستدرێژی. دیارە بوونی دانیشتووان لەودەوروبەرە هۆکارە بۆ زیانگەیاندنی زیاتر بەوپاشماوەیە کە نهێنییەکانی ناو ورگی گردەکە پەیوەندییەکانی ناوچەکە بە شارستانییەتی دەوروبەر دەردەخات. تکاموایە لایەنی بەرپرس هەولێکبدات بۆ دابینکردنی پاسەوانێك بۆی لە دانیشتووانی گوندەکە بۆئەوەی بپارێزرێت.

## سەرئەنجام

هەروەکو دیارە مێژووی دێرینی ئەو قەڵایە بەشێکە لە شارستانییەتی دەشتی شارەزوور لە سەردەمی وەرکا ئەگەر بەراوردیبکەین بە پاشماوەکانی گردەڕەشی باریکە و قالیج ئاغای شوێنەواری ناسراو کە لەناو ئاسەوارە

دۆزراوەکانیاندا سەرەتەشیش لەناویاندا هەبووە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کاری رستن و چنین واتە جۆلایی لە هەزارەی چوارەمی پ.ز لەکوردستاندا سەریهەڵداوە. ئەوەش دەرکەوتنی دیارە بۆ دوای سەرهەڵدانی گوندی کشتوکاڵی وماڵیکردنی ئاژەڵ دەگەرێتەوە هەروەکو قەڵاچەرمەو و زاوی چەمی و ئامرخانی مەندەلی دۆزرانەوە و کەوتنەبەرچاو. دیارە دۆزینەوە و کارکردنیش لەوبوارەدا بیرۆکەکەی هەر بۆ ئافرەت دەگەرێتەوە، چونکە پیاو سەرقاڵبووە بەراوکردنی ئاژەڵی کێوی.

•••

# ساخکردنەوەیەکی مێژوویی سەبارەت بە جەژنی نەورۆز و ناوەکەی

نووسینی: زەردەشت کەمال

لە باسی نەورۆزدا ئەو جەژنەی کە تایبەتە بە گەلانی هیندۆئاری و گەلی کوردیش دەچێتەوەسەر بنەچی ئەو گەلانە و ئەو جەژنەش لای بەرز و پیرۆزە و جەژنێکی نەتەوایەتییە.. بۆیە بەلای منەوە لێکۆڵینەوە لەسەر ناوەکە و بەستنەوەی بە مێژووی دێرین و شوێنەوارەوە و سەرهەڵدانی وەکو نەریت و بۆنەی ساڵانە یادکردنەوەیە کە بۆ هەموو سەری ساڵێکی کوردی کە دەبێت لەبەرچاوبگیرێت و گرنگی پێبدرێت.

ئەوەش دەمانگەیەنێتە مەبەست بۆ کردنەوەی گرێکوێرەی مێژووەکەی و ناوەکەی یان ئەو مەبەستی کە جەژنەکە لەناو ململانێی زلهێزەکانی رۆژگارە زووەکەدا بۆ مەرامی سیاسی توانیویانە بەکاریبهێنن.

ساخکردنەوەی ناو و مێژووەکەی و چوونەناو وردەکارییەکانیەوە بەوجۆرەش کارێکی ئاسانییە، چونکە لەزووەوە جەژنەکە تێکەڵ بە ئەفسانە و داستان بووە. نەورۆزیش لە رۆژگارێکی زووەوە زانیاری لەسەری دەماودەم هاتووە و وایکردووە لە مەبەستی خۆی دووربکەوێتەوە.. بۆیە قسەکردن لەسەری پەلهاوێژە بۆ زۆر شت کە پێویستە لەسەرمان بەدوایدا بڕۆین تاوەکو دەگەینە مەبەست.

### وشەی نەورۆز دەربڕین لەچیدەکات:

نەورۆز لە زمانی کوردیدا گەلێك لێکدانەوەی لەسەرکراوە، سەرەتا دەمەوێ بڵێم نەورۆز لە دوو بڕگە پێکهاتووە، یەکەمیان (نەو) بە مانای نوێ یان تازە یان شتێك نزیك بەو مانایانە. وشەی دووەم (رۆز) یان (رۆژ) بە مانای رۆژی ئاسایی دێت کە لای ئێمە وشەی مێژووشی بۆ بەکاردێنین، دووەمیان بە مانای خۆر دێت کە لە زمانی سۆمەریدا بە وشەی (U4) (ئوو ٤) نووسراوە.

بە لێکدانی هەردوو وشەکە مانای رۆژێکی نوێ یان خۆرێکی نوێ لە وەرزێکی نوێدا دەبەخشێت. ئەمەش لەهەموو شێوەکاندا بەڵگەی ئەوەمان دەداتێ کە بە مانای وەرزێکی نز گۆڕاوە. لە زمانی پەهلەوی کۆنیشدا بە هەردوو شێوەکەی ئەشکانیی و ساسانی ئەم وشەیە، واتە نەورۆز بووەتە (نوگ رۆز) پاشان گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە و بووەتە (نوك رۆز)، بە وردکردنەوەی ناوەکەیان لێکدانەوەی ماناکەی جارێکیتر هەرهەمان مانا کوردییەکە شوێنی دەگرێتەوە کە لەمەوبەر ئاماژەمانپێدا.

(نەورۆز) کە لە ئەدەبیاتی فارسیدا بووەتە (نیرۆز) بە جەژنی (فەروەردین) (مارت- نیسان)و جەژنی بەهار و بەهارە جەژنە بەناوبانگە.[١]

لێکدانەوەیەکیتر لەسەر وشەی نەورۆز لە (قاموس الفارسیە)دا هاتووە، هەروەکو دەڵێ: رۆژی نوێ یەکەم رۆژی سەری ساڵی ئێرانییە کە لە مانگی (فەروەردین) (مارت - نیسان) لە سەرەتای بەهاردا دەستپێدەکات. نەورۆزیش جەژنێکی میللی ئارياييەکانە و بە نەورۆزی سوڵتانی ناویدەرکردووە.[٢]

گەڕانەوەیەکیتر بۆ فەرهەنگی (المعجم الذهبي) هەمان مانای پێشوو دەبەخشێت، هەروەها دەڵێ: لای ئاريايیەکان جەژنێکی نیشتمانییە لەگەڵ ٢١ی مارتی هەموو سەری ساڵێکی کوردی یەکدەگرێتەوە کە بە دوو جەژن دانراوە: یەکەمیان نەورۆزی عامی، دووەم نەورۆزی تایبەت کە هەریەکێك لەو دووانە (٦) رۆژ دەخایەنێت و لە ١٣ی مانگدا کۆتاییدێت کە بە جەژنی سیانزەبەدەر ناسراوە و تێیدا ئاهەنگدەگێڕن.[٣]

جارێکیتر لە فەرهەنگی دانشگادا لێکدانەوەی ناوەکە هەمان مانای پێشوو وەردەگرێت، هەروەکو دەڵێ: لە رۆژی سیانزەبەدەر جەماوەر بەرەو دەشت دەڕۆن.[٤] ئەوەش بۆ بەسەربردنی کاتێکی خۆش لە ئاووهەوای سازگار و رزگاربوون لە وەرزی قاتوقڕی و تەڕوتووشی کە تێیدا دیاری جەژنانە پێشکەشدەکەن.

لەئاوێستادا هاتووە بەهۆی ململانێ لەنێوان (ئەنگەر مینیۆ)و (ئورمزد) یان (هورمزد) بانەکانی ئێران سەرماوسۆڵەیەکی گەورە و بەهێز روویتێکردووە و بەفر و شەختە رووی زەوی داپۆشیووە. لەوڕۆژگارەدا دوو وەرز دەرکەوتووە: یەکەمیان زستان و دووەمیان بەهار کە هەریەکێکیان (٦) مانگی خایاندووە، بەڵام سەرئەنجام سەرکەوتن بۆ (ئورمزد)ی خوای حەق و دادوەری بووە و بەهار کوودەتای بەسەر زستانی شەڕ و ناخۆشیدا هێناوە. وادیارە لێکچوونێك لەنێوان ئەوەی لەئاوێستادا هاتووە لەگەڵ داستانی چوونەخوارەوەی عەشتاردا هەبێت بۆ دنیای مردووەکان بۆ رزگارکردنی (دەموزی) (تەمموز) کە نەیتوانیوە رزگاری بێت لە دەستی پاسەوانەکان.. بۆیە (دەموزی) بەپێی کاتی مانەوەی لە دیلێتی دنیای خواروو، مانەوەی دابەشکردووە لەگەڵ (کاشتن ئانای) خوشکی کە بۆ هەریەکێکیان (٦) مانگ بمێنێتەوە. بەوپێیە (دەموزی) لە کۆتایی کانوونی یەکەم دێتەدەرەوە کە باران دەستپێدەکا و ژیانیش بۆ زەوی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی بەهار شوێنی بگرێت.[٥]

**پەیوەندی لەنێوان جەژنی نەورۆز و نەخشە هەڵکۆڵراوەکانی ئەشکەوتی گوندۆك لە ئاکرێ:**

لە باسی ئەم جەژنەدا و چوونەناو وردەکارییەکانی دەتوانین بەراوردبکەین بەو تابلۆیەی لەناو ئەشکەوتەکەدایە و دەکەوێتە لای دیواری راستی دەرگاکەی تابلۆ هەڵکۆڵراوەکە بەشێکە لە دیمەنە هەڵۆڵراوەکانیتری ئەشکەوتی گوندۆك لە کوردستانی باشوور کە بەشەکانیتری لەدەرەوەی دیواری دەرگای ئەشکەوتەکە هەڵکۆڵراون.

نەخشەکە پێکهاتووە لە ژمارەیەك گیانلەبەر کە بەرەو رووی پیاوێك دەجوولێن لەسەر کورسییەکی بێدەسك لەسەری دانیشتووە و روویکردۆتە لای راست. بەرگێکی پۆشیوە هەتاکو بەرپێی شۆڕبووەتووە و قژێکی زۆری بەسەرەوەیە و دوو شاخیش لەسەریەوە دەرچووە و پرچێکی درێژیش بەسەر پشتیدا هاتووەتە خوارەوە و دەمووچاویشی بێڕیش و سمێڵە. دەستی راستی داناوە و دەستی چەپی بۆ پێشەوە بردووە و خۆراك بە بزنێك دەدات

كە لەبەردەمیدا بەپێوە لەسەر هەردوو پاشووی راوەستاوە. لەنێوان سەری بزنەكە و پیاوەكەدا شتێك بە ئاسۆیی كەمێك لار، نزیك بە یەك بەدیدەكرێت لەشێوەدا وەكو دار بێت وایە كە پێدەچێت درەخت بێت. لەدوای بزنە كێوییەكە بەرازێك بەهەمان رێڕەو دەبینرێت لەوانەیە كێوی بێت شیردەدات بە یەكێك لە بەچكەكانی كە كەوتووەتە نێوان هەردوو قاچیەوە، لەپشتییەوە وێنەی مرۆڤێك دیارە بەهەمانشێوە بەرەوپێشەوە دەڕوات جلكێكی درێژی لەبەردایە و پرچێكی درێژ بەسەر پشتیدا هاتووەتەخوارەوە و دەستی راستی بڵندكردووە بەشێوەیەك پەنجەكانی بەر تەنیشتی گیانلەبەرەكە كەوتووە و دەستی چەپی بۆپێشەوە بردووە. لە كۆتایی نەخشە هەڵكۆڵراوەكەدا دیمەنی ئاژەڵێك دیارە، كەوتووەتە دوای پیاوەكە وەك درزێك كەوتووەتە نێوانیانەوە، ئەم وێنەیە زیاتر لەوەدەچێت سەگێك بێت كلكی بەشێوەیەكی ئاسۆیی بەرزكردبێتەوە و دوای پیاوە كەوتبێت . لەبەرامبەریشیدا واتە لەوسەری تابلۆكەوە لەدوای پیاوە دانیشتووەكەوە دیمەنی سەگێكیتر دەركەوتووە كە دەمی كردووەتەوە و كلكی كەمێك بەرزكردووەتەوە، بەدووری نازانم ئەو دوو سەگە كە هەریەكە و لە جەمسەری خۆیاندا دەركەوتوون دەكرێت ناوی دوو پاسەوانی لێنێین بۆ رانەمەڕەكە. لەم دیمەنەدا كە بە تابلۆی گیانلەبەرەكان پێناسەمان بۆكرد ئەو كەسەی كە لەسەر كورسییەك دانیشتووە و سەری قژێكی زۆری پێوەیە و دوو شاخی بەسەرەوەیە، ئەو كەسە دیمەنی خوای بەناوبانگ (تەموز-دەموزی)یە كە لەبنەچەدا خواوەندی سەوزایی و رووەكو ئاژەڵ بووە و بەوە ناسراوە كە بووەتە هاوسەری خواوەندی خۆشەویستی (عەشتار - ئیننەننا) كە لەوەوە پەرستنی پیتاندن هاتووەتە كایەوە و لە شارستانێتی نێوان دوو رووباردا بڵاوبووەتەوە.. بۆیە بەپیتوبەرەكەتی زەوی و پێگەیشتنی دانەوێڵە و بەرهەم و بەرووبوومەكەی بەلای ئەوانەوە بەندبووە بە لێكنزیكبوونەوە و جووتبوونی ساڵانەی هەردوو خواوەندەكە كە دیارە ئەوەش لە سەرەتای وەرزی بەهاردا روویداوە.

ئەو گیانلەبەر و دارودرەختانەی لەم دیمەنەدا بەرچاودەكەون بەرهەمی ئەو بەیەكگەیشتنەن، چونكە بەهۆی پیتاندنەوە درەختەكان نەشونمادەكەن و ئاژەڵەكان زاوزێدەكەن و لە سەرەتای وەرزی بەهاردا زۆردەبن. لەبەرئەوەیە لەو وەرزەدا ژیان نوێدەبێتەوە و گەرمیی تینی بۆ زەوی دەگەڕێتەوە و بەرگی رەنگاوڕەنگ بۆ دارودرەخت دەگەڕێتەوە و زەویش سەوزدەبێت و ئاویش زۆر دەبێت و كانیاویش دەتەقێت كە بەرلەوە بۆ ماوەیەك بە قۆناغێك سڕبوون و كەم چالاكیدا تێپەڕبووە.[٦]

نەتەوە كۆنەكانی سەر خاكی كوردستانی یەكەم (زاگرۆس) كە ئێمەی كورد لە نەوەی ئەوانین لە سەرگوزەشتە و داستان و ئەفسانەكانیاندا رواندن و گەشەكردنی رووەكیان لەزەویدا بەستووەتەوە بە زاوزێی نێوان عەشتار و دەموزی هەروەكو لەوەوبەر باسمانكرد، باسیش لە خواوەندی ئاسمان و زەمین دەكەن، هەروەها باس لە لەدایكبوون و مردنی نەوەكانیان دەكەن كە بریتینلە رووەك و دارودرەخت. بۆ هەریەكێك لەو دیاردانەش خواوەندێكی تایبەتییان بۆ داناوە و پەیڕەوی نەریت و خووڕەوشتەكانیان كردووە، نموونەش بۆئەوە هەستانیان بە ئاگركردنەوە، وەك هێمایەك بۆ تیشكی خۆر و زیندووكردنەوەی ژیان لەڕووەكدا.[٧]

بەراوردێكیتر لەنێوان جەژنی نەورۆز و جەژنی ئاكیتۆی بابلی كە لە مانگی نیسانی هەموو ساڵێكدا سازكراوە، ئەوەدەگەیەنێت هاوشێوەبن لەبۆنەكەدا.

**راوبۆچوونمان لەسەر جەژنی نەورۆز:**

کورد کە لە نەوەی گەلانی هیندۆئارییە لە رۆژگاری ئەمرِۆدا ئاهەنگدەگێرِێت لە ٢١ی مارتی هەموو ساڵێکدا کە هاوکاتە لەگەڵ هاتنی ساڵێکی نوێی کوردیدا بە بۆنەی هاتنی جەژنی نەورۆزی میللی کە تێیدا کاوەی ئاسنگەر سەردەکەوێت بەسەر زوحاك (دەهاکی) تاوانبار و تێیداکردنەوەی ئاگریش نیشانەیە بۆئەو سەرکەوتنە.

لێرەدا پرسیارێك دێتەپێشەوە ئەویش ئایا نەورۆز وەکو جەژن و ئاهەنگگێران سەرەتاکەی بەپێی بەڵگەکان بۆ کام رۆژگار دەگەرِێتەوە؟ لەهەمانکاتیشدا ئەم جەژنە چۆن و کەی بووەتە نیشانە بۆ جەژنی میللی یان نەتەوایەتی؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بەلای منەوە ئەم جەژنە بەپێی پاشماوە شوێنەوارییەکەی ئەشکەوتی گوندۆك کە لە دوو کۆمەڵەی هەڵکۆڵراو پێکهاتووە وەکو مێژوو سەردەمەکەی پەیوەستە بە چاخی دەسەڵاتی میتایی[٨] کە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی پانزەیەمی پ.ز دەگەرِێتەوە کە ئاهەنگگێرانیان ئەوانەی تێیدا هاوبەشییانکردووە لەوبۆنەیەدا وەکو بەدیمەنەکانەوە دیارن، ئەوەش بە راوکردنی ئاژەڵەکە و خۆشبوونی ئاووهەوا و هاتنی وەرزی بەهار و ئاگرکردنەوە و رێورەسمی پیرۆزکردنی جەژنە کە لەنێوان ژنو مێردەکەدا یان (موغ)و ژنە مووغدا یان گەورەی ماڵدا هەستاون بە هەنووکردنی ئەو دوو منداڵەی نێوانیان بە خوێنی ئاژەڵەکە کە لەسەر مێزێك بە رووتی وەستاون، وەکو بە تابلۆکانەوە دیارن ئاهەنگگێرانەکە شێوەیەکی ئایینی لەخۆگرتووە، تێیدا خواوەند (دەموزی- تەمووز) هاوبەشی تێداکردووە کە پیرۆزکردنی بۆنەکەیە و بەوشێوەیە کراوە، ئەمەش نەریتێکی ساڵانەیە و لەوچوارچێوە ئایینییەدا هەستاون بە ئاهەنگگێران. نابێت ئەوەش لەیادبکەین کە جەژنەکە وەکو سەرەتا بۆ سەردەمی خۆپەرستی واتە میترایی دەگەرِێتەوە کە میتانییەکان پێوەیناسراوبوون.

ئەم جەژنە هەروەکو لەسەرەتادا باسمانکرد ململانێ بووە لەنێوان هێزی چاکە و خراپەدا و تەرازووی دەسەڵات لەدواییدا هەر بەلای چاکە و رووناکیدا شکاوەتەوە. لێرەدا پێویستە هەروەکو لە بەشی دووەمی پرسیارەکەدا ئاماژەمانپێدا ئەوە بزانین لە هەزارەی یەکەمی پ.ز تەرازووی هێز لەنێوان زلهێزەکانی رۆژگارەکەدا گۆرِانکاری گەورەی بەسەرداهاتووە.

هەندێك لەوانە وەکو بابلیی و کاشی و هیتی لە گۆرەپانی سیاسیدا ناویانکوژاوەتەوە و هەندێکیتر هاتوونەتە شوێنیان لەوانە میدییەکان[٩] و فارس کە توانیویانە دەسەڵات بگرنەدەست و سنووریان فراوانبکەن و ناوچەیەکی زۆر داگیربکەن لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا واتە ئیمپراتۆرییەتی گەورە دروستبکەن تاوەکو سەرکردایەتی دنیای خۆرهەڵاتی کۆن بکەن لەرووی رامیاری و سەربازییەوە.[١٠] لێرەدا باشترەوایە بڵێین نەورۆز یان (نیرۆز) هەروەکو فارس دەڵێ بووەتە جەژنێکی میللی و لە هەردوو رووەکەیەوە رامیاری و گەلێ دەوری خۆی بینیوە.

سەرچاوەکانی مێژوو باس لەوەدەکەن کە گەورە پادشای ماد (هووەخشتریتە) واتە کەیخسرەو (٦٣٣- ٥٨٥ پ.ز) لەنەورۆزدا تاجی پادشایەتی لەسەرناوە و هەر لەوبۆنەیەشدا بووە بەپێی ئەو وەسفەی لە خەوەکەی ناحوم پێغەمبەردا هاتووە، کۆتایی بە دەسەڵاتی ئاشوور هاتووە لە نەینەوای پایتەختدا لە ساڵی ٦١٢ی پ.ز کە داگیریکردووە.[١١]

لە رۆژگاری دەسەڵاتی هخامەنشییەکاندا واتە (٥٥٠- ٣٣٠ پ.ز) کاتێك کۆرشی گەورە ئەکبەتانەی پایتەختی داگیرکردووە هەروەکو مێژوو دەڵێ: بەوبۆنەیەوە ئاگرێکی گەورەی کردووەتەوە کە هێمایە بۆ سەرکەوتن. واتە لە جەژنی نەورۆزدا بووە کۆتایی بە دەسەڵاتی مادەکان هاتووە بەوپێیەی لە مێژووی (ایران باستان- حسن پیرنیا- ج١ – مجلد ٢ ص ٢٨-٢٩) هاتووە. کاتێکیش زەینەفوون بە لەشکرەکەیەوە گەڕاوەتەوە بۆ یۆنان ساڵی ٤٠١ی پ.ز لەرێگایدا کە بەکوردستاندا تێپەڕیوە ئاماژەبەوەدەدات لەشکرەکەی کەوتووەتە شەڕەوە لەگەڵ کاردۆخییەکان هەروەکو دەڵێ: کاردۆخییەکان کەوانی گەورە و باڵایان لەشەڕەکەیاندا بەکارهێنا بۆئەوەی تیرەکانیان لە مەودایەکی دوورەوە بگاتە لای ئێمە و سەربازەکانم بپێکێ، هەروەها دەڵێ: لە لووتکەی شاخەکەوە ئاگریاندەکردەوە و بەدەوروبیا هەڵدەپەڕین کە نیشانە بوو بۆ سەرکەوتنیان، هەروەها بەردی گەورەشیان بۆ تلووردەکردینەوە تاوەکو کۆسپ بخەنە رێگامان لەگەڕانەوەماندا. لە ئایینی میترایيشدا واتە خۆرپەرستی ئاگر هێمایە بۆ چاوی خۆر بۆیە لەتابلۆکانیاندا و زیاتر لە لێدانی دراوەکانیاندا گرنگیانپێداوە بەتایبەتی لە رۆژگاری ئاشکانیدا (٢٥٠پ.ز - ٢٢٧ز). بەهەمان دەستوور لە پەرستگاکانی ئاگریشدا لەوانە لە پەرستگای گوندی سەرگەتی ناوچەی خورماڵ کە بە ئەشکەوتی گاوران ناسراوە، هەروەها پەرستگای قەڵای دەرەکۆرە لە شاخی سوورێن نزیك میریسوور لە ناوچەی خورماڵ.[١٢]

ئایینی زەردەشتیش کە دواتر شوێنی گرتووەتەوە لە کۆتایی چاخی حەوتەمی پ.ز بینای ئاینەکەیان لەسەر خۆرپەرستی داناوە و ئاگریان کردووەتە توخمێکی پیرۆز کە نابێت هەناسەی مرۆڤی بەربکەوێت.

زۆرینەی شارەزایانی مێژووی کۆن بۆئەوە دەچن کە گەلی فارس بۆ بەرژەوەندی دەسەڵاتی سیاسییان ئەو جەژنەیان کردووەتە نیشانە بۆ خزمەتی گەلیان و سەرکەوتن بەسەر دەسەڵاتی نەیارەکانیانا. سەرچاوەکانیش وەکو ئاماژەیی پێدەدەن کۆرش لایان لە شوێنی کاوە دانراوە و ئاستیاگسی دوا پادشای مادیش (٥٨٥ – ٥٥٠ پ.ز) هێمایە بۆ زوحاك یان دەهاکی زۆردار. ئەمجۆرە کارانەش شتێکی ئاساییە و سەرکەوتوو هەردەم ئەوەی کردوویە مێژووی لە بەرژەوەندی خۆی نووسیوەتەوە.

لە سەردەمی دەسەڵاتی ساسانیدا لە ئێراندا (٢٢٧- ٦٥١پ.ز) کە خۆیان بە جێگرەوەی هخامەنشییەکان (ئەشکانییەکان) دادەنێن، زۆرینەی خاوەن ئایینەکان لە جەژنی نەورۆزدا هاوبەشییانکردووە بەتایبەتی زەردەشتییەکان بە جەژنێکی میللی ئێرانیان داناوە.

خاوەنی کتێبی (ئێران لە رابردوو و ئێستادا) دەڵێ: نەورۆز سەرەتای ساڵی نوێیە کە یەکەم رۆژی بەهارە و سەرەتای هەواخۆشی رۆژە لەبەهاردا و ئامادەبووان بۆ جەژنەکە بەرلەدەستپێکردنی بە ١٥ رۆژ هەموو خێزانێك دانەوێڵە ئاودەدەن و بە سەوزی بەرهەمیدێنن هەتاکو قەدەکەی بەرزدەبێتەوە، ئەوکاتە دەیکەنە بەڵگە بە هاتنی بەهار کە رۆژی خۆشی و شادییە و پیاو لەورۆژەدا دەگەڕێ و مەشخەڵی ئاگری لەجادەکاندا بەدەستەوەیە.[١٢]

**سەرئەنجام:**

لەبەر تیشکی ئەو زانیارییانەی سەرەوە بەپێی ئەو بەڵگانەی لەسەری دواین گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە بڵێین:

١. نەورۆز وەکو جەژنێکی نەتەوایەتی کوردی سەرهەڵدانی بۆ هەزارەی یەکەمی پ.ز دەگەڕێتەوە بۆئەو رۆژگارەی کە دەسەڵاتی ماد لەئێراندا بووەتە خاوەنی دەسەڵات. جەژنەکەش بەشێکە لە ئایینی خۆرپەرستی، بۆیە لای دانیشتووانی وڵاتەکە بەرز و پیرۆز راگیراوە، بەڵام بەرلەومێژووە واتە گەڕانەوە بۆ چاخی میتانی لە ناوەڕاستی سەدەی ١٥ی پ.ز دەتوانین ناوی جەژنی دارودرەختی لێبنێین. لە سەردەمی دەسەڵاتی هخامەنشیدا (٥٥٠- ٣٣٠ پ.ز) فارسەکان وودیان لەو جەژنە دیوە دوای نەمانی دەسەڵاتی ماد کە کردوویانەتە جەژنێکی مەزهەبی.

٢. جەژنی نەورۆز هەر بە سنووری ئێرانەوە نەوەستاوە، بەڵکو لەناو گەلانی ئاسیای کۆنیشدا بەهەمانشێوەی گەلی کورد و فارس باوبووە و لەوبۆنەیەدا رێوڕەسمی ئاهەنگێڕان ئەنجامدراوە و گرنگی زۆریانپێداوە. هەریەکێکیان بەرێگای تایبەتی خۆی یادیکردووەتەوە، بەڵام لای هەموو ئەو گەلانەش لەناوەڕۆکدا جەژنەکە یەکدەگرێتەوە. جەژنەکە دوورتر لەو سنوورەش رۆشتووە و ساڵانە یادکراوەتەوە لەژێر ناویتردا.

•••

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

١. عەبدولعەزیم رەزای شەریف فەلاح/ مێژووی نەورۆز و کرۆنۆلۆژیای ئێران/ پێداچوونەوە/ جەلیل عەباسی/ چاپی یەکەم ٢٠١٣/ خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە ل١٥٩.

٢. الدکتور عبدالنعیم محمد حسنین/ قاموس الفارسیة/ فارسی - عربي/ ص٧٥٧.

٣. الدکتور محمد التونجي/ المعجم الذهبي/ فارسي- عربي/ بیروت / ص٥٧٧.

٤. احمد سیاح/ فرهنط دانشطاهی ٢/ فارسی/ عربي/ ضاث دوم / ص٧٥٥.

٥ ماجد عبدالله الشمس/ الحضارة والمیثولوجیا في العراق القدیم/ الطبعة الثالثة ٢٠٠٩ / ص٣١.

٦. کەمال نوری مەعروف/ هەندێك شوێنەواری دێرینی بەرلە مێژوو و مێژوویی کوردستان/ چاپی یەکەم ٢٠١٠/ بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی/ ل١٧٥.

٧. الدکتور عبدالفتاح محمد وهیبە/ جغرافیە الانسان/ ص١١٩.

٨. میتانی: گەلێکن لە گەلانی هیندۆئاری کە لەکۆنەوە لە کوردستانی گەورەدا ژیاون و دەسەڵاتیان هەبووە، زمانەکەیان نزیکە لە زمانی ئۆراتی بە مانا زمانی ناوچەی ئەرمینیای کۆن. هەتاکو ئێستاش چەند جۆرێك پاشماوەی هونەریان دۆزراوەتەوە کە بۆ ناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی پ.ز دەگەڕێنەوە، وەکو پەیکەری شێری حەوجۆش لە نیساری و پەیکەری پادشای ئورکیش.

بڕوانە: أندري بارو، بلاد آشور، ترجمة و تعليق دكتور عيسى سلمان ء سليم طه التكريتي ١٩٨٠ بغداد ص٣٦٠.

٩. بەڵگەی دکتۆر سافراستیان کە دەڵێ: گەلێك نەبووە بەناوی میدییەکان بەهۆی ئەوەبووە کە لە مۆرە لولەییەکاندا وشەی میدا هاتووە کە لەبنەمادا بەمانای زەوی یان وڵات دێت هەروەکو دەگوترێ (میدا گۆتیۆم) بە مانای وڵاتی گۆتۆ، یان (مید عیلام) کە مانای وڵاتی عیلام دەگرێتەوە. بابلییەکانیش هەربەوجۆرە کەوتوونەتە هەڵەوە بەهۆی ئەوەی زانیارییەکانیان لە سۆمەرییەکان وەرگرتووە. سەبارەت بە وشەی (میدا) وایانزانیوە کە ناوی وڵاتێکی ناسراو، یان گەلێکە لە گەلەکان، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەیانتوانیوە سنووری ئەو وڵاتە دابنێن یان دەستنیشانی ئەو گەلە بکەن. ئاشوورییەکانیش بەهەمان دەستوور ئەو هەڵەیان لە بابلییەکانەوە وەرگرتووە. ئێرانیەکانیش بەهەمانشێوە لە ئاشورییەکانیان گواستووەتەوە. نووسەرە ئەوروپیەکانیش وەکو خۆی لە نووسەرە یۆنانییە کۆنەکانیان وەرگرتووە.

١٠. الدكتور سامي سعيد احمد، رضا جواد الهاشمي/ تاريخ الشرق الاردنى القديم (ايران والاناضول) ص٧٧.

١١. حسن پيرنيا/ ايران باستان (تاريخ مفصل ايران قديم ) ج١ / ١٣٢٢ چاپ دوم/ ص١٩٢.

١٢. کەمال نوری مەعروف / هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٧٥، هەروەها: گۆڤاری هەزارمێرد ژمارە ٢ساڵی یەکەم ١٩٩٧ ل٧٩- ٨٠.

١٣. خالد السيد محمد غانم/ الزرادشتية (تاريخا وعقيدة وشريعة) (دراسة مقارنة)/ المراجعة التاريخية والتقديم د. منذر الحايك/ ط٢ منقحة ٢٠٠٩ ص٢٤١.

# مێژووی ڕۆژژمێر

وەرگێڕانی: حیکمەت مەعروف

**پێشەکی:**




ڕۆژژمێر، لە ڕابردوویەکی زۆر کۆنەوە بەکاردێت، لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا سەریهەڵداوە. ئەو شێوەیەی کە ئێستا هەیەتی، لە ئەنجامی چەندین هەوڵی گەلانی سەرزەوی بەپێی سەردەمە جیاوازەکان هاتووەتەکایەوە. ئێمە بەشێوەیەکی روون لەوەئاگادارنین کە مرۆڤی سەرەتایی لە کاتە جیاوازەکاندا چۆن ژیانی خۆی ڕێکخستووە، بەڵام هەموو ئەگەرەکان بۆئەوە دەگەڕێنەوە کە لەکۆنەوە مرۆڤ بەپێی گۆڕانکارییە سروشتییەکان و جووڵەی تەنە ئاسمانییەکان ژیانی خۆی ڕێکخستووە.

بێگومان یەکەم ئەو گۆڕانکارییە سروشتییانەی کە مرۆڤ بینیویەتی، دووبارەبوونەوەی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆر بووە، لەمەوە یەکەم یەکەی ئاسان و سادەی کات (زمن) کە ڕۆژە هاتەکایەوە. پاشان تێبینی دووبارەبوونەوەی گۆڕانکارییەکانیتری وەك هەڵکشان و داکشانی ئاوی دەریاکانی کردووە .

لە دەرکەوتنی (هلالی) مانگ و زیادکردن و کەمبوونەوەی مانگدا، (شهر القمری) وەك یەکەیەکیتری (کات) داناوە. دیسان تێبینی دووبارەبوونەوەی وەرزەکان و وەرزی دروێنە و کۆچی باڵندە و گیانلەبەرانی کردووە، هەروەها مرۆڤی سەردەمە کۆنەکان تێبینی ڕۆشتنی (خۆر)ی بە نێو کۆمەڵەیەکی زۆر لە هەسارە لەماوەی ساڵێکدا کردووە و بۆ هەریەکێك لەم هەسارانە ناوی داناوە و خولگەی خۆری بینراوی (مدار الشمس الظاهري) بەدەوری ئەم کۆمەڵە هەسارانەدا دابەشکردووە. بۆ هەریەك لەم کۆمەڵە ئەستێرە و بورجانە ناوی داناوە، کە لە ناوی گیانلەبەرکانەوە وەریگرتووە .

پاشان تێبینی ئەوەی کردووە کە پێوانەکردنی کات بە بورجەکان لە پشتبەستن بە کاتەکانی کشتوکاڵکردن و هاتنی سەرما و گەرما و کۆچی باڵندەکان، وردترە. بە زیاتر وردبوونەوەی مرۆڤ لە دیاریدە گەردوونییەکان و دەستکەوتنی زانیاری زیاتر بەدرێژایی سەردەمانێکی زۆر و چاودێریکردنی جووڵەی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان، ئەو

توانایەی بە مرۆڤ بەخشی تا کات بەشێوەیەکی وردتر دابەشبکات و ڕۆژژمێری بۆ دابنێ. هەر لەڕێگەی ئەم ڕۆژژمێرەوە توانی ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵەکان دیاریبکات. دواتر بۆ پێوانەکردنی کات، کاتژمێری دروستکرد و ڕوانگەی دانا و پێشکەوتنی زۆری لەبواری گەردووناسیدا بەدەستهێنا، بەڵام بەسەر ئەم هەموو پێشکەوتنەشەوە لەبواری گەردووناسیدا، تائێستاش لە زۆر ناوچەی سەرگۆی زەوی لەبەر جیاوازی لە بۆچوون و شێوەی بەڕێوەچوونی ژیانیان و مانەوەی بەرژەوەندییەکانیان، وا بەباشتر دەزانن کە دابەشکردنی کات پێویستە لەژێر کاریگەری حاڵەتە ناوچەییەکاندا بێت نەك دیاریدە سروشتییەکان، ئەمەش بۆ ئاسانکردنی دانانی ڕۆژژمێرەکان و پشتبەستنپێیان بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکان و تۆمارکردنی ڕووداوەکان. ڕۆژژمێر، جۆری زۆرە، چونکە بەدێژایی مێژوو بەشێوەی جیاوازدا ڕۆشتووە، بەم هۆیەشەوە چاککردن و گۆڕانکاری و ڕاستکردنەوەی زۆری بەسەرداهاتووە کە لەدرێژەی ئەم بابەتدا باسیانلێوەدەکەین .

## گرنگی ڕۆژژمێر

ڕۆژژمێر بە مەبەستی زۆر و جیاواز بەکاردێت، لەوانە:

**یەکەم:** دیاریکردنی بەروار، ئەمەش پێویستی بە ئامادەکردنی تۆماری ڕۆژەکان و مانگەکان و ساڵەکانە، لەگەڵ دانانی ڕووداوەکان لەکاتی خۆیدا. ئەو بەروارانەی کە تۆماریشدەکرین، چەند جۆرێکن:

١. دیاریدە گەردوونییە سووڕاوەکان وەك بنەمای ساڵەکان و مانگەکان و وەرزەکان، ئەمەش تۆمارکردنی ڕابردوو و داهاتووە.

٢. دیاریدە زەمینییەکان، وەك هەڵکشان و داکشانی دەریاکان و گۆڕانی کەش لە ڕۆژە جیاوازەکاندا.

٣. ڕووداوە دەگمەنەکان، وەك گەردەلوول و بوومەلەرزە و تەقینەوەی بورکانەکان و ڕوودانی مانگگیران و خۆرگیران.

٤. ڕووداوە مێژووییەکان کە لەلایەن مێژووی مرۆڤایەتییەوە تۆماردەکرێن.

٥. ڕووداوە مەدەنییە هاتووەکان، وەك سەرەتای وەرزەکان و جەژنەکان و سەرکەوتنەکان.

**دووەم:** ئامادەکردنی ئەنجامە ساڵانەییەکان، ئەمەش تێکڕای مانگەکانی ساڵ و ناوی ڕۆژەکانی و ئەو بەروارانەی کە بەرانبەریەتی لەڕۆژژمێرەکانیتردا، هەروەها کاتەکانی پەرستن (نوێژ)و ئەو بۆنە و جەژنانەی کە لەساڵدا ڕوودەدەن.

## پێوانەکانی کات (مقايس الزمن)

ڕۆژ و مانگ و ساڵەکان بە پێوانەیەك پێوانەدەکرێن کە دیاردە گەردوونییەکان دیاریدەکەن کە گرنگییەکی تایبەتی لە ژیانی مرۆڤدا هەیە. ڕۆژەکان بە خوولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات دروستدەبن کە ئەمەش جیاوازی نێوان درێژی شەو و ڕۆژ و جووڵانی هەسارەکانی گەردوونی لێوەدەردەکەوێت. مانگەکان بە سووڕانەوەی مانگ بەدەوری زەویدا دەپێورێن کە لە (هلال) دەمەداسێکی باریکەوە دەستپێدەکات و پاشان وردەوردە

دەبێتە مانگی پڕ (بدر) (مانگی تابان)و تاریکی شەو کاڵدەکاتەوە و دیسانەوە وردەوردە مانگە تابانەکە دەبێتەوە بە دەمەداسەکە. ساڵەکان بە سوورانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا دروستدەبن و لەئاکامیەوە وەرزەکان و جووڵەی بینراوی خۆر لەبورجەکاندا دروستدەبێت، بەڵام مانگە خۆرییەکان و هەفتەکان و بەشەکانیتری رۆژ وەك (کاتژێر و خولەك و چرکە)، یەکەی فەرهەنگی کاتن.

**رۆژ:**

لەبەرئەوەی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا، جووڵەیەکی (منتظم) رێکوپێکە، بۆیە رۆژ دانراوە بەوکاتەی کە زەوی یەکجار بەدەوری خۆیدا دەخوولێتەوە کە دوو جۆرن: رۆژی ئەستێرەیی و رۆژی خۆری کە رۆژی خۆری بە ماوەی (سێ خوولەك و ٥٥،٩ چرکە) لە رۆژی ئەستێرەیی درێژترە. رۆژی خۆری تەواو لەدرێژیدا جێگیرنییە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە خێرایی خۆری بینراو (سرعة الشمس الظاهرية) لەنێوان ئەستێرەکاندا بەدرێژایی رۆژەکانی ساڵ جێگیرنییە، چونکە خولگەی زەوی بەدەوری خۆردا بازنەیەکی تەواو خڕنییە (شێوە هێلکەییە)، بۆیە کەمترین جار روودەدات کە رۆژی خۆری لە شوینێکی سەرزەویدا بەدرێژایی ساڵ هەمان درێژی هەبێت، جگەلەو شوێنانەی کە دەکەونەسەر هێڵی یەکسانی زەوی (خط الاستواء)، بۆیە ئەم شێوە پێوانەکردنە بۆ پێوانەکردنی کاتێکی یەکسان گونجاونییە، لەبەرئەوە زاناکانی گەردووناسی خۆرێکی گریمانەییان داناوە کە بەخێراییەکی (رێکوپێك) یەکسان بەدرێژایی ساڵ دەڕوات و لەماوەی ساڵێکی تەواودا ئەوماوەیە دەبڕێت. شەو و رۆژ بەدوای یەکدیدادێن، بەڵام لەنێوان نەتەوەکانی سەرزەویدا بۆئەم بەدوای یەکداهاتنە و دەستپێکردن و تەواوبوونی رۆژە بیروڕای جیاواز هەیە، بۆنموونە لای عەرەبەکان رۆژ بریتییەلە ئاوابوونی رۆژ و هاتنی شەوی دوای ئەو ئاوابوونە و ئاوابوونی رۆژی دواتر، بەڵام لای فەرەنجەکان رۆژ لە نیوەشەوەوە دەستپێدەکات تا نێوەشەوی دواتر و رۆژ دەکەوێتە نێوان هەردوو نێوەشەوەکەوە.

**مانگی مانگی (الشهر القمري):**

بریتییەلەو ماوەیەی کە مانگ دەیبڕێت لە سووڕانەوەی بەدەوری زەویدا، و سێ جۆر مانگمان هەیە:

**یەکەم:** مانگی شەرعی: ئەم مانگە بە بینینی مانگ لە (هلال)ەوە، دەمەداسەوە دەستپێدەکات.

**دووەم:** مانگی گەردوونی راستی: بریتییەلە تەواوکردنی دەورەیەکی تەواوی مانگ بەدەوری زەویدا.

**سێیەم:** مانگی فەرهەنگی ناوەندی: ئەم مانگە درێژییەکەی جێگیرنییە، بەڵام تێکڕایی رۆژەکانی بیست و نۆ رۆژ و دوانزە کاتژێر و چل و چوار خولەك و ٢،٨٧ چرکەیە. بۆ ئاسانکاری حسابکردنی ساڵێکی فەرهەنگی ناوەندییان داناوە کە درێژییەکەی سێسەد و پەنجا و چوار رۆژە لە ساڵی ئاساییدا و سێسەد و پەنجا و پێنج رۆژە لە ساڵی کەبیسەدا. ئەمساڵە ناونراوە بە (ساڵی مانگی ناوەندی) (سنة الوسطية)، کە نزیکەی یانزە رۆژ لە ساڵی خۆری کورتترە.

**ساڵی خۆری:**

بریتییەلەو ماوەیەی کە زەوی پێویستێتی بۆ سووڕانەوەی بەدەوری خۆردا کە لە خاڵێکی دیاریکراوەوە دەستپێدەکات تا دەگەڕێتەوەسەر هەمان خاڵ .

**مانگە خۆرییەکان:**

مانگە خۆرییەکان بە دوو پێشکەوتندا تێپەڕیوون: یەکەمیان ئەوەبوو کە مانگەکان بە ژمارە ناودەنران وەك مانگی یەکەم و دووەم و سێیەم.. هتد، دووەمیان ناونانی مانگەکان بەناوی کەسایەتییەکان بۆ مانەوەیان بە نەمریی و بەرزڕاگرتنی یادیان، وەك مانگەکانی یۆلیۆ و ئۆگوست یان ناونانی مانگەکان بەناوی خوداوەندەکان یان دیاردەکانیتر کە هەندێك لە نەتەوە کۆنەکان بەکاریاندەهێنان، وەك ئەوەی کە ناوی مانگی تشرینی یەکەمیان ناونابوو (مانگی زەرد) کە لەومانگەدا گەڵای دارەکان زەرددەبێت، هەروەها ئەنگلۆسەکسۆنییەکان مانگی تشرینی دووەمیان ناونابوو (مانگی با یان مانگی خوێن)و لە باشووری ئەڵمانیا و بەشێك لە سویسرا بە مانگی ئەیلولیان دەوت( مانگی دروێنە.

**سەرەتای ناونانی مانگەکانی ساڵ:**

١. مانگی ینایر: مانگێکی رۆمانی یان فەرەنجییە، بەرانبەرە لەگەڵ مانگی( کانونی دووەم) ئەم مانگە یەکێکە لە مانگە سریانییەکان یان رۆمییەکان. رۆمانەکان ئەم مانگەیان ناونابوو بەناوی خوداوەند (یانوس) کە خوداوەندی شەڕ و ئاشتی و دەرگەوانی دەرگەکانی ئاسمان بوو لە لای رۆمانییەکان، وایاندانابوو کە ئەو خوداوەندە وەك مرۆڤ وایە و دوو دەموچاوی هەبوو کە هەریەکێکیان رووی لە شوێنێك بوو، پەرستگەکەی ئەم خوداوەندە لە رۆژانی شەڕدا دەرگەکانی دەکرایەوە و لە رۆژانی ئاشتیدا دەرگەکان دادەخران.

٢. مانگی فێبرایەر: مانگێکی رۆمانییە و بەرانبەرە لەگەڵ (مانگی شوبات) ناوی ئەم مانگە لە وشەی (فبرورا) وەرگیراوە کە بە واتەی (پاككردنەوە) دەهات، چونکە لەم مانگەدا و لە رۆژی پانزەهەمینیدا چەژنێکان هەبوو کە تێیدا رۆحی خۆیان لە تاوان و گوناه پاکدەکردەوە. هەر لەم مانگەدا ماڵەکانیان و کەلوپەلەکانیان پاکدەکردەوە، تائێستاش ئەم عادەتە لە وڵاتانی ئەوروپادا ماوە و پێیدەڵێن (پاككردنەوەی بەهاران.

٣. مانگی مارت یان مارس: مانگێکی رۆمانییە و بەرانبەرە لەگەڵ مانگی ئازار، ئەم مانگە بەناوی هەسارەی مەریخەوە ناونراوە کە خوداوەندی شەڕ بووە و سەرخەری رۆمانەکان بووە لەشەڕدا. ئەم مانگە تا هاتنی رۆژژمێری یۆنانی یەکەم مانگی ساڵ بووە، ئەم مانگە بە مانگی یەکەمی ساڵ تا سەدەی هەژدەهەم لە ئینگلتەرا مایەوە.

٤. مانگی ئەبریل یان ئەفریل: مانگێکی ڕۆمانییە و بەرانبەرە لەگەڵ مانگی (نیسان)، بنەڕەتی ناوی ئەم مانگە لە وشەی (ئەبرییر)ەوە هاتووە کە بە واتەی (گوڵکردن) دێت، هەروەها دەڵێن دەگەڕێتەوە بۆ خوداوەند (ئەبریل) کە سەروکاری کردنەوەی گوڵەکانی کردووە لەگەڵ کردنەوەی دەرگەی ئاسمان، تا تیشکی خۆر بێتەوەسەر زەوی دوای کاڵبوونەوەی لە وەرزی زستاندا.

٥. مانگی مایو: مانگێکی ڕۆمانییە و بەرانبەرە لەگەڵ مانگی(ئایار) کە ناوی خوداوەند (مایا)یە، مایا، کچی خوداوەند (ئەتلەس)ە کە هەڵگری زەوییە و لەگەڵ دایکی (عەتارد) کە کارەکەری خوداوەندەکان بووە. مایا، خوداوەندی پیتاندن و گەشە و زۆربوون بووە، ڕۆمانەکان لە سەرەتای ئەم مانگەدا قوربانییان بۆ (مایا) کردووە. تائێستاش بەشێکی زۆر لە پەرستنەکانی (مایا) وەك عادەت لە وڵاتانی ئەوروپادا ماوە، وەك هەڵبژاردنی جوانترین کچ بۆئەوەی ببێتە شاژنی ئایار.

٦. مانگی یۆنیۆ: مانگێکی ڕۆمانییە، بەرانبەرە لەگەڵ مانگی (حوزەیران) بڕواوایە کە ناوی خوداوەند (جونو) بووە کە ژنی خوداوەند (موشتەری) بووە و گەلێك جوان بووە. هەروەها بڕواوایە کە ئەم مانگە ناوی قەبیلەیەکی کۆنی ڕۆمانی بووە و ئەم مانگەیان بەناوی ئەوانەوە ناوناوە.

٧. مانگی یۆلیۆ: مانگێکی ڕۆمانییە، بەرانبەرە لەگەڵ مانگی (تەمموز) ئەم مانگە بەناوی قەیسر (کایوس یۆلیۆس) ناونراوە کە لەم مانگەدا لەدایکبووە. کاتێك کە یۆلیۆس ڕۆژژمێرە بەناوبانگەکەی خۆی دانا، ناوە کۆنەکەی ئەم مانگە (QUINTILIS) کە واتەی (پێنچەم) بوو، بۆ بەرزڕاگرتن و نەمریی ناوی ئەو کرا بە (یۆلیۆس).

٨. مانگی ئۆگۆست (أغسطس): مانگێکی ڕۆمانییە، بەرانبەرە لەگەڵ مانگی (ئاب)، ئەم مانگە بەناوی قەیسەر (ئۆگۆست)ەوە ناونراوە کە پێشتر ناوی (SEXTILIS) شەشەم بوو. ئەم گۆڕانکارییە لەلایەن ئەنجومەنی پیرانی ڕۆمانەوە کرا بە ئۆگۆست، چونکە لەم مانگەدا یەکێك لە گەورەترین سەرکەوتنەکانی بەدەستهێنا.

٩. مانگەکانی (سێبتەمبەر، ئۆکتۆبەر، نۆڤەمبەر، دیسەمبەر) ئەم مانگانە ناوەکانی خۆیان پاراست و هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردانەهات و وەك خۆیان مانەوە کە واتەکانیان دیارە ژمارەن. سێبەتەمبەر، بەرانبەرە لەگەڵ مانگی (ئەیلول) و لە وشەی (SEPTEM) ەوە هاتووە، واتە (حەوت). ئۆکتۆبەر، بەرانبەرە لەگەڵ مانگی (تشرینی یەکەم)و لە وشەی (OCTO) ەوە هاتووە، واتە (هەشت). نۆڤەمبەر، بەرانبەرە لەگەڵ مانگی (تشرینی دووەم)و لە وشەی (NOVEM) ەوە هاتووە، واتە (نۆ). دیسەمبەر، بەرانبەرە لەگەڵ مانگی (کانونی یەکەم)و لە وشەی (DECEM) ەوە هاتووە واتە (دە).

لێرەدا پێویستە تێبینی ئەوەبکەین کە ئەم مانگانە ناونراون بەپێی ڕێکخستنیان لە ڕۆژژمێری ڕۆمانی کۆندا، کە (ڕۆمیۆلس) دایناوە و لەگەڵ ڕێکخستەنەکانی ئێستادا ناگونجێن، چونکە یەکەم مانگ لەورۆژژمێرەدا مانگی (مارس، ئازار) بووە، بۆیە ئەگەر لە مانگی مارسەوە دەستپێبکەین ڕێکدەبنەوە. لەڕابردوودا زۆر هەوڵدرا بۆئەوەی ناوی ئەم مانگانە بگۆڕن بەناوی ئیمبراتۆرەکانەوە، وەك (تیباریۆس) بۆ مانگی نۆڤەمبەر و (جرمانۆس یان ئەنتۆنیۆس) بۆ مانگی ئۆکتۆبەر، بەڵام هەموو ئەم هەوڵانە بە هۆکاری سیاسی و حیزبی شکستیانهێنا.

**هەفتە:**

هەفتە حەوت ڕۆژە و هیچ کارێکی بەسەر تەنە ئاسمانییەکانەوە نییە، بەتەواویش نازانرێ کەی هاتووەتەکایەوە. ئەغریق و ڕۆمانەکان هەفتەیان بەکارنەهێناوە تا سەردەمی قنستەنتین (۳۱۲- ۳۳۷م). بۆیە بەکارهێنانی دراوەتە پاڵ جوولەکە کە لەتەوراتدا هاتووە دەڵێت: خوا بە شەش ڕۆژ دروستکراوەکانی خۆی دروستکرد و لە ڕۆژی حەوتەمدا پشوویدا و ڕۆژی پشووی خودایان ناونا (السبت) شەممە و ڕۆژەکانیتر ناویاننییە، بەڵکو بە ژمارە دانراون وەك (الاحد - یەکشەممە، الاثنین - دووشەممە..)، بەڵام ناوی ڕۆژەکانی هەفتە لە زمانی ئینگلیزییدا لەوناوانەوە وەرگیراون کە نەتەوەکانی باکوور و دانیشتووانی ئەسکەندەنافیای کۆن بەکاریانهێناون، ئەمانیش ناوی خوداوەندەکانی خۆیانیان بۆ ڕۆژەکانی هەفتە داناوە. بۆنموونە: ڕۆژی یەکشەممە (SUNs day) بۆ خوداوەندی ڕۆژ بووە کە یەکێك بووە لە گەورەترین پەرستراوەکانی دانیشتووانی ئەسکەندەنافیا، دووشەممە (MOONs day)بۆ مانگ کە ژنی ڕۆژ بووە و لەپیرۆزیدا لەدوای ڕۆژەوە هاتووە، سێشەممە (TIWs day)ناوی خوداوەند (تیر)ە کە سمبولی خۆبەخشین بووە، دەگەڕێنەوە گورگێکی دڕ لەچیاکاندا بووە و پەلاماری مرۆڤ و گیانداری داوە، بەم هۆیەوە خوداوەندی چیا تووڕەبووە و ویستوویەتی ئەو گورگە زنجیربکات، بەڵام لەم کارەیدا سەرکەوتوونەبووە و بۆ دواجار گورگەکە ڕازیبووە کە لە قەفەس بنرێت بەمەرجێك دەستی یەکێك لە خوداوەندەکانی لەدەمدا بێت! بۆیە خوداوەند (تیر) دەستی خۆی خستووەتەناو دەمی گورگەکەوە تا خراوەتە نێو قەفەسەکەوە، بەڵام لەدوای لە قەفەسنانی گورگەکە دەستی خوداوەند (تیر) دەقرتێنێت. چوارشەممە (WODENs day) ناوی خوداوەند (ئۆدین) بووە کە خەڵکی ئەسکەندەنافیا کۆشکێکیان لە زێر و زیو بۆ دروستکردووە و دوو قەلەڕەشی هەبووە کە هەواڵی هەموو دنیایان بۆهێناوە، هەروەها چەندین حۆری جوانی هەبووە کە دەیناردن بۆئەوەی ڕۆحی ئەو پاڵەوانانە هەڵبگرن کە گیانی خۆیان بەخشیوە، بۆئەوەی ئەو حۆرییە جوانانە بەخۆشی و شادی لەگەڵیاندا بژین.

ڕۆژی پێنجشەممە (THORs day) بۆ خوداوەند (گا) بووە کە خوداوەندێکی بەهێزبووە و بۆ هەر ژەمێك گوێرەکەیەك و حەوت نەهەنگی خواردووە! ڕۆژی هەینی (FREYAs day) بۆ خوداوەند (فرایا) بووە کە ژنی (ئۆدین)و دایکی خوداوەند (گا) بووە، ئەم ڕۆژە بەناوی ئەوەوە ناونراوە تا ئیرەیی بە خوداوەند (ئۆین و گا) نەبات و تووڕەنەبێت! ئینگلیزەکان بڕوایانوایە کە ڕۆژ هەینی، کاتێکی (بێبەختی)ی تێدایە، چونکە تەنیا ڕۆژی هەفتەیە کە بەناوی خوداوەندێکی مێینەوە ناونرابێت، نەك وەك خەڵاتکردنی بەڵکو لە ترسی ئیرەیی و تووڕەبوونەکەی بووە و لە کاریگەری ئەمەوە هیچ شانۆیەك چیرۆکە شانۆیەکی نوێی لە ڕۆژی هەینیدا دەستپێنەدەکرد، چونکە بڕوایانوابوو کە سەرکەوتن بە دەستناهێنێ. ڕۆژی شەممە(SETERNs day) ، بۆ خوداوەند (سترن) کە ڕۆمانییە، سمبولی دڵڕەقی

بووە، چونکە منالّەکانی خۆی دەخوارد و لەسەر کوشتن و زۆرداری دەژیا. رۆمانەکان لەم رۆژەدا خواردنی زۆریان دەخوارد و شەرابیان بە بڕێکی زۆر دەخواردەوە، هەروەها نەتەوەی عەرەب لە پێش هاتنی ئیسلامدا ناویان بۆ رۆژەکانی هەفتە دانابوو کە ئێستا ئەو ناونانە بەکارناهێنرێن و (أول، أهون، جبار، دبار، مؤنس، عروبة، شيار).

## جۆرەکانی رۆژژمێر

### ١. رۆژژمێری میسری کۆن

یەکەمین رۆژژمێرە کە مێژونووسەکان زانیارییان لەبارەیەوە هەبێت و هەر لەسەر بنەمای ئەم رۆژژمێرە، رۆژژمێری یۆنانی دانراوە و پاشان رۆژژمێری گریگۆری کە ئێستا زۆربەی ولّاتان لەسەری دەڕۆن. میسرییە کۆنەکان بۆیان دەرکەوت کە درێژی ساڵ (سێسەد و شەست و پێنچ) رۆژە، ئەمەش لە ئەنجامی تێڕامانیان لە دیاردە سروشتییەکان و بە تایبەتی دەرکەوتنی ئەستێرەی سیریوس (SIRIUS) ی بەیانیان پێش هەڵاتنی خۆر بە ماوەیەکی کەم. میسرییەکان ئەم ئەستێرەیەیان ناونابوو سبدت (SPEDT)هەر لەم وشەیەشەوە ناوی سوتیس (SOTHIS)ی یۆنانی وەرگیراوە، هەروەها میسرییەکان تێبینی ئەوەیان کرد دوانزە خولی مانگی روودەدات، بۆیە ساڵیان دابەشکرد بە دوانزە مانگ و هەرمانگێك سی رۆژ و پێنج رۆژیشیان دەخستەسەر کۆتایی ساڵ. پاشان ساڵیان دابەشکردبوو بۆ سێ وەرز کە هەروەرزێك چوار مانگ بووە. وەرزی یەکەمیان ناونابوو (وەرزی لافاو) یەکەم رۆژی ساڵ بوو کە ناوی بە زمانی میسری کۆن ئیخت (EKHET)ە. وەرزی دووەم پێیاندەوت بریت (PRET) بە واتەی دەرچوون کە ئاماژەبوو بۆ گەشەکردنی رووەك و لە زەوی هاتنەدەرەوەیان لەدوای لافاو. وەرزی سێیەمیشان ناونابوو شمو (SHMIW)واتە کەمی ئاو یان وشکەساڵی، بەڵام دوای هێرشەکانی فارس، ناوی مانگەکانیان نا بەناوی خوداوەند و چەژنەکانەوە، هەروەها والێکدراوەتەوە کە میسرییەکان یەکەم نەتەوە بوون رۆژیان دابەشکردبێت بۆ بیست و چوار کاژێر و دوانزە کاژێر بۆ رۆژ و دوانزەکەیتر بۆ شەو. ئەم کاتژێرانە بەکارنەدەهاتن بۆ مەبەستە ئاینییەکان نەبێت، جگەلەوە هیچجۆرە ئامێرێکی وایاننەبوو تا پێوانەی کاژێرەکانیان بەشێوەیەکی رێك بۆبکات.



**بنەمای ساڵی یەکەم:** یەکەمین رۆژی ساڵی یەکەم لەڕۆژژمێرەکانیاندا بە سێ دیاردەی سروشتی جیاکردەوە:

١. فێنکبوونی هەوا لە سەرەتای پایز.

٢. گەیشتنی ئاستی لافاو بە بەرزترین ئاست .

٣. هەڵهاتنی ئەستێرەی سیروس لەبەرەبەیاندا .

ئەم ساڵە کە ماوەکەی سێسەد و سەشت و پێنج رۆژ بوو بەبێ حیسابکردنی چارەکە رۆژەکەی ساڵ کە لە ساڵی خۆریدا حیسابدەکرێت، بەم هۆیەوە وەرزەکان لە شوێنی خۆیان گۆڕان و وەرزی کەم ئاوی لە وەرزی لافاودا هات، ئەم هەڵەیە، خۆی راستکردەوە پاش تێپەڕینی (١٤٦٠) ساڵی خۆری. میسرییە کۆنەکان هیچ بنەمایەکیان نەبوو بۆ دانانی بەروار. بەروارەکانیان لە دانانی پادشاکانەوە دادەنا و ئەو ساڵەیان دەکرد بە سەرەتای دانانی بەروار و رووداوەکانی سەردەمی ئەو پادشایە. بە واتەیەکیتر ساڵی پاشایەتیان بەکاردەهێنا. تائێستاش شوێنەوارناسان هیچجۆرە نووسینێك یان نەخشێکیان نەدۆزیوەتەوە تا بەرچاویان روونبکاتەوە بۆ دۆزینەوەی ئەو ساڵەی کە رۆژژمێری میسری تێدابەکارهاتووە، بەڵام زاناکان بەشێوەیەکی نزیکەیی دایانناوە. لە ساڵی (٢٣٨) زایینی فەیلەسوفی بیرکاری (سنسورینوس) کتێبێکی دانا و روونیکردەوە کە ساڵی (١٣٩) زایینی لەگەڵ یەکەم رۆژی ساڵی میســــــری بەرانبەر بووە بەهەڵهاتنی ئـــــەستێرەی سیروس لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر. وەك وتمان ساڵی میسری هەموو (١٤٦٠) ساڵێك بەرانبەر دەبێت لەگەڵ ساڵی خۆری. ئەمەش وادەکات بنەمای کارکردن بە ساڵی میسری بەمشێوەیە بێت: ١٤٦٠ - ١٣٩، بەمشێوەیە نزیکبوەوە: ١٤٦٠×٣= ٤٣٨٠-١٣٩ - ٤٢٤١ ی پێشزایین دەبێتە سەرەتای دروستبوونی رۆژژمێری میسری.

**٢. رۆژژمێری رۆمانی**

دانانی ئەم رۆژژمێرە دراوەتە پاڵ (رۆمیولس)ی دروستکەری شاری رۆما، مێژونووسان دەڵێن: شاری رۆما لە ٢١ی ئەبریلی ٧٥٣ی پێشزایین دروستکراوە. ئەم بەروارە بوو بە بنەمای رۆژژمێری رۆمانی. سەرەتای ساڵ لای رۆمانەکان دەکەوتە مانگی مارسەوە کە یەکەم مانگی بەهار بووە، هەروەها ساڵ پێکهاتووە لە دە مانگ و درێژی هەموویان (٣٠٤) رۆژ بووە و لەمانە پێکهاتبوون: مارس، ٣١ رۆژ. ئەبریل، ٣٠ رۆژ. مایۆ، ٣١ رۆژ. یۆنیۆ، ٣٠ رۆژ. کونتیلس ( پێنجەم)، ٣١ رۆژ. سکستیلس (شەشەم)، ٣٠ رۆژ. سێپتەمبەر، ٣٠ رۆژ. ئۆکتۆبەر( (هەشتەم)، ٣١ رۆژ. نۆڤەمبەر (نۆیەم)، ٣٠ رۆژ. دیسەمبەر (دەیەم)، ٣٠ رۆژ. چوار مانگی سەرەتای ساڵ ناونرابوون بەناوی خوداوەندەکانەوە (لە بەشی یەکەمدا باسمانکردووە).



بێگومان ئەم رۆژژمێرە لەسەر بنەمایەی زانستی دانەنرابوو، لەبەرئەوە چەندجارێك چاككاری تێداكراوە. بەنموونە لە سەردەمی نوما (NUMA POMPITIUS)دووەم مەلیكی رۆما ئەم چاككارییانە كراوە:

١. مانگێكی نوێ خرایە پێش مانگی مارس و ناونرا یەنایەر.
٢. مانگێك زیادكرا لەدوای مانگی دیسەمبەر و ناونرا فیبرایەر.
٣. رۆژەكانی مانگ كرا بە (٢٩ یان ٣٠) رۆژ بەدوای یەكدا و درێژی ساڵ بووە (٣٥٤) رۆژ وەك ساڵی مانگی.
٤. بۆ رێككردنەوەی ساڵی رۆمانی بە ساڵی خۆری، نوما بڕیاریدا هەموو دوو ساڵ جارێك مانگێك بخرێتەسەر ساڵ و درێژی (٢٢ یان ٢٣) رۆژ بێت و یەك بەدوای یەك دابنرێن و هەموو چوار ساڵێك جارێك (٤٥) رۆژ زیادبكرێت كە تێكڕای ئەم زیادكردنە بۆ هەرساڵێك دەكاتە (١١) رۆژ و چارەكە رۆژێك بەمەش تێكڕایی درێژی ساڵێك دەبێتە (٣٦٥) رۆژ و چارەكە رۆژێك.

لە ساڵی (٤٥٢)ی پێشزایین، دووبارە چاككاری تێداكراو مانگی فیبرایەر خرایە دوای یەنایەر. ئەم چاككارییانە لەلایەن پیاوانی ئایینییەوە یاری پێدەكرا لە بەرژەوەندنی خۆیان یان لە بەرژەوەندنی كەسانی خاوەن دەسەڵات. ئەم یاریكردنە بە رۆژژمێر بەردەوامبوو تا سەردەمی (یۆلیۆس قەیسەر.

### ٣. رۆژژمێری یۆنانی

لە ساڵی (٤٦)ی پێشزایین یولیوس قەیسەر یەكێك لە گەردووناسەكانی ئەسكەندەرییەی راسپارد كە رێكخستنێكی جێگیر بۆ رۆژژمێر بكات، ئەو گەردووناسەش (سوسیجینوس) بوو، كە ئەم چاككارییانەی كرد:

١. كاركردنی بە ساڵی مانگی لابرد و ساڵی خۆری كارپێكرد كە درێژییەكەی (٣٦٥) رۆژ و چارەكە رۆژێك بوو، بەجۆرێك كە سێ ساڵی لەدوای یەك درێژی هەرساڵێك (٣٦٥) رۆژ بێت و ناوینان (ساڵی ئاسایی)و ساڵی چوارەمی كردە (٣٦٦) رۆژ و ناوینا (ساڵی پڕ) (سنە كبیسە).
٢. سەرەتای بەرواری یۆنانی كرد بە یەكەم رۆژی مانگی یەنایەری ساڵی ٧٠٩ی دروستكردنی شاری رۆما كە بەرانبەرە لەگەڵ ١ی ینایەری ٤٥ پێشزایین.

٣. مانگە تاكەكانی كردە (٣١) رۆژ و مانگە جووتەكانی كردە (٣٠) رۆژ، جگەلە مانگی فیبرایەر كە لە ساڵی ئاساییدا (٢٩) رۆژ و لە ساڵی پڕدا (٣٠) بوو. بەم چاككارییانە مانگەكانی ساڵ بەمشێوەیەیان لێهات:
ینایەر، ٣٠ رۆژ. فێبرایەر، ٢٩ رۆژ لە ساڵی ئاسایی و ٣٠ رۆژ لە ساڵی پڕ. مارس، ٣١ رۆژ. ئەبریل، ٣٠ رۆژ. مایو، ٣١ رۆژ. یونیو، ٣٠ رۆژ. كونتیلس، ٣١ رۆژ. سكستیلس، ٣٠ رۆژ. سێپتەمبەر، ٣١ رۆژ. ئۆكتۆبەر، ٣٠ رۆژ. نۆڤەمبەر، ٣١ رۆژ. دیسەمبەر، ٣٠ رۆژ .

ئەوەی کە ئاشکرایە، سوسینجینوس ئەم رۆژژمێرەی دانەهێناوە، بەڵکو لە رۆژژمێری چاککراوی میسرییەوە وەریگرتووە کە لە ساڵی (٣٢٨) پێشزایینەوە کارپێکراوە و گوماندەکرێت کە گەردوونناسی یۆنانی (ئۆردۆکس) داهێنەرەکەی بێت. لە ساڵی (٤٤) پێشزایین ناوی مانگی کونتیلس کرا بە یولیو بۆ بە زیندووهێشتنەوەی ناوی لیولیوس قەیسەر. لە ساڵی (٨) پێشزایین ئەنجومەنی پیران بڕیاریدا کە مانگی سکستیلس بکرێتە ئۆگۆست بۆ بەرزڕاگرتنی ناوی قەیسەر ئۆگۆست، ئەمە ئەو نازناوە بوو کە (ئۆکتافیوس) وەریگرت لەدوای سەرکەوتنی بەسەر (ئەنتۆنیوس) لە جەنگی (ئەکتیوم) لە ساڵی (٣١) پێشزایین. پاش ماوەیەك دەرکەوت کە ئەو مانگەی بەناوی لیولیوس قەیسەرەوەیە ٣١ رۆژە، بەڵام ئەو مانگەی بەناوی ئۆگۆستەوەیە ٣٠ رۆژە! کە ئەمەش بەرزڕاگرتنی یەکەمە بەسەر دووەمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی رۆما خۆشیان بە ژمارەی جووت نەدەهات، لەبەرئەوە مانگی ئۆگۆستیشیان کردە ٣١ رۆژ و رۆژێکیان لە مانگی فێبرایەر کردەوە! بەم هۆیەوە سێ مانگی دوابەدوای یەکی یولیو و ئۆگۆست و سێپتەمبەر ٣١ رۆژ بوون. بۆ چارەسەری ئەمە هەریەك لە مانگی سێپتەمبەر و نۆڤەمبەر کرانە ٣٠ رۆژ و هەردوو مانگی ئۆکتۆبەر و دیسەمبەر کرانە ٣١ رۆژ.

بەمشێوەیە دابەشکردنی مانگ و رۆژەکانیان بەجۆرەی لێهات: یەنایەر، ٣١ رۆژ. فێبرایەر، ٢٨ یان ٢٩ رۆژ. مارس، ٣١ رۆژ. ئەبریل، ٣٠ رۆژ. مایو، ٣٠ رۆژ. یونیو، ٣٠ رۆژ. یولیو، ٣١ رۆژ. ئۆگۆست، ٣١ رۆژ. سێپتەمبەر، ٣٠ رۆژ. ئۆکتۆبەر، ٣١ رۆژ. نۆڤەمبەر، ٣٠ رۆژ. دیسەمبەر ٣١ رۆژ. کە تێکڕایی رۆژەکانی ساڵ بووە ٣٦٥ یان ٣٦٦ رۆژ.

**گۆڕینی بنەمای بەرواری یۆنانی بۆ لەدایکبوونی مەسیح:**

ئەم گۆڕینە لە لایەن راهبێك بەناوی (دیونیسس ئەکسیجیوس) کرا، کە لە شاری (سیپیا)ی باشووری روسیا لەدایکبووە و کۆتاییەکانی تەمەنی خۆی لە شاری رۆما بەسەربردووە، ئەم زانایە شارەزاییەکی بەرفراوانی هەبووە لە گەردوونناسی و بیرکاریدا. دەڵێن ئەو گۆڕینەی لە ساڵی ٥٣٢ کردووە و خۆشی لە ساڵی ٥٥٠ کۆچیدواییکردووە. وەك زانراوە (دیونیسس) پشتی بەو چیرۆکە بەستووە کە دەخرێتە پاڵ (کلیمنت ئەسکەندەری) کە بڕوای وابووە، حەزرەتی مەسیح لە ٢٥ی دیسەمبەری ساڵی (٢٨) لە فەرمانڕەوایی ئۆگۆست قەیسەر لەدایکبووە. کە سەرەتایی فەرمانڕەوایی بە ساڵی ٧٢٧ی رۆمانی دانراوە، بەجۆرە ساڵی ٢٨ دەکاتە ساڵی ٧٥٤ ( ٧٢٧+٢٧) بەمشێوەیە دەرکەوت کە حەزرەتی مەسیح لە ( ٢٥ی دیسەمبەری ٧٥٤ی رۆمانی) لەدایکبووە، هەروەها دیونیسس یەکەم رۆژی مانگی یەنایەری ئەم ساڵەی کردە بنەمای یەکەم ساڵی زایینی، بەمشێوەیە یەکەم رۆژی مانگی یەنایەری ساڵی یەکەمی زایینی بەرانبەربوو بە یەکەم رۆژی مانگی یەنایەری ساڵی ٧٥٤ی رۆمانی. بەجۆرە (رۆژژمێری رۆمانی ٧٥٣ ساڵ لەپێش ساڵی زایینییەوەیە). ئەوەی کە گرنگە ئاگاداربین ئەوەیە کە دیونیسس لە حیساباتی خۆیدا کەتبووە هەڵەوە! چونکە ئەو سەرەتایی فەرمانڕەوایی ئۆگۆستی بە ساڵی ٧٢٧ رۆمانی داناوە، راستییەکەی ئەو ساڵەیە کە (ئۆکتافیوس) نازناوی ئۆگۆستی وەرگرت! بەڵام فەرمانڕەوایەتی ئۆکتافیوس لە ساڵی ٧٢٣ دەستیپێکردووە! واتە ساڵی ٢٨ لە فەرمانڕەوایەتی ئۆکتافیوس بەرانبەرە بە ساڵی ٧٥٠ی رۆمانی کە

لەڕاستیدا ساڵی ٧٥٠ی ڕۆمانی ساڵی لەدایکبوونی حەزرەتی مەسیحە.. بۆیە بەپێی حیساباتی دیونیسس (٤) ساڵ لەدایکبوونی مەسیحی پێشخستووە! بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم هەڵەیە ڕاستنەکرایەوە و هەروا مایەوە و تائێستاش کاریپێدەکرێت. ئەوەی ماوە بیڵێین ئەوەیە کە پێویستە ئێمە جیاکاری بکەین لەنێوان لەدایکبوونی مەسیح و بەرواری زایینی، چونکە مەسیح لە ٢٥ی دیسەمبەر لەدایکبووە و بەرواری زایینی بە یەکی یەنایەری ئەو ساڵە دەستپێدەکات کە مەسیحی تێدا لەدایکبووە. گرنگترین شتێك کە پێویستە ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە ( ئەو چیرۆکەی کلیمنتی ئەسکەندەری، کە بـــەرواری زایینی لەسەردانرا، هیچ جۆرە بەڵگەیەکی نییە و بەهیچ جۆرێك زانستی نییە!!؟).

### ٤. ڕۆژژمێری گریگۆری:

لەڕاستیدا ئەم ڕۆژژمێرە چاککارییەکیتری ڕۆژژمێری یۆنانییە بە مەبەستی گونجاندن و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی بووە. ساڵی یۆنانی (٣٦٥,٢٥) ڕۆژە، لەکاتێکدا ساڵی خۆری (٣٦٥،٢٤٢٢) ڕۆژە. کەواتە ساڵی یۆنانی بە ڕێژەی (٠,٠٠٧٨) لە ساڵی خۆری زیاترە، واتە نزیکەی (سیانزە خولەك و چواردە چرکە). ڕاستە ئەم جیاوازییە گەلێك بچووکە، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات گەورەدەبێت. لە ساڵی ٣٢٥ زایینی ئیمبراتۆر قوستەنتین فەرمانیکرد بە کۆمەڵێك لە پیاوانی کەنیسەی شاری نیقیا لە ئاسیای بچووك، تا ڕێکخستن بخەنەنێو هەندێك لە کاروباری ئایینی و دانانی کاتی چەژنەکان و ئەو بێسەروبەرەییەی کە هەیە نەیهێڵن. لەو ساڵەدا کاتی هەواخۆشبوونی ئەو ساڵە دەکەوتە ٢١ی مارسەوە بەپێ ساڵنامەی یۆنانی. لە ساڵی ١٥٨٢ زایینی پاپا گریگۆری سیانزەیەم تێبینی ئەوەی کرد، کە (اعتدال الربیعی) لەو ساڵەدا کەوتووەتە ١١ی مارسەوە! واتە هەڵەیەك هەیە کە ماوەکەی (١٠) ڕۆژە! ئەم جیاوازییە لەماوەی نێوان ساڵانی ٣٢٥ تا ١٥٨٢دا ڕوویداوە. ئەم هەڵەیە هەموو ١٢٨ ساڵ جارێك ڕۆژێك جیاوازی دەکات یان زۆردەبێت لەساڵێکدا! پاپا گریگۆری ویستی ئەم هەڵەیە ڕاستبکاتەوە، بۆئەو مەبەستە (کریستۆفەر کلافیوس)ی ڕاسپارد. کریستۆفەر کلافیوسیش ئەم دوو چاککارییەکەی کرد:




١. دۆزییەوە کە جیاوازی نێوان ساڵیَ یۆنانی و ساڵی خۆری نزیکەی (٣) ڕۆژە بۆ هەموو (٤٠٠) ساڵێك، بەواتەیەکیتر: ٤٠٠×٠,٠٠٧٨=٣،١٢ ڕۆژ، ئەم ڕۆژانە زیادەکانی ساڵی یۆنانییە لە ساڵی خۆری لەو ماوەیەدا. بۆیە کلافیوس بڕیاریدا (٣) ڕۆژ لە هەر (٤٠٠) ساڵێك بکاتەوە.

٢. بۆ ڕاستکردنەوەی (اعتدال الربیعی) بڕیاریدا ڕۆژی ٢١ ی مارس بکاتە ڕۆژی (اعتدال الربیعی) لەبری ١١ ی مارس. کلافیوس بڕیاریدا (١٠) ڕۆژ لە ساڵی ١٥٨٢ بکاتەوە و ڕۆژی ٥ی ئۆکتۆبەری ١٥٨٢ی کردە ڕۆژی هەینی بەپێی ڕۆژژمێری یۆنانی کە بەرانبەر دەبێت لەگەڵ ١٥ی ئۆکتۆبەری ١٥٨٢ی ساڵنامەی گریگۆری .

لەم بەروارەوە رۆژژمێری گریگۆری کارپێکرا. بەشێك لە وڵاتانی وەك (فەرەنسا و ئیسپانیا و پرتوگال) لەهەمانکاتدا کاریان بەم رۆژژمێرە کرد، بەڵام هەندێ لە وڵاتانیتر لە سەرەتاوە کاریان بەم رۆژژمێرە نەکرد تا کاتێکی دوورتر لەوانە: بەریتانیا لە ساڵی ١٧٥٢ەوە کاری پێکرد، بەڵام یابان لە ساڵی ١٨٧٢و زایین و روسیا لە ساڵی ١٩١٢و یۆنان لە ساڵی ١٩١٧ و رۆمانیا لە ساڵی ١٩٢٣و میسر لە ساڵی ١٨٧٥و لە سەردەمی خدێوی ئیسماعیل کاریان بەم رۆژژمێرە کرد.

### جۆرەکانی رۆژژمێر:

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گەلێك جۆر لە رۆژژمێر داهێنراون و کاریان پێکراوە، زۆربەی رۆژژمێرەکان تا ئێستاش لە ناوچەیەکی دیاریکراو یان لە ناو نەتەوەیەی دیاریکراودا لە پاڵ رۆژژمێری گریگۆری یان کۆچیدا کاریان پێدەکرێت، وەك رۆژژمێری کوردی، کە تا ئێستاش لە کوردستاندا کاری پێدەکرێت، یان رۆژژمێری فارسی کە لە ئێراندا کاری پێدەکرێت، ئەمە جگە لە رۆژژمێری سینی و کۆری کە لە ولآتانی سین و کۆریادا بە تەواوی کاریان پێدەکرێت. لێرەدا چەند ناوی چەند جۆرێك لە رۆژژمێرەکان ناودەهێنین وەك:

میسری، یۆلیانی، سلوقی، مایا، ئەکادی، عیبری، سریانی، سینی، کوردی، کۆری، بێزەنتی، گریـــگۆری، کۆچی (هیجری)، فارسی (هجری شمسی)، ئیمامی، بەهائی، هیندۆسی، ئەمازیغی، ئەسیوپی، تەبەری، بەنگالی، هیندی.

لەم سەردەمەی ئێستاماندا رۆژژمێری گریگۆری بەشێوەیەکی گشتی لە وڵاتانی جیهاندا کاری پێدەکرێت، جگەلە چەند کەنیسەیەکی رۆژهەڵاتی کە تائێستاش کار بە رۆژژمێری یولیانی دەکەن.

•••

**سەرچاوە:**

www.wikipedia.org

# ڕۆڵی ڕۆژنامە و ڕێکخراوەکانی باشووری کوردستان لە بزواندی هەستی نەتەوەیی کورد لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی شێخ مەحموددا ( ١٩١٨ - ١٩٢٤ )

نووسینی: نیشتمان محەممەد ئەمین

بەرلەوەی ناساندن و شیکردنەوە بۆ هەستی نەتەوەیی بکەین پێویستە ئاماژە بەچەند خاڵێك یان هەندێ ڕاوبۆچوون بکەین بۆ تێگەیشتن لە مانای نەتەوایەتی؟ چونکە دەبێ سەرەتا ئاشنای مەبەست و واتای نەتەوایەتی بین. بۆباشتر تێگەیشتن لە هەستی نەتەوەیی گەیشتن بە مەبەستی بابەتەکەمان.

لێرەدا چەند خاڵێك دەخەینەڕوو لەڕووی چەند میتۆد و مەنهەجێك، نەتەوایەتی دیاردەیەکی مێژووییە بەومانایەی کە لە مێژوویەکی دیاریکراودا پەیدابووە، لەهەمانکاتدا لە مێژوویەکی دیاریکراویشدا گەشەدەکات و گۆڕانکاری و وەرچەرخانیشی بەسەردادێت، هەموو ڕەوشەکانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و جیهانی کاریانتێکراوە، ئەمە وامانلێدەکات بزانین ئەوسەردەمە مێژووییە چییە کە نەتەوایەتی تیایدا پەیدابووە زۆربەی ئەو کەسانەی کە گرنگیان بە مەسەلەی نەتەوە داوە دەڵێن ئەو سەردەمە مێژووییەی کە نەتەوایەتی تیایدا پەیدابووە بووەتە ڕاستییەکی دیار لە ژیانی نەتەوەکاندا، هەندێك لە زاناکان پێیانوایە مەسەلەی نەتەوەیی هەتاهەتاییە وەك (والتەر باکۆت) کە یەکێکە لە زانا ئەڵمانییەکان پێیوایە نەتەوایەتی بە قەدەر مێژوو کۆنە ئەم دیدەش پێچەوانەی دیدگای مێژووییە کە پێیوایە نەتەوایەتی لە مێژوویەکی دیاریکراو پەیدابووە هیگڵ لە کتێبی (العالم الشرقیة) دەڵێت زمانەکان و نەژادەکان لە ئەفسانەکان پیتەکانیش کۆنترن.. بۆیە ڕەگەکانی نەتەوایەتی زۆر کۆنە، لەلایەکیترەوە (ئێرنس ڕینان) کۆمەڵناسێکی فەرەنسییە پێیوایە نەتەوایەتی دەنگدانێکی ڕۆژانە و بەردەوامە، جگەلەمانە دیدی مارکس بۆ نەتەوایەتی تا ساڵی ١٨٦١ گرنگی بە مەسەلەی نەتەوەیی نەداوە وەك پاشکۆیەك یان یەدەگێکی شۆڕشی کرێکاری دادەنا، بەڵام پاش چوونە لەندەنی کە کێشەی بەریتانیا و ئێرلەندای بینی قسە هەرە دیارەکەی خۆی کرد کە ئەویش ئەوەیە هەر نەتەوەییەك نەتەوەییەکیتر بچەوسێنیتەوە زنجیرەکانی چەوسانەوەی خۆی بەهێزتردەکات، هەروەك (ئەریك هۆبس) دووجار لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی نووسیووە لە کتێبێکی مێژوویی بەناوی (الامم النزعه القومیه) کە بڕوای وایە نەتەوایەتی ڕەگەزی ڕابردووە بۆ دروستکردنی ئایینده ڕەگەزی مێژوویی و نەریتیی و فەرهەنگیی و نەژادیی کە ئەمانە هی ڕابردوون بۆ دروستکردنی ئایینده کە مۆدێرنەی سیاسییە دەوڵەتی نەتەوەیی و سەربەخۆیی و سەروەریی نەتەوەکانە کە ئێستا پێیدەوترێت دەوڵەتی نەتەوە[1] ئەمە وەك ناساندنێکی نەتەوایەتی بوو، بەڵام شیکردنەوە یان ناساندنێك بۆ بیری نەتەوەیی بخەینەڕوو، هەستی نەتەوەیی هەرگەلێك لەژێر کاریگەری کۆمەڵێ فاکتەری جیاواز لەنەتەوەییەکیتر دەرکەوتووە و گەشەیکردووە، هەربۆیەش هەستی نەتەوەیی

هەر نەتەوەییەك دەبێتە سیمبولێکی فیکری بۆ گوزارشتکردن لە خودی نەتەوەکە بەجۆرێك کە بەرگێکی جیاواز لەئەوانیتر دەپۆشێت، بە رەنگێکی جیاوازیش لە رەنگی ناسۆنالیزمی نەتەوەکانیتر خۆی دەپۆشێت، تەنانەت خودی زاراوەی ناسۆنالیزم لە زمانە جیاوازەکان و سەردەم و قۆناغە جیاوازەکان تەنانەت لەناو نووسەرە بیریارە ناسۆنالیستەکانیشدا بە مانا و واتای جیاواز لێکدراوەتەوە.

رەنگە هەرئەمەش هۆکار بووبێ وای لە توێژەران کردووە پێناسەی جیاجیا بۆئەم چەمکە دابڕێژن هەریەکە لە روانگە و دید و سەردەمە جیاوازەکان پێناسەی ئەم چەمکە بکەن هەرچەندە لەنێوان تیۆرو پێناسە جیاوازەکاندا خاڵی هاوبەش هەیە، بەڵام ناسۆنالیزم لەهەر جێگە و شوێنێکدا لەنێو هەر کۆمەڵگەیەکدا خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هە[٢].

بۆیە پێناسەکان جیاوازن ئاستەمە کە یەك پێناسە دیاریبکەین بەشێوەیەکی گشتگیر بۆ هەستی نەتەوەیی، بەڵام ئەو پێناسەی تاڕادەیەك گشتگیری پێوەدیارە بۆ ناسیۆنالیزم کە بریتییەلە هەستکردن بە ئینتیما بۆ کۆمەڵێك خەڵك کە زمان و مێژوو و بەرژەوەندی هاوبەش لە وڵاتێك بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە [٣]، بەڵام ئەوەی ئێمە دەمانەوێت لێرەدا ئاماژەی پێبکەین و قسەی لەسەربکەین ئەو ماوە مێژووییە کە شێخ مەحمودی حەفید لە دەسەڵات بووە (١٩١٨-١٩٢٤)، چونکە قسەکردن لەسەر سەرەتای هەستی نەتەوەیی لای کورد بەشێوەیەکی ورد کارێکی وائاسانییە، چونکە بیروڕای جیاواز هەیە لەبارەی سەرەتای سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی هەریەکە خاڵێك یان سەردەمێك دەکاتە دەستپێکی ئەم مەسەلەیە لای کورد بۆنموونە زۆرێك لەنووسەران ساڵی ١٦٩٥ بە سەرەتای سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی کورد دادەنێت کە ئەمەش ساڵی نووسینی مەم و زینی خانییە کە خانی لەنووسینەکەیدا مەبەستی ئەوەبووە کە کوردیش لە خوێندن و نووسین بێبەشنەبووە یان کورد خۆشەویستی و سۆزیان نەکردبێ، بەڵام ناتوانین بڵێین ئەمە سەرەتایەکە بۆئەم هەستە، چونکە هەستی ناسیۆنالیزمی تەنیا بریتینییەلە زمان، بەڵکو دەبێت هەموو فاکتەرەکانیتری نەتەوە و رەگەز و مێژوو هەموو لایەنەکانیتری هاوبەش هەبێ تەنها نووسینێك ناتوانین بڵێین ئەمە سەرەتای سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی بووە لەلای کورد ئەگەر تەنها نووسین یان زمان بێ ئەوە نووسینەکانی بابا تاهیری هەمەدانی لە ساڵی ٩٣٥ شیعری بە زمانی کوردی نووسیووە واتا ناتوانین تەنها زمانی کوردی بەتەنها بۆ سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی کوردی دابنێین، یەکێکیتر لە رایەکان (رۆبەرت ولسن) دەرکەوتنی راپەڕینی شێخ عەبدوڵڵا وەك رێبەری راپەڕینە کوردییە بەرفراوانەی هەردوو کوردستانی عوسمانی و ئێرانی گرتەوە دەکاتە نیشاندەری هۆشیاری نەتەوەیی کورد بەوپێیەی ئامانجی کوردستانی سەربەخۆ بەئاشکرا لەم راپەڕینە راگەیەنرا لەکاتێکدا لە راپەڕینەکانی پێشوودا ئەم ئامانجە بەروونی بەرچاوناکەوێت، هەروەها ئەم راپەڕینە بە سەرەتای گواستنەوەی هەستی نەتەوەیی بۆ هۆشیاری نەتەوەیی دادەنرێت، چونکە ولسن پێیوایە هەستی نەتەوەیی تەنها هەستکردنە وەك بەشێك لەنەتەوەیەکی جیا لەنەتەوەکانیتر، بەڵام هۆشی نەتەوەیی قۆناغێکی پەرەسەندوترە لە هەستی نەتەوەیی بەوپێیەی ئەم هۆشیارییە وادەکات تاك مافە نەتەوایەتییەکەی خۆی بناسێت و بەئەرکی خۆی بزانێت هەوڵ بۆ بەدیهێنانی بدات کە لەپێش هەموویان پێکهێنانی قەوارەیەکی نەتەوەیی دەگرێتەوە..[٤] بۆیە لەبارەی سەرەتای سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی لای کورد رایتر زۆرە زۆریان کۆکن لەسەرئەوەی کە سەرهەڵدانی

هەستی نەتەوەیی کورد دواکەوتووە بۆ سەدەی ١٩و سەرەتای سەدەی ٢٠ وەکو (د. عیسا) دەڵێت: سەرەتای سەدەی ١٩ سەرەتای بڵاوبوونەوەی هۆشیاری نەتەوەیی هاوچەرخە بۆ کورد وایانلێهاتبوو کوردەکان داوای سەربەخۆیی و جیابوونەوەیان دەکرد لە دەوڵەتی عوسمانی، رۆژنامەی کوردستانیش بەفاکتەرێك بۆ هۆشیاری نەتەوەیی دادەنێن.(٥)

هەربۆیە ئێمە لێرەدا باس لە سەرەتای سەرهەلدانی ناکەین هەروەك پێشتر ئاماژەمان بەچەند راوبۆچوون کرد ئالۆزی و ناڕوونییەك هەیە لەمبارەیەوە ئەوەی ئێمە لێرەدا گرنگیپێدەدەین رۆڵی رێکخراو و کۆمەڵەکان لەگەڵ ژمارەیەك بڵاوکراوە و رۆژنامەکان بەتایبەت لەنێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٤) بۆ زیاتر پووختکردنەوەی بابەتەکەمان و گەیشتنی مەبەستەکەمان بە خوێنەر.. بۆیە ئەم ماوە مێژوویەمان دیاریکردووە ئەم قۆناغەش یەکێکە لە قۆناغە هەستیارەکانی مێژووی نەتەوەیی کورد کە لەوکاتەدا کوردستان بە بارودۆخێکی هەستیار تێدەپەڕی رووبەڕووی چەندان ئازار و ناخۆشی بووەتەوە.. بۆیە لەنێوان ئەو هەموو نەهامەتی و ناخۆشییانەی لەوکاتەدا تروسکاییەك یان هیوایەك بۆ کورد دەرکەوتن بۆ بەرەوپێشچوونی و گەشەسەندنی هەستی و بێهیوانەبوونی تاکەکانی ئەوکاتە ئەویش رۆڵی رێکخراو و رۆژنامەکان بوو، هەرچەندە لەوکاتەدا ژمارەیەك رێکخراو و کۆمەڵە دروستببوو لەپارچەکانیتری کوردستانیش، بەڵام ئەوەی لێرەدا ئاماژەی پێدەدەین تەنیا کۆمەڵە رۆژنامەکانی باشووری کوردستان، بەڵام ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبکەین باسەکەشمان بەبێ ناوهێنانی ئەوشارە ناتەواودەبێ، هەریەکی بیەوێت شیکردنەوە بۆ هەستی نەتەوەیی کورد بکات ئەوە ناتوانێت بەدەربێت لە باسکردنی شاری سلێمانی، چونکە سلێمانی لەوکاتەدا ناوەندێك بووە بۆ کۆبونەوەی رۆشنبیر و نیشتمانپەروەران ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە پایتەختی میرنشینی بابان بووە کە هەمووان دەزانین ئەم میرنشینە لەڕووی ئەدەب و رۆشنبیرییەوە لەلووتکەدا بووە جگەلەوەی ناوەندێك بووە بۆ تەریقەتەکان بەتایبەت تەریقەتی (قادری و نەقشبەندی) کە لەوکاتەدا رۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە رۆشنبیرکردنەوەی خەڵك و بزواندنی هەستی نەتەوەییان، چونکە لەوکاتەدا پیاوانی ئایینی رۆڵێکی کاریگەریان هەبووە لەسەر بیروبۆچوونی خەڵك پایەکی بەرزیان هەبووە لە کۆمەڵگەی کوردیدا، جگەلەوەی زۆربەی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەی لەوکاتەدا دەردەچون لە سلێمانی بوون.(٦)

بۆنمونە لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی یەکەم جیهان و جەنگی دووەمی جیهاندا نزیکەی (دە) رۆژنامە و گۆڤار لە کۆی (چواردە) رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکەی سەرتاسەری عێراق لە سلێمانی دەردەچوو، ئەوانیتریش (دوو) دانەیان لە بەغدا و (یەك) دانەیان لە هەولێر و (یەك) دانەش لە رەواندز دەردەچوون، هەروەکو لە گۆڤاری لەندەنی (خۆرهەڵاتی نزیك و هیندستان) یان گوتەی رۆژنامەی (العالم العربي) کە سلێمانی ناودەبات بە ناوەندی گەردەلوولە تۆقێنەرەکان.(٧)

سەرەڕای ئەمانەش ناوەندی دەسەڵاتی شێخ مەحمود بووە ئەمەش وایکردبوو زیاتر خەڵك لەم ناوچە کۆبێتەوە، کەواتا دەتوانین بلێین ئەمانە هەموو فاکتەرێك بوون کە دەرفەتی زیاتری لەچاو شارەکانیتر بۆ رەخساوە بۆ قوولبونەوەی هەستی نەتەوەیی لەناو خەڵکەکەیدا، هەروەها هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ بزواندنی هەستی نەتەوەیی کورد بەهۆی ئەو زوڵم و زۆری و پێشێلکردنی مافی نەتەوەی کورد لەیەکیترەوە هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان بە مانای خۆئامادەکردنی ناسۆنالیزمی کوردی بوو بۆ مامەلەکردنی سیاسییانەی هێزێکی

نویێ هێزێك جگەلەوەی دەوڵەتێکی زلهێز و بڕیاربەدەستی سیاسی دنیایە لەتوانایدابوو جوولانەوەی سیاسی کورد سەرکوتبکات ئەگەر بەرژەوەندی بخوازێت دەوڵەتی کوردی دروستبکات.(٨)

بۆیە دوای ئەوەی کە ئینگلیز گەیشتە کوردستان بەگشتی و سلێمانی بەتایبەت کە چاویان لەوشارە بڕیبوو دەیانەویست بیخەنەژێر دەسەڵاتی خۆیان لەوکاتەشدا ١٩١٨ کە شێخ دەسەڵاتی هەبوو لەوشارە پەیوەندیشی لەگەڵ ئینگلیز باشبوو بەتایبەت ئەوکاتەی کە(مێجەر نوێل) حاکمی سیاسی ئینگلیز بوو لەن اوچەکە، بەڵام دوای ئەوەی کە (مێجەر سۆن) جێگای گرتەوە هاتە سلێمانی، لە مایسی ١٩١٩ بووە حاکمی سیاسی ئینگلیز هەر لەسەرەتاوە پەیوەندی لەگەڵ شێخ باشنەبوو هەرکە دەسەڵاتی گرتەدەست یەکەم کاری گۆڕانکاری بوو لەبواری ئیداری لە دەسەڵاتی شێخی کەمکردەوە، لە هەوڵی لابردنی شێخ بوو لە دەسەڵات تا ئەم هەلەی بۆڕەخسا دوای شکستی شێخ لە شەری دەربەندی بازیان ١٩١٩ دوورخرایەوە لە سلێمانی بەمەش بارودۆخی کوردستان بەگشتی و سلێمانی بەتایبەت تێکچوو بەریتانییەکان دەستیانگرتبوو بەسەر هەموو جومگەکانی کۆمەڵگە، خەڵکەکە بێزارببوو لە بارودۆخە، بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەك گەورەپیاوان و رۆشنبیرانی سلێمانی مەجلیسی میللییان پێکهێنا بەسەرپەرشتی شێخ مەحمودی حەفید ئەمەش بەمەبەستی دروستکردنی دەسەڵاتێکی کوردی و ئاشوب و ئاژاوەی شار نەهێڵدرێت ژیانی خەڵك باشبکرێت.. بۆیە لەوکاتەدا بیرۆکەی ئەوە دروستبوو کە منەوەرەکان لەگەڵ سەرۆك عەشیرەت و هەموو ئەوکەسانەی دژی دەسەڵات و مانەوەی ئینگلیزن کۆبکەنەوە لەژێر سایەی کۆمەڵەیەکدا، بەڵام لەسەرەتادا تەنیا ئەم بیرۆکە گەڵاڵەکرابوو، بەرنامەیەکی پوخت و و هەڵسەنگێنراوی بۆدانەنرابوو لەسەرەتادا حەوت کەس ئەو کۆمەڵەیان بەڕێوەدەبرد مەبەستیان بوو کە هەستی نەتەوەیی لەناو هەموو دەستە و هۆز و شار و دێهات بڵاوبکەنەوە، کەسێکی خاوەن هەستێکی نەتەوەیی و بیرو باوەڕی پوخت بێنەناوەوە هەستکی گشتی کوردایەتی یەکیانبخەن دواتر ئەوانەی جێگەی متمانەن بیانهێنەژێر سایەی کۆمەڵە و بەرنامەی سیاسی و کردەوەی کۆمەڵایەتییان بۆدانێن کەسانی ئەم کۆمەڵەش لەرووی ئاستی زانیاری و تێگەیشتن و تەمەن و عەشیرەت جیاوازبوون، بەڵام بیروباوەڕ و هیوا و ئامانجی نەتەوەیی هەمووی لەژێر یەك ئاڵای نەتەوەیی کۆکردبووە، بەڵام ئەوەی کێشەی ئەم کۆمەڵە بوو ئەویش نەبوونی سەرکردەیەك بوو، چونکە ئەوکەسەی هەڵدەبژێردرا دەبوو لە بنەماڵە یان عەشیرەتێکی دیاربێت دەنا خەڵك دەورینەدەدا هەرچەندە کە خوێندەوار و شارەزاش بوایە.(٩)

بۆیە ئەوەی لەوکاتەدا گرفتێك بوو لەبەردەم کۆمەڵە و رێکخراوەکان بەتایبەت و کایەکانی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی گشتی زاڵبوونی هەستی خێڵایەتی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی کوردی بوو وایکردبوو هەستی هاوکاری نەتەوایەتییان تاڕادەیەك کەمبێت، بەتایبەت دوای دوورخستنەوەی شێخ مەحمود لە دەسەڵات بەمەش بارودۆخی کوردستان بەگشتی و سلێمانی بەتایبەت بەرەو گرژی و ناخۆشی رۆیشت لە ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٠چەندان راپەڕین و شۆڕشی بەدوای خۆیدا هێنا بۆ هێورکردنەوەی ئەم بارودۆخەش ئینگلیز پێویستیان بە کەسێك هەبوو کە جێگەی شێخ مەحمود بگرێتەوە چارەسەری کێشەکان بکات، چونکە ئینگلیز دەترسا ئەم بارودۆخە زیاتر بەرەو گرژی بڕوات ناتوانن کۆنترۆڵی رووداوەکان بکەن.. بۆیە پەیوەندییانکرد بەچەند کەسایەتییەك، یەکێك لەوانە حەمدی بەگی بابان بوو کە یەکێك بوو لە میرەکانی میرنشینی بابان نیشتەجێ بەغدا بوو.. بۆیە لەسەر داوای ئینگلیز هاتەوە باشووری

کوردستان ب ئەم مەبەستەش بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری سەرۆکە کوردەکان ویستی کۆمەڵەی (سەربەخۆیی کورد) دابمەزرێ، ئەو کۆمەڵە لەلایەن ئینگلیز سەرپەرشتیدەکرا، ئەم کۆمەڵە وەك یەکەم کاری رێکخراوی ئینگلیزی بوو وەك بیرۆکە پالپشتی کێشەی نەتەوەیی کوردی پێبکات، بەڵام حەمدی بەگ دوودل بوو لەمکارە پێیوابوو دەبێ چاودێری بریتانیا زۆر کەمبێت لەسەر ئەم کۆمەڵە تا کورد بتوانێ کارەکانی بە سەربەستی بکات، لەلایەکیترەوە ئینگلیز پێیوابوو کە حەمدی بەگ لەبەغداوە شوێنەکەی دوورە باش ئاگاداری بارودۆخی باشووری کوردستان نییە.. بۆیە حەمدی بەگیان وەلانا[١٠]، لەوکاتەشدا لە رەواندز نوری باوەیل ئاغا خۆی بۆ هێرشی دژی ئینگلیز ئامادەکردبوو توانی هۆزی سورچی و خۆشناو و توێژەکانیتری ئەو دەڤەرە لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە کۆمەڵەیەکی دروستکرد لە ساڵی ١٩٢٠ بەناوی (جامیعەی ئیسلامی) خەڵکی هاندەدا دژی بەریتانیا راپەرینبکەن، داوای مافی نەتەوەیی خۆیان بکەن بەشێوەیەکی گشتی لەوکاتەدا کەسایەتی و سەرۆك عەشیرەتەکان دەیانەویست لەرێگەی رێکخراو و کۆمەڵەوە خەڵك کۆبکەنەوە هانیانبدەن بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان هەر لەم رێگەیەشەوە توانیان رەواندز لەدەست ئینگلیز رزگاربکەن لە کۆیەش بەهەمانشێوە خواست هەبوو بۆ چوونەناو جامیعەی ئیسلامی جیهادبکەن دژی ئینگلیز. واتا دەتوانین بلێین لەوکاتدا هەستی ئایینی زالبووە بەسەر هەستی نەتەوەیی، چونکە پێگەی پیاوانی ئایینی یان تەریقەتەکان لە کۆمەڵگەی کوردیدا بەرزبووە کاریگەری زۆریان هەبووە لەسەر بیروباوەڕی خەڵك و چۆنیەتی ئاراستەکردنیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئینگلیز واتا ئەم کۆمەڵەیە زیاتر ئایینی بوو لەرێگەی بیروباوەڕی ئایینییەوە هەستی نەتەوەیی خەڵکیان دەبزواند.[١١]

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە توندوتیژییەی ئینگلیز لەسەرووی هەموویانەوە رەفتارەکانی مێجەر سۆن بەتایبەت لەگەڵ لایەنگرانی شێخ مەحمود ئەوانەی داوای هاتنەوەی شێخیان دەکرد بۆ سلێمانی ئەم سیاستەی زیاتر هاندەربوو بۆ بزواندنی هەستی نەتەوەیی خەڵك بایەخدانی زیاتر بە رێکخستنی تاکی کورد و کۆبونەوەیان لەژێر سایەی کۆمەڵەیەکی نەتەوەیی یەکگرتووی کورد بۆ داکۆکی و داواکردنی مافەکانیان بەتایبەت لەوکاتەدا شێخ مەحمود لەلایەن ئینگلیزەوە دورخرابووەوە بۆ هیندستان، لە یەکێك لە بەڵگەنامەکانی بریتانییەکاندا بێپێچوپەنا دانیانبەوەداناوە کە لەوکاتەدا هەموو هەستی نەتەوایەتی کورد ئاراستەکرابوو بۆ گەڕانەوەی شێخ مەحمود،[١٢] چونکە خەڵك پێیانوابوو کاتێك کە شێخ ئازادبکرێت دەتوانن زیاتر برەوبە شۆڕش و خەباتی نەتەوەیی بدەن و داوای مافەکانیان بکەن بەڕابەرایەتی شێخ.. بۆیە لەوکاتەدا گشت بیروبۆچوونەکان یەکیاندەگرت دژی بریتانیا هەموو چین و توێژەکان بەبێ جیاوازی لە شار و دێهات و بە خوێندەوار و نەخوێندەوار کەوتنە یەکگرتن و دامەزراندنی کۆمەڵە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز لەسەرووی هەموویانەوە سیاسەتەکانی سۆن، چەند کۆمەڵەیەك دروست بوون لەوانەش کۆمەڵەی (بەرزی وڵات، کوردستان، گزنگ، فیداکارانی کورد، وڵاتپەروەران) ئەم کۆمەڵانە زیاتر لەسەر یەك بەرنامە و پرۆگرام بوون لقیان لە زۆربەی ناوچەکان بڵاوبوبووەوە، زۆر بەهێز و پڕگڕوتین بوون زیاتر مەبەستیان دەرکردنی دەسەڵاتی بێگانە و گەڕانەوەی شێخ مەحمود بوو کە لە یەکەم بەیاننامەدا کە بڵاوکرایەوە تێیداهاتبوو ( تەنیا بەدوورخستنەوەی یان نەمانی شێخ مەحمود نە ناوی شێخ مەحمود، نە ناوی کورد نامرێت، چونکە دەبێت ئەو شێخ مەحمودەی حوکمداری کوردستان بەزوویی بێتەوە یان دەبێت ئێوە بڕۆن کوردستان نیشتمانی کوردە، ئینگلیز

بێگانەیە)، ئەم بەیاننامە لە ۲۰ شوباتی ۱۹۲۰ بڵاوکرایەوە بەناوی کۆمەڵانی کوردستان و کۆمەڵەی بەرزی وڵات. ئەم بەیاننامە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر هەستی نەتەوەیی خەڵك و خرۆشانی تێکڕای جەماوەر بووە هۆی تووڕەبوونی مێجەر سۆن خەڵك زیاتر رقیانلێبێتەوە و پلە و پۆستی پێلەقبکەن زیاتر پێداگریبکەن لەسەر رۆشتنی ئینگلیز بەگشتی لە کوردستان، بەو وتانەیان کە ئینگلیز بێگانەیە هەم بە بیر مێجەر سۆن هەم خەڵکەکەشیان خستەوە کە لە ئینگلیز نەترسن بەهەموو توانایەنەوە بەرەنگاریانبنەوە لە خاکی خۆیان بەدەریانبنێن،(۱۳) ئەم کۆمەڵانە بەردەوامبوون لەسەر بڵاوکردنەوەی بەیاننامە و بەرزکردنەوەی هەستی نەتەوەیی میللەت، کۆمەڵەی گزنگیش بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە لە ۲۱ مارتی ۱۹۲۰ دژی ئینگلیز بەگشتی و بەتایبەت سیاسەتەکانی سۆن، ئەم بەیاننامە زیاتر ئاراستەی خەڵکی سلێمانی کرابوو لەبارەی ئازادکردنی شێخ مەحمود داوادەکرا هەموو بەیەکدەنگ داوای سەربەستی بکەن لەخەو هەلسن بەئاگا وەرن ئەوە حوکمدارتان دیلی دەستی دوژمنە، چونکە داوای ئازادی و مافی نەتەوەکەی خۆی کردووە، ئینگلیز ماڵ و موڵکمان وێراندەکات نە قوتابخانە و نە کارگە نە دڵسۆزی نییە تاکەی ئەم سەرشۆڕییە دوژمنی خوێنمژتان لەناوببەن داوای ئازادی بکەن بە چەك، پێنووس، هاوار؟

کوا حوکمدارەکەتان؟
کوا ئاڵای رەنگاوڕەنگتان؟
کوا هەڵمەتە دلێرانەکەتان؟

ئەم وتە ئاگرینانە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر بڵێسەسەندنی ناخی خەڵك و بەئاگاهێنانەوە و خرۆشانی هەستی نەتەوایەتییان، داواکردنی مافەکانی جا بەهەر رێگەیەك بێت.(۱٤)

سەرەڕای ئەمانە چەندان پارتیتریش دروستبوون لەوکاتەدا لەپارچەکانیتری کوردستان شانبەشانی ئەم پارتانە بەیاننامەیان بڵاودەکردەوە تەنانەت ژنانیش رۆڵیان هەبووە لەم خەباتەدا بێدەنگنەبوون لە ئاست داگیرکاری بێگانە و زوڵم و زۆرییەکانیان لەسەرووی هەموویانەوە خێزانی شێخ مەحمود و عایشە خانی کچی نەقیب نامەیەکیان ئاراستەی سۆن کرد داوای هاتنەوەی شێخیان دەکرد، لەلایەکیترەوە پزیشکان بێبەشنەبوون لە دەربڕینی نارەزایی بۆئەم مەبەستەش کۆمەڵێ پزیشك بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە داوای هاتنەوەی شێخیان دەکرد و رۆشتنی بێگانە لە خاکەکەیان.(۱٥)

بەشێوەیەکی گشتی گەر سەیری شێوازی بەیاننامەکان بکەین دەبینین زیاتر هەستی نەتەوەیی خەڵك لەوکاتەدا چڕببووەوە لە ئازادکردنی شێخ و گەڕانەوەی بۆ کوردستان، کەواتا گرتنی شێخ مەحمود لەلایەك و توندوتیژییەکانی ئینگلیز لەلایەکیترەوە هۆکاری سەرەکیبوون بۆ بزواندنی هەستی نەتەوەیی خەڵك، چونکە گەر سەیری بەیاننامەکان بکەین دەبینین داواکاری خەڵك لە دوو خالدا خۆی دەبینییەوە ئەوانیش گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی و کۆتاییهاتنی دەسەلاتی بێگانە.

لە ئەنجامی تێکچوونی ئەم بارودۆخە خراپی سیاسەتەکانی سۆن، بەڵام نابێ ئەوەشمان لەیادبچێت هەرچەندە سۆن کەسێکی توندوتیژبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئەوروپییەکی پێشکەوتوو بیریدەکردەوە لە بیری رۆشنبیرکردنی خەڵك بوو چەند بابەتی دەنووسی و بڵاودەکردەوە بۆ ئەوکاتەی کورد شتێکی نوێبوو بەمەش کورد ئاشنای کلتوری رۆژئاوایی دەبوو زیاتر درکی بە مافەکانی دەکرد، گرنگیی زۆری بە زمانی کوردی داوە جا لەمەدا هەر مەبەستێکی هەبووبێ وەك هەندێ لە نووسەران دەلێن مەبەستی سیاسی خۆی لەپشت ئەم بایەخپێدانە بووە هەستا بەهێنانی چاپخانەیەك بۆ سلێمانی یەکەم، رۆژنامەی کوردی پێدەرکرا بەناوی (پێشکەوتن) لە ٢٩ نیسانی ١٩٢٠ تا ٢٣ شوباتی ١٩٢٢، هەفتەی جارێك دەردەچوو (١١٨) ژمارەی لێدەرچوو، سۆن خۆی سەرپەرشتیدەکرد چەندین رۆشنبیری ئەوکاتە لەدەوری خۆی کۆکردبووە لەڕاستیدا رۆژنامەی پێشکەوتن دەرگایەك بوو لەبەردەم رۆشنبیرانی کورد و رۆژنامەگەری هەستا بەدانانی خەڵات بۆ سێ چیرۆك کە بە کوردی پەتی بنووسرێت واتا سۆن بە دوو لایەن هۆکاربووە بۆ بزواندنی هەستی نەتەوەیی لایەنە توندوتیژییەکەی کە پێشتر باسمانکرد خەڵك چۆن هەستی بە پێشیلکردنی مافەکانی دەکرد لەلایەکیترەوە لەڕێگەی پێشکەوتنەوە بەهۆی نووسینەکانەوە گەلێك وتاری سیاسی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و زانستی و رۆشنبیری گشتیی هۆشیاریی بڵاوبکاتەوە زیاتر چاوکراوەبێت بەرامبەر رووداوەکان خەڵکی ئەم رۆژنامە بخوێنەوە زیاتر گرنگی بە زمانی کوردی بدەن،[١٦] بەڵام خەڵك هەر بێئومێدبوو داوای مافەکانی خۆیان دەکرد، چونکە هەولەکان ئینگلیز زیاتر دەبووە هۆی دروستبوونی مەترسی لای گەلی کورد سەرەڕای ئەم مەترسییانە لەوکاتەدا پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاوببووەوە کە ئەزدەمیری تورك دێت بۆ سلێمانی کوردەکان یان نیشتمانپەروەران لەناودەبات.. بۆیە خەڵکەکە هیوایان لێبڕابوو کەوتبوونە نێوان دوو هێزەوە بەهۆی ئەم پڕوپاگەندانەوە مستەفا پاشای یامولکی لەئەستەمبولەوە گەڕایەوە بۆ سلێمانی بەمەبەستی پارێزگاریلێکردنی لە دەستی تورك لەلایەکیترەوە بۆ تازەکردنەوەی هەستی نەتەوەیی بۆئەم مەبەستەش هەستا بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی کوردی مۆڵەتیشی لە حکومەتی سیاسی سلێمانی وەرگرت لە ٢١تموزی ١٩٢٢ لە مزگەوتی سەیید حەسەنی موفتی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی ناسراوی سلێمانی کۆبونەوە دوایی توانر ژمارەیەك لە کەسانی شارەزا و دیاری شار هەلبژێرن ببنە ئەندامی کۆمەڵەکە ئەوانیش: (رەفیق حیلمی، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، فایەق بەگی مارف بەگ، شێخ عەلی، شێخ محەممەدی گوڵانی، سالح ئەفەنی قەفتان، سدیق ئەفەنی عەلەکە.. هتد) کۆمەڵەکەش بە (کۆمەڵەی کوردستان) ناونرا ئەندامەکانیشی بەدەنگدانی نهێنی لە کۆی بیست و چوار کەس سێزدە کەسیان لێهەلبژێردرا و رەفیق حیلمیش زۆرترین رێژەی دەنگەکانی بەدەستهێنا.

ئەم کۆمەڵەیە بە یەکەم کاری رێکخراوەی کوردی دادەنرێت لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان کە تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە،(١٧) دیارە ئەمەش بەهۆی ئەوەبووە کە رۆژنامەیەکیشیان دەرکردووە بەناوی (بانگی کوردستان) یەکەم ژمارەشی لە ٢٠ ئە غستۆسی ١٩٢٢ بە هەرسێ زمان کوردی و فارسی و تورکی بڵاوکرایەوە، چواردە ژمارەی لێدەرچوو لە چاپخانەی حکومەت لە سلێمانی چاپکراوە بارسی هەموو ژمارەکانی ٢١/٣٤ سانتیمە جگەلە ژمارە چواردەی کە چوار لاپەڕە بووە، هەموو ژمارەکانیتری شەش لاپەڕە بووە، ئەم رۆژنامە رۆڵێکی دیاری گێڕا لەبەرەوپێشبردنی بیری نەتەوەیی و بەرزبوونەوەی ئاوازی نیشتمانپەروەرانی ئەو سەردەمە نووسینەکانی ئەم رۆژنامە

بەڕوونی بیری ناسیۆنالیزمی کوردیان پێوەدیاربوو جا چ لەڕێگەی وتارە سیاسییەکانەوە بووبێت یان شیعری هەندێ لە شاعیرانی کورد بوو کە لەوکاتەدا لەسەر لاپەڕەکانی بانگی کوردستان بڵاویاندەکردەوە، هەرچەندە ئەم رۆژنامەیە توانی خزمەتێکبکات بە چین و توێژەکانی کۆمەڵگە و بزواندنی هەستی نەتەوایەتییان و هاندانیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی بێگانە لە خاکەکەیان، بەڵام دوای تەنها دەرکردنی چواردە ژمارە دادەخرێت، هەندێك بۆچوون هەیە لەبارەی داخستنیەوە دەڵێن هۆکاری داخستنی بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە ئینگلیز دەستی هەبووە لە دامەزراندنی، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە تەواوی کۆمەڵەکە دەستی بێگانەی تێدابووبێ بۆ بەرژەوەندی ئینگلیز کاریانکردبێ و پشتیان لە مافی رەوای کورد کردبێ، رایەکیتریش هەیە دەوترێت بیروبۆچوونەکانی پێچەوانەی بیری عەشایری بووە تەنانەت دژی شێوازی حوکم یان بیرۆکەکانی شێخ بووە، چونکە لەسەر بنەمای عەشایری بوو ئەم رۆژنامە داوایدەکرد کە ناسیونالیزمی کورد تەنها لە چوارچێوەی دەسەلات و پەیڕەوی شێخایەتی و ئاغا و هۆزایەتی پەیڕەونەکرێت بەڵکو دەبێت دیدێکی فراوانتر بدرێت بە ناسیونالیزمی کورد.[١٨]

دواتر رۆژنامەیەکیتر جێگای بانگی کوردستانی گرتەوە ئەویش (رۆژی کوردستان ) بوو ئەم رۆژنامە زمانحاڵی حکومەتەکەی شێخ مەحمود بوو کە دووپاتیان لە دروستبونی دەسەڵاتی سەربەخۆی کوردی دەکردەوە لە عێراق، ئەم رۆژنامە بابەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبییەکانی بڵاودەکردەوە، ئەگەر سەیرێکی ژمارەکانی ئەم رۆژنامە بکەین دەبینین کە باسی زۆربەی لایەنەکانی ژیانی تاکەکان کردووە تەنانەت شیکردنەوەی بۆ پیتی پەتی کوردی کردووە گرنگی بە زمانی کوردی داوە، کۆمەڵێ شیعری جوانی کوردی تێدابڵاوکراوەتەوە ئەم رۆژنامەش هەروەك ئەوانیتر داکۆکیکراوە لەسەر مافەکانی گەلی کورد جیابوونەوەی لە عێراقی عەرەبی و بەدیهێنانی مافەکانی گەلی کورد،[١٩] داوای دروستکردنی دەوڵەتی کوردی دەکرد و پشتگیری بەرنامە و پرۆگرامی حکومەتی شێخ مەحمود دەکرد، بەڵام نابێ ئەوەش لەیادبکەین راستە کە کورد داوای جیابوونەوەی لە عێراقی عەرەبی دەکرد کە ئەمە مافێکی یاسای خۆیەتی، بەڵام هەرگیز نەیویستووە لەسەر پێشلکردنی مافی دراوسێکانی وەك عەرەب و تورك و فارس مافەکانی خۆی وەربکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رازینەبوو کەس چاوبرێتە خاك و ئاوی کورد بە بەشێك لە عێراقی عەرەبی بزانن، ئەم رۆژنامە لەوکاتەدا کاریگەرییەکی زۆریان دروستکردبوو لەسەر بیرکردنەوەی خەڵك هەروەکو کاتێك ئینگلیز سلێمانی جێهێشت گرنگیی بلاوکراوەکانی دەزانی کە چ کاریگەرییەکی هەیە لەسەر بیرکردنەوە و رەفتاری خەڵك.. بۆیە دوای رۆشتنیان هەڵسان بە خراپکردنی ئەو چاپخانەی کە هێنابوویان بۆ سلێمانی بۆدەرکردنی رۆژنامەی پێشکەوتن و جێبەجێکردنی کارە میرەییەکانی خۆیان.. بۆیە نەیانتوانی لەگەڵ خۆیانی بەرن بۆیە نەیانویست کە کورد سوودیلێوەربگرێت، بەڵام دواتر توانرا چاکبکرێتەوە بۆئەم مەبەستەش دەستەیەك لە روناکبیران پێکهێنرا لەوانە (ئەحمەد خواجە، ماجید مستەفا، سەیید ئەحمەدی بەرزنجی، سەبری کاکە رەش.. هتد) بۆدەرکردنی رۆژنامەیەك دوای راوێژکردنی دەستەکە بڕیاری دروستکردنی رۆژنامەیەکیان دەرکرد سەرەتا چەند ناوێکیان دۆزییەوە بۆ رۆژنامەکە دواتر بە بڕیاری زۆرینە ناونرا (ئومێدی ئستیقلال) یەکەم ژمارەی لە ئەیلولی ١٩٢٣ دەرچوو، بیست و پێنج ژمارەی لێبڵاوکرایەوە رۆژژنامەیەکی سیاسی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بوو هەفتەی جارێك دەردەچوو ئەم رۆژنامە بەهەمانشێوەی رۆژی کوردستان زمانحاڵی حکومەتەکەی سێەمی شێخ مەحمود بوو

محەمەد زوهدی ئەم رۆژنامەی چاپدەکرد و پیتەکانی هەرژمارەیەکی بەچەند رۆژێك رێکدەخست و بە رۆژێکیش چاپیدەکرد لاپەرەکانی ئەم رۆژنامە پرشنگێکیتری تۆماری رۆژنامەنووسی کوردی بوو، ژمارەکانی ئەم رۆژنامە بۆ زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستان دەنێردرا تەنانەت بۆ بەغداش، هەروەها لەم رۆژنامەدا باسی ژیانی کەسایەتییەکان کراوە سووچێکی رۆژنامەکە بۆ مەبەستی ریکلام و ئاگادارییەکان تەرخانکرابوو، بەلاَم ئەم رۆژنامە زۆری پێنەچوو کاتێك فرۆکەکانی ئینگلیز گەمارۆی سلێمانیان دا لە چاپ وەستا ، بەلاَم دوای مانگێك دەزگایەکی میری کەوتە بلاَوکردنەوەی رۆژنامەیەك بەناوی ( ژیانەوە ) لە ١٨ ئابی ١٩٢٤ کەوتە بازارەوە.[٢٠]

ئەم رۆژنامە لەلایەن شارەوانی سلێمانی دەردەچوو ئینگلیز خۆیان سەرپەرشتییاندەکرد و ئاگاداری هەموو بابەت و برگەکانی بوون، ساڵی یەکەمی ٣٦ ژمارە وساڵی دووەمی ٢٠ ژمارەی بلاَوکرایەوە کە چاوپێخشاندنێك بە برگەکانی ناو ئەم رۆژنامە بکەین ئەوەمان بۆدەردەکەوێت کە لەرووی رێنووسییەوە شێوە نووسینەکانی باشتر و تازەتربوو تارادەیەك هەوڵێشدراوە کوردی پەتی لەچاو رۆژنامەکانی پێشخۆی زیاتر تێدابەکاربێت ئەوەی لەم رۆژنامە بەدیدەکرێت زیاتر رەخنەبووە لە شێوازی دەسەلاَت و حوکمەتەکەی شێخ مەحمود، ئینگلیز هەولێانداوە ئەوە بۆ کورد روونبکەنەوە کە کورد و تورك هەرگیز ناتوانن بەیەکەوە بژین کە ئەمەش بەرژەوەندی خۆی تێدابووە ئینگلیز دەترسا کە کورد و تورك یەکبگرن نفوزی دەسەلاتی خۆی کەمببێتەوە لە کوردستان، ئەمە سەرەرای ئەوەی کە کۆمەڵی چیرۆك و شیعر بلاودەکرایەوە لەسەر لاپەرەکانی ئەم رۆژنامە بەتایبەت ئەوجۆرانەی کە رەخنەبوون لە فەرمانرەوایەتی شێخ و چۆنیەتی حوکمکردنی نموونەی ئەوەش وەك چیرۆکی (لەخەوما)ی جەمیل سائیب، لەگەڵ کۆمەڵی شیعری شاعیری کورد پیرەمێرد،[٢١] کەواتا دەتوانین بلێین ئەم رۆژنامە زیاتر رەخنەبووە لە دەسەلاَتی شێخ مەحمود، چونکە هەروەکو پێشتر لە بەیاننامەی کۆمەڵەکان بۆماندەردەکەوێت کە چ گرنگییەك بەگەرانەوەی شێخ دەدرا هەروەك لە یەکێك لە دیکۆمێتەکانی ئینگلیز دانیان بەوەداناوە کە هەستی نەتەوەیی خەڵکی کوردستان ئاراستەکرابوو بۆ گێرانەوەی شێخ مەحمود، بۆیە زیاتر لەرێگەی ئەم رۆژنامەوە دەیانەویست حکومەتەکەی شێخ لەبەرچاوی خەڵك ناشیرینبکەن، چونکە گرنگیی بوونی شێخیان بۆدەرکەوت لای نەتەوەی کورد ئەمە سەرەرای ئەو بەیاننامانەی کە شێخ و هاورێکانی لەوکاتەدا بلاَویاندەکردەوە لە شاخ، لێرەدا گرنگیی و رۆڵی رۆژنامە و بلاوکراوەکانمان بۆدەردەکەوێت راستی ئەو قسانەی پێشوومان بۆدەردەخات کە نووسینەکان چ رۆڵێکی دیاریان هەبووە لەسەر بزواندنی هەستی نەتەوەیی شێخ مەحمودیش هەستی بەو کاریگەرییە کردبوو لەسەر رۆشنبیرکردن و کرانەوەی بیری خەڵك لەرێگەی بلاَوکرانەوەکانەوە بەتایبەت دوای ئەوەی کە شێخ مەحمود سلێمانی جێهێشت لە ١٩٢٣ بەرەو سورداش شاخەکانی کوردستان بەرێکەوت بۆ ئەشکەوتی جاسەنە لەگەڵ خۆیدا چاپخانەیەکی بچووکی برد لەوێ رۆژنامـــــــەیەکی دەرکرد بەناوی بـــــانگی هەق یەکـــەم ژمارەی رۆژی ٥شەممە ٢٨ی مارتی ١٩٢٤ بە دوو لاپەرە (٢١/٣٣کم ) دەردەچوو، چونکە شێخ لەوراستیە گەیشتبوو کە دەکرێت لەرێگەی نوسین بیر و هەستی خەڵك زیاتر هانبدات بۆ کوردایەتی، کاریگەری خۆی جێبهێلێ لەرێگەی ئەم رۆژنامە و شێخ مەحمود بەرنامە و پرۆگرامی خۆی بلاَودەکردەوە بۆ شۆرش و خەبات لەپێناو ولاَتەکەی و بەدەستهێنانی مافەکانی گەلی کورد واتا شاخەکانی کوردستان هەرتەنیا ناوچەیەك نەبوو بۆ رووبەرووبونەوەی چەکداری، بەلکو شوێنیکیش بووە بۆ بلاَوبونەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و خۆرۆشنبیرکردن.[٢٢]

سەرەڕای بەرنامە و پرۆگرامی ئەو کۆمەڵە و ڕۆژنامانەی کە باسمانکرد کە مەبەستی سەرەکییان بەرزکردنەوە یان بزواندنی هەستی نەتەوەیی بوو لەلای تاکی کورد، بەڵام سەرەڕای ئەم مەبەستە لەلایەکیترەوە ئامانجێکیتریان هەبوو ئەویش ناساندنی زمانی کوردی و بەکارهێنانی لە دامودەزگاکانی بوو بەشێوەیەکی فەرمی و پاکردنەوەی ئەم زمانە لە وشەی بێگانە هەولێکیتری ڕووناکبیران بوو کە لەمڕێگەیەوە زیاتر هەست بە مافی نەتەوەیی خۆیان بکەن.. بۆیە لە ساڵی ١٩٢٤ لە شاری سلێمانی کۆمەڵەیەك پێکهات بەناوی (زانستی کوردستان) لەلایەن ڕەفیق ئەفەندی و ڕەمزی ئەفەندی و فایەق بەگ و مارف بەگ سەرپەرشتیدەکرا مەبەستیان بوو فەرهەنگێکی کوردی کە لەگەڵ مافی نەتەوەیی گشتی کورد و ڕێکوپێکبێت دامەزرێت ئەم کۆڕە ڕۆڵێکی باشی گێڕا کە گرنگیانداوە بە زمانی کوردی شانبەشانی ئەم کۆمەڵە جگەلە شاری سلێمانی چەندان کۆمەڵەیتری نهێنی پێکهێنرا لەشارەکانیتر وەك لە هەولێر و کەرکوك تەنانەت لە ڕەواندزیش سەیید تەها کۆمەڵێکی ئەدەبی دانا بەناوی (هوژیری) ئەمە زیاتر مەبەستی ناساندنی زمانی کوردی بوو.

شێخ مەحمودیش پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ ئەم کۆمەڵانە هەبوو، هاتوچۆیدەکردن هەموو ئەم کۆمەڵانە توانیان لەڕێگەی خۆیانەوە خزمەتێك بە کورد بکەن لەسەرووی هەموویانەوە زمانی کوردی زیاتر ناساندن و بەکارهێنانی، زمانیش یەکێکە لە ڕەگەزەکانی هەستی نەتەوەیی ڕێگەیەکە بۆ خزمەتی نەتەوەیی پێبکەن و ببێتە هۆی زیاتر بزواندنی هەستی نەتەوەیی.(٢٣)

بەشێوەیەکی گشتی گەر سەیری ڕۆژنامەکانی سەردەمی شێخ بکەین دەبینین سەرەڕای فاکتەری ئایینی کە باسمانکرد پەنابراوەتەبەر زمان و مێژوو و جوگرافیا و تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکان.. هتد، وەك فاکتەری خۆجیاکردنەوە لە عەرەبی هاوئایین و تورکی برای دینی واتا ڕێگەیەکیان گرتووەتەبەر بۆدەرخستنی کورد وەك میللەتێکی سەربەخۆ و خاوەن خاك و ناسنامەی تایبەت بەخۆی جیا لە نەتەوە دراوسێکانی ئەویش خاوەن هەمان بەها کۆمەڵایەتییەکانی تایبەت بەخۆیەتی.

ئەم هەلوێستەی ڕۆژنامە و کۆمەڵەکانی ڕۆژگاری شێخ مەحمود نیشانەی دەرککردنی نوخبەی ڕووناکبیری کورد بووە بە سەنگی سیاسی و سەربازی و ئابووری، ئینگلیز کاریگەری هەبوو لەبڕیاردانی مافی دیاریکراوی گەلانی ژێردەستی عوسمانی.. بۆیە کورد دەیانەویست پشتگیری ئینگلیز بەدەستبهێنن، لەلایەکیترەوە تورك هۆکارێکیتر بوو کە پێشتر کورد ئازاری بینیبوو بەدەستی تورکەوە بەبیانووی ئایینی، پشتگیری کوردیان بەدەستهێنابوو، بەڵام هیچی بۆ کورد نەکرد.. بۆیە ئەم هەنگاوەی ڕووناکبیرانی ئەم ڕۆژگارە لەپێناوی بەدیهێنانی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد دووربکەوێتەوە لە تورك نیشانەیەکی هۆشیاری سیاسی و نەتەوەیی و خوێندنەوەیەکی دروستی نوخبەی ڕووناکبیران ڕۆژگارەکە بووە.(٢٤)

ئەم بڕوایەی بەدەستهێنانی پشتگیری ئینگلیز بۆ کورد لە قۆناغێك لەقۆناغەکانیدا بووە لەوکاتەی کە کورد کەوتبووەژێر فشاری مەترسییەکانی تورکەوە دەیەویست ڕزگاربێت.. بۆیە پێیوابوو لەڕێگەی پشتگیری ئینگلیزەوە دەتوانی مافەکانی بەدەستبهێنێ بەوهیوایەی سەربەخۆیی تایبەتی خۆی بەدەستبهێنێ، بەڵام دواتر دەبینین ئەم هیوا و ئومێدەی کە هەیبوو بە ئینگلیز ئەویش نەما بەتایبەت لەکاتی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموددا کە ئینگلیز

پاشگەزبووە لەوبەڵێنانەی بە کوردی دابوو لەبارەی دروستبونی دەسەڵاتی سەربەخۆیی کوردی بۆیە دوای ئەوەی کە راستی ئینگلیزیان بۆدەرکەوت بەتایبەت رووناکبیران پێنووسی نووسینەکانیان دژی ئینگلیز ئاراستەی وەرگرت ئەوەشمان لە وتارە و بەیاننامەی کۆمەڵەکاندا بۆدەرکەوت کە چۆن بە بێگانە ناویاندەبردن دەیانەویست لە وڵات بچنەدەر.

•••

## پەراوێز

١. ئەکرەمی میهرداد، نەتەوایەتی لەتیۆرەکاندا، گۆڤاری هاوار، ژمارە ٢١

٢. جەعفەر عەلی رەسول (دکتۆر)، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٢٥-٢٦

٣. فاضل حسين، كاظم هاشم، التاريخ الاوروبي الحديث (١٨١٥-١٩٣٩)، الطباعة والنشر جامعة موصل، بغداد، ١٩٨٢، ص٩٣

٤. سەعد عوسمان هەروەتی (دکتۆر)، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٦، ل٢٧-٢٨

٥. شێرزاد ئەحمەد نەجار (دکتۆر)، روانینێکی گشتی گەشەسەندنی هزری نەتەوەیی کورد، www.sherzad.najar.com.

٦. جەعفەر عەلی رەسول (دکتۆر)، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٠

٧. کەمال مەزهەر ئەحمەد (دکتۆر)، کوردی سلێمانی و بەغدا لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە ٩، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٢١١

٨. جەعفەر عەلی رەسول (دکتۆر)، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٠

٩. رەفیق حیلمی، یادداشت، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣،ل٢١٣-٢٣٣

١٠. عوسمان عەلی (دکتۆر)، چەند لێکۆلینەوەیەك دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی کامەران جەمال بابان زادە، بەشی دووەم، چاپخانەی دیلان، ٢٠٠٦، ل٣٥

١١. هەمان سەرچاوە، ل٦٨

١٢. کەمال مەزهەر( دکتۆر)، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی ئەدیب ئەلبەغدادییە، بەغداد، ١٩٨٥، ل١٥٦.

١٣. ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، بەغداد، ١٩٦٨، ل٦١-٦٢

١٤. هەمان سەرچاوە، ل ٦٦-٦٧

١٥. هەمان سەرچاوە، ل ٨٤-٨٦

١٦. سیروان بەکر سامی، لە مێژووی رۆژنامەگەری کوردییەوە ئاوڕدانەوەیەك لە رۆژنامەی پێشکەوتن، رۆژنامەی پێشکەوتن، هەولێر، ١٩٨٨، ل٦-٧.

١٧. ئەحەد باوەڕ، کوردستان و چالاکی کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان لەساڵانی ئینتیدابی بریتانیادا ١٩٢٠-١٩٣٢، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ١٩٩٨، ل١٤-١٦.

١٨. دیڤید ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی ئەبوبکر خۆشناو، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٢٩١.

١٩. رۆژنامەی رۆژی کوردستان، ژمارە ١، ١٥ تشرینی دووەم، ١٩٢٢.

٢٠. کەمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦-١٠٧.

٢١. محەمەد رەسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، لەندەن، ١٩٩١، ل٥٩٣-٥٩٤.

٢٢. سێ رۆژنامەی رۆژگاری شێخی نەمر، ئامادەکردنی رەفیق حیلمی، چاپخانەی بەدرخان، سلێمانی، ٢٠٠١: جەعفەر عەلی رەسول، سەرچاوەی پێشوو، ٢٢٣-٢٢٩.

٢٣. کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا، وەرگێڕانی محەمەد رەیانی، چاپی دووەم، چاپخانەی صدق تاران، ل١٨٢-١٨٣

٢٤. جەعفەر عەلی رەسول (دکتۆر)، سۆفیزم و کاریگەری لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورددا ١٨٨٠-١٩٢٥، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل١٩٦-١٩٧.

# خوێندنەوەیەك بۆ هەردوو چەمكی ئازادی و ئەخلاق

نووسینی: د. محەممەد موجتەهید شەبستەری
وەرگێڕانی: هەڵكەوت هەورامی

لەم بابەتەدا باس لە پەیوەندی نێوان ئازادی و ئەخلاق دەكەین، بەداخەوە لە كۆمەڵگەی ئێمەدا بەشێوەیەك ئەم پەیوەندیە باسدەكرێت كە گوایە ئازادی دژی ئەخلاقە و كەسانێك كە بانگەشەی ئازادی دەكەن، بانگەشەی كەنارخستنی ڕێكخستن و یاسا و ڕێسا ئەخلاقییەكان دەكەن، هەر لەم روانگەیەشەوە هەندێكجار سەیریدەكەین بەمەبەستی سنوورداركردنی ئازادی، ئازادی لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەكانی كەسانیدی و دواجاریش ئازادی لە چوارچێوەیەك دیاریدەكرێت. ناونیشانی (بەرگری لە ئازادی) ئەم بۆچوون و بیردۆزە بەشێوەیەك ڕووندەكرێتەوە، ئەویش ئەوەیە كە بەرپرسیارێتی لەپێشترە تاكو ئازادی و لەپێش ئازادییەوەیە، لەڕاستیدا دەیانەوێت بڵێین ئەخلاق لەپێشترە تاكو ئازادی ئەم گوتەیە كە دەڵێ: (ئەخلاق لەپێشترە تاكو ئازادی) ڕاست و دروستە، بەڵام بەمەرجێك بە دروستی لێیتێبگەین.

ئەگەر ئەم دەستەواژەیە كە ئەخلاق لەپێش ئازادی و لەپێشترە تاكو ئازادی بە دروستی لێیتێبگەین. ڕووندەبێتەوە كەوا لەبەرخاتری ئەخلاق و بۆ پاراستنی ئەخلاقە، كەوا دەبێت ئازادی سنووردارنەكرێت (هەڵبەت جگەلە عەدالەت)، پاراستنی ئازادی مەرجی پێویستی پاراستنی ئەخلاقە و ئازادی بۆ ئەخلاق و بۆ هێنانەدی ئەخلاق پێویستە، هەڵبەتە ئەوەی لەسەرەتادا گوتەی (سنووردارنەكردنی ئازادی)یم هێنایەوە و كردمەناونیشانی، مانای ئەوەنییە لەكۆمەڵگەیەكدا ئازادی بوونی هەبێت، ئیدی تاكەكانی ئەو كۆمەڵگەیە بەهیچ مەرج و ڕێسا و یاسایەك پابەندنەبن و ئازادی مانای ئەوەبێت هەركەسێك حەزی لەهەركارێك بێت ئەنجامیبدات، نەخێر ئەو وتەیە هەرگیز بەو مانایە نییە، كاتێك دەكرێت ئازادی سنووردارنەكراو مەرجی بەدیهێنانی ئەخلاقە، مەبەست لە ئازادی سنووردارنەكراو لە قۆناغی پێشدانان و دروستكردن یاسا و ڕێسا كۆمەڵایەتییەكانە، گەر نا ئەم ڕێسا و یاسا و سنوورانەی لەگەڵ عەدالەتدا دێنەدی و دروستدەبن، چوارچێوە و سنووردارییەك بۆ ئازادی فەراهەمدەكەن.

**سەبارەت بە ئازادی دەبێت باسی دوو قۆناغ بكرێت:**

یەكێكیان فەرزكردنی هەموو ئەندامانی كۆمەڵگە بەوەی مرۆڤی ئازادن و لەڕووی ئەخلاقەوە بەرپرسیارن لە ئازادی كەسانیتر، ئەم ئازادییەش (ئازادی دەرەكی)یە، بۆئەم مەبەستەش و لەمڕووەوە ئیرادەی گشتی لەم ئازادییە فەرزكراوە بێسنوورە. لەم قۆناغە بۆ ڕێكخستنی پەیوەندی كۆمەڵایەتی بە زنجیرەیەك ڕێسا و یاسای ئەخلاقی كۆتاییبێت و لەئەنجامدا ئەم پەیوەندییە كۆمەڵایەتییە لەگەڵ ڕێسای ئەخلاقیدا ڕێكبخرێت و ئازادییەكانی پلەی

دووەمی تاکەکان لەگەڵ ئەو ڕێسایانە دیاریبکرێن، پاشان ئازادی لە دوو قۆناغدا شایەنی باسکردنە، (ئازادی پێشدانانی یاسا و بڕیارە کۆمەڵایەتییەکان)و (ئازادی پاشدانانی یاسا و بڕیارە کۆمەڵایەتییەکان)، ئازادی پێشدانانی یاسا و ڕێسا و بڕیارە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت بەشێوەیەکی دیارینەکراو سنوورنەدراو فەرزبکرێت، بەڵام ئازادی پاشدانانی یاسا و ڕێسا و بڕیارە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت بەشێوەیەکی تەواو سنوورداربکرێت. ئەو باسە ئەمڕۆ لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بوونی هەیە، ئەوەنییە کە ئایا پاش وەرگرتن و دانانی یاسا و بڕیارە کۆمەڵایەتییەکان، دەبێت ئازادی سنوورداربکرێت یاخود بەپێچەوانەوە، چونکە قبوڵکراوە کە دەبێت لەو قۆناغەدا ئازادی سنوورداربکرێت، قسە لە قۆناغی یەکەمە قسە لەوەیە کە ئەو هەڵبژاردنە گشتییەی کە بە دروستکردنی یاسای بنەڕەتی و دانانی ڕێسا و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان و ڕێکخستنی سیستەمە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان کۆتاییدێت، ئایا ئازادی دەتوانێت لەم قۆناغەدا سنوورداربێت یان نا. قسە ئەوەیە کە نابێت ئازادی لەم قۆناغەدا سنووردار بکرێت، ئەم ئازادیە سنووردارنەکراوە لەم قۆناغەی سەرەتادا بۆهێنانەدی ئەخلاق پێویستە بەدەربڕینێکیدیکە، سنووردارنەکرانی ئازادی لەم قۆناغەدا، مەرجی هێنانەدی ئەخلاقە. سنوردارکردنی ئازادی لەم قۆناغەدا بە مانای لەنێوبردنی ڕێسا ئەخلاقییەکانە و کارێکی دژە ئەخلاقییە. ئەگەر لەم قۆناغەدا قسە لەبارەی ئازادییەوە دەکەین، دروست لەبەرخاتری خودی ئەخلاقە و بەتەواوی بەپێچەوانەی ئەوەی هەندێك دەڵێن: (کەسانێك قسە لەسەر ئازادی و لەبارەی ئازادییەوە دەکەن بۆئەوەیە تاکو ئەخلاق لەنێوبەرن) ئەم بابەتە بەمشێوەیە نییە، بەڵکو کەسانێك قسە لەسەر ئازادی دەکەن تاکو وەفایان هەبێت و وەفاداربن بەرامبەر ئەخلاق. من لێرەدا ئەم بابەتە لەچەند خاڵێك ڕووندەکەمەوە:

**خاڵی یەکەم: ئازادی مرۆڤەکان**

دابەش دەبێت بۆ دوو ئازادی:

- ئازادی دەرەوە (دەرەکی).
- ئازادی ناوەوە (ناوەکی).

ئازادی دەرەکی هەر مرۆڤێك بریتییەلە ئازادی لە جەبرە دەرەکییەکان لە خود، لە هەوڵدان بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی. دەوترێت ئەم ئازادییە (بە)و (لە)و (بۆ)ی هەیە، واتە ئازادی لە جەبرەکان، ئازادی لە کردار ئازادی بۆ ئامانجەکان، ئازادی دەرەکی، ئەو ئازادییەیە کەوا مرۆڤ لەژێر کاریگەری جەبرە دەرەکییەکاندا نەبێت، ئەم جەبر و فشارانەی دەرەوەش جۆراوجۆرن وەك: (فشار و پەستانە فیزیاییەکان، سنوورە سیاسییەکان و جۆرەکان و بەشەکانیدیکە جەبر) کە لەدەرەوە دێنەنێو مرۆڤەوە، لەم قۆناغەدا دەوترێت کەوا مرۆڤ، ئازادی پێداویستی هەیە، (ئازادی بەیان دەربڕین، ئازادی چاپەمەنییەکان، ئازادی کۆبونەوەکان و.. هتد) بەشەکانی ئەو ئازادییانەی کە لە ئازادییە سیاسییەکانن، ئەم ئازادییانە ئازادی دەرەکین و مەبەست ئەوەیە کە هۆکاری ناچارکردن و سنووردارکردن بۆ ئەندێشە و بیر، دەربڕین، قەڵەم و وتار و کۆبوونەوەیە، ئازادی بوونمان نەبێت. ئەمانە ئازادین لە جەبر و دەرەوەی مرۆڤ، بەڵام ئازادی لەو جەبرانە لەم کارانەدا بۆ چ مەبەستێك و بەدیهێنانی چ ئامانجێکە؟ وەڵام ئەوەیە: بۆ بەدیهێنانی مرۆڤبوونی مرۆڤە، مرۆڤ بە دەربڕین مرۆڤە، بە بەشداربوونی سیاسی و لە چارەنووسی کۆمەڵگەیە و بەدیهێنانی ئینسانییەت، مرۆڤ ئامانجێکی بەرزتری مرۆڤایەتییە، بەمکارەوە بوونی دەبێت و هەیە. مرۆڤێك کە

ناتوانێت ئازاد بیربکاتەوە، ناتوانێت بە ئازادی بیرکردنەوە و ئەندێشەی دەربڕێن و رەخنە لە بیرکردنەوەی ئەوانیتر بگرێت، ناتوانێت بە ئازادی لە چارەنووسی سیاسی خۆیدا بەشداری سیاسی هەبێت، ئەمجۆرە مرۆڤە ناتوانێت مرۆڤایەتی خۆی دەربخات، ئەوەی کە ئەوانیتر بیڵێین (ئێمە سنوور بۆ تۆ دیاریدەکەین، بیربکەرەوە، بەڵام بەوجۆرەی کە ئێمە دەڵێین، مرۆڤ بە بەوجۆرەی کە ئێمە دەڵێین ، مرۆڤ بە بەوجۆرەی ئێمە دەڵێین، ئێمە مانای مرۆڤایەتیت بۆ دەکەین)

ئەمانە هەمان ئەو شتەیە کە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئازادی دەرەکی، پاشان ئازادی دەرەکی واتە: ئازادی بێسنوور یاخود دیارینەکراو لە بیرکردنەوە و ئازادی رادەربڕینی ئەندێشە و بیرکردنەوەی ئازادانە و بەشداری لەسیاسەتدا، واتە: ئەوەی خۆت شێواز و جۆری بیرکردنەوە بدۆزێتەوە و یارمەتیدیکەش وەربگرە، بەڵام نەك ئەوەی کەسیدیکە، خەڵکانیدیکە بڵێن، بەمجۆرە بیربکەنە، بەڵکو خۆت بگەیت بە باوەڕ و قەناعەتێکی عەقڵانی، دەتەوێت یارمەتی لە کەسیتر وەربگریت، بەڵام ئەو یارمەتییە هەڵبژێرە. ئازادی سنووردارنەکراو و دیارنەکراو لەبیرکردنەوە، ئازادی دیارینەکراو لە دەربڕینی بیر و ئەندێشە، ئەو ئازادییانەن کە لە مافەکانی مرۆڤدا ریزبەندیکراون. ئەو ئازادییەی کە دەوترێت تەنانەت لەگەڵ دانانی رێسا و یاساکان نەبێت دیاریبکرێت، ئەم ئازادییانە، واتە: نابێت هیچ رێسا و یاسایەك لەکۆمەڵگەدا دابنرێت، تاکو ئازادی بیرکردنەوە، ئازادی دەربڕین، ئازادی بەشداری سیاسی و ئازادی کۆبوونەوە سیاسییەکان دیاریبکات و سنوورداریانبکات، ئەم ئازادییە سنووردارنەکراوانە لەم قۆناغەدا، تەنانەت لەگەڵ یاسا سیاسییەکان و یاساکانی دواتر سنووردارناکرێت و ئەم ئازادییانەن پێش قۆناغی یاسان کە هەمان ئەو ئازادییە دەرەکییانە بەوجۆرەی کە گووتم بەدیهێنان و هاتنەکایەی مرۆڤایەتی مرۆڤ بەو ئازادییانەوەیە. ئەو رێسا و یاسایانەی کە پێشتر دایادەنێین، کردار و کاروباری مرۆڤەکان لە زەمینەیدیکەدا و گونجاو لەگەڵ مافە گشتییەکاندا دیاریدەکەن، واتە ئازادییە کردارییەکان دیاریدەکەن.

**جۆری دووەم: ئازادییە ناوەکییەکان:**

پرسار لە ئازادی ناوەکی باسێکی فەلسەفییە. ئازادی ناوەکی (ناوەوە) مرۆڤ کە باسێکی گرنگی ئەخلاقە، پەیوەستە بەم پرسیارەوە کە ئایا ئیرادەی مرۆڤ ئیرادەی ئازادە یاخود ئیرادەیەکی ناچارە؟ بەدەربڕینێکی سادەتر: ئایا ئیرادەی ئێمە کە سەرەتا کردار دەبێت و دەبێتە سەرەتایەك بۆ کار و کردار لەژێر کاریگەری ناچاری زنجیرەیەك لە هۆکاری دەروونی ئێمە، وەك: ئەنگێزەکان، غەریزەکان، ئارەزووەکان، چێژەکان، مەیلەکان و.. هتد، یا خود نا؟ ئەگەر بنەمای کەسێك ئەوەبێت کە مرۆڤ، ئیرادەی کارێك ناکات، مەگەر ئەوەی ئەو ئیرادەیە لەڕووی حەز و مەیل و ئارەزوو و غەریزەوە چێژەکانیەوە دەردەچێت و دەبێت، نەك شتێکیدیکە، ئەمجۆرە کەسە ئیرادەی مرۆڤ بەئازاد نازانرێت، بەڵام ئیرادەی ئازاد ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت کارێك ئەنجامبدات بەبێ ئەوەی لەژێر کاریگەری ناچاری حەز و ئارەزوو و مەیل و.. هتد،دا بێت، (وەك ئەوەی کە "کانت" دەیووت) ئەگەر باوەڕتوایە کە ئەمجۆرە ئازادییە ئیرادەی لەبەردەست و لەبووندا هەیە، ناوی ئەم ئازادییە ئازادی ناوەکی و دەروونی مرۆڤە. پاشان زۆر بەوردی سەرنجبدات کە مەبەست لەم ئازادییە چییە؟ لەم بابەتەدا ئازادی خۆی پیشاندەدات، نەك ئەو فشار و هێزە ناچارییانەی کە لەدەرەوەدان، هەرلەبەر ئەمەشە و لەمڕووەوە کە ئەو بەشەی یەکەم ناودەنێت ئازادی دەرەکی، واتە ئازادی لە جەبرە

دەرەکییەکان، و ئەم بەشەی دووەم کە ئازادی ناوەکییە، واتە ئازادی لە جەبر و فشارە ناوەکییەکان.

هەندێك نەیانتوانیوە ئەم بابەتە روونبکەنەوە و سەرنج لەم بابەتە بدەن ئەویش ئەوەیە مرۆڤ چۆن دەتوانێت ئازادی ناوەکی هەبێت، بەڵام کۆمەڵە کەسانێکیدیکە ئەم بابەتەیان بەجۆرێکیتر وتووە، گووتویانە کە مرۆڤ دەتوانێت ئازادی ناوەوە و ناوەکی هەبێت دەڵێن: ئازادی ناوەکی مرۆڤ لەکاتێکدا دێتەدی کەوا عەقڵی مرۆڤ بتوانێت وەزیفەی ئەخلاقی مرۆڤ دیاریبکات. واتە لەهەر کار و فەرمانێکدا و لەهەموو شتێکدا وەزیفەی ئەخلاقی دیاریبکات و مرۆڤ لەوبارەوە بەتەواوی بەرەو ئەو وەزیفەیە کاربکات. لەڕاستیدا کرداری چاك لەسەر هەمان ئەو وەزیفەیە کە عەقڵی مرۆڤ لە ناخی خودی خۆیدا دیاریدەکات واتە: عەقڵ، رێسا و یاسایەکی ئەخلاقی دیاریدەکات. هەڵبەتە عەقڵی رووت و پەتی، نەك عەقڵێك لەژێر کاریگەری ئەنگیزەکان و حەز و مەیل و ئارەزووەکاندا بێت، واتە عەقڵی رووت، عەقڵ ئەوەی بۆچی پێویستە مرۆڤ عەقڵێکی هەیە و ئەم عەقڵەش هەبێت، ئەم عەقڵە یاسای گشتی ئەخلاقی دیاریدەکات و سەبارەت بەهەر شتێك کە ئیرادەی مرۆڤ لایەنگیری ئەو یاسایە ئەخلاقییە وەزیفەی بێت و ئەرکی خۆی بەمجۆرە بهێنێتەدی، ئەوە ئەو ئیرادەیە ئیرادەیەکی ئازادە. بە بۆچوونی هەندێك لە فەیلەسوفەکان کێشەی بنەڕەتی مرۆڤ لەوەدانییە کە (چی دەتوانم بزانم، چی ناتوانم بزانم) هەڵبەتە ئەمەش کێشەی مرۆڤە کە لە باسی مەعریفەتناسیدا باسیلێوەدەکات، بەڵام کێشەتر و کێشەدارتر لەمەو گیانسووتێنەر لەمە پرساری (دەبێت چی بکەم) دەبێت کەسانێك بەرامبەر لەو جەبر و فشاری دەرەکییانەی رووبەڕوویدەبنەوە و خۆیان دەخەنە نێویەوە ئازادبن و ئازادبووبن و گەیشتبێتە تاکگەراییەك، گەیشتبێتە تەنهاییەك، خودی خۆی بێت و خۆی حوکم و فەرمانڕەوایی خۆی بێت، دەبینێت کە گرنگترین پرسیار رووبەڕوویدەبێتەوە و فشاری دەخاتەسەر و بێتوانایدەکات و رووبەڕووی تەنهایی دەکاتەوە لەدەروونیدا ئەمەیە کە (دەبێت چی بکەم)؟ بە تەعبیرێکیدیکە ئەرکی من بە ناونیشانی مرۆڤ و وەك لەژیانیدا چییە؟ مرۆڤ بوونەوەرێکی کە بە بوونی ئیدارە کاردەکات و لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی دیار و ئاشکراش ئیرادەی مرۆڤ ئازادە. ئەم پرسیارە گیانهەژێنەرە خۆی بۆ دەردەخات و راستدەبێتەوە کە دەبێت چی بکات؟ ئەو کەسانەی کە ئەم پرسیارەیان بۆ تەرکنابێت بەشێوەیەکی جیدی و گرنگ، ئەوە زیاتر لەژێر کاریگەری دەرەوە دەژین، ئەم کەسانە تائێستاش نەهاتوونەتەوە بەخۆیاندا، بێدارنەبوونەتەوە، نەگەیشتوونەتە تاکگەرایی، ئێستاش کەسانیدیکە ئەرکەکانیان بۆ دیاریدەکەن. ئێستا ئەگەر مرۆڤ بگاتە تاکگەرایی، گیان سوتێنەرترین و واقعییەت ئەوەیە کە (من ئازادم! بەڵام ناتوانم بەبێ کردار بژیم، من دەبێت ئیشبکەم) مرۆڤ بە ئیش و کار زیندووە، بە کردار زیندووە و کرداری مرۆڤ بۆ ئیرادەی مرۆڤ دەگەڕێتەوە و ئەرکی ئیرادەی مرۆڤ روونددەبێتەوە کە وەڵامی ئەم پرسیارەی دابێتەوە ئەویش ئەوەیە کە (دەبێت چی بکەم و ئیرادەم لەسەر چ شتێك هەبێت) ئێستا، لەسەر ئەو بنەمایەی کە پێشکەشمکرد عەقڵی مرۆڤ یاسای گشتی ئەخلاق و وەزیفە دیاریدەکات و ئیرادەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو یاسایە گشتییەی ئەخلاق و ئەرکی مرۆڤ خۆی وەزیفەی خۆی روونددەکاتەوە، چونکە کاتێك گوتمان عەقڵ و وەزیفە دیاریدەکات، واتە مرۆڤ وەزیفە دیاریدەکات. ئەم گوتەیە کە مرۆڤ دەتوانێت بە عەقڵی خۆی و ئەرکی و (لەئەنجامیشدا مافەکانی) دیاریبکات و ئیرادەی مرۆڤ ئازادە لە "کانت"ەوە، بەڵام جێگەی ئاماژەپێکردن و جێگای سەرنجە کەوا سەرنج لەم خاڵە بدەین کە کۆمەڵێك لە سەدەکانی سێهەم و چوارەمی کۆچی لەنێوان موسڵماناندا کە بە (موعتەزیلە) ناسراون هەر ئەم خاڵەیان روونکردووەتەوە، موعتەزیلەکان دەیانگووت، مرۆڤ کرداری چاك و خراپ (حسن و قبح)ی ئەخلاقی بە عەقڵ

دیاریدەکات، ئەم گووتەیە گەلێگ گرنگبووە، هەڵبەتە گووتەی ئەوان هەروەك قسەکەی "کانت" نەبوو، بەلاّم لەم بابەتەدا کە ئەو مرۆڤە لەگەڵ عەقلّی خۆیدا و عەقلّی خۆی وەزیفەی ئەنجامدەدات، نزیکییەك هەیە، ئەوان دەیانگووت چاکە و خراپەی ئەخلاقی، کرداری مرۆڤ شتێکی عەقڵییە و ئەو "ئەمر و نەهی"یانەی لەشەریعەتدا بوونیان هەیە پاڵپشتێکی دینی ئەم کردار و دیاریکردنانەی عەقڵن. ئەم گووتەیە، قسەیەکی گرنگە، کاتێك لە "کانت" دەپرسین، ئەو یاسا گشتییە ئەخلاقییە چییە کە ئێوە دەڵێن عەقلّی مرۆڤ دەتوانێت دیارییبکات و ئەگەر ئیرادەی مرۆڤ روونبکاتەوە ئەوە یاسا گشتییە و بەو یاسا گشتییە کاربکات، ئیرادەیەکی ئازادی دەبێت؟ لە وەلاّمی ئێمەدا دەڵێن، (بەوجۆرە کاربکە و بجولێرەوە کە بتوانن ئەم کردارەتان بگۆڕێت بە یاسایەکی گشتی تاکو هەمووان بەو یاسایە بژین). ئەگەر بتوانێت بەوجۆرە کاربکات، کردارت کردارێکی ئەخلاقییە، ئەمە قسەیەکی گەورەیە گەلیّ مانادارە. بەوجۆرە کرداربکە کە بتوانی لەگەڵ ویژدانی خوتدا هاوڕا و رازیبێت و بەوجۆرە بێت کە ئەگەر کرداری تۆ بگۆڕێت بە یاسایەکی گشتی و هەمووان ئەوە ئەنجامبدەن تۆ بتوانیّ لە ویژدانی خۆتدا ئەوەت پێقبوڵبێت، ئەمە یاسای گشتی ئەخلاقە. بەهەرحاڵ ئەوە کۆمەڵێك یاسایان دیاریکرد و "کانت"و فەیلەسوفەکانی دواتریش کۆمەڵێك یاسای دیکەیان دانا و دیاریکرد، بەلاّم لێرەدا رووی هاوبەش ئەوەیە کە دواجار ئەوە مرۆڤە کە بە عەقلّی خۆی وەزیفەی خۆی دیاریدەکات، لەبەرئەوە و لەسەر ئەم بنەمایە، گووتەکان، جێگەی فەرمان و ئەرکەکانی مرۆڤ، عەقڵییەتی، عەقلّی مرۆڤ، یاسای گشتی ئەخلاقی کەشفدەکات و ئەو یاسا گشتییەی ئەخلاقیش بە بوارە جیاوازەکاندا جێبەجێدەکات و دەڵێت ئەو یاسا گشتییەی ئەخلاق پێویستدەکات کە بۆنموونە من لەم بوارەدا بەمجۆرە کاربکەم، کاتێك ئیرادە روویکردە ئەمجۆرە کردارە ئەو ئیرادەیەکی ئازادە ئیرادەیەکە لەژێر کاریگەری غەزیرە و حەز و چێژ و مەیلدا نییە، ئیرادەیەکە لەگەڵ عەقلاّنییەتدا دێتەدی و پێکدێنەوە، پاشان ئەگەر ئێمە باس لە ئازادی دەرەکی قسەبکەین، ئەم ئازادییە لە کۆمەڵەی یەك یاسای گشتی ئەخلاقیدایە کە بێئەو یاسا گشتییەی ئەخلاق، مرۆڤ ناگاتە ئازادی ناوەکی، کەسانێك کەوا دەڵێن مرۆڤ دەبێت ئیرادەی لە جەبر و فشارەکان ئازادبێت ئەو ئازادییە لەنێو یەك یاسای ئەخلاقی و لە چوارچێوەی یاسایەکی ئەخلاقیدا بە شایەنی وێناکردن دەزانن. لەبەرئەوە پاش روونکردنەوەی ئەم دوو ئازادییە ناوەکی و دەرەکی باسی ئەوەدەکەم کە بۆ بەدیهێنانی ئازادی دەرەکی مرۆڤ پێویستی بە ئازادی ناوەکی هەیە، رێسا و یاسا و نۆڕمە کۆمەلاّیەتییەکان کە سیستەمی کۆمەلاّیەتی- سیاسی و پەیوەندی تاکەکان لەگەڵ یەکدا رێکدەخەن، دەبێت بە زنجیرەیەك یاسا و رێسای هزری ئەخلاقی رێگە پێدراو رۆشنبکات واتە ئەو یاسا و رێسا نۆرمانە جێگای قبولّکردن بن لەلایەن تاکەکانی کۆمەلّگە، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کەوا نێویدەنێم (مەشروعییەتی یاسا و رێسا و نۆڕمەکان) ئەم مەشروعییەتە تەنها کردارێکی تەقلیدی و خۆبەخۆی بێت، تاکەکانی کۆمەلّکە دەبێت وەلاّمێکیان بۆئەم بابەتە هەبێت کەوا بۆچی رێگەکانی و سیاسی و ئابووری و.. بەمجۆرە رێکخراون و بەجۆرێکیدیکە رێکنەخراون، دەبێت کۆمەلّگە رازیبوونێکی عەقلاّنی هەبێت لەم رێسا و نۆمانە، ئەگەر بەمجۆرە نەبێت، ئەم یاسا و رێسایانە (ئەخلاقی) نابن، ئەمانە لەکاتێکدا دەبنە ئەخلاقی کە مرۆڤەکان بەشێوەیەکی عەقلاّنی هەڵیانبژێرین، گەیشتبنە ئەو قەناعەتە عەقلاّنی کە دەبێت ئەم رێسا و یاسا و رێکخستنانە فەرمانڕەوایی لەسەر سیستەمەکانی کۆمەلّگە، ئەگەر بگەنە ئەم تێگەیشتنە ئەوکاتە ئەم یاسا و رێسا و تێگەیشتنێکی و چەمکێکی ئەخلاقی پەیدادەکەن، تەنها لەیەککاتدا کەوا گۆێڕایەلّیکردن لەم رێسا و یاسانەیە وەزیفەیەکی ئەخلاقی دادەنێن، ئەگەر

تاکەکانی کۆمەڵگە لەڕووی ترس و ناچاری و لە بابەتی تەقلید و چاولێکەرییەوە و لەڕووی بەدەستهێنان و راکێشانی سوودەوە وەك ئەم شتانە لە رێسا و یاساکان رازین، ئەم رازیبونە لە پێکهاتەی ئەخلاقی خاڵییە و تەنها بە بوونی هێزگەرایەوە درێژەدەکێشێت، ئەگەر ئازادییەکانی دەرەوە (ئازادییە دەرەکییەکان) واتە ئازادی بیرکردنەوە، ئازادی دەربڕن، ئازادی بەشداری سیاسی و هەموو ئەو ئازادییانە ناودەبرێن بە ئازادییە سیاسییەکان و لەو کۆمەڵەیەدا، دەبێت بەبێ جیاوازی بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە و بەبێ پلە یەك و پلە دوو فەراهەمبکرێن و ئەم پلە پلەکردنە بوونی نەبێت، ئێمە سەبارەت رێسا و یاسا و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان ناگەن تێگەیشتنێکی عەقڵانی و ئەخلاقی ئەگەر هەموو گووتەکان نەگووترێت، ئەندێشە و بیرکردنەوە جیاوازەکان پیشاننەدرێن و نەخرێنەڕوو تاکو تاکەکانی کۆمەڵگە بگەنە بڕیارێك کە ئایا ئەمە رێسا و یاسایانە و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، پێکهاتەی ئەخلاقییان هەیە یاخود ئەم پێکهاتەیان نییە و بەپێچەوانەوە؟

ئەوانەی دەمانەوێت بوونیان هەیە یاخوود بوونیان نییە؟ دەبێت باشتری بکەین یاخود هەرئەوانە بپارێزین؟ دەبێت لەکوێدا راستیانبکەینەوە، ئەم بڕیاردارانە بەرهەمهێنەرە یاخود بەرهەمهاتووە ئازادی ناوەکین.

ئەوەی لە رێبازی بکەینەوە و دووبارەیبکەینەوە بەها ئەخلاقییەکان دەبێت بپارێزین، تەنها بەس نییە و ئەم بابەتە لێرەدا چارەسەرنابێت، هەموومان دەمانەوێت بەهاکان بپارێزین، هیچ کەسێکی خێرخواز و چاکەویست هیچ مرۆڤێکی بە ئەخلاق و کارناس جگەلەوەی شتێکیدیکەی ناوێت، ئەویش ئەوەیە کەوا ئەو بەهایانەی کە پێوانەی ژیانی کۆمەڵایەتین بپارێزین، ژیانی ئێمە ژیانێکی بەهادارە، ئێمە پابەندی ئەخلاقین، دەمانەوێت کارەکانمان پێکهاتەی ئەخلاقییان هەبێت، بەڵام بەهاکان چۆن بپارێزین؟ تەواوی داواکاری هەر ئێمەیە، بەهاکان لە رووناکی ئازادییە دەرەکییەکاندا دەپارێزین. بەندە و ئێوەش هەرکاتێك کارێکی چاك ئەنجامدەدەین، ئەو کارەی لەهەر بارێکدا ئەنجامبدەین ئەوە جارێکیتر بۆمان چاکە و تازە و نوێیە، تام و چێژی لێوەردەگرین، ئەخلاق لەجێگایەکدا مانا پەیدادەکات کە هەرکاتێك ئێوە کارێکتان ئەنجامدا، لەهەمانشوێندا هەستدەکەیت کە ئەمە وەزیفەیەکە، هەمانشوێنی ئەم کردار و وەزیفەیە، ئەخلاقییە کە کۆتایی بە گووتەکانم دەهێنم و کۆتا قسەم سەبارەت ئازادی و ئەخلاق ئەوەیە کە ئازادی دەرەکی و ناوەکی هەبێت و بۆ دۆزینەوەی پێکهاتەی ئەخلاقی رێسا و یاساکان و نۆرمە بنەڕەتییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کە سیستەمە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەی بەوانەوە رێکدەخرێت، پێویستی بە بوونی ئازادییە دەرەکییەکان هەیە، ئازادی نە ئەخلاقی ونە لە جێگای ئەخلاق دادەنیشێت ونە سەبارەت بە ئەخلاق شتێکی نێگەتیڤە و خراپە، بەڵکو ئازادی چرایەکە کە لەژێر رووناکی ئەودا ئەخلاق خۆی پیشاندەدات.

•••

**سەرچاوە:**

تاملات در قرائت انسانی از دین، محمد مجتهد شبستری، انتشارات طرح نو، تهران، ١٣٧٦.

# سوهراب سپهری و تەپوتۆزی عادەت

## نووسینی: سەروەت عەبدوڵلا


سوهراب سوپهەری

زۆرن ئەو کەسانەی ناوی (سوهراب سپهری)یان بیستووە و بەجۆرێك لەجۆرەکان سەرسامبوون بە کارەکانی. سوهراب، چ وەك شاعیر و چ وەك نیگارکێش یەکێکە لەو کەسایەتییانەی سنوورەکانی وڵات و تەپوتۆزی مێژوو و کۆتوبەندی زمان تێدەپەڕێنێ و هەموو سەدەیەك شانبەشانی رووداو و داهێنانەکانی سەردەم دەڕوات و خۆی بە نەوە دوای نەوە دەناسێنێت! سادەیی زمان و قووڵی واتا و شیعرەکانی سوهراب یەکێکە لە دیارترین هۆکار کە وایکردووە ناوی ئەم شاعیرە بۆ هەمیشەیی بمێنێتەوە.. من لەم نووسینەمدا نامەوێت باس لەناوەڕۆك و سادەیی زمانی نووسینی سپهەری بکەم ئەوەندەی دەمەوێت لەسەر پەیامێکی بووەستم و بیخەمەڕوو.

ئەوە لای هەمووان ئاشکرایە هەر پارچە شیعرێك کە دەنووسرێت هەڵگری پەیام و ئەندێشەیەکە، هەر شیعرێك لەمە خاڵیبێت نەك پێیناوترێت شیعر، بەڵکو دەبنە (وشەی مردوو)! وەك (ئەلبێرت کامۆ) لە رۆمانی (گیلۆتین – المقصلە) دەڵێت: "وشەکان لە واتایان خاڵیدەبنەوە کاتێك ئەندێشە دەنوێت"، واتە کاتێك ئەندێشە دەنوێت ئیتر وشەکانیش واتایان نابێت.

ئەو پەیامانەی سوهراب لەشیعرەکانیدا دەبینرێت زۆرن، دەکرێت چەندین توێژینەوەی ناوازەی لەسەر ئەنجامبدرێت، هەروەك چۆن دەیان بیریاری ناودار بابەتیان دەربارەی ناوەڕۆکی شیعرەکانی ئەم شاعیرە نووسیوە. ئەوەی ئێمە لەم نووسینەدا ئەنجامانداوە بریتییەلە باسێك دەربارەی (عادەت)و خوگرتن لە شیعرەکانی (سوهرابی سپهری)دا. هەوڵماندا لەناو شیعرەکانیدا بەشوێن ئەم بابەتەدا بگەڕێین و کەشفی ئەوەبکەین: ئایا سوهراب لەگەڵ عادەتدا بووە؟ یان ئەویش عادەتی بە رێگری و بچوککەرەوەی شتەکان زانیوە؟ ئایا سپهری لەشیعرەکانیدا پەیامێکی بۆئێمە بەجێهێشتووە تاوەکو ئاگادارمانبکاتەوە لە تەپوتۆزی عادەت؟ عادەتگرتن لە دونیای ئەم شاعیرەدا چی بەسەر مرۆڤەکان دەهێنێت و بەرەوکوێ ئاڕاستەیاندەکات؟ لەم بابەتەدا هەوڵمانداوە بەشوێن وەڵامی ئەم پرسیارانە و چەند پرسیارێکیدیکە بگەڕێین.




(د. عەبدولکەریم سروش) لەباسێکدا لە ناونیشانی (چییەتی مەرگ) دەنووسێت: "من ئەگەر بمەوێت لەوشەیەکدا و بەشێوەیەکی کورت پەیامی ئایینەکان روونبکەمەوە، رەنگە زۆرترین کاریان و کاری پێغەمبەرانیش، بریتیبێتلە بانگهێشتکردنی خەڵکی بۆ فەرامۆشکردنی (عادەت)".

دەربارەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکان و کاری ئەوان لەسەر زەوی و ناوەڕۆکی پەیامەکانیان (تیۆریای) زۆر پێشکەشکراون. بیروبۆچوونی فرە خراوەتە بازاڕی لیکۆڵینەوەکانەوە، ئەگەر کەسێك بیەوێت ئاگاداری ژمارەیەك لەو تیۆریانە بێت دەکرێت بگەڕێتەوە بۆ کتێبی (تەحسین حەمە غەریب) بەناونیشانی (پێغەمبەرناسی)، کە لەوێدا ژمارەیەکی زۆر لە (تیۆرییەکان) بەکورتی و پوختی باسکردووە.

ئەوەی (د. سروش) وتی، ئەوەش یەکێکە لەو تیۆریانەی لەبارەی کاری پێغەمبەرانەوە تەرحکراوە کە بەپێی ئەم تیۆرییە "ناوەڕۆکی پەیمانی پێغەمبەران بریتییەلەوەی خەڵکی هەر سەردەمێك رابکەن و وازبێنن لەو شتە خراپانەی خوویان پێوەگرتووە و بووەتە عادەت لەناویاندا، ئیتر ئەوە دینداریە".

لەڕاستیدا ئەگەر وردبینەوە، بەکردارییی بۆماندەردەکەوێت ئاگاداری و رێنمایی پێغەمبەران هەرئەمە بووە، بۆ نموونە (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) دەڵێت: "کاری پێغەمبەران بریتیبووەلە نەهێشتنی بان و خوار و تەبەقایەتی لەناو کۆمەڵگەدا".. دەی ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو و سەردەمی ئەوکاتەی هاتنی پەیامی ئاسمانی، ئەمە دەردەکەوێت کە خەڵکی عادەتیان کردبوو بەوەوە کە بەشێکیان زۆرداربن و بەشێکیان کۆیلە. هەندێکیان گەدابن و هەندێکیان سەروەتمەند. کاتێك پێغەمبەریش هات هەر ئەوەیکرد کە جیاوازی لەنێوان (بیلال و حەمزەدا) نییە، بەوەشدا دەردەکەوێت ئەمە عادەتێك بووە کاتێك کۆمەڵگە وازیانلێهێنا، جگەلە خۆشگوزەرانی دووچاری هیچ گرفتێك نەبوونەوە. لەئێستاشدا زۆرن ئەو بیریارانەی بانگەشە بۆئەوە دەکەن کە دەبێت موسوڵمانان لەم ئیسلامەی عادەتیان پێوەگرتووە راکەن و بێنەناو ئیسلامی حەقیقییەوە، یەکێك لەوانە (ئەبولحەسەنی نەدەوی) دەفەرمووێت: "گەورەترین ئەرکی ئیسلامییانەی ئەمڕۆمان ئەوەیە ئەم خەڵکە رەشوڕووتە زۆرەی میللەتی موسوڵمانان لە ئیسلامی رواڵەتیەوە بگوێزینەوە بۆ حەقیقەتی ئیسلام، ئەمەش گرنگترین و چاکترین خزمەتە لەگەڵ نەتەوەی ئیسلام بکرێت"، وەك شاعیری ناوداری ئێران (قەیسەر ئەمین پوور) لە دیوانی شیعری (دستور زبان عشق)دا دەنووسێت:

چرا عاقلان را نصیحت کنیم؟
بیا بید از عشق صحبت کنیم
تمام عبادات ما عادت است
به بی عادت کاش عادت کنیم

چه اشكال دارد پس از هر نماز
دو ركعت گلى را عبادت كنيم؟

بەپێچەوانەوە گەورەترین بەڵا و زیانێك لەژیانماندا هەیە ئەوەیە، عادەت بە كۆمەڵێ شتەوە دەكەین و ئەم عادەتەش وردەوردە بەسەرماندا زاڵدەبێت و لەجیاتی ئەوەی عادەتەكان شوێنمانبكەون، ئێمە شوێنی ئەوان دەكەوین".

(د. عەبدولكەریم سروش) دەڵێ: "تەرككردنی عادەت، بریتییەلە بانگهێشتكردنی مرۆڤەكان بەگرتنەبەری جۆرێكیدی لە ژیان و چاوخشاندنەوە بەرێگایەكدا كە تێڕامانە هەڵنەسەنگێنراوە و لەبەردەمیاندایە و مرۆڤەكانیش بەبێ تێڕامان لەو رێگەیەدا بەرێكەوتوون".

بەدەر لە ئایینە ئاسمانییەكانیش، ئەگەر چاوێك بە قوتابخانە پەروەردەیی و رێسا ئەخلاقییەكانیشدا بخشێنینەوە، لەوێش بۆماندەردەكەوێت هەموویان بریتینلە كۆمەڵێك یاسا و رێسا و رێنمایی بۆ فەرامۆشكردنی بەشێك یان هەموو ئەو شتانەی عادەتمان پێوەگرتوون بۆ نموونە (قوتابخانەیەكی وەك یۆگا) ئەو دەستور و رێسایانەی كە هەیانە گەلێك سادە و ساكارن، بەڵام هەموویان پێچەوانەی خوو و عادەتكردنن، بەپێچەوانە جوولانەوەیە لەگەڵ عادەتدا مرۆڤەكان دروستدەكات.

"بۆ نموونە ئێمە هەموومان (هەناسە) هەڵدەمژین و عادەتمانكردووە بە هەناسەهەڵمژینەوە، بەڵام نازانین شێوەی راست بۆ هەناسەهەڵمژین كامەیە..! لەم قوتابخانەیەدا مرۆڤەكان فێردەكەن چۆن بە راستودروستی (هەناسە) هەڵمژین.." جابۆیە هەركەسێك پێدەنێ بەوشتانەی عادەتی پێوەگرتووە و فەرامۆشیاندەكات" بۆشایی و دەروازەیەكی بۆدەكرێتەوە بە جیهانی رۆح و سەیر و سلوكدا دەبێتە خاوەنی شتگەلێكی باش كە دەرئەنجامێكی باش و چاكی دەبێت و بەهایەكی مەزنی دەستدەكەوێت، ئەوەی كە دەڵێن، وازهێنان لە عادەت بەختەوەرییە:

هەرچ خلاف امد عادت بوود
قافله سالار سعادت بوود

هەرلەبەرئەمەش (داریوش ئاشوری) دەڵێت: "عادەت وا لە شتەكان دەكات بێبایەخ بن، مرۆڤ كە بە دەستوری عادەت بژی بەرامبەر هیچ شتێك سەرسامنابێت و لەهیچ شتێك ناناسێنێت. ئێمەی مرۆڤ بەبێ ئەوەی ئاگامان لە خۆمان بێت بەبەردەوامی لە پەنجەرەی عادەتەوە دەڕوانین بۆ شتەكان، ئێمە هەمیشە بە چاویلكەی عادەتەوە لە بارینی بەفر دەڕوانین. بۆیە هەرگیز ناتوانین لەبەرامبەر كڵۆیەك بەفرەوە رابمێنین و وەك خۆی بە سادە و دڵێكی سپییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكەین. جگەلەوەی مرۆڤەكان لە سەردەمی بەرزبوونەوەی دووكەڵی كارگەی ئاسنەكاندا زیاتر دڵیان بووە بە جێگەی نیشتەجێبوونی رق و هەوەسی شەڕ، عەبایی عادەتیش بەجۆرێك هەستی نەرمیی و دەرك و پەیبردن بە جوانییەكانی یەكەم نیگای دابارینی (بەفر)ی لێوەرگرتوونەتەوە ناتوانن بەیانییەكی زستان لە خەو راپەڕین و بەدەم ئیحساسێكی سپییەوە بڵێن*:

به خۆر بلێن با جارێ سەرنەدا،
کلۆ بەفرەکان ئەمشەو گەشتوون،
چاویان بە رۆشنایی فێرنەبووە
پشووئەدەن.
کاتێك هاتیت، نەرم پێدانێ، با
رانەچڵکێ میوانی شەو
نەبێ بە ئاو، لەناو خەوا بە دەنگی پێبوو.

ئەوە عادەتە، هەموو ئێمەی فێرکرد لە وەرزی بەفربارینیدا بڕۆین بۆ شەڕەتۆپەڵ و لە وەرزی زاوزێی ماسییەکاندا بڕۆین بۆ راو و لەهاوینیشدا ئارامیی جۆگەیەك بە (شلێپو هوڕیی) مەلەکردن بشێوێنین. لە وەرزی خەزاندا نەهێڵین بۆ ساتێکیش گەڵاکان لەسەر زەوی سرەوتبکەن و لە سەفەری نێوان (درەخت و زەوی)دا پشوویەکبدەن، یەکسەرە گسکیاندەدەین و لەناو (حاویەیەکدا) بەڕێیاندەکەین بۆ گۆڕستانی سووتاندن**:

هەر دارەکان بۆ سەفەری گەڵاکانیان
ئاخ و داخ هەڵناکێشن!
زەویش هاوڕێ و هاوخەمیانە،
لەلایەکەوە خەمیەتی و
لەلایەکەوە حەیرانە.
حەیرانی رەنگ و بۆیانە،
شەیدایی دەنگی نەرمی خشەی کاتی وەرینیانە،
عاشقی چرپە و لارەلاری نیشتنەوەیانە!
پەروانەی دەوری شەمع و
رەنگی زەردبووی پایزیانە.
خەفەتی بەدەم باوە رۆشتن و
لەسەر تاشەبەرد کەوتن و لە سەرمایی شەوا
خەوتنیانە،
بۆیە بە دڵ نزادەکا و ئامێزی دەکاتەوە،
با گەلاکان نەرمنەرم لا ببنەوە،
مەنزڵی کۆن جێبهێڵن و
لەسەر کۆشی ئەم - زەوی- سەربنێنەوە.

ئالێرەدا، ئەوەی (سوهراب) ناویلێدەنێت (تەپوتۆزی عادەت) بەرِوونی دەردەکەوێت و هەستیپێدەکەین کە بەراستی ئێمە تەپوتۆزی عادەت بەرچاوی تەڵخکردووین و رێگەمانناداتات لە شتەکان تێبگەین و تێبفکرێین!

دستشان را نرساندیم به سرشاخه هوش
جیبشان را پر عادت کردیم. (سوره تماشا)

واتە: دەستیانمان نەگەیاندە سەر لقی هۆش
گیرفانیانمان پرکرد لە عادەت

ئەوە عادەتە سنوور و مەودا لەنێوان مرۆڤ و شتەکاندا دروستدەکات و دەبێتە رێگرمان بۆ چوونەناویانەوە و لەگەڵیاندا ژیان. عادەتکردنی ئێمە بە ژیانی ئەم دونیایەوە بووەتە هۆکارێك بۆ کردنەوەی ئازار و نارِەحەتی و ترسێکی نەبراوە. ترس لەهەموو شتێك و نائارامی بەرامبەر بەهەموو شتێك و هەموو هۆکارێك!

عادەت و ترس ئێمەیان جۆرێك پەروەردەکردووە، لە مانەوەمان و لە مردنیشمان دەترسین، ئەگەر دەمێنیتەوە رۆژێك واهەستدەکەین، جارێ زووە و ئەگەری مردنمان دوورە. بەبێ ئاگایی هەست بە نارِەحەتی و ترس و بیم دەکەین! خۆ ئەگەربێتو هەواڵی ئەوەمان پێبدەن بەیانی یاخود چەند مانگێکیدیکە دەمرین لەترساندا دەکەوینە گیانەڵا و زەندیقمان دەچێت!

ئالوودەبوونمان بە ژیانەوە دەرگایی لەناوبردنێکی ئارام و لەسەرخۆی لێکردووینەتەوە، تەنها ئاگامان لەوەیە رۆژەکانی گەورەبوونی خۆمان بژمێرین و وەرز و ساڵ بخەینەسەر تەمەنمان، بێئاگا لەوەی گەورەبوون "ژەهرێکە تنۆکتنۆك دەرژێتە تەمەنمانەوە"، ئەوە (سوهراب)ە دەتوانێت دەرکی ئەم عادەت و گەورەبوونە بکات:

بەڵام ناوبەناو
ئاوازی نامۆی گەورەبوون
خۆی لە جومگەی ناسکی چێژەوە
دەئاڵاند.
ئەژنۆی باڵابوون
خۆڵاوی دەبوو. (لە ئاوەکان بەولاوە)

ئاخر، ئونسگرتنی ئێمە بەم دونیایەوە و عادەتکردنمان بە ژیانەوە هەمیشە ئێمە بەرەو نامۆبوون و نائارامی پێشرِەودەکات! (ناسری سوبحانی) دەڵێت: "ئەم دونیایە دوو سیفاتی هەیە کە بەبەردەوامی مرۆڤەکان نائارامدەکات، ئەگەربێتو لە خۆیان و ئەرکیان تێنەگەن، واتە ئەگەر لەو عادەتە هەڵنەیەن کە فێریکردوون (چەندیان هەبێت)، نەك (چەند هەبن) ئەوانیش:

**یەکەم:** شتەکانی ئەم دونیایە، بۆ نموونە (پارە) هەمیشە ترسی ئەوە دەدات بە مرۆڤەکان، بەردەوام لە خەمی ئەوەدا بن زۆر پەیدابکەن و پارێزگاریلێبکەن. کەسێك نەیەت و لێیانبسێنیت یاخود بارودۆخێکی تەنگەژێی ئابووری سەرهەڵنەدات و ئەم ئیفلاسبکات و بێپارەبکەوێت، بۆیە دەبینیت بەردەوام نائارامی و عەودالّی پەیداکردنی پارەیە و خۆی و ژیانی لەبیرچووەتەوە.

**دووەم:** سیفەتەکەیتری ئەم ژیانە ئەوەیە، ئەگەربێتو لە ترسی یەکەم رزگاریببێت و بەهەر هۆکارێك بووە ئەوەندە پارەپەیدابکات، ئەگەر تەواوی بانقەکانی دونیا ئاگربگرن و هەرچی کارگەی دروستکردنی پارەیە ژێراوژووربن ئەم زیانی لێنەکەوێت و ترسی نەمێنێت و کەسێك نەیەت پارەکانی لێبستێنێت، ئەوا هەرگیز ناتوانێت لەوە دڵنیابێت، کە رۆژێك ئەم لە دەست (پارەکە) نەستێنن! واتە هەرگیز ناتوانێت کارێکبکات نەمرێت و رۆژێك بێت مردن یەخەینەگرێت و ئەم لە چنگی پارەکان وەرنەگرێتەوە! بۆیە بەمپێیە ئەو مرۆڤانەی لە عادەتی پەیداکردنی پارە و یەك دیوی بینینی شتەکاندا ژیان دەگوزەرێنن ناتوانن ئارام و ئاسوودەبن! بەڵام کاتێك تەماشای شیعرەکانی (سپهری) دەکەین و بە ئاوازێکی سکوتەوە بە ناو لق و پۆپی دێڕەکاندا شۆڕدەبینەوە بۆماندەردەکەوێت (سوهراب) بریتییەلە شاعیرێکی هەڵهاتوو لە عادەت.

شاعیرێك لێوانلێو لە راکردن لە خووگرتن بە شتەکانەوە و دەربازبوون لە دووبارەبوونەوەی ساتەکان و خۆدزینەوە لە عورفی کۆمەڵگا، واتە (سوهراب سپهری) هەڵگری گەورەترین پەیامی ئاسمانی و مرۆڤایەتی بوو، کە ئێمە فێردەکات با لە عادەت هەڵبێین و لەبەردەم باراندا تەپوتۆزی عادەت لە خۆمان بکەینەوە و چاوانمان شۆین و جۆرێکیدیکە بڕوانین. "ئەگەر بەچاوی رابردووەوە (لە عادەتەوە) بڕوانینە شتێك ئەوا وەکو پێویست ئەو شتە نابینین، ئەو دەمە بە چاو و زەینی ئەوانەوە کە تۆزی سەدە و رۆژگاریان لێنیشتووە حوکمی باشی و خراپی بەسەردا دەدەین. میراتی حەوت هەزار ساڵە کە پڕە لە خۆشەویستی و رق بەسەر ئەوشتەدا دەسەپێنین بەبێ هیچ هۆ و ئەنگیزەیەك و تەنها بەمەبەستی پەیڕەوکردن لە عورف و عادەت (ئەسپ بە حەیوانێکی نەجیب) دەزانین و (داڵ) بە ناشیرین لەقەڵەمدەدەین".

من نازانم؟!
بۆچی دەڵێن: ئەسپ حەیوانێکی نەجیبە،؟ کۆتر جوانە.
بۆ کەس لە قەفەزی خۆیدا داڵ راناگرێت.
وێنجە چی لە گوڵاڵە سوورە کەمترە
دەبێت چاوانمان بشۆین،؟ بەجۆرێکیدی بڕوانن. (دەنگی پێی ئاو)

ئا ئەم خاڵەیە (سوهراب)ی نارەحەتکردووە و هەمیشە بەگومانەوە دەڕوانێت و بانگی خەڵکی دەکات لە تەپوتۆزی عادەت خۆیان دابماڵن، تاوەکو ئەوانیش بتوانن دیوەکەیتری شتەکان ببینن، ئەو دیوەی عارفەکان دەڵێن، هێندە فراوانە ئەوەی ئێستا لەبەرچاودایە هەر هیچ نییە!

تەپوتۆزی عادەت هەمیشە وا لەسەر ڕێی ڕوانینمان.
هەمیشە دەبێ بە هەناسەی تازەوە ڕێبکەین و فووبکەین.
تا ڕوخساری دێرینی (مەرگ) پاکپاکبێتەوە. (موسافیر)

سروش دەڵێت: پێغەمبەران خەڵکیان فێرکردووە کە لەوێدا پەردەی بێئاگایی و پەردەی عادەتی بێئاگایی هێنەریان بدڕێنێ و لایبەن و ژیانی خۆیان بکەنە ژیانێکی شیاو و هەڵسەنگێنراو یادکردنەوەی مەرگ یەکێکە لەو شتانەی پێچەوانەی عادەتە. ئێمە بەجۆرێك گرفتاری ژیانین کەمتر یادی ڕۆشتن دەکەینەوە. بۆ ئێمەی مرۆڤ جیهان جێگەی مانەوەیە، نەك جێگەی لەناوچوون، بەڵام عادەتگرتن بە ژیان ئێمەی دووچاری ئەم بێئاگاییە کردووە. کەواتە دەزانین ڕۆشتن بۆ ئەوانیدیکەیە و ڕووداوێکە لە پەراوێزی ژیانماندایە، نەك لە خودی ژیانماندا"، بەڵام ئێمە کاتێك (سوهراب) دەخوێنینەوە، هەست بەوەدەکەین کە (مەرگ) لەپەراوێزدا نییە و شتێکە لە خودی ژیاندا، بەڕای ئێمە، ئەگەر (سوهراب) هیچ شتێکی لەبارەی (سادەیی مەرگەوە) نەگوتایە و بە دیوێکیدیکەی ژیانی تەماشاینەکردایە و لەشیعرەکانیدا باسینەکردبایە، ئەوا ئێمە هەر دەمانتوانی ئەم ئەنجامە بەدەستبهێنین و بڵێین: سوهراب لەگەڵ مەرگدا گەمەی هەبووە، هەروەك چۆن لەگەڵ ژیان و شتەکانی ناوژیاندا گەمەی هەبووە، چونکە هەڵهاتنی سوهراب لە (عادەت) باسێکە گومانهەڵناگرێت، دەی کەوابێت هەڵهاتن لە ئولفەتگرتن بە دونیاوە دەکاتە سادەڕوانینە مەرگ و لەمەشەوە مامەڵەی سوهرابمان بەرامبەر بە مەرگ بۆ دەردەکەوێت.

لە کۆتایدا، ئێمەش وەك (سوهراب) دەڵێین، ئەوە ئێمەین عادەتمانگرتووە بە دوژمنایەتیکردنی یەکترییەوە و سێبەر و لقەکان دەفرۆشین و گەڵایەکیش هەبێت ئێمە نەخرۆشێین:

من نەمدیوە دوو سنەوبەر دوژمنی یەکبن،
من نەمدیوە داربییەك سێبەری خۆی بە زەوی بفرۆشێ،
نارەوەن بە خۆڕایی لقی خۆی بە قەلەڕەش دەفرۆشێ،
لەهەرکوێ گەڵایەك هەیە، خرۆشان شکۆفەئەکا.

(دەنگی پێی ئاو)

•••

**پەراوێزەکان:**

*) ئەم بەیتە شیعرییە، شیعری نووسەرە و تائێستا بڵاونەکراوەتەوە.

**) ئەم بەیتە شیعرییە، شیعری نووسەرە و تائێستا بڵاونەکراوەتەوە.

**ئەو سەرچاوانەی سوودیانلێوەرگیراوە:**

١. د، عەبدولکەریم سروش: چییەتی مەرگ؟، و. موسعەب ئەدهەم زەڵمی، چاپی یەکەم، چاپخانەی سایە، سلێمانی ٢٠٠٩.
٢. عاشق هەمیشە تەنیایە (ژیان و شیعری سوهراب سپهری)، و. ئازاد بەرزنجی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٦.
٣. تەحسین حەمە غەریب: پێغەمبەرناسی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠١٠.
٤. سەروەت عەبدوڵڵا: کاك ئەحمەدی موفتی، هەوڵێك بۆ ناساندنی بەشێك لە بۆچوونە پەروەردەی و فکری و فەلسەفییەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی ٢٠١١.
٥. ئەلبێرت کامۆ: گیلۆتین، و. سامان عەلی حامید، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١١.
٦. قیصر امین پور: دستور زبان عیشق، چاپ نهم، انتشارات مروارید، تهران، ١٣٨٨.
٧. هەشنگ حسامی: کار ما نیست شناسائی راز گل سرخ، سهراب سپهری، (باغ تنهایی)، به کوشش سیاهپوش، چاپ دهم، مؤسسه انتشار نگاه، تهران، ایران، ١٣٨٥.
٨. ئەکرەم عەنەبی: مردن، دەرگایەك بەڕووی گەورەبووندا، گۆڤاری هەژان، ژمارە ١٣، ٢٠٠٥.
٩. داریوش ئاشوری: راوچی ساتەکان، عاشق هەمیشە تەنیا، (ژیان و شیعری سهراب سپهری)، و. ئازاد بەرزنجی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٦.
١٠. سهراب سپهری: حجم سبز، کتابخانه ملی ایران، تهران، ١٣٨٢.
١١. ئازاد رەئوف، مەولانای رۆمی، چاپی یەکەم، رانیە، ١٩٨٥.

# دەستی مرۆڤ دەچێتە سووتاندنی پەرتووکەوە

## تاریکترین رووداو لە مێژووی مرۆڤدا، گڕتێبەردانی پەرتووکخانەکانی ئەسەندەرییە و عەجەم وەك نموونە

نووسینی: ماجید خورماڵی

توندترین گورز لە فەرهەنگ و کلتور و هزری مرۆڤایەتی بریتیبوولە رووداوی سووتاندنی پەرتووکخانەکانی عەجەم و ئەسکەندەرییەی میسر، ئەم گورزە لە هەردەست و ئەقلێکەوە هێزی وەرگرتبێت بێگومان سرەوانێك بووە لە رابوونی فەرهەنگیی ئەوکاتەی دونیا و شاردنەوە و ونکردنی بەشێکی بەرین و فراوانی جێدەستی عەقلّ و ئاوەزی مێژووی مرۆڤایەتیش بووە لە حان و وەختی ئێستادا، لەم نووسینەدا هەوڵدراوە لەسەرچاوەی گێڕانەوەکانی ئەو تراژیدیایەی جیهانی کتێب و ئەو جینۆسایدەی قەڵەم و نووسین بدوێین و هۆ و هۆکارەکانی نومایانبکەین. لەم توێژینەوەیەدا تەواوی بۆچوونگەلەکانی پێوەست بە سووتێنەرانی ئەو کتێبخانانە هێنراوە و ورد و درشتی ئەو تێکستانەی کە گێڕانەوەکەیان وتووە بەراوردکراوە بە لێکدانەوە لۆژیکییەکانی پەیوەست بەڕاستی و دروستی رووداوەکە .

لەڕاستیدا خانەدانی (بەتلیمۆس) لە سێهەم سەدەی پێش ئیسلام لەئەسکەندەرییەدا پەرتووکخانەیەکی مەزنیان پێکەوەنا، ئەوان داهێنەری گەورەترین کتێبخانەی فرە پەرتووك و فرەبووار و فرەژمارە و رەنگی ئەوکاتەی دنیابوون، لەوێدا زۆرێك لە کتێبە زانستییەکانی ئەوکاتەی دنیای شارستانییەت و پێشکەوتن خڕکرابوونەوە، وەلێ بەداخەوە لە سەردەمی رۆمەکانەوە تا سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیی رووداوگەلێکی زۆروزەبەند لە هەوڵی نابوودکردنی ئەو کتێبخانەیەدا هاتنەپێشەوە، تادواجار سووتاندن و تالآنبردن هەموو ئەو کتێبخانە گەورەیەی لەنێودا مێژوونووسانی عەرەب و ناعەرەب لەچۆنیەتی لەناوبردن و لەباربردنی ئەو کتێبخانە گەورەیەدا، بۆچونگەلێکی جیاوازیان هەیە هەندێك لەو مێژوونووسانە دەڵێن سووتاندنی ئەم کتێبخانەیە رێك بە فەرمانی خەلیفەی دووەمی موسڵمانان عومەری کوری خەتاب بووە، ئەوان دەڵێن، ئەو فەرمانی کردووە بە (عەمری کوڕی عاس) کە ئەوکات والی ولآتی میسر بوو، ئەوکارە ئەنجامبدات، مێژوونووسان بۆ پشتراستکردنەوەی ئەم بۆچوونەیان پشت قایمن بە بەڵگە و بۆچونی مێژوونووسانی عەرەب خۆیان، لێرەدا بەنێوبانگترین بەڵگە و مەدرەکێك کە بەدەستیانەوەبێت و لەوبارەوە نووسرابێت، بریتییەلە نووسینی مێژووزانە کۆن و رەسەنەکانی وەك ئەبولفەرەج مەلّتی، عەبدولەتیف بەغدادی، مقریزی، حاجی خەلیفە، بەلآم ژمارەیەکیتر لە مێژوونووسان، سەردارانی عەرەب لەوە بەباڵاتر دەزانن کە لەئەجێندایاندا هەبووبێت بیر لە سووتانی کتێبخانەکان بکەنەوە، بە گوتەی وان سەردارانی عەرەب خۆیان بەگرنگیپێدەری کتێب و نووسین و زانیارییەکان زانیوە، هەربۆیە وتەی کەسانی ناوبراو بە نادرووست و ناڕاستدادەنێن

و بەڵگەکانیان پشتڕاست بە بەڵگەی زانستی نازانن، جرجی زیدان لە کتێبی (تاريخ تمدن اسلام) تاچەند ساڵێکی پێشئیستا لەگەڵ بۆچونی دووەمدابوو، ئەمەشی لە کتێبەکەی خۆی بەنێوی (مێژووی میسری نوێ) روونتر پەنجەی بۆ درێژکردووە، بەڵام دواتر لەئاکامی زانیاری دروستتر و زێدەتر لەسەر مێژووی ئیسلام و ژیاری ئیسلام بایدایەوە بەلای بۆچونی پێڕی هەوەڵ و لە رابردووی نووسینەکانی دەسبەرداربوو.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆ سەرنجدان لەسەر بۆچونی دروست لەسەر سووتێنەرانی پەرتووکخانە مەزنەکانی مێژووی مرۆڤایەتی بە گورجی چاوێك دەخشێنین بە نێوەرۆکی سەرچاوەکانی پەیوەست بەم مەسەلەیە دەخەینەڕوو. موسڵمانانی پێشینی ئیسلام تەنهاوتەنها بەپشتبەستن بە فەرمودەکانی پەیامبەر و لێدوانەکانی هاوەڵانی دەجووڵانەوە بەدەر لەو دوو سەرچاوەی زانیارییە توخنی هیچ سەرچاوەیەکیتر نەدەکەوتنەوە، ئەمەش وەك بیرێکی ئایدیۆلۆژی کاریلەسەردەکرا. لەم پێودانگەوە دەتوانین سەرەداوێکمان لەوەدا دەستبکەوێت کە جۆرە نەفرینێك لە نووسین و نووسینەوەی هەر ئاراستەیەکیتر کاریلەسەرکراوە.

ئەبولفەرەج مالگی لە کتێبی (مختصر تاريخ الدول)و لە باسی فەتحکردنی میسردا بەمجۆرە دەنووسێ: یەحیا گراماتیکی بیرمەندی ئەوکاتەی میسر تا زەمانی فەتحکردنی میسر و ئەسکەندەرییە لەلایەن عەمری کوڕی عاس لەژیاندا مابوو، ئەو زانایە لەکاتی فەتحکردنی ئەسکەندەرییە هاتەلای عەمری کوری عاس، عەمر ئاگاداری بلیمەتی و پایەبەرزی ئەو زانایە بوو، هەربۆیە رێزی زانابوونی لێنا، یەحیا فەیلەسوف و بیرمەندێکی مەزن بوو، ئەوەی دەیوت لەلایەن عەمرەوە بێلاموجیم جێگەی تێڕامانبوو، چونکە تائەوکاتە قسەگەلێکی لەوجۆرەی لەنێو عەرەبدا نەبیستبوو، عەمر بڕیاریدا لەلایەن خۆیەوە ئاگادارییبکات و بیپارێزێت، رۆژێك یەحیا بە عەمر دەڵێ: ئێوە تەواوی دەسەڵاتتان لەئەسکەندەرییەدا هەیە، میهرەبانیتان لەهەموو شوێنێك نواندووە، لەبەرئەوە هەموو ئەوەی کە بۆ ئێوە جێگەی سوودە با لەدەستاندابێت شتانێکیش کە لە نەهجی ئێوەدا جێگەیەکی دیارینەکردووە وازیلێبهێنن، عەمر پرسیاردەکات بۆ ئێوە چی بەکەڵکە و کە پێویستانە و لەدەستی و دەسەڵاتی ئێمەدایە؟ یەحیا لەوەڵامدا دەڵێ: گەنجینەکانی حیکمەت لە خەزێنەی پاشایەتیدان. عەمر لەوەلامدا وتی: پێویستە بۆئەم مەسەلەیە خەلیفەی موسڵمانان ئاگاداربکرێتەوە. راستەوخۆ عەمر نامەیەکی نارد بۆ خەلیفە و خواستەکانی یەحیای گەیاند، وەڵێ لە وەڵامی نامەکەدا خەلیفە نووسیبووی: "هەموو ئەو نووسراو و کتێبانەی کە دەگەڵ کتێبی خوادا هاوهەڵوێستن ئەوە زیادەن، چونکە کتێبی خودا بەسە، ئەوانەشی کە پێچەوانەی فەرمایشتی خودان ئەوە دیسان سوودی نییە"، کەواتە لەهەردوو باردا پێویستە لەنێوبدرێن. ئیتر دوای گەیشتنی ئەم نامەیە عەمر بە بڕیاری خەلیفە تەواوی کتێبەکانی کتێبخانەی ئەسکەندەریەی لەنێو توونی حەمامەکانی شاردا گلێرکردەوە و گڕیتێبەردان. هەندێك لە گێڕەرەوەکان دەڵێن شەش مانگ تەواوی گەرماوەکانی ئەسکەندەرییە بەگڕی کتێبەکانی ئەسکەندەرییە سووتان و نەکوژانەوە تاوەکو پاکیان بوونە خۆڵەمێش. لەڕاستیدا ئەم گێڕانەوەیە جێگەی مشتومڕ و بگرەوبەردەیەکی زۆرە، ئەمە داستانێکی زۆر روون و ئاشکرای جێگای تێڕامانە.

سەبارەت بەو تێکستەی سەرەوە شاراوەییەك هەیە. لێرەدا هەموو ئەو هەوڵانە دەخەینەڕوو کە بەراورد بەڕاستزانینی ئەم دەقەکراون، دیارە ئەوانەی کە نکوڵی ئەم چیرۆکە دەکەن، ئەوانەن کە سەردار و کەسایەتییەکانی

عەرەب لەو ئاستەدا نابینن كاری لەوجۆرە بكەن، بۆیە هەمووئەو گێڕانەوانەش لەو گوزەرەدا بەنادروست دەزانن، هەندێكجار ئەوان دەمارگیریی ئاینیی خۆی ترنجاندووەتە كایە مێژوویەكەیان.

هەر ئەوەیشە هەندێك لەوانە دژی هەر راستییەكن كە باس لە سووتان بكات بۆ پەرتووكخانەكانی ئێران و ئەسكەندەرییە. لەبەرانبەردا پێڕێك لە مێژوونووسانی دیاری كلتور و فەرهەنگیش بۆئەم بابەتە قسەی خۆیانیان هەیە و دەستی خەلیفە لە گڕدانی كتێبەكاندا بەدوور دەزانن. بەڵگەكانی ئەوان لەم تەوەرانەدا دەخولێنەوە:

(ئەبولفەرەج لە سەدەی حەوتەمی كۆچیدا ژیاوە، ئەو باوكی یەهودی بووە و خۆیشی لەسەر ئایینی عیسایی بووە و دییان بووە، لە پلەكانی ئاینیی مەسیحیدا سەركەوتووە، سەرەتا شاگردی قەشەبووە و دواتر بووە بە قەشەیەكی تەمامی مەسیحی، تەنانەت مێژوویشی بە زمان و نووسینی سریانی نووسیوە. هەربۆیە ئەو مێژووەی ئەو وەرگێراوی كتێبە فارسی و یۆنانی و عەرەبییەكان بووە، لە كتێبە سریانییەكەیدا كورتەیەكیشی بە عەرەبی داناوە كە هەمان كتێبی (موختەسرولدووەل)ە دیارە ئەم كتێبە یەكەمین كتێبە كە ئەم رووداوەكەی تیاداهێناوە و فەرەنسییەكانیش لەم كتێبەوە وەریانگرتووە و رووداوەكەیان باسكردووە، ئەوەش كە (عەبدولەتیف بەغدادی و مەقریزی و حاجی خەلیفە) لە مێژوونووسانی موسڵمان تایبەت بەو كتێبانەی ئەسكەندەرییە نووسیویانە بە بەڵگەیەكی دروست و سەربەخۆ نایەتە ئەژمار، چونكە مەقریزی هەمان قسەكانی (عەبدولەتیف بەغدادی) هێناوە و حاجی خەلیفەش ناوی شاری ئەسكەندەرییەی نەبردووە، ئەو تەنها گوتوویەتی عەرەبەكان لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە بێجگەلە شەریعەت و رێساكانی خۆیان بەهیچ رێسا و یاسایەكیدی گرنگی و بایەخیاننەداوە، تەنانەت لەشوێنێكدا دەڵێ عەرەبەكان بۆ هەرشوێنێك روویانبكردایە نووسراو و كتێبەكانی ئەوێیان دەسووتاند، هەروەها بەغدادیش لە باسكردنێكی بێتەحقیقی ئەسكەندەرییەدا باسی كتێبخانەكەی كردووە. بەرەیەكیتر روانینێكی تاڕادەیەك نێزیك لەڕاستییان پێیە، بە روانینی ئەوان كتێبخانەی ئەسكەندەرییە پێشئیسلام و لە زەمانی رۆمانییەكاندا سووتاوە، چونكە ئەگەر عەرەب ئەوێیان سووتاندبێت ئەوا مێژوونووسانی عەرەبی لە كتێبەكانی پەیوەست بە فتوحات و زانیاری و ژیانی ئەدەبی خۆیاندا باسی ئەو رووداوەیان دەكرد، ئەم بۆچوونەیش تاڕادەیەك لەڕاستییەوە دەمانتلێنێت. ئەمەی سەرەوە كورتەی جوداوازی بۆچونەكان بوو سەبارەت بە سووتانی كتێبخانەی ئەسكەندەرییە، بەڵام دەكرێ ئەوە راستبێ كە بەشێك لەو كتێبانە لەپێش ئیسلامەوە سووتێبن واتە لە سەردەمی رۆمانییەكاندا، بەلام ئەمە رێگری لەوەناكات كە ئەو كتێبانەی كە ماونەتەوە لە زەمانی ئیسلامدا نەسووتێبن، چونكە تەنها ئەبولفەرەج ئەم رووداوەی نەگێڕاوەتەوە، بەڵكو لە شوێنانێكیتری نێزیك لەڕاستیەوە ئاماژە بەو سووتانە كراوە بە دەستی عەرەبەكان، بۆ نموونە عەبدولەتیف بەغدادی تەواوی میسر گەڕاوە، بەغدادی ئەوەی لەمیسردا بینیویەتی نووسیویشیەتی، بابەتی سووتانی كتێبخانەی ئەسكەندەریەشی بیستووە و ئاماژەپێیداوە، تەنانەت چەند ساڵێك پێشلەدایكبوونی ئەبولفەرەج نووسینەكەی كۆنترە، چونكە ئەبولفەرەج لە ساڵی ١٢٢٦ زاینی لەدایكبووە وەلێ عەبدولەتیف بەغدادی لە كۆتایی سەدەی شەشەمی كۆچی سەری لە میسر داوە. ئەمەش دەقی نووسینەكەی بەغدادییە: "پایە یان ستونگەلێكم لە چواردەوری، عەمود سوارییە پێشچاوكەوت كە هەندێكیان بەپێوە وەستاوبوون و هەندێكیشیان داتەپیبوونە بانزەوی، وادیاربوو رووی ستوونەكان سەقفێك بووبێت و ستوونەكان راگیریانكردبێت

لەبەرئەوە لەڕووی عەمود سوارییەدا تائەوکاتەش گومەزەکان دەبینران وادەبینم ئەمە هەمان ئەو شوێنە بوو کە ئەرستۆتالیس و پێڕەوانی ئەو دوای مەرگیشی وانەکانیان لەوێدا دەوتەوە، ئەویش هەمان دارولعیلم بووە کە ئەسکەندەر بناغەی شاری ئەسکەندەرییەی تێیدادانابوو پاشان بڕیاری دروستکردنی ئەوێیشیدابوو کە مەبەست پێی دروستکردنی کتێبخانە مەزنەکەی ئەسکەندەرییە بوو. ڕێك ئەو کتێبخانەی کە عەمری کوری عاس بە فەرمانی خەلیفە عومەر خاپوریکرد.

وتەی بەغدادی لەمیانەی قسەکردنی لەسەر عەمود سوارییە دیسانەوە جۆرێك لە تەك لۆژیکدا هەمئاهەنگە و نێزیکی هەیە، بە نەزمێك وا لە لێکۆڵەر دەکات کەوا هەستبکات بەڵگەیەکی باوەڕپێکراوی لەبەردەستدایە، بەڕادەیەك دەتوانرێت لەم کەناڵەوە بۆچونەکەی ئەبولفەرەج پشتڕاستبکاتەوە.

لەڕاستیدا ئەبولفەرەج کتێبەکەی (موختەسرولدووەل)ی لە کۆتاکانی ژیانیدا نووسیوە و لە ٦٨٤کۆچیشدا مردووە، بەلاّم کتێبی موختەسەرولدووەل کورتەی کتێبە سریانییەکەی ئەو نییە، چونکە لە تانوپۆی کتێبەکەدا جگەلە مەسەلە پەیوەستەکانی بە فتوحات مەسەلەگەلێکیتریشی خستووەتەڕوو وەك مێژووی ئیسلام و مەغۆل و زانستەکان و ئاداب و هەروەها مێژووی ڕۆمانیی باسکردووە کە لەکاتێکدا لە نوسخە سریانییەکەدا ئەم بابەتانە بوونێکیان نییە، لەمڕووەوە نووسخە عەرەبییەکە زۆر زێدەتر لە نوسخە سریانییەکە باس و تەوەرەی خستووەتەڕوو، چونکە لە نوسخە سریانییەکەدا تەنها فتوحاتەکان باسکراون، هەربۆیە بابەتی سووتانی کتێبخانەی ئەسکەندەرییەش لە نوسخە عەرەبییەکەدا باسکراوە، بەتایبەتی لەو تەوەرانەی کە تایبەتن بە زانست و ئاداب و زانیارییەوە. جورجی زیدان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە گەلێکی قووڵەوە دەڵێ: "ئەوەم ئاشکراکردووە کە ئەبولفەرەج بابەتی سووتانی ئەو کتێبخانەیەی لە یەك مێژوونووسی موسڵمان وەرگرتووە بەناوی (جەمالەدین ئەبولحەسەن عەلی بن یوسف بن ئیبراهیم ئەلقەفتی، ئەم مێژوونووسە شالیاری حەلەب بووە و ناسراوبووە بە قازی ئەکرم، ئەم ناوبراوە نێزیکەی چل ساڵ پێش ئەبولفەرەج مردووە ، چونکە جەمالەدین لە بەرواری ٥٦٥ لە قەفتی دەوروبەری سەعیدی میسر بەدونیاهاتووە و لە ٦٤٦یشدا لە حەلەب مردووە، ئەو خاوەنی کتێبێك بوو بەنێوی (تەراجمولحوکەما) نووسخەیەکی دەستنووسی ئەو پەرتووکە کە لە ١١٩٧ کۆچیدا نووسرابوو لە کتێبخانەی سوڵتانی دیتراوە. بەگوێرەی ئەو دەستنووسە جەمالەدین لەمیانەی شەرحی حاڵی یەحیادا باسگەلێکی نووسیوە کە هەمان نووسینەکانی ئەبولفەرەجن بەلاّم نەختێ درێژدادڕیی لەنووسینەکەدا کردووە. بۆ نموونە ئەو باسی کتێبخانەکەی لە دامەزراندنییەوە تاخاپورکردن و کوێرکردنەوەی کردووە، لە گێڕانەوەی گرتێبەردانی پەرتووکخانەکەدا بەم ڕەنگە نووسیویەتی: یەحیا تاکاتی فەتحی میسر و ئەسکەندەرییە بە دەستی عەمرە لەژیاندا مابوو، ڕۆژێك هاتەلای عەمر، مادامەکێ یەحیا ئاستی زانستیی یەحیای دەزانی، لە باوەڕەکانی ئەو دەربارەی عیساییەکان بەتەواوی ئاشنابوو، یەحیا زۆر ڕێزی لێدەگرت، تەنانەت شوێنێکی تایبەتیی بۆ دانابوو لەلای خۆی، لەبارەی زانیارییەکانی مەسیحەوە، وتەکانی ئەوی لە بەپووچپیشاندانی ئاینینی سییانە (باوەڕ بەوەی خوا و مەسیح و گیانی پیرۆز یەکێکن) دەبیست، هەروەها باوەڕی ئەوی دەربارەی (دهر) بەتەواوی دەزانی، هەربۆیە وتەکانی یەحیا هەردەم جێگەی سەرسوڕمانی بوون و سەرنجڕاکێشا بۆ فەلسەفە و بەڵگە لۆژیکییەکان، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە وتەگەلێکی لەوجۆرە تائەوکاتە بەرگوێی فەرهەنگی بیریی

عەرەبەکان بەگۆشنەکەوتبوو. یەحیا پیاوێکی خۆشمەشرەب و کەڵە بیرمەندێکی قوڵبوو. ئەمە کاریکرد تا ئەوی لەلای خۆی هێشتەوە. رۆژێ یەحیا بە عەمری وت: تۆ بەهەموو شتێکی ئەسکەندەرییە گەیشتی و تەواوی ئەو دەڤەرانەت لەژێر رکێفدایە، هەڵبەتە هەرشتانێك بۆتان بەکەڵکە پێویستتانە و شتانێکیش کە بێسوودە بۆتاندەکرێ وازیلێبهێنن تا بارگرانتان نەکات. عەمر لەوەڵامدا وتی: ئەوشتەی بۆ تۆ بەکەڵکە دەبێت چیبێت؟ یەحیا لەوەڵامدا گوتی: خەزێنەکانی حیکمەت و کتێبخانەکان کە لە گەنجینەکانی شاهانەدان، هەموو ئەوانە لەلای ئێوە دەستیانبەسەرداگیراوە، من بەوان نیازم هەیە، خۆ دیارە کە سوودی بۆ ئێوەومانان نییە، ئیتر عەمر و لە بوونی ئەو کتێبانە و ریشەی خڕبوونەوەیان پرسیاریکرد. یەحیا وتی: بگولوماوس فیلادلقوس لە پادشایانی ئەسکەندەرییە کاتێ کە بەدەسەلاتگەیشت، تەواوی فێرخوازانی لە دەوری خۆیدا گلێرکردەوە، پاشان دەستوریدا بەکۆکردنەوەی هە کتێبێك و نووسراوێك کە لەوسەردەمەدا هەبوو. بۆئەو مەبەستە گەنجینەیەکی مەزنی لە نووسراو و پەرتووك بەچنگگەیشت. ئەم کاروبارە پیاوێك بەنێوی (زمیرە) وەك سەرپەرشتیاری گردکردنەوەی پەرتووکەکان پێیهەڵسا، زەمیرە لە سەرەتاوە و لە یەکەم هەنگامیدا دەستووریدا تەواوی کتێبەکانی ئەوکاتەی دنیا بەهەر نرخ و شێوەیەك بووە جەمبکەن، تەنانەت پیاوانێکی بازرگانی تایبەتی راسپارد بۆ کڕینی کتێب لە شوێنە دوورەدەستەکاندا، بەم رەنگە و لەئەنجامی هەوڵەکانی زەمیرەدا توانرا ٥٤١٢٠ کتێب لەکتێبخانەکەدا کۆبکرێتەوە. پادشای ئەووەختە کاتێك بە شومارەی زەبەندی ئەو کتێبانەی زانی. پرسیاری لە زەمیرە کرد ئایا لەدنیادا کتێبانێکیتر هەن کە لەو کتێبخانەدا نەبن، زەمیرە وەڵامیدایەوە: بەڵێ لە وڵاتانی سەند و هیند و گورگان و ئەرمەن و فارس و موسڵ و بابلدا کتێب و نووسراوی زۆر هەن و لێرە دەسمانپێیان دوورە. لەوکات بەدواوە و ئەم وتەیە پادشای لەسەر هەوڵەکانی سورترکرد تاتوانی هەوڵی بەدەستهێنانی زیاتربدات. تەنانەت ئەم هەوڵە لەدوای پادشاکانیتر بەردەوامبوو، بە نەزمێك بەردەوام هەوڵی کۆکردنەوە و پاراستنی کتێب و نووسراوەکان لەو کتێبخانەیەدا بەبایەخبووە . بە بیستنی ئەم گێڕانەوەیە عەمر بابەتەکەی یەحیای بەگرنگزانی و بۆئەم مەسەلەیە بڕیاری ئاگادارکردنەوەی خەلیفەی دا و چیرۆکەکەی یەحیای بۆ باسکرد، خەلیفەش لە وەڵامی پەیامی عەمردا بەمجۆرە نووسی: ئەگەر ناوەڕۆکی ئەو کتێبانە لەگەڵ ناوەڕۆکی کتێبی خوادا تەبابوون ئەوا پێویستمان بەبوونی ئەوانە نییە، ئەگەر پێچەوانەی زانیارییەکانی خوا و پەیامبەریش بوون ئەوا دووبارە پێویستما نین کەواتە لەهەردووباردا پێویستە لەناوبدرێن . ئیتر عەمر بەگەیشتنی ئەو نامەیە دەستووریدا تەواوی ئەو کتیبانە لە توونی حەمامەکانی ئەسکەیدەریەدا گڕیانتێبەربدەن، بەشێوەیەك تا شەش مانگی رەبەق توونی گەرماوەکانی ئەو شارە بە گڕ و بڵسەی پەڕەی کتێب گەرمدەکران.

ئەوەی سەرەوە کۆتایی قسەکانی ئیبن قەفتی بوو. ئێستا ئەگەر ئەم نووسینە بە نووسینەکەی ئەبولفەرەج بەراوردبکەین تێدەگەین هەمان نووسینەکەی ئیبن قەفتی هێناوە، بەلاَم ئەم نووسینە بەجۆرێك لەجۆرەکان درێژتر و روونتر نووسراوەتەوە. بەدەر لەم باسە چیرۆکی پیاوێکی پزیشکی حەجاج هەروەکو کتێبەکەی ئیبن قەفتی باسکراوە.. کەواتە پێویستدەکات بزانین کە ئیبن قەفتی لەکوێوە ئەم گێرانەوەی هێناوە. دیارە گومانێکی زاڵ هەیە کە بەئاراستەی ئەوەیە هەردوو سەرچاوەی ئیبن قەفتی و بەغدادی پەیوەست بەو رووداوە هەریەك سەرچاوەیە، چونکە هەردووکیان هاوسەردەمی یەکتری بوونە، تەنها بەغدادی کەمێك لەپێش ئیبن قەفتی ژیاوە، چونکە ئەو لە ساڵی

٥٥٧ بەدنیاهاتووە و لە ساڵی ٦٢٩دا کۆچیدواییکردووە، بۆیە ئەوەی جێگەی بایەخە لێرەدا گەڕانە بەدوای سەرچاوەی ئەم دوو مێژوونووسەدا ئایا لەچ سەرچاوەیەکدا ئەم باسەیان وەرگرتووە. رەنگە ئەمە بتوانێت تاڕادەیەك بڕیار لەسەر درووستی رووداوەکە بدات. بۆچونێك هەیە پێیوایە ئەگەر لە پێرستی ئیبن ندیم ی پەیوەست بە ئەخبارولفەلاسیفە و رووداوی دامەزراندنی ئەم کتێبخانە وردبینەوە کە لەو نووسراوەدا هاتووە، ئەمەش دەردەکەوێ کە سەرچاوەی ئەو دوو مێژوونووسە لێرەدا وەرگیراوە، لە کتێبی مێژووی ئیسحاق راهیب کە دەربارەی هەواڵ و عادات و نەریتی یۆنان و رۆمان نووسراوە ئیسحاق لەبابەتەکاندا باسی دامەزرانی ئەم کتێبخانەیەی کردووە و لەوێدا باسدەکات کە زەمیرە ناوێك پەرتووکخانەکەی چێکردووە. ئەو بەمجۆرە باسیکردووە: بگلوماوس فیلادلفوس لە پادشایانی ئەسکەندەرییە هەرکە بەدەسەلاتگەیشت دەستیکرد بە گەڕان بەدوای کتێبی زانستیی نووسراودا و ئەم کارەیشی سپارد بە زەمیرە. دەڵێن: زەمیرەش پەنجا و چوار هەزار و سەد و بیست کتێبی کۆکردەوەو دواجار بە پادشای وت کە لە سەند و هیند و گورگان و ئەرمەن و موسڵ و بابلیشدا کتێبی زۆر هەن و دەکرێت بەدەستیانبهێنین.

ئەم باسە بەجۆرێ هاتووە، کە رێك هەمان باسەکەی مێژوونووسەکانیترمان یاددێنێتەوە. لێرەوە دەردەکەوێ کە ئەوان لە ئیسحاق راهبیان وەرگرتوە بۆماندەردەکەوێ کە ئەبولفەرەج لە ئاکامی دەمارگیریی ئاینییەوە نەیویستووە رووداوێکی لەمجۆرە بۆ خەلیفە و مێژووی موسڵمانان تۆماربکات وەکو ئەوەی نەیارانی دەڵێن مەسیحییە و بابی جووە، ئەمەش بۆیە وادەڵێن چونکە خەڵکانیتر لەپێش ئەوەوە هەمان باسیان هێناوە، هەروەها ئیبن قەفتی ئەم باسەی هێناوە، ئەو زانا بە شەرع و بووارەکانی دادوەری بووە و تابوترێت ئەهلی کتێب و زانست بووە، لە زمان و نەح و علومی قورئاندا بیریاربووە و لە بوارەکانی جەرح و تەعدیلی حەدیسیشدا وردەکار و سەلیم بووە و سەرەڕای ئەوەش کتێبی لە هەرشتێکیتر زۆر لامەبەست و گرنگ بووە. دەبێ چی وایلێکردبێت کە هەواڵێکی لەمجۆرە دروستبکات . دیارە هیچ نابینرێ و ئەوی ئەو باسیکردووە دەیەوێ راستیمان پیشانبدات و هیچیتر.

ئەم زانایە تەنهاوتەنها کتێبی هەبووە کە مردووشە تەنها زاڕۆیەك چییە لەدوای بەجێنەماوە و وەجاخکۆربووە، هەربۆیە کتێبەکانی بەدیاریی بەخشیوەتە ناسرولدەولەی فەرمانڕەوای حەلەب، هەروەها لە مێژوو و نەحو زماندا دانراوگەلێکی بەپێزی هەیە لەوان: کتێبی ئەخبار میسر کەتێیدا لە سەرەتاوە تاوەکو سووتاندنی کتێبخانەی میسر هەمووی شەنوکەوکردووە لە شەش بەرگدا، هەروەها کتێبی تەراجومل‌حوکەمایشی هەیە. دیارە هۆکاری گرنگینەدان و باسنەکردنی ئەم رووداوە گرنگە لەلایەن موسڵمانەکانەوە رەنگە لەسەر ئەوەبێت کە ئەوان خۆیان بە دانەری کتێب و بایەخپێدەری ئەو مەیدانە دەزانن و پێیانشەرمە کە سەردەمێکی زێرین و دیاری وەکو راشدینەکان بەو رووداوە لەکەداربکەن.

سەبارەت بە سووتاندنی کتێبخانەکانی ولاتی عەجەم و فارس لە سەردەمی فتوحات و پێشفتوحاتدا سەرچاوەگەلێکی ناڕوون و ئاڵۆز لەپێشچاودان کە دیسانەوە بڕیاردان لە تۆمەتبارکردنی دروستی لایەنێك یان کەسێك توێژەر ماندوودەکاتەوە. ئەوەی لێرەدا ئاماژە بەو رووداوە دەکات دانەری کتێبی کەشفولزنون، ئەو لەمیانەی قسەکردن لەسەر زانستی پێشینان ئەم هەواڵە بەمجۆرە دەگێڕێتەوە: کاتێ موسڵمانەکان بوونە فەرمانڕەوای ئێران

دەستیانگرت بەسەر تەواوی کتێبخانەکاندا، لەم سەروبەندەدا سەعدی کوڕی وەقاس نامەی نارد بۆ خەلیفە تاوەکو تەواوی کتێبەکان بگوازنەوە بۆ ناو موسڵمانەکان و کەڵك لە فەرهەنگ و عەقڵی نووسینی عەجەم بکەن.. عومەر لەوەلاّمدا بەجۆرەی نووسی: هەموو ئەو کتێبانە بخەنەناو ئاوەوە، چونکە ئەگەر لەواندا راستییەك هەبێت، ئەوە خودا لەوان چاکتر رێنوێنیانکردووین، ئەگەر راستیشیان تێدانییە و گومڕاییانتێدایە ئەوا خودا لە گومڕایی ئازادیکردووین، کەواتە پێویستمان پێیاننییە و لە هەردووباردا پێویستە لەناویانبدەن و بیانسووتێنن.

ئیتر سەعدیش هەرچی هەبوو نەبوو یان سووتاندنی یان لەتوکوتیکردن.. بەجۆرە تەواوی زانستی و فەرهەنگی مەزنی عەجەم کوژایەوە و بوو بە خۆڵەمێش. لێکۆڵینەوە لەم رووداوانە رەهەندێکی مانادارتر وەردەگرێت لە رەهەندی جینۆسایدی مرۆڤەکان و جەنگە خوێناوییەکان، هەرچۆنێك بێت بریاری هەڵە و بیری تەسکی ئایدیۆلۆژی و مەکری سیاسیی سەردار و مەزهەب و رەگەزەکان دەستیچووەتە سووتاندنی کتێب و پێنووس و بیری بەرامبەر و نەیارییەتی یەکتر و جینۆسایدی یەکدی ئەو دنیاپاکەیشی گرتووەتەوە.. هەربۆیە ئیبن خلدونیش دەڵێ: کەواتە زانستەکانی ئێران کە لەکاتی فەتحدا لەنێودران مانای چبوو!

•••

**سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**

١. ابولفرج ملطی: مختصر تاریخ الدول
٢.جرجی زیدان: تاریخ تمدن اسلام

# پەیوەندی کورد و ئەرمەن و بێتاوانی کورد لە جینۆسایدی ئەرمەن

نووسینی: ئارام مەجید شەمێرانی




## پێشەکی

کورد و ئەرمەن دوو نەتەوەی خاوەن خاك و مێژوو و کەلتور و فەرهەنگی خۆیانن و لە خاکێکی نزیك و هاوسنوور و پێگەیەکی جوگرافیدا دەژین، ئەمەش بە حوکمی لێکنزیکی و هاوسنووری و نزیکیان لە دوو دەوڵەتی (عوسمانی- ئێرانی (فارس) بۆخۆیان دووژمن و بۆئەم دوو نەتەوەیە دۆست، دووچاری گەلێك ماڵوێرانی و نەهامەتی و تراژیدیا و جینۆسایدکردن بوون بەهۆی هێرش و شالاّوەکانیان بۆسەر خاکی یەکتر ئەمانیش لەو نێوەندەدا دووچاری هەزارەها نەهامەتی و مەرگەساتی هاتن.

ئەم دوو نەتەوەیە سەرەتایان لە پەیوەندی زۆر باشبوو پێکەوە بە ئاشتی و برایەتی دەژیان تەنانەت ئەرمەنەکان لە زۆر ناچەی خۆیاندا بەباشی فێری زمانی کوردی بوبوون و پەیوەندی بازرگانی و هاتوچۆکردن لەنێوانیاندا بەردەوامبوو، بەلاّم دەوڵەتی عوسمانی فاشیزم چاوی بەم دوو نەتەوە دراوسییەدا نەدەهات و بە بەردەوامی لە هەوڵی سڕینەوەی رەگەزی کورد و ئەرمەندا بوون هەموو پلان و هەولێکی لەپێناوەدا بەکاردەهێنا.

هەر بەهۆی ئەو ماڵوێرانی کاولکارییەی ئەم دەوڵەتە بەسەریاندا هێناوبووی ئەم دوو نەتەوە مەزلۆمە چەوساوە زوڵملێکراوە دەوڵەتی عوسمای تورکیان بە دوژمنی سەرسەختی هەردوولا ناودەبرد و مێژوونووسانی هەردوو نەتەوەکەش شاهیدی ئەم راستییە بەڵگەنەویستەن.

ئەگەر بەوردی لاپەڕەکانی مێژووی ئەم دوو نەتەوەیە هەڵدرێتەوە هەردوولایان لە (ئازار و ناخۆشی و رەشەکوژی و زیانی مادی و مەعنەوی) هاوبەشن، بەلاّم ئەگەر ئەرمەن لەو قوناغەدا خاکیان دابەشکرابێت بە دوو بەشەوە ئەوا ئێمەی کوردی بێکەس خاکمان دابەشکراوە بۆ چواربەش بەسەر چواردەوڵەتی دوژمنی سەرسەختی کوردا.. هەزارەها نەهامەتیشمان بەدەست ئەوانەوە چەشتووە، ئەو کارەساتەی بەسەر ئەم دوو نەتەوەدا هاتووە بەشێکی گرنگی لە رووپەری مێژوو بۆخۆی تۆمارکردووە و شەرمەزارییەکی باشی بە بەرپرسانی کارەساتەکانی ئەم

دوو نەتەوە بەخشیوە بەتایبەت دەوڵەتی عوسمانی و ئیتیحادوتەرەقی تورکی و سەرانی ئەو ڕێکخراوە نامرۆڤانەییە وەك (ئەنوەر و جەمال و تەلعەت پاشا) کە بە سێکوچکەی دیکتاتۆری ناسرابوون، ئەوان تەنیا مەبەستیان لەناوبردنی ئەم دوو نەتەوەیە نەبوو بەتەنیا بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا خاکیان دابەشکردن و ڕایانگوستن و سەروماڵیان وێرانکردن لەڕاستیدا نموونەی ئەم کارە قیزەون و نامرۆڤانە لەمێژوودا کەمە.

ئەم توێژینەوەیە خستنەڕووی ئەو پرسیار و ڕاستییە بەڵگە نەویستەیە کەوا کێ بەرپرسیارە لە کوشتاری ئەرمەن؟ وەڵامی ئەم پرسیارەش دەمێکبوو خولیای من بوو کە وەڵامی بدەمەوە بەپشتبەستن بە ڕای مێژوونووسانی بێلایەن و ڕاستەقینە، چونکە هەندێك مێژوونووس و نووسەر بەکەمی و بچڕبچڕی باسیانکردووە نەیانوێراوە وەك ئەرکی سەرشانیان خۆیان لەقەرەی ئەوبابەتە هەستیارە بدەن و بیخەنەڕوو ئەمەش بەهۆی ترسنۆکی خۆیان یان داردەستیان بۆئەو دەوڵەتەی ئەوکارەی کردووە و هەندێکیشیان بێویژدانانە و بێگوێدانە بەهای مرۆڤایەتی پشتگیریان لە دەوڵەتی عوسمای سوڵتانەکانی کردووە بۆ بەدەستهێنانی مەرامە گڵاوەکانیان، بەڵام بەخوێندنەوەی ئەم بابەتە ئەو ڕاستییە بۆ خوێنەری کورد ڕووندەبێتەوە کەوا تورکی فاشی و سوڵتانی عوسمانی سێکوچکەی دیکتاتۆری ئیتیحادوتەرەقی خاوەن بڕیار و هێز و سوپا بەرپرسیاری ئەو قەتڵوعامەن بەسەر ئەم دوو نەتەوەیەدا هاتووە و جێبەجێنەکردنی بڕیاری ئەوانیش مەرگی بەدواوەدەهات.

هەندێك دەڵێن کورد تاوانبارە بەڵام دەپرسم ئەی بۆچی ئەرمەنەکان لەدواییدا تۆڵەیان لە کورد نەکردەوە و یەك تاکی کوردیان لەسەر ئەوە لە کورد نەکوشت؟ وەك چۆن تۆڵەی خۆیان لە بەرپرسانی تاوانباری جینۆسایدکەرانی خۆیان کردەوە لەکاتێکدا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵهاتبوون و لە دەرەوەی دەوڵەتی هەڵوەشاوەی عوسمانی بوون، بەڵام خۆ کوردەکان (باکووری کوردستان) لەبەردەست و نزیکیانبوون تەنانەت یەککەس لە کوردەکان وەك تۆڵە لە کورد نەکوژراوە، ئەمە ئەو ڕاستییەیە کە لەم توێژینەوەیەدا بۆتڕووندەبێتەوە.

**کوردەکان ئەرمەنیان پاراستووە نەك جینۆسایدکردنی ئەرمەن:**

مەسەلەی جینۆسایدی ئەرمەن بابەتێکی گرنگ و هەستیار و زیندووە لە ڕابردوو و ئەمڕۆدا، لێرەو لەوێ زۆری لەسەر نووسراوە و زۆری لەسەر وتراوە دەربارەی کۆمەڵکوژی ئەرمەن و بەشداریکردنی کورد و ناوهێنانی لەو کارە کۆمەڵکوژ و قێزەونەدا، زۆر نووسەر و مێژوونووس بێئاگایانە لە ڕابردوو و لە مێژوو بێشەرمانە کوردیان خستووەتە بۆتەی ئەو تاوانە ڕەشە دژە مرۆڤایەتییە، بێئەوەی ئاگاداری پەیوەندی و هاوکاری و دۆستایەتی ئەم دوو نەتەوەیە بن، چونکە ئەوانە بە چاویلکەی تورکی و ڕۆژئاوا خوێندنەوە بۆ ڕووداوەکان دەکەن لەکاتێکدا ڕۆژئاوا خۆی ئاگاداری کێشەکە بووە کەچی لەئاستیدا بێدەنگی نیشانداوە، ئەمەش بەهۆی بەرژەوەندی و سیاسەتی خۆیان بووە!! یان هەندێککەس لەژێر سێبەری لایەنێکی توندڕەو دژە کورد و بەکرێگیراو ئەوکارانە دەکەن و دەنووسن و هەڵیدەواسن، چونکە قسە بێدەسەڵاتە و هەموو کەس پێیدەوێرێت و دەتوانێت باق و بریقی پێبدات و بیرازێنێتەوە. ئەوانە هەرگیز فێرنەبوون بە چاوی واقیعی و مێژوویی ئاوڕ لە ئارێشە و کێشەکان بدەنەوە و ڕاستییەکان وەك خۆی

بگەیەنن و بینووسن کەوا کورد هەر لەسەرەتاوە دۆست و هاوکاری ئەرمەن بووە و رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە پاراستن و رزگارکردنی ئەرمەنەکان و پاراستنیان لە دەست دوژمنە سەرسەختەکەی هەردوولا کە تورك دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانی بوون، ئەوانە هەرگیز زمانیان راست ناڵێ و قەڵەمیان واقیعی نانووسێت و چاویان بەراییناداتت کورد ببینێت و دوژمنی سەرسەختی کوردن و کەسایەتییە ناودارەکانی کورد بەسووکسەیردەکەن، لەکاتێکدا ئەگەر چاوێك بەنێو لاپەڕەکانی مێژوودا بگێڕین بۆماندەردەکەوێت کە ئەوانە چەند بەپەرۆشبوون بۆ هاوکاری ئەرمەن و پاراستنیان لەو مەترسیانەی رووبەڕوویان بووەتەوە.

پەیوەندییەکی نزیك لەنێوان هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن هەبووە و ئەم پەیوەندییەش بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەوڵەتی ماد، ئەوکاتەی کە دەوڵەتی میدییەکان بە هاوپەیمانی لەگەڵ دەوڵەتی کلدانییەکان (بابلی) توانییان ئیمپراتۆرییەتی ئاشوری لەساڵی ٦١٢ پ.ز بڕووخێنن و ئەوکات ئیدی ناوچەی ئەرمەنەکان دەکەوێتەژێر دسەلاتی میرە ئەرمەنە خۆجێیەکان کە لەژێر دەسەلاتی ناڕاستەوخۆی میدییەکان دەبرابەڕێوە ئەمەش خاڵێکی بەهێز بوو لە پەیوەندی کورد و ئەرمەن.

تەنانەت دوای رووخانی دەوڵەتی ماد و لەناوبردنی دەسەلاتی ماد لەلایەن کۆڕشەوە، کۆڕش ئیمپراتۆری ئەخمینی دادەمەزرێنێت و بەمشێوەیە کورد و ئەرمەن کەوتنەژێر دەستی یەك فەرمانڕەوا، ئەمە بوویە مایەی ئەوەی کە هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن پەیوەندییەکانیان خۆشبکەن لەپێناو دژایەتی دەسەلاتی ئەخمینی زاڵ و نوێدا، ئەوەبوو ئەرمەنەکان پشتگیریان لە شۆڕشی (فرۆرتیش)ی میدی کرد، فرۆرتیش هاوپەیمانی لەگەڵ ئەرداشیشی حاکمی ئەرمەنەکان بەست و توانی دەستبگرێت بەسەر هەندێك ناوچەی میدیاوە.

لە سەردەمی دەسەلاتی ساسانیدا کاتێك ئەردەشیر زۆربەری ناوچەکانی کورد و ئەرمەنی خستەژێر دەستی خۆیەوە، بەلاَم هەریەك لە کورد و ئەرمەن پێکەوە دژی شاپوری پاشای ساسانییەکان شۆڕشێکیان هەڵگیرساند بەلاَم شاپور شۆڕشەکەی لەنێوبرد، دواتر رۆمەکان هاوکاری تیردادی پاشای ئەرمەنییان کرد بۆ گەڕانەوەی ولاَتەکەیان و کوردستانیش لەگەڵی.

دوای ئەوەی ئەرمینیا باوەڕ بە ئایینی کریستی دێنێ، بەلاَم ئەمە نابێتە هۆی دروستبوونی کێشەی ئایینی لەنێوان هەردوو نەتەوە ئەوکات کوردەکان هەموویان زەردەشتیبوون مێژووش هیچ کێشەیەکمان بۆناگێڕێتەوە بەوهۆییەوە یان بەهۆکاریدیکە لەنێوان ئەم دوو نەتەوەیە روویدابێت. لە سەردەمی دەسەلاتی ئیسلامیشدا کە زۆربەی کوردەکان بڕوایان بە ئایینی ئیسلام هێنا و ئەرمەنەکانیش لەسەر ئایینی کریستی مانەوە پەیوەندییەکانی نێوانیان لە هاوکاری و خۆشگوزەرانی بەولاوە هیچیدیکەمان بۆناگێڕنەوە، ئیدی لەو سەردەمە بەدواوە چارەنووسی کورد و ئەرمەن بەیەکەوەبەسترایەوە بەتایبەت لەڕووی ئابووری و کۆمەلاَیەتی و کەلتوورییەوە چونکە لە سنوورێکی جوگرافی نزیکیەکدابوون، کورد و ئەرمەن بەیەکەوە رووبەڕووی هێرشەکانی تورك و تەتەر و مەگۆلەکان بوونەوە پێکەوەچارەنووسیان بوویە یەکچارەنووس کە بوونە خاوەن کوشتن و بڕین و کاولکاری ئەمە بووەتە مایەی ئەوەی کە هەردووکیان ببنە خاوەنی یەکچارەنووس و یەکهەست.

بەمشێوەیە پەیوەندییە باشەکانی کورد و ئەرمەن بەردەوامبوو لە ئاشتی و پێکەوەژیان و پەیوەندی برایانە تادەگەینە سەدەی نۆزدەیەم و سەردەمی بەدرخان پاشا و دامەزراندنی میرنشینەکەی.

سەرچاوەکان ئاماژە بەوەدەکەن کە بەدرخان پاشا کە هانی کوردەکانی دەدا بۆ ژن و ژنخوازی لەگەڵ ئەرمەنەکان، رۆژهەلاتناسی ئەلمانی (جوهانس لیبسیۆن) لە ساڵی ١٨٤٨ باس لە کورد و ئەرمەن دەکات و دەڵێت: دۆستایەتی و پەیوەندییان هێندە خۆشبوو گەشتبووە ئاستی ژن و ژنخوازی، جگەلەوەش ئەرمەنەکان لای میر بەدرخان رێز و پاییەیی تایبەتیان هەبوو تەنانەت بە چاوی کورد سەیریدەکردن و بۆیە هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن: بەدرخان پێیوابووە کورد و ئەرمەن یەك رەچەڵەکن، بەهۆی ئەو رێزەوە وایکرد هەموو ئەرمەنەکان بچنەپاڵیەوە ئەویش پشتیانپێببەستێ و ببنە جێیمتمانەی لەهەموو کاروبارەکاندا وەك راوێژکار و فەرماندەی سوپا ئەمە لەکاتێکدابوو تورکەکان لەهەموو ئەو مافانە بێبەشیانکردبوون و کاتێك عوسمانییەکان هێرشدەکەنەسەر شۆڕشەکەی بەدرخان ئەرمەنەکان شانبەشانی بەدرخان رووبەڕووی عوسمانییەکان وەستان و لە هەڵوێستە باش و جوامێرییەکانیان پەشیمان و پاشگەزنەبوونەوە، لە راپەڕینەکەی یەزدانشێریش هەمانهەڵوێستیان هەبوو، تەنانەت لە سەردەمی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری بەهۆی هاوکارییەکانیانەوە پەیوەندییەکیدیکەی بتەوی لەنێوان کورد و ئەرمەن دروستکرد

یان کەسایەتییەکی وەك (شێخ عوبەیدوڵلا) کە لە کۆنگرەی ساڵی ١٨٨٠ دژی لێدانی ئەرمەنەکان بوو و نەیارەکانی ئەو فیکرەی دەمکوتکرد کە بەکرێگیراوی عوسمانییەکان بوون ئەمەیە راستی مەسەلەکان، ئەرمەنەکان لە شۆڕشەکەی شێخیشدا بەشداربوون و هێندەیتر پەیوەندییەکانیان بەهێز و پتەوبوو، شێخ ئەوەی راگەیاند کە ئێمە و ئەرمەن براین و بۆیە ئەوانیش پشتیوانییان بۆدەربڕی، مێژوونسی رووسی (مینۆرسکی) کە لەوسەردەمە ژیاوە دەڵێت: هیچکەس لە ئەرمەنەکان لە بزووتنەوەکەی شێخ زیان و ئازاریانپێنەگەشتووە.. ئەمە ش راستییەکی بەڵگەنەویستە جوابێکی باشە بۆ ناحەزانی کورد و ئەرمەن. ئەو هاوکارییانە بەردەوامە تا سەردەمی (سوڵتان عەبدولحەمید)و سوارەی حەمیدییە کە لە ساڵی ١٨٩١بە فەرمانی سوڵتان پێکهێنرا لە (ئەلبان و چەرکەس و کورد) نەك بەتەنیا کورد، لە باسکردنی ژمارەی سوارەی حەمیدیدا زۆر نووسەر کەوتوونەتە هەڵەوە دەڵێن: سوارەی حەمیدی هەمووی کوردبوون، ئەمەش بەپشتبەستن بە سەرچاوە تورکەکان بووە، بەلام ئەمە دوورە لەڕاستییەوە، راستییەکەی ئەوەیە کە رۆبەرت ئۆلسن باسیکردووە کە دەڵێت: ژمارەی سەربازی سوارەی حەمیدی بریتیبوولە (٥٣) هەزار، محەممەد رەسوڵ هاوار لەکتێبەکەیدا (کورد و باکووری کوردستان بەرگی یەکەم) ناوی نووسەرێك بەناوی (مەروان ئەلمدەوەر) دێنێت و دەڵێت: نووسەر ئاماژە بەوەدەکات کۆی ژمارەی کورد لە سوارەی حەمیدی تەنها (١٠) هەزار کەسە نەك هەمووی کورد بووبن، ئەمەش کەسانی ماستاوچی و بەرتیلخۆری وەك( ئاغا و دەرەبەگی دژە کورد و ئەرمەن) ئەمانە چەند زیانیان بە ئەرمەن گەیاند زۆر لەوەزیاتر زیانیان بەخودی کوردەکان گەیاندووە، ئەوانە تێیدابەشداربوون لەپێناو دەستکەوتنی بەرژەوەندی خۆیان کاریاندەکرد، سەرەڕای ئەوەش دروشمی خودی سوڵتان ئەوەبوو کە (تا ئەمە هۆکارێکبێت بۆ کۆتایی کێشەی ئەرمەن و جینۆسایدکردنیان) هەرئەو دروشمەش بوو دەسەلاتەکانی دواتر درێژەیانپێدا و لەسەری رۆشتن کردیان بە شارێگە لە کوشتار و لەناوبردنی ئەرمەنەکان.

لەگەڵ ئەوەی سوارەی حەمیدی بەرهەمی عەقڵ و هزری سوڵتان بوو بۆ لەناوبردن و لێدانی ئەرمەن و کوردەکان، بەلاّم هەموویان دژی ئەرمەن نەبوون و ئەو کارانەی سوارەی حەمیدی کردیان لە رەشەکوژی ئەرمەن هەموویان کورد نەبوون و نابێت ئەوەش لەسەر کوردیش تۆماربکرێت وەك ئەوەی هەندێك کۆلکەنووسەر کردوویانە، چونکە لەڕاستیدا ئەوە سوپایەکی سەربە حکومەت بووە و فەرمانی حکومەتی جێبەجێکردووە و نەیتوانیوە لە بڕیاری حکومەت دەرچێت، ئەوانیش وەك هێزی پۆلیس و سوپا وابوون و هیچکات نوێنەری گەلی کورد نەبوون.

سەرەڕای ئەوەش کوردستان لەوسەردەمەدا لەنێوان دوو بەرداشدا دابەشکراوە بەشی رۆژهەلاّت و بەشی رۆژئاوا، لە بەشی رۆژئاواشدا کە لەژێر دەسەلاّتی عوسمانیدا بوو هەموویان بەشدارنەبوون بەشی باشووری هەر ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نەبوون تەنانەت ئامادەشنەبوون یەك سەربازی خۆیان بنێرن بۆئەو کوشتارە، ئەوەی ئاگاداری ئەو کێشەیە بوو تەنیا کوردەکانی باکوور بوون ئەوانیش وەك دانیشتووان بەشدارنەبوون، بەڵکو هەندێك ئاغا و دەرەبەگ و کەسانی بەکرێگیراو بوون و لەسەر ئاستی کاری تاکەکەسی بووە، بۆیە ناکرێت ئەمە نەتەوەیەکی پێتاوانباربکرێت تاوانی ئەو کوشتارە بخرێتەئەستۆی، چونکە خاوەن بڕیار و هێز دەوڵەت بووە نەك کورد.

تەنانەت ناوهێنانی وشەی (کورد) یان (نەتەوەی کورد)یش لەڕووی زمانەوانییەوە راست نییە، چونکە کە دەڵێن کورد واتە هەموو کرود بەشداربووە، بەلاّم لەمێژوودا هەرگیز نەتەوەی کورد بە ژن و منداڵەوە، بە گەورە و بچووکەوە تەنانەت لەسەر ئاستی میر و میرنشینەکان کورد دژی هیچ نەتەوەیەك نەبووە نەخوازە ئەرمەنیش کە پێکەوە گیرۆدەی دەستی دەوڵەتی عوسمانی بوون و هاوئازار و هاوخەمبوون، بەلاّم دەکرێت بەناوی هەندێك ئاغا و دەرەبەگەوە ناوبنرێت نەك نەتەوەی کورد، لەسەرەوە ئاماژەمبەوەدا کە هەموو سوارەی حەمیدی لەو کوشتارە بەشدارنەبوون و هەندێك ئاغای کورد دژی ئەو کێشەیە بوون، بۆیە لێرەدا دەمەوێت بە بەڵگە ناوی هەموو ئەو کەسانە بخەمەڕوو کوردبوون و کە لەناو سوارەی حەمیدی و دەرەوەی ئەو سوپایە بوون دژی ئەو کێشەیە بوون تەنانەت ئەرمەنەکانیشیان پاراستووە و رووبەڕوی دەوڵەت وەستاون بۆ پاراستنیان.

ئەوکەسانەی لەناو سوارەی حەمیدی بوون و ئەرمەنەکانیان لە کوشتن و لەناوبردن پاراست و دژی ئەرمەن نەبوون وەك (موتیعوڵلاّ) کە لە ناوچەی مۆکس و (بەدرخان بەگ) لە مەرگەوەڕ و قائیمقام (حاجی خان) لە نوردز، ئەمە و جگەلەوەش کەسایەتیەکی وەك (زوهیر ئاغایان) یەکێك بووە لەو ئاغایانەی کە دژی سوپای عوسمانی وەستاوە بۆ پاراستنی ئەرمەنەکان، تەنانەت ئەرمەنەکانی گوندی (خاتسۆ) باس لەوکاتە دەکەن کە عوسمانییەکان هێرشیانکردووەتە سەریان بۆ کوشتن و راگواستنیان چۆن خەڵکی تیرەی (محمد ئاغا) بەرگریانلێدەکەن و دەستدەدەنە چەکەکانیان و سنگ لە سوپای عوسمانی دەگرن رێگەیانپێنادەن بیانگوازنەوە و تخونیانبکەون، ئەوەش ئاشکرادەکەن کە چۆن کوردەکان نانەڕەقەیان لەگەڵ ئەرمەنەکان پارچەدەکردن و کەلوپەلەکانی خۆیان بۆ ئەرمەنەکان دەفرۆشت و دەیاندا بە نان بۆ ئەرمەنەکان ئەمە هەڵویستی کوردە.

جگەلەوانەش کوردەکانی ناوچەی (دەرسیم)یش زیاتر لە (٥٠) هەزار ئەرمەنی ئاوارەیان لە کوشتن پاراست و رزگاریانکردن و کەسایەتییەکی کوردی وەك (ئیبراهیم پاشای میللی) کە پلەی میری میرانی هەبوو زیاتر لە (١٠) هەزار ئەرمەنی لە کوشتن پاراست، تەنانەت ئیبراهیم پاشا کاروانی ئەرمەنەکانی دەکڕینەوە و ئازادیدەکردن ئەمە لەو

شوێنانەی کە لەژێر دەسەلاتی ئیبراهیم پاشادا نەبوون، بەلاّم ئەو شوێنانەی کە لەژێر دەستی ئەودابوون هیچجۆرە ئازارێکیان پێنەگەشتبوو.

سەرەڕای ئەوەش هەلّویستی رۆژنامەی کوردستانیش کە بۆ ئەوکات زمانحالّی نەتەوەی کورد بوو دلّسۆزانە هانی کوردانی دەدا کە دژی سولّتان بن و دووربن لە کوشتاری ئەرمەنەکان، بۆیە لە بواری پەیوەندی کورد و ئەرمەندا رۆژنامەی کوردستان وەك و یەکەم رۆژنامەی کوردی و رۆژنامەکانیتری کوردی رۆلّی باشیان لە بتەوکردنی پەیوەندییەکان و بە درۆخستنەوەی راگەیاندنە شاخدارەکانی تورك و ناحەزانی بینی و رێگەیان لە چاندنی تۆوی دوژمنکاری گرت و کە تورکەکان هەولّیان بۆ دەدا لەنێوان کورد و ئەرمەن کەلێنێك بۆ لەیەکدوورکەوتنەوەیان دروستبکەن بۆیە رۆژنامەی کوردستان هەر لە سەرەتای دەرچوونییەوە لەلایەن ئەرمەنەکانەوە زۆر بەگەرمی پێشوازیلێکرا و تەنانەت بەشدارییان تێدادەکرد بە وتارنووسین و بلاّوکردنەوەی رۆژنامەکە بە ناوچەکانی دەرەوە، لە زۆربەی ژمارەکانی رۆژنامەکەدا وتاری باشی تێدابوو ئاماژەی بە خالّە هاوبەشەکانی کورد و ئەرمەن دەکردەوە ئاماژەییەوەدابوو سەرکەوتنی کورد و ئەرمەن لە هاوکاری و خەباتیاندایە، تەنانەت لە ژمارە (١٤)ی رۆژنامەکەدا وتارێکی (مەلاسالّح) لە جەزیرە بلاّوکردووەتەوە کە تێیدا نیگەرانی خۆی بۆ ئەو دۆخە دەربڕیوە کە ستەم لە کورد و ئەرمەن کراوە و دەلّێت: (لە سووچێکی ئەم دونیایەدا خەلّك بە کردنەوەی خوێندنگە و ئاوەدانکردنەوە و پرۆژەی خزمەتگوزارییەوە خەریکە کەچی لای ئێمە سولّتانەکان بە کاری لەناوبردن و کاولکاری کورد و ئەرمەنەکانەوە خەریکن و هانی هەردوولایان دەدەن تا بەگژیەکدابچنەوە، بەلاّم ئەوەی سولّتانەکان مەبەستیانە هەرگیز نابیەتەدی).

لەڕاستیدا ئەوەی لە مێشکی تورکاندا بوو پلانی بۆ دانرابوو سڕینەوە و لەناوبردنی نەتەوەی ئەرمەن بوو، لەمێژوودا کورد نەخشەی بۆ لەناوبردنی هیچ نەتەوەیەکی غەیرەدین و غەیرە خۆی دانەناوە و هەرچی روویدابێت دەستی دەرەکی بووە و توانیویانە بە چەند کرێگیراوێك ئەوکارانە بکەن وەك جاشەکانی لای خۆمان کە دستیان لە ئەنفالی کورداندا هەبوو دواتر وەك بەرزەکی بانە بۆیدەرچوون!! تورکیش ئێستا دەیەوێ دەستی تاوانی رەشی خۆی بەسەر کوردی بێتاواندا بسڕێ، بەلاّم دەکرێت بۆ مێژوو ئەوە بوترێت هەمیشە کوردەکان هاوسۆزی ئەرمەنەکان بوون و لەهەر شوێنێك بۆیانکرابێت یارمەتی ئەرمەنەکانیان داوە و ئەوانیان پاراستووە و حەواندوویانەوتەوە و لەدەست تورکەکان رزگاریانکردوون، ئەرمەنەکانیش لەهەموو شوێنێك دۆستی کوردیان هەبووە، بەگشتی ئەمە رەوشی ئەوکاتە بوو لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەیەم و لەمیانی جەنگی یەکەمی جیهانیش، لە زۆر شوێن کوردەکان دەستی یارمەتی و هاوکارییان بۆ ئەرمەنەکان درێژدەکرد و لەهەندێك شوێنیش بەکرداری بەشدارییان لە بزووتنەوەکەیان و بەرگریکردنیان دەکرد بۆئەوەی سنوورێك بۆ کۆمەلّکوژییەکەیان دابنرێت ئەم حالّەتەش بەتایبەت لە دەرسیم روویدا.

### پەیوەندی کورد و ئەرمەن لە سەرتای سەدەی بیستەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی

هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن وەك یەك رووبەڕووی زولّم و ستەمەم و تاوانی کۆمەلّکوژی دەولّەتی عوسمانی تورك بوونەوە هەردوولا دەمێکبوو بەدەست ئەو ئازارەوە دەیانناڵاند هەم خۆیان وەك جەستە هەم خاکەکەشیان رووبەڕووی قوربانیدان و کاولکاری بوونەوە.

قوربانیدان و چەوساندنەوەی هاوبەشی کورد و ئەرمەن و خەباتی سیاسی و چەکداری هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن دژی چەوساندنەوەی سوڵتانە عوسمانییەکان لە سەرەتای سەدەی بیستەم رۆڵێکی باشی گێرا بۆ لەیەکنزیکبوونەی زیاتری سەرکردەی هەردوو نەتەوە، دواتر ئەم پەیوەندییە ساسییانە رەنگیدایەوە بۆسەر رەوشی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی هەمەلایەنەی هەردوو گەلی خەباتگێر، بەهۆی هاوبەشی و لەیەکچونیان لەرووی چەوسانەوەوە بێبەشبوون لە مافی نەتەوایەتی یان زۆربەیجار هەماهەنگبوون لە مەینەت و رووبەڕووبوونەوەی زوڵم و ستەمی عوسمانییەکان هاوکاربوون لەیارمەتیداندا تەواوکاری یەکبوون تەنانەت کوردەکان بۆ پاراستنی ئەرمەنەکان قوربانیشیانداوە.

لە سەرتای سەدەی بیستەم بەهۆی پەیوەندی شاندی هەردوولا لە رووبەڕووبوونەوەی پلانەکانی عوسمانیدا ئەم دوو نەتەوەیە یەکڕیز و یەکهەڵوێست بوون ئەمەش لە چاپەمەنی و بلاۆکراوەکانی کورد و ئەرمەنی رەنگیدابوویەوە و کورد و ئەرمەن خۆیان پشتوپەنای یەك بوون و هاوکاری یەکتریاندەکرد دژی ئەو ستەمەی لەهەردوو لا دەکرا.

تەنانەت لە ساڵی ١٩٠٣شدا تورکەکان ویستیان ئەرمەنەکانی ناوچەی ساسۆن دەرکەن و ئەوانیش راپەڕین، کوردەکانیش وەك وەفایەك بۆ ئەرمەنەکانی دراوسێیان لەو راپەڕینەدا بەنهێنی و بەئاشکرا یارمەتی ئەرمەنە راپەڕیوەکانیان دا، هەرئەمەش بوو وای لە قۆنسۆڵی بەریتانیا کرد لە ئەرزەرۆم کە لە نامەیەکی رۆژی ١٦تشرینی یەکەمی ١٩٠٣بنووسێت (لەم چەند مانگەی دواییدا دیاردەیەك سەرنجڕادەکێشێت ئەویش مەسەلەی پەیوەندی کورد و ئەرمەنە و کوردەکان یارمەتی ئەرمەنەکان دەدەن) تەنانەت بەریتانییەکانیش چاویان بەم دۆستایەتییەدا نەدەهات، بەهەمانشێوەش لە سەردەمی هاتنەسەرکاری تورکەلاوەکان لە ساڵی ١٩٠٨ کورد و ئەرمەن دۆست و هاوکاری یەکبوون و هەرلەوسەردەمەشدا رێکخراوی (کورد تعاون ترقی جمعیتی) بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادر نەهری دامەزرا کە یەکێك لە ئامانجەکانی بەهێزکردنی پەیوەندی کورد و ئەرمەن بوو، ئەمە هەڵوێستی کوردە نەك کوشتاری ئەرمەن، خەباتی سیاسی و چەکداری کورد و ئەرمەن دژی چەوساندنەوەی سوڵتانە عوسمانییەکان لە سەرەتای سەدەی بیستەم رۆڵێکی باش و گرنگی گێڕا بۆسەر پەیوەندییەکانی ئەم دوو گەڵە شۆڕشگێرە بەهۆی هاوبەشی لەیەکچوونیان لەرووی چەوساندنەوە و بێبەشبوون لە مافی نەتەوایەتی یان زۆرجار هەماهەنگبوون لە میحنەت و رووبەڕووبوونەوەی زوڵم زۆری، لەوقوناغەدا کۆمەڵانی کورد و ئەرمەنی بانگەوازی یەکڕیزییان بۆ یەك دەکرد، تەنانەت کە تورکە لاوەکان پێشتر بەڵێنیان بەهەردوو نەتەوە دابوو لەو بەڵێنەی خۆیان پاشگەزبوونەوە ئەمەش سیاسەتێکە لای زۆر دەوڵەتی داگیرکەری کورد و ئەرمەنەکان درێژەی هەبووە، بۆیە دژی هەردوو نەتەوە بوونەوە و لێرەدا تورکەکان ئەرمەنەکانیان بە لەمپەر دەزانی بۆ جێبەجێکردنی فیکرە و هزری پانتورانیزمیان کە گەشتن بوو بە ناوچەکان (ئازەربایجان و تورکمانستان)و دروستکردنی دەوڵەتی تورانی تورك، بۆیە ساڵی ١٩٠٩ جارێکیتر ماڵوێرانییان هێنایەوە بەسەر ئەرمەنی زوڵملێکراودا.

هەر لەو قۆناغە بەدواوە چەند کەسایەتییەکیتری کورد وەك (حەسەن بەدرخان و عەبدولڕەزاق بەدرخان) رۆڵێکی بەرچاویان بینی لە پتەوکردنی پەیوەندی کورد و ئەرمەن، لەڕاستیدا ئەمە هەڵوێستی ناودارانی کوردە کەچی ناحەزانی کورد، کورد بەو مەسەلەیە تاوانباردەکەن بێبەڵگە، نزیکبوونەوەی سەرکردەکانی کورد و ئەرمەن

دەسەلاتدارانی ئەستانەی بیزارکردبوو چونکە ئەوان پیلانیان بۆ بەگژیەکدابردنی کورد و ئەرمەن دادەڕشت کەچی کارەکان بە ئاوەژووی مەرامەکانیان هاتن.. هەردەم هەوڵیاندەدا کورد بەگژ ئەرمەندا بدەن، بەلام ئەم دوونەتەوەیە سووربوون لەسەر هاوکاری یەکدی.

تەنانەت (مەلاسەلیم) داوای هاوکاری و کۆمەکی لە ئەرمەنەکان کرد و پاشتر کە راپەڕینێکی بەرپاکرد کورد و ئەرمەن جارێکیتر دۆست و هاوکاری یەك بوون و بۆ پاراستنی یەکتر هەوڵیاندەدا، هەرلەبارەیەوە رۆژنامەی ئەرمەنی بەناوی (هوریزۆن) لە ژمارە ٧٤ی رۆژی ١٠/٤/١٩١٤ دەنووسێت: (کوردەکان بەوپەڕی رێز و دۆستایەتی لەگەڵ ئەرمەنەکان هەڵسوکەوتدەکەن).. ئەمەش بەڕادەیەك رازینەدەبوون نان بەخۆرایی لە ئەرمەنەکان وەرگرن کە بەڕەزامەندی خۆیان پێیاندەدان، تەنها لەکاتی پێویست بۆ خۆگەرمکردنەوە سووتەمەنییان لێوەردەگرتن، چونکە ئەو رۆژگارانە زۆر ساردبوون و ئەمەش ئەرمەنەکانی خۆشحاڵدەکرد کاتێك دەبوونە مایەی گەرمکردنەوەی ئەوان (کوردەکان) ئەمە شایەتیدانی خودی ئەرمەنەکانە بە بەڵگەوە، ئیتر ئەوانەی باسی کورد دەکەن لە کوشتاری ئەرمەن تەنیا فیشەك بەتاریکییەوە دەنێن، بەلام ناحەزانی هەردولا حەزیان بە ئاژاوە و قسەی بێبەڵگەیە و دەیانەوێت بۆ مەبەستی سیاسی خۆیان  کورد لەو مەسەلەیەدا تاوانباربکەن، تەنانەت تورکەکان پڕوپاگەندەیان لەسەر کورد و ئەرمەن بلاودەکردەوە دەیانوت کوردەکان لەجیاتی ئەوەی داوای مافی خۆیان بکەن هێرشدەکەنەسەر ئەرمەنەکان، بەلام ئەم هەولانە بەفیڕۆچوون، وەك چۆن تورکەکان لە هاوکاری کوردەکان بۆ ئەرمەنەکان دڵگرانبوون بەهەمانشێوەش لە هاوکاری ئەرمەنەکان بۆ کوردەکان دڵگرانبوون، ئەمەش بەوەی ئەو هاوکاریەی ئەرمەنەکان دەسەلاتدارانی تورکی خستبووە دڵەڕاوکێ و نارەحەتییەوە چونکە هەوڵەکانیان بەدرێژایی رۆژگارەکە شکستیانهێنابوو پیلانەکەیان سەرینەگرتبوو کە بتوانن کورد و ئەرمەن بەگژیەکدابدەن، بۆیە والی تورکی لە موش کە (ئیحسان پاشا) بوو داوای لە ئەرمەنەکان کرد چەك لە دژی کوردەکان هەڵگرن، بەم داواییەی والی ئەرمەنەکان لەڕووداماں هیچ چارەیەکیان نەما، چونکە بە رەتکردنەوەی دووچاری سزا و راوەدونان دەبوونەوە بە قبوڵکردنیشی دوژمنایەتی دەکەوتە نێوان کورد و ئەرمەنەکانەوە ئەمەش رێگە و بژاردەیەکی سەختبوو بۆ ئەرمەنەکان، بەلام کەسایەتی ئەرمەنی (کارۆساسۆنی) وتی: ئەرمەنەکان زۆر باش لەم داواییە دەگەن بۆیە ژیرانە رووبەڕووی ئەم هەڵوێستە بوونەوە، ئەوەبوو بەڕووکەش و بەزارەکی پشتیوانی خۆیان بۆ والی دەربڕی لەژێرەوەش لەم پلانەیان کوردەکانیان ئاگادارکردەوە و پێیانڕاگەیاندن کە تورکەکان خەیاڵیان خاوە ئەو رۆژە بەچاوی خۆیان ببینن کە کورد و ئەرمەن رووبەڕووی یەکتربببنەوە، ئەرمەنەکان کوردەکانیان ئاگادارکردەوە کە هەرگیز ئامادەنین چەکەکانیان بەرامبەر کورد ئاراستەبکەن. لەڕاستیدا تورکەکان بێگوێدانە هیچ بنەمایەکی مرۆڤاییەتی ئامادەبوون هەموو پیلان و رێگەیەك بگرنەبەر بۆ بەگژیەکدادانی کورد و ئەرمەن و نەمانی هاوکاری نێوانیان تەنانەت تورکەکان کەوتنە گرتنی هاولاتیانی سڤیلی ئەرمەنی.. بۆنموونە (هاگوپ) هاولاتی ئەرمەنیان گرت چونکە بە گەنم هاوکاری خێزانی خەباتگێڕی کوردەکانی کردبوو، هەروەها (نەخشۆ) کە هاولاتییەکی ئەرمەنی بوو دەسگیرکرا بەهۆی هاوکاری و یارمەتیدانی راپەڕیوەکانەوە جگەلەوانەش تورکەکان رۆژنامەی (ئەزتاماران)ی ئەرمەنییان داخست بەبیانووی ئەوەی هەواڵی راپەڕینی کوردەکانی بلاوکردەوە ئەمەش لەگەڵ سیاسەتی تورکەکان نەدەگونجا.

سەرەڕای هەموو ئەوانە کەچی خۆشبەختانە ئەمڕۆ لای ئەرمەنەکانیش ئەوە ساغبووەتەوە کە کورد دەستی لەو کوشتار و کێشەیەدا نەبووە تەنانەت مێژوونووسی ئەرمەنی (ئارشاك سافرستیان) لە کتێبی کورد و کوردستانەکەی ئەوەی ئاشکراکردووە کە: (خودی تورکەکان هەموو تاوانێکی لێککەوتنی هەردوو گەلی برای کورد و ئەرمەنیان لەئەستۆدایە نەك کورردەکان) ئەمەش بەڵگەیەکیتری خودی مێژوونووسی ئەرمەنەکانە و دیرۆکنووسەکانیان شایەتی لەسەردەدەن، لەڕاستیدا پێموایە هێندەی نووسەران و مێژوونووسان باسی ئەوەیان کردووە کە کورد بەشدارە لە کوشتاری ئەرمەن و کۆمەڵکوژی ئەرمەن و تاوانبارکردنیان بە کوشتاری ئەرمەن هەرگیز باسی ئەوەیان نەکردووە کە کورد چەندێك ئەرمەنی پاراستووە و لە مردن رزگاریکردوون، خۆشبەختانە دەتوانین بۆ مێژوو ئەوە بڵێین نیوەی ئەرمەنەکانی ئەمڕۆ نەوەی ئەو ئەرمەنانەن کوردەکان لە مردن رزگاریانکردوون و پاراستونیان. جگەلەوەش خودی ئەرمەنەکان زۆر لەگەڵ کوردەکان بەختەورن پێکەوەژیاون ئەم بەختەوەرییەی ئەوانیش بۆ بێتاوانی کوردەکان دەگەڕێتەوە لە جینۆسایدکردنی ئەرمەنەکان. تەنانەت ئەرمەنەکان لەگەڵ کوردەکان زۆر بەختەوەربوون هەر لەوبارەیەوە میجەری بەریتانی (ك. سۆن) جوگرافیناسی شاهانە لە لەندەن لەموحازەرەیەکدا ئاماژەی بەوەکردبوو دەڵێت: (دوورنییە هەریەکە لە ئێمە بیرۆکەیەکی شاشی لەسەر ئەوەهەبێت کە کوردەکان لە کۆمەڵکوژی ئەرمەنەکان بەرپرسیاربن، بەلاّم کەم کەس لە ئێمە ئەوە دەزانێت کە بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی ئەو کریستیانە (ئەرمەنەکان) لە ناوچە کوردییەکان دەژیان گەلێك بەختەوەربوون.

## ئەرمەنەکان لەژێر بڕیاری سەرانی سێکوچکەی دیکتاتۆرییەت دووچاری جینۆسایدکردن بوون

لەم بەشەدا دیسان دەمەوێت زیاترلەوەی کە پێوستە بچمەنێو بابەتە گرنگەکانی مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و ئەرمەن و دورخستنەوەی کورد لە کوشتار و کۆمەڵکوژی ئەرمەن و نیشاندانی مێژووی راست و دروستی کورد بەشێوەیەکی شەفاف و بەڵگەنەویست و لادانی ئەو پەردە رەشە نامۆیەی کە بەدەستی لەخوێنهەڵکێشراوی تورکی ئەرمەنکوژ و دژەویژدان لەسەر رووی سپی مێژووی کورد.

لەڕاستیدا ئەم کارە هەروا ئاسانییە، چونکە زۆر لە نووسەرەکان بەبێ بەڵگە و بەشێوازێکی نامەنتیقی خۆیان بەو بابەتەوە هەڵواسیوە و کانیاوی راستییەکانیان بە بەردی رەش و نەگریسی خۆیان پڕکردووەتەوە و خۆیان بە سۆپەر مێژوونووس ناوزەدکردووە، بۆیە ئەمەش هەوڵ و ماندووبوونی زۆری دەوێ و ئەرکی سەرشانی نووسەر و مێژوونووس و رۆشنبیرە بەویژدانەکانی هەردوو نەتەوەی برای کورد و ئەرمەنە کار بۆ خستنەڕووی راستییەکان بکەن.

لێرەوە دەمەوێت ئاشناتانکەم بە بەشی دووەمی راستی و بەڵگەکان کە لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و نەتەوەکانی جیهان تووشی کارەسات و ماڵوێرانی بوون، بەلاّم ئەوەی گرنگە مەسەلەی پاراستنی ئەرمەنەکانە لەلایەن کوردە خۆنەویست و قارەمان و دڵسۆزەکانەوە کە لەکاتی تەنگانە و گەرمەی شەڕدا ئەرمەنی برایان لەیادنەچووە، لەوپێناوەشدا ئامادەی قوربانیدان بوون لەپێناو پاراستنیان، ئەمەیە راستی مەسەلەکان کە بەدەستی ناحەزان و بەناو مێژوونووسان شێوێنراوە،

زۆربەی زلهێزەکان لە سالانی جەنگدا لە هەولی سەرنجراکێشانی نەتەوەکانی ناو دەولەتی عوسمانی بوون بەبیانووی جۆراوجۆر بۆ مەبەست و بەرژەوەندی گلاوی خۆیان، لەهەمانکاتیشدا سیاسەتێکی نادیاریان بەرامبەر هەردوو نەتەوەکە هەبوو، لە هەولی بەگژیەکدادانی کورد و ئەرمەن بوون ئەمەش لە سنوور و چوارچێوەی دەولەتی عوسمانیدا بۆ زیاتر شێواندنی بارودۆخەکە و تاوانبارکردنی نەتەوەی کورد، ئەوەی گرنگە بۆ مێژوو ئەوە بوترێ لە سالانی جەنگی یەکەمدا دەولەتی عوسمانی لەژێر فەرمان و سیاسەتی سێکوچکەی دیکتاتۆری ئیتیحادوتەرەقی بوو کە (جەمال پاشا و ئەنوەر پاشا و تەلعەت پاشا) بوون ئەمانە خاوەن دەسەلات و خاوەن بریاربوون تەواوی فەرمانەکان لەلایەن ئەوانەوە دەردەچوو، ئەمانە باوەریان بەپێکەوەژیانی نەتەوەکانی ناو دەولەت نەبوو لە هەولی پاکتاوکردنیان بوون، بۆیە لەوماوەیەدا ئیتیحادییەکان کوشتارێکی ترسناکیان لە کورد و ئەرمەن کرد ئەمەش گوزارشتێك بوو لە ماهییەت و فراوانخوازی و رەگەزپەرستی بزووتنەوەی تورانیزم، چونکە ئەوان باوەریان بە هەردوو نەخشەی پانتورکیزم و پانتورانیزم بوو، ئامانج لە نەخشەی یەکەم بەتورککردنی هەموو میللەتی غەیرە تورك بوو کە زۆربەی دانیشتووانی دەولەتی پێکدەهێنا.

ئامانج لە نەخشەی دووەم کۆکردنەوەی هەموو میللەتی تورانی بوو لە چوارچێوەی دەولەتێکی تورکی فراوان کە لە بەغازی بسفۆرەوە دەستیپێدەکرد و دەگەشتە ئاسیای ناوەراست، بەلام لەبەرامبەر ئەمەدا گەلی ئەرمەنیان بە لەمپەر و رێگر دەزانی بۆ گەشتن بەو خەونەیان، چونکە بە پێگە جوگرافییەکەی تورکانی ئامۆزای تورانییەکانی دانیشتووانی ئازەربایجانی روسیا و تورکستانیان جیادەکردەوە، لەوپێناوەشدا هەموو رێگە و شێوازێکی نامرۆڤانە و کوشتوبریان دەگرتەبەر.

ئەمە لەلایەك و لەلایەکیتر سیاسەتێکیتریان بەکاردەهێنا ئەویش هەستی ئایینی بوو، ئەمەش بۆ بزواندنی هەستی ئایینی کورد بوو، بەلام لەهەمانکاتدا ئیتیحادییەکان عەلمانیبوون و باوەریان بە ئاین نەبوو، لەلایەکیتر لەو ئانوساتەدا سولتان بەناو خۆی بە پارێزەر و خەلیفەی ئیسلام دەزانی و بانگەوازی ئایینی دەکرد بۆ نەتەوەکانی ناو دەولەت، بەلام لەهەمانکاتیشدا لەگەل ئەلمانیای غەیرە ئیسلام دەستی تێکەلکردبوو ئەمە سیاسەتی سولتان بوو دژی ئەرمەنی مەسیحی.. کەچی دۆست و هاوپەیمانی ئەلمانی مەسیحیش بوو ئەمەیە سیاسەتی چەواشەکاری سولتان بەناو خەلیفە، لەراستیدا ئەمە دوورە لە واقیعی ئیسلام.

لەگەل ئەوەشدا هەندێك کەس وایبۆدەچن کە کورد بەهۆی سیاسەتی کوێرانەی ئایینی دژی ئەرەمەنەکان بووە، بەلام راستی مەسەلەکە ئەوەیە بەدرێژی مێژوو تائەمرۆش کورد کێشەی ئایینی لەگەل هیچ نەتەوەیەك نەبووە و بوونی ئەو هەمووە ئاین و ئایینزاییە لە کوردستان و پێکەوەژیان لەگەلیاندا راستییەکی بەلگەنەویستە، سولتان و سەرانی تورك لەم سیاسەتەیان زیرەك بوون کەوتنە فەتوادەرکردن، بۆیە هەر لەسەرەتای شەرەوە دیسان تورکەکان کۆمەلکوژی و مالوێرانییەکیتریان بەسەر ئەرمەنەکاندا هێنایەوە، تەنانەت لە رۆژی ٢٤/٤/ ١٩١٥ فەتوایەکیاندەرکرد کە لەسەر کورد و تورك پێویستە غەزای ئەرمەن کوشتن دەستپێبکەن و لە مایسی هەمانسالدا حکومەت فەرمانیدەرکرد ئەرمەنەکان لەسەر سنوور دەربکەن لەو سەروبەندەدا (ئەنوەر پاشا) سوودی لەو هەل و بارودۆخە وەرگرت تا بە وتەی خۆی (مەسەلەی ئەرمەن بۆ هەتاهەتای لەتورکیادا چارەسەربکات و ئەو کێشەیەش

بنەبڕبکات) کە ئەویش ڕەشەکوژی ئەرمەنەکان بوو بەشێوەیەك هیچ ئاسەواریان نەمێنێ ئەمەش بەڵگەیەکە کە خودی ئەنوەر پاشا خاوەن بڕیارە کە یەکێکە لە سێکوچکەی دیکتاتۆرییەت نەك کوردەکان.

لەماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا دەوڵەتی عوسمانی تووشی چەندین شکستی یەك لەدوای یەك بوویەوە لە بەرەکانی شەڕدا، بۆیە هەریەك لە ئەنوەر پاشا و تەلعەت پاشا هەوڵیاندەدا تاوان و تاوانبار و هۆکاری ئەو شکستەیان بدۆزنەوە و کەسیش لەو ڕۆژەدا وەك ئەرمەن بۆ ئەو مەسەلەیە دەستینەدەدا.. بۆیە ئەنوەر بڕیاریدا تەواوی ئەرمەنەکانی تورکیا لەناوبەرێ بەوشێوەیە کوشتارێکی دروستکرد تاوانەکانی (سوڵتان عەبدولحەمید) لەوبارەیەوە هیچ نەبوو!! سەرەڕای ئەوەش هەستا بە بەردان و ئازادکردنی زیندانییەکان و مەرجی ئازادبوونیانی کردبوو بە کوشتنی ئەرمەن و لەناوبردنیان، لەلایەکیتر بۆ تاوانبارکردن و سوککردنی کورد هەستا پیاوکوژ و تاوانبارەکانی خۆیان جلوبەرگی کوردی لەبەردەکردن و دەیانناردنەسەر ئەرمەنەکان بەجۆرێك کە بەشێوەیەکی وەحشیگەری و دڕندانە قەتڵوعامی ئەرمەنیان دەکرد و لەهەموو لایەك بڵاویاندەکردەوە کەوا کوردەکان پەلاماری ئەرمەنەکانیان داوە و کوشتاریانلێکردوون، بەوشێوەیە ناوی کوردی بێتاوانیان زڕاندووە ئەمەیە سیاسەتی شەیتانی تورك و تاوانی نێومێژووی ڕەشیان، ئەمەیە تێکدانی ڕاستییە مێژووییەکان و هەندێك لە مێژوونووسەکان دیماگۆجییانە (ساویلکە) شوێن ئەو سیاسەتە شوومە کەوتوون کە دوورە لەڕاستییەوە لەوەوە خوێندنەوە بۆ کورد و مێژووەکەی دەکات.

جگەلەو سیاسەتە ناڕەوایانە سەرانی تورك بۆ لەناوبردنی ئەرمەن چەندین بڕیار و بروسکەی جۆراوجۆریان دەردەکرد لەوانەش بەنموونە بروسکەیەکی (تەلعەت پاشا)یە دەینێرێت بۆ حاکمی حەلەب و دەڵێت: (بەرلەئێستا پێتانڕاگەیەنراوە کەوا بەپێی فەرمانی جەمعییەت بڕیاردراوە کە بەیەکجاری ئەو ئەرمەنانە لەناوبرێت کە لە تورکیا دەژین، ئەوانەی دژی ئەم بڕیارەن ناتوانن لەسەر کاری خۆیان بمێنن، هەرچەندە ئەو هەنگاوانە توندوتیژبن، بەڵام بەهیچشێوەیەك گوێمەدەنە تەمەن و ژن و پیاو و ویژدان) ئەمە ناوەڕۆکی سیاسەتی تورکە و تەنانەت دژی ویژدانیشن!!

لەئەنجامی ئەو سیاسەتەی تورك کە بەپێی ڕاپۆرتێکی ئینگلیز لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٦ ناردبووی بۆ پەرلەمانی وڵاتەکەی نووسرابوو (لە دوو ملیۆن ئەرمەنی دانیشتووی تورکیا ٣/١یان کوژراون و ٣/١یان ئاوارە و دەربەدەربوون)، تەنانەت ڕۆژنامەنووسی ڕووسی لەوبارەییەوە دەنووسێت (لە شاری وان نە کەسی زیندووی تیاماوە نە خانووی بەپێوەماوە، لە شاری بەتلیس لە ١٨ هەزار ئەرمەنی تەنیا ٣٠٠ تا ٤٠٠ ژن و منداڵ ڕزگاریانبوو، لە شاری مووش و ئەو سێ گوندەی دەوروبەری کە ٢٥ هەزار ئەرمەنی لێدەژیا پاش ڕەشەکوژییەکان تاکەکەسێکی لێدەرنەچوو!!).

ئەمەیە سیاسەتی جینۆساید و پاکتاوی ڕەگەزی تورك کە بەو کارانەیان لاپەڕەکانی مێژووی خۆیان پێ ڕەش و شەرمەزارکرد، لەڕاستیدا لەمپەڕ بۆ ئەوپەڕی مێژووی کورد بگەڕێ سیاسەت و کارێکی هاوشێوە و قێزەونی وا بەدیناکەی ئیدی کامەیە کوشتاری ئەرمەن بە دەستی کوردی بێدەوڵەت و بێکیانی سیاسی و خاك دابەشکراو.

لە بروسکەیەکیتری وەزیری ناوخۆ (تەلعەت پاشا) دەڵێت: (ئەرمەنەکانی ولایەتی رۆژهەلاّت بە نهێنی بکوژن) کەچی خۆشیان ئەو راستییانە باشدەزانن، بەلاّم تائەمرۆش سەرانی تورك دانیپێدانانێن و تورکی لێبێبەریدەکەن، لەگەڵ ئەو هەموو ماڵوێرانی و رەشەکوژییەی سەرانی تورك و دەوڵەتی عوسمانی بەسەر نەتەوەی ئەرمەنیاندا هێنا کەچی پاکانە بۆخۆیان دەکەن و تاوانی ئەو کوشتارانە دەخەنەئەستۆی کورد، ئەمەش بۆئەوەی پەردەی رەش و تاریك بەسەر کوردەکان بدەن و بە چەتە و رێگر لەقەڵمیانبدەن، لەلایەکیتر ئابرووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بەرن و لەکەداریبکەن، لەلایەکیتریش ئەمە بەهانەیەکیش بێت کە پەلاماری کوردەکانی پێبدەن، تەنانەت (تەلعەت پاشا) پاکانە بۆخۆی دەکات و تاوانی کوشتارەکە دەخاتەئەستۆی خودی ئەرمەنەکان چونکە یامەتی روسیایان داوە و دەڵێت: کڵێسەکانیان جگەلە چەك و تەقەمەنی هیچیتری تیانەبووە، بەلاّم ئەی تاوانی راگوێزان و کوردکوشتن دەخاتەئەستۆی کێ! لەکاتێکدا هاوئایین و هاومەزهەبی خۆیان بوون، بەلاّم پەتی درۆ کورتە و مێژوو حاکمێکی بەویژدانە و تاوانباران لە مەحکەمەی مێژوو رزگاریاننابێت و مێژوو رەحم بەکەسناکات، جگەلەوەش (جەمال پاشا) تاوانی کوشتارەکە دەخاتەئەستۆی روسەکان چونکە هانی ئەرمەنیان داوە دژی تورکەکان، ئەمانە بڕوبیانووی پووچن و ناکاتە ئەوەی نەتەوەیەك بە ژن و منداڵەوە جینۆسایدکەیت.. خۆئەوانە نە لە بەرەی شەڕدا بوون و نە لەناو سوپای روس، ئەمە واقیعی مێژووە، بەلاّم ئەی ماڵوێرانی و راگواستنی کوردەکان چی؟! سەرەڕای ئەوەی ئیتیحادییەکان ئەو کارەساتەیان بەسەر ئەرمەن هێنا بڕیاریاندا ئەوەی بە ئەرمەنیان کردووە بە کوردیشی بکەن.

بۆیە دەستیانکرد بە راگواستن و ئاوارەکردنی کوردەکان ئەمەش بەمەرجێك ژمارەی ئەو کوردە ئاوارانە لەهەر شارێکی تورکدا ژمارەیان لە ٥٪ زیاترنەبێت لەڕاستیدا ئەمە سیاسەتی تەتریك و تواندنەوەی کوردە لە بۆتەی نەتەوەی تورکدا، لەئەنجامی ئەوەدا نزیکەی ٥٠٠ کورد گیانیانلەدەستدا و ٧٠٠ هەزار کوردیش بەرەو رۆژئاوای ئەنادۆڵ راگوێزران ئەمانە بەدەم رێگە و برسییەتی و ماندوویەتی و سەختی رێگا لەناوچوون و بەشێکیتریان پێش ئەوەی بگەنە شوێنی دیاریکراو کوشتنیان، هەرلەوبارەییەوە (د. عەبدولعەزیز یامولکی) دەنووسێت: (تا بڕانەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی زیاتر لە٧٠٠ هەزار کوردی تورکیا مردن و لەناوبران) ئەمانە راستی سیاسەتی تورکە و چاویان بەراییناداتە راستییەکان ببینن.

سەرباری ئەوەی کوردەکان وەك ئەرمەنەکان تووشی کارەسات و ماڵوێرانی سیاسەتی رەگەزپەرستی تورك بوون، بەلاّم لەو قۆناغەشدا و لەگەرمەی شەڕیشد برا ئەرمەنەکانیان لەیادنەکردووە بەپێی توانا یارمەتی ئەرمەنیان داوە تەنانەت ئەو ئەرمەنانەی لەڕێگەی دیرۆزەوە پەنایانبردووەتەبەر کوردە یەزیدییەکان ئەوانیش پاراستونیان و نەیانهێشتووە تورکەکان سزایانبدەن و لەناویانبەرن،

لەلایەکیتر (عەبدولعەزیز یامولکی) دەنووسێت: (بێگومان ئەو ئەرمەنانەی لە ئەنادۆڵ مابوونەوە لە شمشێری تورکان رزگاریانبوو بەبێ خۆهەڵکێشان سێ لە چواریان ئەوانە بوون کورد رزگاریکردبوون یان شاردبوونیەوە) بەهەمانشێوە (د. بلەج شێرکۆ) دەنووسێت: (خۆشبەختانە ئەمڕۆ لەکۆڕەکاندا ساغبووەتەوە کە لە ساڵانی جەنگی گشتیدا و لەکاتی کوشتاری ئەرمەندا کوردەکان بەوەی داڵدەی ٥٠ هەزار ئەرمەنیان داوە و نەیانهێشتووە دەستی

تورکانیان پێبگات کارێکی دۆستانه و بێوێنه‌یان ئه‌نجامداوه به‌تایبه‌ت خودی ئه‌رمه‌نه‌کان دان به‌و راستییه‌دا ده‌نێن)و له سالّی ١٩١٥دا که‌سایه‌تیه‌کی وه‌ك (ئه‌حمه‌د به‌گ) بوویه سایه و په‌نای ئه‌رمه‌نه‌کان و گه‌لێکی له مردن رزگارکرد، له نامه‌یه‌کی تایبه‌تیدا ئه‌رمه‌نه‌کانی گوندی (خاتسۆ) باسی ئه‌وه‌یانکردووه که چۆن کورده‌کانی هۆزی (محه‌مه‌د ئاغا) به‌رهنگاری سه‌رباز و جه‌ندرمه‌ی میری بوونه‌ته‌وه رێگه‌یاننه‌داوه ئه‌رمه‌نه‌کان بگوازرێنه‌وه، هه‌رله‌ونامه‌یه‌دا نووسراوه هۆزه‌که خۆیان به‌ده‌ست برسێتییه‌وه ده‌یانناڵاند که‌چی دواپارچه‌نانیان له‌گه‌ڵ ئه‌رمه‌نه‌کان ده‌کرد به دوو به‌شه‌وه و یارمه‌تیانده‌دان.

لێره‌شدا ده‌مه‌وێت به‌ڵگه‌یه‌کی راست و دروستی ئه‌رمه‌نه‌کان بهێنمه‌وه که یه‌کێك له پیاوه ئایینییه‌کانی ئه‌رمه‌ن به‌ناوی (گریگۆریۆس په‌لاکیان) به‌هه‌مانشێوه داکۆکی زۆری کردووه له کورد و ده‌یسه‌لمێنێت که کورد رۆڵی نه‌بووه له کاره‌سات و کوشتاری ئه‌رمه‌نه‌کان نموونه‌ش دێنێته‌وه له‌کتێبه‌که‌یدا به‌ناوی (ئه‌رمه‌نه‌کان و کۆمه‌ڵکوژی و تاراوگه) باس له‌و رووداوه ده‌کات له‌نزیك ئه‌نقه‌ره روویداوه و ده‌ڵێت: کوردی لێنه‌بووه.

به‌مه‌ش نه‌ك نووسه‌ر و مێژوونووسه ئه‌رمه‌نیه‌کان به‌ڵکو پیاوه ئایینیه‌کانیشیان بێتاوانی کورد له کوشتاری ئه‌رمه‌ندا ده‌سه‌لمێنن و ته‌واوی کوشتار و ماڵوێرانیه‌کانی ئه‌رمه‌ن ده‌خه‌نه‌ئه‌ستۆی تورك و سه‌رانی ئیتیحادییه‌کان بۆیه ده‌بێت به‌رپرسیاریه‌تی مێژوویی بخرێته‌سه‌ر تورك نه‌ك کورده‌کان، چونکه ئه‌وان ویستویانه ده‌ستی به‌خوێنسووربووی ئه‌رمه‌نکوژی خۆیان به‌سه‌ر نه‌ته‌وه‌ی کورد بسوون له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا هه‌رئه‌وان خاوه‌ن ده‌وڵه‌ت و دامووده‌زگا و سوپا و هێز و بڕیاربوون نه‌ك کوردی به‌شمه‌ینه‌ت و بێماڵوحاڵ و بێسوپا و بێده‌سه‌ڵات. له‌ڕاستیدا ئه‌مه سیمای هه‌موو ده‌سه‌ڵاتێکی خوێنمژه بۆ په‌رده‌پۆشکردنی کاره قێزه‌ونه‌کانی خۆی ته‌واوی کاره خراپه‌کانی خۆی ده‌خاته‌ئه‌ستۆی نه‌ته‌وه ژێرده‌سته‌کانی خۆی بۆ بێتاوانی خۆی.

## سه‌رده‌می تۆڵه‌ی ئه‌رمه‌ن و له‌ناوبردنی جینۆسایدکه‌رانیان

زۆرگرنگه لێره‌دا ئه‌وه بۆ مێژوو بخرێته‌ڕوو یان ده‌کرێت وه‌ك به‌ڵگه‌یه‌کی گرنگ و وه‌ك جوابێکی پۆلایین و کۆنکرێتی به‌کاربهێنرێت که ده‌ڵێم پۆلایین چونکه هه‌تائێستا زۆر که‌س و لایه‌ن و زۆر مێژوونووس و زۆر فه‌ریکه‌نووسه‌ر پێیانوایه کورد جینۆسایدی ئه‌رمه‌نی کردووه و کوردیان به‌وناوه‌وه ناساندووه یان بۆ هه‌رمه‌به‌ستێك بێت راستییه‌کانیان شاردووه‌ته‌وه، به‌ڵام وه‌ك ده‌ڵێن راستی له‌نێو ئاگریشدابێت ناسووتێ، جگه‌له‌وه‌ش ئه‌مه سه‌رده‌مێکه ده‌توانین به‌ئاشکرا و بێترس راستییه مێژووییه‌کان وه‌ك خۆی بوترێ و بنووسرێت، لێره‌دا سه‌یرنییه ئه‌مه بوترێ، چونکه لای مێژوونووسی راستگۆ و به‌ویژدان گه‌ردیله و وردیله راستییه‌کان وننابن له‌به‌رئه‌وه ئه‌وانه رۆحیه‌تی مێژوویی و نووسینی مێژووییان هه‌یه به‌چاوی واقیعی بۆ رووداوه‌کان ده‌چن وخوێندنه‌وه‌ی بۆده‌که‌ن، زۆر پێمخۆشبوو منیش ئه‌م راستییه بڵێم چونکه ده‌مێکه سه‌لماندنی ئه‌م راستییه ئاواتی منه و ده‌مێکبوو له‌مێشکمدا ده‌هاتوده‌چوو، به‌ڵام سوپاس بۆخودا پاش ئه‌وه‌ی توێژینه‌وه‌یه‌کم له‌سه‌رکرد گه‌شتمه راستییه‌کان، منیش حه‌زده‌که‌م ئه‌و راستییانه وه‌ك خۆی باسکه‌م بۆئه‌وه‌ی بتوانین هه‌میشه ده‌مکوتی ناحه‌زانی کوردی پێبده‌ینه‌وه و شه‌رمه‌زاریانکه‌ین.

ئەمرۆش ئێمە نە دەوڵەت و نە کیانێکی سیاسی زۆر بەهێزمان هەییە تابتوانین بەهێز یان بەفشاردروستکردن ئەو گومانانە لەنێوبەرین، بەلاّم ئەوەی مایەی خۆشحاڵیمانە ئەمرۆ چەکی دەستی ئێمەی کورد تەنیا قەڵەمی دەستمانە بۆیە دەتوانین زۆر راشکاوانە و بێترس تەواوی خلّتە و بوختان و گومانە پیسەکان لەسەر مێژووی خۆمان لابەرین و مێژوویەکی بێهەڵەوپەڵە تۆماربکەین، پێویستە جوابی تەواوی بەناومێژوونووس و نووسەرە گومانچییەکان بدەینەوە و بڵێین: گەر ئێوە بێبەڵگە کورد بەجینۆسایدکردنی ئەرمەن ناودەبەن؟ ئەی بۆچی ئەرمەنەکان تۆڵەی ئەو جینۆسایدەیان لە کورد نەکردەوە و نەهاتن چەند کەسایەتییەکی ناوداری کورد لەنێوبەرن؟ خۆ ئەوان تۆڵەی خۆیان لە جینۆسایدکەرانیان کردەوە و حەقی مەعنەوی خۆیان کردەوە و ئەوەی کردبوویانە ئامانج بۆ تۆڵە لەنێویانبرد چ لەدەرەوە و چ لەناوەوە، خۆئەوانە تورکبوون و دوڵەتیان هەبوو،بەلاّم کوردی بێدوڵەت و دابەشکراو زۆر نزیکن لە ئەرمەن و دەیانتوانی بەئاسانی لە کوردەکان بکوژن بەو ناوەی کە ئێوە دەڵێن جینۆسایدکردن، بەلاّم دەڵێم ئەی بۆ کورد و بەرپرسانی کوردیان تیرۆرنەکرد؟ بۆ تۆڵەیان لە کورد نەکردەوە؟ ئەمە راستییەکانە چونکە کورد بێبەرییبووە لە کوشتاری ئەرمەن و جینۆسایدکردنیان وەك لە بەشەکانی پێشووتر روونمانکردەوە.

لێرەوە دەمەوێ ئەوە بڵێم ئەرمەنەکان وێرای کوژرانی سەدان هەزار ئەرمەن و ئاوارە و راگواستنیان، بەلاّم هەوڵیاندا تۆڵەی خۆیان بکەنەوە و رووی جینۆسایدکەرانیان رەشکەن و بیانخەنەنێو زبڵدانی رەشی مێژوو، بۆ هەتاهەتای مرۆڤاییەتی ڤێزیانلێبکاتەوە نەفرەتیان لێبکەن و شەرمەزاری نێولاپەرەکانی مێژوویان کەن، وەك پێشینان دەڵێن (قەرز کۆندەبێت و نافەوتێت) جینۆسایدکەرانی ئەرمەنیش باجی ئەو قەرزەیاندەدەن وەك دواتر روونەدەبێتەوە، دوابەدوای تەواوبوونی جەنگ سەردەمێك هاتەئاراوە دەتوانم ئەو حەقە بەخۆم بدەم و بە سەردەمی (تۆڵەسەندنەوەی ئەرمەنەکان) ناوزەندییبکەم، ئەوەبوو دوای کۆتاییهاتنی کۆمەڵکوژی و رووخانی ئیمپراتۆری عوسمانی و هەڵهاتنی سەرانی سێکوچکەی دیکتاتۆرییەت و دامەزراندنی کۆماری تورکیا، ئەو ئەرمەنانەی کە لە گۆشە و کەناری دنیادا پەرتوبلاّو بووبوونەوە بەدەست تورکان، بەتایبەت ئەو ئەرمەنانەی لە مەرگی مسۆگەر رزگاریانبوبوو کەوتنە هەوڵی تۆڵەسەندنەوە لەو کەس و بەرپرسانەی کە لە کوشتار و جینۆسایدکردنی ئەرمەندا دەستیان هەبوو لەناویانبردن و تیرۆریانکردن، هەرلەو واقیعەشدا ئەرکی تۆڵەسەندنەوە کەوتەئەستۆی خودی نیشتمانپەروەرانی ئەرمەن کە لە ساڵانی (١٩٢٠-١٩٣١) بەوپەڕی فیداکاری و قارەمانی چاونەترسی سەرانی حکومەتی خوێنرێژی ئاژاوەگێری ئیتیحادی تورکی فاشستیان تیرۆرکرد، بۆیە لەناو ئەوانەش سەرۆکوەزیرانی ئازەربایجان بوو لە ساڵی ١٩٢٠ بەدەستی (ئارام یەرگانیان) تیرۆرکرا و هەر لەهەمانساڵدا (عەباس بیگۆف) لە کوشتاری ئەرمەندا پێگەی پلە دووی هەبوو بەدەستی (یەرگان) تیرۆرکرا، دوای ئەوەش کەسێکیتر کە دەستی تۆڵەی پێگەشت شەرمەزاری نێومێژوو بوو (تەلعەت پاشا) بوو کە لەکۆمەڵکوژیەکەدا پلە یەکی هەبو هەموو ئەو فەرمانانەی ئەو دەریدەکردن بۆ کۆمەڵکوژی ئەرمەن هێشتا ماون، دوابەدوای رووخانی دەوڵەتی عوسمانی تەلعەت رۆشتە بەرلین و لەوێدا بەنهێنی دەژیا ئەمیش دەستی تۆڵەی پێگەشت و بەدەست کەسایەتیەکی ئەرمەنی تیرۆرکرا بەناوی (سوغوفۆن تەهلیریان) کە ئەویش لە سەردەمی کۆمەڵکوژیەکەدا برینداربوبوو، تەهلیریان دەڵێت: (کاتێك بەهۆش خۆم هاتمەوە چەند هەنگاوێك لەولامەوە بووك و دایك و برا و خوشکەکانم لەخوێندا نقومبوبوون)و خۆیشی

بەزەحمەتێکی زۆر لە گۆڕستانی بێگۆڕی ئەرمەن رزگاریبووبوو، دواتر بە جلی تورکی و بەناوی نەخوازراو دەژیا، بەلاّم پاشماوەیەك گەشتە ئەلّمان و لەوێدا بەدوای جینۆسایدکەرانی ئەرمەندا دەگەرا و بەتایبەتیش تەلعەت کە لەوێبوو، پاش دۆزینەوەی مالّەکەی و لە رۆژی ٢١/ئاداری ١٩٢١ گەشتە تەلعەت و دەلّێت: بەناوی خۆی بانگمکرد و کاتێ ئاوڕیلێدامەوە و پێموت: (گۆڕهەلّکەنی پیس دواساتی تەمەنت هاتووە) هەرلەوێدا تیرۆریکرد و تۆلّەی مەعنەوی خۆی کردەوە و دوابەدوای ئەوە خۆی تەسلیمی دادگاکرد و دواتر دادگای لەسەرکرا و لە داگا پرسیار لە تەهلیریان کرا کە بکوژی تەلعەت بوو: ئایا ئەوانەی ئەرمەنیان کوشت و تەقەیانلێکردن کورد بوون؟ ئەویش دەلّێت: نەخێر، پاشان لێیدەپرسن: جلەکانیان کوردی بوو؟ پێیاندەلّێت: نەخێر، لەڕاستیدا ئەمەش ئەوە دەردەخات کە دادگا ویستوییەتی بەهەرشێوەیەکبێت مەسەلەکە و کۆمەلّکوژییەکە لەسەر کورد ئیسپاتبکات، بەلاّم وەلاّمدانەوەکەی تەهلیریان بەنەخێر بەلّگەیەکی باشە لەبێتاواندەرچوونی کورد لەو مەسەلەیەدا و بێبەرییبوونی کورد لەو کۆمەلّکوژیدا.

سەرەڕای ئەوانەش یەکێکیتر لە جەلادەکانی کۆمەلّکوژی ئەرمەن کە دەستی تۆلّەی پێگەشت (سەعید حیلمی پاشا) بوو ئەمە یەکێکبوو لە هاوکارە نزیکەکانی تەلعەت پاشا کە هەلّهاتبوو بۆ ئیتالیا و لە رۆما دەژیا ئەمە بەدەست لاوێکی راکردووی ئەرمەنی بەناوی (ئەرشاویز شیرگیان) تیرۆرکرا کە لەتورکیاوە رۆشت بۆ ئیتالیا و بەدوای ئەوداگەڕا و لە رۆژی ٦ی کانونی یەکەمی ١٩٢١ دۆزییەوە تیرۆریکرد.

جگەلەوەش شۆڕشگێرانی ئەرمەن حوکمی کوشتنیان بۆ (د. بەهائەدین پاشا) دەرکرد کە رۆلّێکی گەورەی هەبوو لە کوشتاری ئەرمەنەکاندا ئەوەبوو لە سالّی ١٩٢٢ لە ئیربیلی بەهەمانشێوەی ئەوانیش تیرۆرکرا، دواتریش کەسێکیتر کە تۆلّەیانلێکردەوە و لەناویانبرد ئەویش (ئەنوەر پاشا)ی وەزیری جەنگ و پێشەوای خەیالّی تورکیای مەزن کە یەکێکبوو لەو نەژادپەرستانەی تورکیای لاو بۆ دروستکردنی تورکیای مەزن لەگەلّ کۆمەلێك سەرباز سەردانی تورکستانی کرد تا ئەو ناوچەییەش بکاتە بەشێك لە قەلّەمڕەوی عوسمانی و (تورکیای مەزن)، بەلاّم خۆشبەختانە پێش ئەوەی نەخشە خەیالّیەکەی جێبەجێبکات دەستی تۆلّە بیەخەیگرت و دوو ئەرمەنی قارەمان بە ناوەکانی (پەترۆس تربۆغوسیان و ئەرتاش گورگیان) تیرۆریانکرد و رەوانەی دۆزەخی هەتاهەتاییان کرد، یەکێکیتر لەو کەسانەی کە دەستی تۆلّەی پێگەشت (بەهبودخان جوانشیر)ی وەزیری ناوخۆی ئازەربایجان بوو کە لە کۆمەلّکوژی ئەرمەندا دەستی بالاّی هەبوو لە ١٩ی تەمموزی ١٩٣١ لە ئەستەمبولّ بەدەستی (میساك تورلاکیان) تیرۆرکرا، کاری ئەرمەنکوژی تەلعەت و ئەنوەر و جەمال پاشا وای لە کەسایەتیەکی وەك (لۆردبرایس) کرد کە بە (پیاوکوژی بێشەرم) ناویانبنات، بۆیە حەقی خۆی بوو ئەمانە تۆلّەیانلێبکرێتەوە، چونکە ئەوانە بەلەناوبردنی ئەرمەن و سڕینەوەیان قەناعەتیاندەکرد و دلّیان ئاویدەخواردەوە.

لەڕاستیدا کوژرانی ئەو ناپاك و خوێنڕێژ و رەگەزپەرستانە بەدەستی ئەرمەنەکان هەرچەندە ناکاتە تۆلّەسەندنەوەی تەواوی ئەرمەنەکان و سارێژبوونی برینەکانیان، بەلاّم ئەوەی گرنگە ئەوان بەدەستی خۆیان تۆلّەیان لە ناحەز و خوێنڕێژانیان کردەوە و شەرمەزاری نێومێژوو و کۆمەلّگەلی مرۆڤایەتیان کردن و رەوانەی نێوزبلّدانی مێژوویان کردن، ئەمەش هەرهیچ نەبێت تارادەیەکی باش خەمەکانی سەرشانی ئەرمەنی سووك و سارێژکرد، ئەمەش چارەنووسی هەموو مرۆڤێکی دیکتاتۆر زالّمی نێومێژووی مرۆڤایەتییە و وەك وتراوە پەتی زولّم و ستەم

لەئەستوریدا دەبچڕێت، لەڕاستیدا ئەمە وەلاّمی ئەو هەموو پرسیارانەییە کە دەلێن کێ بەرپرسیارە لە کوشتاری ئەرمەن؟ یان کوردەکان بەرپرسیاربوون لە کوشتاری ئەرمەن؟ بەلاّم ئەی بۆچی ئەرمەنەکان و پارتی داشناکی ئەرمەنی تۆلّەیان لە کورد نەکردەوە و چەند ناودارێکی کوردیان لەناونەبرد و تیرۆریاننەکرد وەك ئەنوەر و تەلعەت و جەمال..؟!!! بەلاّم لەڕاستیدا تیری ژەهراوی ئەمجۆرە پرسیارانەی ئەوان هەرگیز ناتوانێت پەیوەندی دۆستانەی کورد و ئەرمەن و خۆری ڕووناکی نێوانیان کۆتاییپێبهێنێت، لەهەمووشی گرنگتر دوابەدوای جەنگی یەکەم قۆناغێکی نوێتر لە پەیوەندی کورد و ئەرمەن دەستپێدەکات، ئەمەش خالێکی زۆر گرنگ و پڕبایەخە چونکە ئەگەر کورد دەستی هەبواییە لە کوشتاری ئەرمەن ئەوا ئەرمەنەکان هەرگیز ئامادەنەدەبوون پەیمانی دۆستایەتییان لەگەلّ ببەستن و دەستی برایەتی بخەنەنێودەستی کورد و درێژە بە کاروانی پەیوەندییەکانیان بدەن.

ڕۆلّی شەریف پاشا لە بەهێزکردنەوەی پەیوەندی کورد و ئەرمەن و سیاسەتی تورکیای کەمالی لەهەمبەر ئەو دوو نەتەوەیە دوابەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و سەرکەوتنی هاوپەیمانان و کۆتاییهاتنی جەنگ بەپێی ئاگربەستی (مۆدرۆس) لە ڕۆژی ١٩١٩/١٠/٣٠ هاوپەیمانان بەلێنیان بەهەموو گەلە ژێردەستەکانی دەولّەتی عوسمانی دا کە ڕزگاریاندەکەن و داهاتوویان دیاریدەکەن و لە زولّموزۆری عوسمانییەکان ڕزگاریاندەکەن، هەرلەوسەروبەندەدا (ولّسن)ی سەرۆکی ئەمریکا ڕایگەیاند کە پێویستە هەموو گەلانی ژێردەستەی دەولّەتی عوسمانی (مافی چارەی خۆنووسین) وەرگرن، لەناو ئەوانەشدا هەردوو گەلی کورد و ئەرمەنی ستەمدیدەی دەستی تورك، ئەم گەلانەش زۆر دلّخۆشبوون بەو بڕیارە، بۆیە بۆ باشترکردنی ئەو بارودۆخە گەشتن بەمەبەستەکانی خۆیان.. بڕیاردرا بەبەستنی کۆنگرەیەك ئەوەبوو لە ڕۆژی ١٩١٩/١/١٨ کۆنگرەی (ئاشتی) لە پاریس بەسترا ئەوەش بەسەرپەرشتی ولاّتانی سەرکەوتوو لەسەروو هەمووشیانەوە ( ولّسنی) سەرۆکی ئەمریکا و (کلیمەنسۆ)ی سەرۆکوەزیرانی فەرەنسا و (لویدجۆرج)ی سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا، سەرەڕای ئەوەش نزیکەی (١٧) وەفد بەشداریانتێداکرد، ئەوەی گرنگە لێرەدا بوترێ ئەوەیە لەم کۆنگرەیەدا هێندە بەرژەوەندی زلهێزەکان ڕەچاوکرا هێندە گرنگی بەلایەنەکانیتر نەدرا..!!

لەو سەروەختەشدا گەلانی ژێردەستەی ناوچەکەش بەهیوای بەدەستهێنانی ئازادی و مافی چارەی خۆنووسین و پێکهێنانی دەولّەتی سەربەخۆبوون، بۆیە شەڕی یەکەمی جیهانی و شکستی دەولّەتی عوسمانی هەلێکی گونجاوی بۆ ڕزگاربوونی نەتەوە ژێردەستەکانی ئەو ئیمپراتۆرە هێنایەئاراوە لەسەروو هەمووشیانەوە هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەنی ژێردەستە کە دروستبوونی دەولّەت ئاواتی هەمیشەی و لەمێژینەیان بوو، لەو کۆنگرەیەدا دوو شاندی ئەرمەنی بەشداربوون کە یەکێکیان بە سەرۆکایەتی (ئاوادیس ئاوهانیان)ی نوێنەری پارتی تاشناق و کۆماری ئەرمەنی بوو کە دوای کشانەوەی ڕوسیا سەربەخۆیی ڕاگەیاندبوو، شاندی دووەمیان بە سەرۆکایەتی (بوغس نۆبارپاشا)



**بوغزنۆبار پاشا**
**نوێنەری ئەرمەن لە کۆنگرەی ئاشتی**



**شەریف پاشا**
**نوێنەری کورد لە کۆنگرەی ئاشتی**

بوو نوێنەرایەتی ئەرمینیای رۆژئاوای دەکرد واتە ئەو پارچە ئەرمینیایەی دەکەوتەنێو خاکی تورکیاوە.

ئەوەبوو لەوبارودۆخەدا رۆشنبیران و خاوەن راکان و پیاوماقولاّن و چەندین کۆمەلّەی کوردی هەولّی بەستنی ئەو کۆنگرەیان بیست (شەریف پاشا)یان وەك نوێنەری خۆیان هەلّبژارد بۆ بەشداریکردن و بەدەستهێنانی مافە رەواکانی کورد، ئەوەی شایانی هەلّوەستەلەسەرکردنە لەوسەردەمەدا کورد دەولّەتێکی نەبوو تا بە رەسمی بەشدارییکات لەو کۆنگرەیەدا، لەوکاتەشدا شەریف پاشا لە پاریس بوو داوایلێکرا بکەوێتە گفتوگۆ لەگەلّ بەرپرسانی کۆنگرە بۆ سەندنەوەی مافی کورد و بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەلّ ئەرمەن، ئەوەبوو شەریف پاشا وەك سیاستمەدارێك خۆی گەیاندە کۆمەلّەکانی ئەرمەن بۆ گفتوگۆ لەگەلّیاندا بۆ لابردنی ئەو ناکۆکییەی کە ناحەزان بۆیان هەلّواسیبوون، لەراستیدا بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ئاریشە دەسکردەکانی دوژمن، پێشووتر شەریف پاشا لەگەلّ (بوغز نۆبار پاشا)ی سەرۆکی وەفدی ئەرمەن لە کانونی یەکەمی سالّی ١٩١٨ لە پاریس پەیمانێکیان مۆرکرد ئەمەش زیاتر بۆئەوەبوو تا رێگەبگرن لەدەستتێوەردانی لایەنەکانیتر لە کێشە بەدرۆهەلّواسراوەکان و زیاتر زەقنەکردنەوەی ئەو کێشانە.

لەلایەکیتر بۆ لەناوبردنی ئەو هەولّەی درابوو بۆ دروستکردنی دەولّەتی ئەرمەنی لەسەر خاکی کوردستان بە هاوکاری زلهێزەکان و باسیش لەوەکرابوو کە تورکەکان رۆلّی خراپیان بینیبوو لە ئالۆزکردنی پەیوەندییەکانی کورد و ئەرمەن و قەلاّچۆکردن و لەناوبردنی هەریەك لە کورد و ئەرمەن، بۆیە هەرلەوسەردەمەشدا سەرۆکی وەفدی ئەرمەن ( بوغز نۆبار پاشا) لە مانگی تەمموزی سالّی ١٩١٨ ئەوەی راگەیاندبوو کە (سولّتان عەبدولحەمید)و تورك بەرپرسیارن لە کوشتوبڕەکانی ئەرمەن ئەمە لەلایەك و لەلایەکیتریش لە کۆنگرەی ئاشتیدا دیسان تورکەکان هەولّی ئەوەیاندەدا نێوانی کورد و ئەرمەن تێکبدەنەوە و بیاندەنبەگژیەکدا و لەهەمانکاتدا ئەوان لەسەر ئەو سیاسەتەی خۆیان بەردەوامبوون،

لەراستیدا خەباتی سیاسی و دیبلۆماسی شەریف پاشا لەو قۆناغەدا زۆر قورس و گرانبوو چونکە کەش و سیاسەت و بەرژەوەندی زلهێزەکانی ئەو سەردەم لەگەلّ خواستە نەتەوەییەکانی کورد پێکنەدەهاتەوە، بەلاّم تاڕادەیەك بۆ ئەرمەن باشتربوو بۆ دامەزاندنی دەولّەتی ئەرمەنی چونکە تاڕادەیەك ولاّتانی رۆژئاوا لەگەلّیانبوون، تەنانەت لەو سەردەمەشدا ئەرمەنەکان بەهاندان و سیاسەتی زلهێزەکان داوای دولّەتی خۆیان دەکرد ئەوەش زیاتر ناوچە کوردییەکانی (ئەرزەرۆم و وان و خەرپوت و ئازەربایجان و دیاربەکر)ی دەگرتەوە، بەلاّم ئەمجۆرە سیاسەتە و ئەمشێوازە داواکارییە کورد و نوێنەرەکەی دلّگرانکردبوو، بۆیە هەولّێکی زۆردرا ئەو داوایە لە مێشکی ئەرمەنەکان بسڕنەوە، چونکە ئەوە لە بەرژەوەندی کورد و ئەرمەندا نییە ئەمە فیتی دوژمنی هەردوولایانە.

ئەوەش لە ئەستۆی کەسێکی بەتوانای وەك شەریف پاشا بوو تاهەولّبدات ئەو پلانە گلاّوە دەسکردە لە مێشکی ئەرمەن دەرکات، هەربۆیە لە رۆژی ١٩١٩/١٢/٢٠ رێکەتنێکی دووقۆلّی لەنێوان نوێنەری کورد شەریف پاشا و نوێنەری ئەرمەن بوغز نۆبار پاشا مۆرکرا و جێگری سەرۆککۆماری ئەرمینیا (د. هـ. ئۆهانجانیان) وەك چاودێر لەو دانیشتنەدا بەشداربوو، لەواقیعدا ئەمە یەکەمجاربوو کە لەنێوان هەردوو میللەتی کورد و ئەرمەن بەلّگەنامەیەکی هاوپەیمانی ئیمزاکرا، ئەوەشی گرنگبوو لەم یاداشتەدا هەردوو شاندەکە بە سەرۆکی کۆنگرەیان

ڕاگەیاندبوو کە لەنێوان کورد و ئەرمەندا هیچجۆرە کێشە و گیروگرفت و ئاریشەیەك لەئارادانییە و ئەوەشی بمێنێتەوە سەبارەت بەدیاریکردنی سنوورەکانی نێوان کوردستان و ئەرمینیا دواتر بۆ خۆیان چارەسەریدەکەن، لەمەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە هەردوولا هەستیان بە مەترسی ناحەزان و دوژمنانیان کردبوو کە دەستبخەنە کارەکانیان و ئاژاوەیەکیان بۆ دروستکەن.

ئەم پەیمانەش بۆئەوەبوو کە کێشە لەنێوان کورد و ئەرمەن دروستنەبێت و شەریف پاشا لەگەڵ نوێنەری ئەرمەنەکان کۆبوویەوە و پاش ئەم کۆبوونەوەیەش نوێنەری ئەرمەنەکان لە دروستکردنی ئەو دەوڵەتە پەشیمانبوویەوە و داواکارییەکی هاوبەشیان لەگەڵ کورد بەرزکردەوە بۆ کۆنگرەی ئاشتی، لەڕاستیدا ئەوە بوارێکی گرنگی بۆ دۆستایەتی و هاوکاری نێوان کورد و ئەرمەن دروستکرد، ئەوەی گرنگە بوترێ ئەوەیە ئەو بەیانەی ئەو دوو نوێنەرە هاوبەشە ئاراستەی کۆنگرەیان کرد دەنگوسەدایەکی باشی لەناوەوەی کوردستان و ئەرمینیا و لەناو کۆنگرە و لەسەر کاربەدەستان و حکومەتی تورکیاش هەبوو و دەسەڵاتدارانی تورك پێیحەپەسان تێیداهاتبوو (ئێمە بەیەکەوە بەرێکەوتنێکی تەواوەوە داوا لە کۆنگرەی ئاشتی دەکەین بەپێی بنەماکانی نەتەوایەتی مافی سەربەخۆیی بە ئەرمینیای یەکگرتوو و کوردستانێکی سەربەخۆ بدەن)، حەپەسانەکەی تورکیش بۆ ئەوەبوو چونکە لەمێژبوو زۆر بەخراپی و بەشێوەیەکی هەڵواسراو باس لە خراپی پەیوەندی ئەو دوونەتەوە هاوستەملێکراوە کرابوو.

هەرگیز چاوەڕوانی شتێکی لەوجۆرەنەبوون وابەئاسانی کورد و ئەرمەن پێکبێنەوە پێکەوە بەهاوبەشی داوای مافە ڕەواکانی خۆیان بکەن، لەگەڵ ئەوەی شەریف پاشا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە چارەسەرکردنی کێشە هەڵواسراوەکان و بوختانە ناڕەواکانی نێوان ئەو دوو نەتەوەیە، بەڵام دیسان نەهامەتی کورد دەستیپێکرد و ئەوانەی ئەم کۆنگرەیەیان بەڕێوەدەبرد دانیاننەنا بەوەی کە شەریف پاشا نوێنەری کوردە و ئەو یاداشتانەی ئەو دەیگەیاندە کۆنگرە کاریگەرییەکی وایاننەبوو، چونکە ئەمەش بەهۆی سیاسەتی ئەوان لەلایەك و لەلایەکیتریش پاڵپشتییەکی نێودەوڵەتی بەهێزی نەبوو ئەمانە و چەندان فاکتەریتر بوویە هۆی ئەوەی شەریف پاشا لە ڕۆژی ١٩٢٠/٤/٢٧ دەست لە کاری نوێنەری بکێشێتەوە، بەڵام شۆڕەسواری کورد جارێکیتر ویژدانی قبوڵێنەکرد لەپێناو مافە ڕەواکانی میللەتەکەی تێنەکۆشێ و ئەو ئەرکە لەئەستۆنەگرێ.. بۆیە دیسان لە ڕۆژی ١٩٢٠/٥/١ نوێنەری کورد جەنەڕاڵ شەریف پاشا سکاڵانامەیەکی بەناوی کورد ئاڕاستەی کۆنگرەی ئاشتی کرد و هەمیشە لە خەمی نەتەوەکی بوو، بەڵام بارودۆخ بەوشێوەیە مایەوە تابەستنی پەیماننامەی سیڤەر. ئەوەبوو لەوسەرووەختەشدا هێزە سەرکەوتووەکانی شەڕ پەیماننامەی سیڤەریان ئیمزاکرد، ئەمەش لە ڕۆژی ١٩٢٠/٨/١٠ لەلایەن چواردە دەوڵەتەوە بەسترا و لە ١٣ بەش و ٤٣٣ مادەشی لە خۆدەگرت، لەوێدا کێشەی کورد پانتاییەکی باشی وەرگرتبوو، ئەوەی گرنگە لەم پەیمانەشدا نوێنەرانی کورد و ئەرمەن بەشداریانکرد و تاڕادەیەك گوێ لەم نوێنەرانە گیرابوو، لەواقیعیدا ئەم پەیمانە تەنیا مەرەکەبی سەرکاغەز بوو، بەڵام تاڕادەیەك ڕێژەی بەرژەوەندی پێکهاتە ئەتنیکییەکان ڕەچاوکرابوو، چەند مادەیەکی سیڤەر بۆ نەتەوەکانی کورد و ئەرمەن تەرخانکرابوو، بەڵام بەتەواوی خواست و ئاوات و بەرژەوەندی ئەو دوو نەتەوەیەی نەهێنایەدی، چونکە وەك دەڵێن: (پەیماننامەی سیڤەر بەمردوویی لەدایکبوو)، بەڵام لە چوارچێوەی ئەم پەیمانە مردووەدا دوو دەوڵەتی نیمچەسەربەخۆی کورد و ئەرمەنی دیاریکرابوو.

ئەوەی تایبەتبوو بە کورد لە مادەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) پێك هاتبوو، ئەوەشی تایبەتبوو بە نەتەوەی ئەرمەن لە مادەکانی (٩٣,٩٢,٩١,٩٠,٨٩,٨٨) پێکهاتبوو، ناکرێت لێرەدا بەوردی ناوەڕۆکی مادەکان بخرێتەڕوو، بەڵام دەکرێت بڵێم ئەم مادانە بەشێوەیەکی مردوو لەنێو پەیمانە مردووەکەدا ناوهێنرابوون و وەك لاشەیەکی مردوو خرابوونەڕوو، لەوەشدا ئەتاتورك ڕۆڵێکی بەرچاو و دیاری هەبوو، چونکە ئەوان دژی هەموو ئامانج و ئاواتێکی ئەم دوو نەتەوەیە بوون، بەمەش سیڤەر نەیتوانی ئومێدەکانی گەلانی ژێردەستی عوسمانییەکان بهێنێتەدی و لە زوڵم و ستەم ڕزگاریانبکات و ئاشنایانبکات بە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان.

بەوشێوەیە سیاسەت و هەوڵی تورکیای فاشست بەردەوامبوو لە سیاسەتی خراپی خۆی بەرامبەر هەریەك لە کورد و ئەرمەن و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی نەتەوەی و دژایەتیکردنی کەلتور و فەرهەنگ و زمان و مێژووی ئەم دوو نەتەوەیە و درستکردنی کۆسپ و لەمپەر لەڕێگەی سەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەر.. بۆیە سەرئەنجام بەیەکجاری پەیمانی سیڤەریان خستەنێو ئەرشیفی مێژوو و خەون ئاواتەکانی ئەو دوو نەتەوە ستەملێکراوەیان لەگۆڕنا، دواتریش پەیمانی (لۆزان)یان لە ٢٢/تەمموز١٩٢٣ بە دوو قۆناغ هێنایە جێگەی، ئەمەش بوویەهۆی بەهێزبوون و داڕشتنی بناغەی دەوڵەتی تورکی کەمالی و دواتر کۆتاییهێنان بە خەلافەتی عوسمانی، بەمشێوەیە دەوڵەتی تورکی عەلمانی کردە ئەمری واقیع و ئەرمینیای ڕۆژئاوای لەسەر جوگرافیا سڕییەوە و لەلایەکیتر لەسەر جەستەی ماند و شەکەتی کورد پایەکانی خۆیان بەهێزکرد، تەنانەت کەمالییە نەتەوەپەرستەکان و شۆڤێنییەکان هەر لە سەرەتای گرتنەدەستی دەسەلاتی سیاسی و سەربازی خۆیان، یەکەم ئامانجیان هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی سیڤەر بوو و لەمەشدا سەرکەوتووبوون و پەیماننامەی سیڤەریان بەمردوویی خستەنێوگۆڕی هەتاهەتایی.

سەرەڕای ئەوەش تورکیای کەمالی هەرگیز ڕازینەبوو دان بە بنەمای نەتەوایەتی ئەو دوو نەتەوەدا بنێت، بەلاّم خۆشبەختانە دوای ئەو کۆنگرەیە خەباتی سیاسی و سەربازی کورد و ئەرمەن بەردەوامبوو زۆرجاریش هاوکاری و هەماهەنگی لەنێوانیان دروستدەبوو.

لەسەروو ئەو سیاسەتە خراپانەی ئەتاتورك لەهەمبەر کورد و ئەرمەن پەیرەویدەکرد هێشتا تروسکایی هاوسۆزی و هاوکاری کورد و ئەرمەن هەربەردەوامبوو،تەنانەت لە سەردەمی کۆماری تورکیادا قۆناغێکیتری پەیوەندی دۆستانە بەشێوەیەکی ڕەسمیترو توندوتۆڵتر هاتەکایەوە، ئەوەبوو کە شۆڕشەکەی (شێخ سەعید) سەریهەڵدا دژی سیاسەتی تورك و کەمالیزم و هەڵوێستە خراپەکەیان لەو شۆڕشەشدا ئەرمەنەکان دیسانەوە هاوکاری کورد و شۆڕشەکەیان کردەوە بەمەش دیسان لاپەڕەیەکی پڕشانازیان بۆخۆیان تۆمارکرد، بەلاّم سەرئەنجام کەمالییەکان ئەو شۆڕشەیان سەرکوتکرد و کەوتنە ویزەی کورد و ئەرمەن و ڕاوەدوونانیان، ئەوەی گرنگە لێرەدا بۆ دیرۆك بوترێ و جێگەی شانازیمان بێت ئەو هەوڵ و ماندووبوونەی کەسایەتی کورد شەریف پاشا بوو کە لەناو نازونیعمەتی خۆیدا کوردی لەیادنەکرد و بەتەنگ کێشەی کوردەوە بوو لەوپێناوەشدا ماندووبوونی زۆری چەشت، بۆیە نابێت ئێمەی کورد ئەو کەسایەتییە کوردپەروەرەمان لەیادبچێت، ئەوەی گرنگە لێرەوە لەم قۆناغە بەدواوە سەردەمێکیتر لە هاوکاری و هاوکۆمەکی و هاوسۆزی لەنێوان کورد و ئەرمەن دەستپێدەکاتەوە، ئەمەش لە سەردەمی کۆمەڵەی (خۆیبوون) کە دەچێتە چوارچێوەی پەیمانێکی دۆستایەتی و ستراتیژی.

**دوستایەتی و پەیوەندی ستراتیژی کورد و ئەرمەن**

**لە کۆمەڵەی خۆیبووندا**

ئەگەر پەیوەندییەکانی پێشووی نێوان کورد و ئەرمەن پەیوەندییەکی خۆرسك بووبن یاخود سەرئەنجامی دۆخێکی تایبەتی بووبێت ئەوا پەیوەندییەکانیان لە سەرەتای سەدەی بیستەم و لەگەڵ گەلاڵەبوونی بزووتنەوەی سیاسی کوردی و بزووتنەوەی سیاسی ئەرمەنی کە رۆژ لەدوای رۆژ بەرەوپێشچوونی بەخۆیەوە دەبینی.. بۆیە پەیوەندییەکی سیاسی بتەو و ستراتیژی لەنێوان پارت و رێکخراوەکانی کورد و ئەرمەنی، لەنێو ئەم پەیوەندییە دیارانەدا پەیوەندییە دۆستانەکەی نێوان پارتی تاشناقستیۆن و پارتی یەکێتی شۆڕشگێڕی ئەرمەنی و پارتی خۆیبوونی کوردی بوو کە لەدوای شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران دروستبوزبوو.

دوابەدوای سەرکوتکردنی شۆڕشی (شێخ سەعیدی پیران) لە ساڵی ١٩٢٥و لەسێدارەدانیان لە رۆژی ٣٠/ حوزەیرانی ١٩٢٥، لە پایزی هەمانساڵدا لە خارپێت (٤٠٠) نیشتیمانپەروەری کوردیان لەسێدارەدا و دواتریش لە ناوچەیەکی سەربە بینگولیش (١٠٠) هاولاتیدیکەی کوردیان لەسێدارەدا و هەڵیانواسین، تەنانەت لەو رۆژگارەشدا رۆژنامەی (وەقت)ی تورکی دەنووسێت: (چیتر پرسی کورد لەئارادانەماوە)، جگەلەوەش تورکە کەمالییەکان بەشێوازێکی زۆر توندوتیژ و دڕندانە لە دژی تاکەکانی کورد و ئەرمەن هەڵسوکەوتیاندەکرد هەر لەوسەروبەندەدا شێخ سەعید پێشبینی ئەوەی دەکرد تورکەکان هەوڵی بلاوبوونەوەی نائارامی و پشێوی دەدەن بۆئەوەی ناکۆکی بکەوێتە نێوان کورد و ئەرمەنەکان، بەلام خۆشبەختانە پێچەوانەی خواستی تورکەکان ئەرمەنەکان هاوکاری شێخیان دەکرد بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ، تەنانەت لەکاتی شۆڕشەکەی شێخدا باشی پەیوەندی کورد و ئەرمەن بوون بە شاهید بۆ ئەورۆژگارە، ئەرمەنەکان لەو راپەڕپەڕینەدا بەشداریانکرد، بۆیە هەر لەسەرەتاوە شێخ سەعید فەرمانی بۆ هەموو لایەك دەرکرد کە بەهیچشێوەیەك دەستدرێژی نەکەنەسەر ماڵ و مۆڵکی ئەرمەنەکان، چونکە شێخ هەستی بەوەکردبوو کە تورکەکان نیازیانە درزێك بخەنە دۆستایەتی کورد و ئەرمەنەوە، بۆئەو مەبەسە ئاگاداری بەهەموو کوردێکدا کە (هەرکەسێك دەستدرێژی بکاتەسەر ئەرمەنەکان رووبەرووی توندترین سزا دەبێتەوە).. ئەم فەرمانەی شێخ دەنگوسەدایەکی باشی دایەوە لەنێوەندە کوردییەکاندا، بەلام تورکەکان کەوتنە بلاوکردنەوە ئەو سیاسەتەی خۆیان بۆ شێواندنی راستییەکان و دژایەتی کورد و ئەرمەن.

بەهۆی ئەو سیاسەتە رەگەزپەرستییەی تورکەوە ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەن کۆچیانکرد و خاکی خۆیان بەجێهێشت، تەنانەت ژمارەی ئەو ئەرمەنە کۆچکردووانەی تورکیا لەنێوان ساڵانی (١٩٢١-١٩٢٥) گەشتە (٥٥٠٠٠) هەزار کەس، بەهۆی ئەم سیاسەتە خراپەی تورکە کەمالییەکان هەریەك لە کورد و ئەرمەن ناچاربوون رێگەی هەڵهاتن بگرنەبەر، ئەوەبوو بەشێك لە روناکبیران و پیاوانی سیاسی کورد لە تورکیا هەڵهاتن و روویانکردە ناوچە قەڵەمڕەوییەکانی فەرەنسا (سوریا و لوبنان)و قەڵەمرەوی ئینگلیز (عێراق) لەوێدا خۆیان گرتەوە، بەهەمانشێوەش ئەرمەنەکان لە ترسی گیانی خۆیان هەڵهاتبوونە ئەو نێوچانە، لەوکاتەدا ئەرمەنە کۆچکردووەکان و کوردەکان لە سوریا تازە پێکەوەدەژیان لە چوارچێوەی پەیوەندییەکی گەرموگوڕدا و نزیکبوونەوەیەکی باشتر لەنێوانیان هاتەئاراوە.

دەمەوێ بۆ دیرۆك ئەوە بڵێم ئەو سیاسەتە خراپەی تورکی فاشیست لەبەرامبەر هەریەك لە کورد و ئەرمەن پیادەیدەکرد سەرلەنوێ پەیوەندی ئەو دوو نەتەوەیەی نوێدەکردەوە و گیانی برایەتی بەهێزدەکردن و وایلێکردن سەرلەنوێ بەدوای پەیوەندییەکی باشتر و بەهێزتردا بگەڕێن.

لەڕاستیدا هەڵهاتنی هەریەك لە کورد و ئەرمەن بۆ ئەوناوچانە بوارێکی باشتری بەو دوو نەتەوەیە دا تا دەروازەیەکی نوێتر و باشتر لە پەیوەندی لەدەرەوەی خاك و نیشتیمانی خۆیان بکەنەوە،ئەوەبوو (ئەسکەندەر بەگ) پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەرمەن پێشخست لە سوریا و لوبنان و سەرلەنوێ پەیوەندییەکی باشتری رێکخستەوە، لەوسەروبەندەدا بەهۆی سیاسەتی مەغۆلئاسای تورکەوە نیشتیمانپەروەرانی کورد خۆیان ئامادەکرد بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی بەهێز، بۆیە بەنهێنی و ئاشکرا کۆڕ و کوبوونەوەیان رێکدەخست و سەرئەنجام گەشتنە ئەو باوەڕەی کە هەنگاوی یەکەمیان بنیاتنانی پارتێکی سەرەکی سیاسی کوردستانی بێت، ئەوەیان بۆ روونبوویەوە ئەگەر بەدەستوبرد شتێك نەکەن ئەوا تورکە فاشییەکان کوردیش بەدەردی ئەرمەنەکان دەبەن، لەمکارەشدا رۆشنبیرێکی وەك (مەمدوح سەلیم) رۆڵێکی سەرەکی دەگێڕا لەم نزیکبوونەوەیەدا چونکە دۆستایەتی و پەیوەندییەکی باش و فراوانی هەبوو لەگەڵ کەسایەتییەکانی ئەرمەندا پارتی داشناکی ئەرمەنی بە هەوڵ و ماندووبوونی ئەم دەزانن و دەستخۆشی لێدەکەن و لێرەوە گفتوگۆ و دانیشتن دەستپێکرد، دوای کۆبوونەوەی سەرانی کۆمەڵە کوردییەکان بڕیاریاندا کۆنگرەیەکی گشتی ببەسترێ بەناوی (کۆنگرەی نەتەوایەتی کوردی) بەهۆی ئەم پەیوەندییەی نێوان مەمدوح سەلیم و پارتی داشناکەوە لە لوبنان توانرا کۆنگرەیەکی نەتەوایەتی کوردی لە ماڵی (واهان پاپازیان) لە شاری بحەمدون لە لوبنان لە ساڵی ١٩٢٧ ببەسترێ دوای گفتۆگۆ و دانیشتن توانرا بڕیار لەسەر دامەزراندی کۆمەڵەی خۆیبوون بدەن.

ئەوەبوو لە رۆژی ١٩٢٧/١٠/٥ کۆنگرەی دامەزراندن دەستپێکرد لە هاوینەهەواری (بحەمدون) لە لوبنان، لەم کۆنگرەییەدا ژمارەیەك لە ئەفسەر و کەسایەتی ناودار و هەندێك سەرۆکخێڵ و عەشیرەت بەتایبەت ئاوارەبووەکان لەکۆنگرەیەدا بەشداربوون، لەوەش گرنگتر سەرانی چوار کۆمەڵەی کوردی ئامادەبوون هەموویان بڕیاردەدەن خۆیان هەڵوەشێننەوە و لە چوارچێوەی یەك رێکخراودا واتە (خۆیبوون) یەکبگرنەوە. سەرئەنجام کۆمەڵەی خۆیبوون دامەزرا و خۆیبوون لە یەکەم کۆنگرەی خۆیدا چەند بڕیارێکی گرنگیدا کە تێیدا ئاماژە بە گەلی ئەرمەن دەکات ئەو بڕیارەش لە شەش مادە پێکهاتبوو و لە مادەی چوارەمدا دان بەهەموو مافەکانی ئەرمەندا دەنێت دەڵێت: (پەسەندکردنی هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بەئەرمەنەوە هەیە لەڕووی ئازادی و بیروباوەڕ و پەسەندکردنی جیاوازی و تێپەڕکردنی ناکۆکی تایفی و پتەوکردنی دۆستایەتیان) ئەمەش خاڵێکی گرنگ و پڕبایەخە بۆ ئەرمەنەکان، بەمجۆرە سەرلەبەری کونگرەکە گیانی برایەتی کورد و ئەرمەن لەخۆدەگرێت، لەڕاستیدا دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە لەو سەردەمەدا بەوەرچەرخانێکی دیار لە مێژووی رێکخراوە سیاسییەکانی کورد ئەژماردەکرێت و بایەخێکی گرنگ و دیاری هەبوو لە مێژووی کورددا، لەو واقیعەدا سەرکردایەتی خۆیبوون هەوڵی ئەوەیدەدا پەیوەندییەکانی کورد وئەرمەن بەهێزبکات و پێشنیاری ئەویکرد کە هەردوو گەلی برای کورد و ئەرمەن ناخۆشی و رووداوە تراژیدییەکانی رابردوو لەیادکەن و لاپەڕەیەکی تازە لە هاوکاری و لەیەکگەشتن لەنێوانیان بکەنەوە.

ئەمەش بوویەهۆی ئەوەی ئەودوو نەتەوەیە ناکۆکییە هەڵواسراوەکانیان لەیادکەن و لەسەر بنەمای نوێ لاپەڕەیەکی پڕشانازی و دۆستایەتی و هاوکاری بکەنەوە، لەوسەروبەندەدا پارتی داشناك هەوڵی ئەوەیدا لەگەڵ کوردەکان خەباتێکی رزگاری هاوبەش دەستپێبکات، لەوسەروبەندەدا پەیوەندییەکی دیار و بەهێز لەنێوان پارتی تاشناکی ئەرمەنی کۆمەڵەی خۆیبوونی کوردی دەنگی هەبوو کە دوای شۆڕشی شێخ سەعید دروستبوو ئەم پەیوەندییە دۆستانەش لە ئەنجامی کۆمەڵێك دانیشتن و بەیەکگەشتنی نوێنەری کورد و ئەرمەن بوو لە کوردستان و تاراوگە هاتەبوون.

لەبەرئەوە لە دامەزراندنی خۆیبووندا ئەوپەڕی هاوکاری و هەماهەنگییان نیشاندا، سەرئەنجام خۆیبوون ئارەزوومەندی ئەوەبوو کە هاوپەیمانییەك لەگەڵ پارتی داشناکی ئەرەمەنی ببەستێت، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٢٧ واتە هەمانساڵ خۆیبوونی تیادامەزرا هەردوو پارتی داشناکی ئەرمەنی و خۆیبوون پرۆتۆکۆلێکی هاوکارییان مۆرکرد، ئەمەش بەئامادەبوونی چەندین کەسایەتی کورد وەك: (عەلی رەزا و مستەفا شاهین بەگ و جەلادەت بەدرخان و حاجۆ ئاغا و ئەمین ئاغا و کەریم رۆستەم و مەمدوح سەلیم و شوکری سەکبان)و ئەرمەنەکانیش بە ئامادەبوونی (واهان پاپازیان) بەشداریانکرد، ئەمەش نوێنەر و بەرپرسی پارتی داشناکی ئەرمەنی بوو، لەم پەیمانەدا ئاماژە بە خواستە هاوبەشەکان و سەربەخۆیی سیاسی و خواستە نەتەوەییەکانیان کرابوو، لەپێناو دابینکردنی بەرژەوەنییەکانی هەردوو گەلی ئاری و و پێوستیشە پەیوەندی برایانە بێتەئاراوە، ئەم پەیمانەی نێوان ئەو دوو نەتەوەیە لە ١٩ مادە پێکهاتبوو، لەمادەکانیشدا زیاتر گوزارشت لە هاوکاری و سەربەخۆیی و یارمەتی هاوبەش دەکات و تەنانەت لە مادەی پێنجەمدا پارتی شۆڕشگێڕی ئەرمەنی بەڵێندەدات کە دامودەزگاکانی خۆی لە ئەمریکا و ئەوروپا بخاتە خزمەت ناساندنی دۆزی کورد و پووچەڵکردنەوەی پڕوپاگەندەی تورکی کەمالی دژی کورد.

لە مادەی شەشەمدا داشناك بەڵێندەدات لەڕووی داراییەوە یارمەتی خۆیبوون بدات و لە مادەی دەیەمدا پارتی ناوبراو بەڵێندەدات لە چالاکییە سەربازییەکاندا لەڕووی ئازووقە و جبەخانەوە هاوکاری خۆیبوون بکات، جگەلەوانەش لە مادەی یانزەیەمدا باسلەوەکراوە ئەگەر هەر ناکۆکییەك لەنێوانیان هاتەئاراوە ئەوادەبێت بە گفتوگۆ چارەسەربکەن و نابێت لە چوارچێوەی ئەو پەیمانە دەرچن، ئەمەش ناوەڕۆکی هەندێك لە مادەکانی پەیمانەکە بوو، لەڕاستیدا دەبێت بۆ مێژوو ئەوە بڵێم پەیمانی نێوان داشناك و خۆیبوون بە وەرچەرخانێکی نوێتر لە پەیوەندییەکانی کورد و ئەرمەن لەقەڵەمدەدرێت، پێشتر لە قۆناغی یەکەمدا پەیوەندی رەسمی یان خۆرسك دەستیپێکرد بەلاّم لە قۆناغی دووەمدا بەهۆی ئەم پەیمانەوە پەیوەندی هەردوو نەتەوە بەئاراستەی پەیمانی ستراتیژیدا رۆشت. سەرەڕای ئەوانەش هەرچەندە خۆیبوون لەلایەن کوردەکانەوە پێکهاتبوو، بەلاّم یارمەتیدانی ئەرمەنەکانیش بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ کوردەکان لە چالاکییەکانی خۆیبووندا ئەمەکارێکی زۆر گرنگ و پڕبایەخبوو، رۆڵێکی زۆرباشیان هەبوو بۆ ئەوەی خۆیبوون بتوانێت پەیوەندی بەزۆر شوێنی جیهانەوە بکات، بەتایبەت لەگەڵ کوردە ئاوارەکانی ئەمریکا و فەرەنسادا، بەمشێوەیە کوردەکان توانیان لەڕێگەی ئەرمەنەکانەوە دەروازەیەکی دیبلۆماسی و گرنگ بەڕووی خۆیاندا بکەنەوە چ لەدەرەوە و چ لەناوەوە، ئەوەبوو (سورەیا بەدرخان) لەگەڵ (گریگۆر ڤارتانیان) کە رابەرێکی چالاکی ئەرمەنی بوو، چوونە ولاّتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەگەڵیدا چووەتە لەندەن و رۆما و ئەسینا و پاریس.

هەرلەورێگەییەشەوە ئەرمەنەکانی ولاٌتەیەکگرتوەکان یارمەتی و پیتاکەکانی خۆیان دەگەیاندە خۆیبوون، سەیر لەوەدابوو کوردەکان کە ژمارەیان لە (١٠-١٥) هەزار کەس دەبوو سالاٌنە پەنجا تا شەست هەزار دۆلاریان کۆدەکردەوە و بەوپەڕی کورتبینییەوە دەیاندایە کەمال ئەتاتورك پێدەچێت ئەمەش بەهۆی نەبوونی وشیاری و هەستی نەتەوەیی بوبێت، بەلاٌم خۆشبەختانە لەڕێگەی سورەیا و ڤارتانیان بە هەولٌ وماندوبوونی ئەوان ئەو کوردانەیان رازی و وشیارکردەوە کە ئەو برە پارەیە پێشکەش بە خۆیبوون بکەن ئەوانیش بەمە رازیبوون، لێرەوە کورد توانی جارێکیدی هاوکاری و دۆستایەتی ئەرمەنی لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەشی هەردوو نەتەوە بەدەستبهێنێتەوە، ئەرمەنەکانیش لە ناوەندی نێوان خۆیبوون و ولاٌتاندا رۆڵێکی دیاری هەبوو تەنانەت رۆژنامەگەری ئەرمەنی هەنگاوێکی گەورەی هاویشت لەولاٌتانی ئەمریکا و ئەوروپادا ئەوترسەیان خستە روو کەلەتورکیا رووبەرووی نەتەوەی کورد دەبێتەوە ئەمەش خاڵێکی جەوهەری و گرنگە کە ئەرمەنەکان سەرەڕای ئیش و ئازار و جەستەی برینداری خۆیان کەچی لەو قۆناغەشدا ئێش و ئازاری کوردیان لەیادنەکردبوو و بەتەنگ خەمی کوردەوە بوون.

هەرلەوروانگەیەشەوە زنار سلوپی دەڵێت: (لەو رۆژانەدا کورد پێویستی زۆری بەهاوکاری و دۆستایەتی ئەرمەن هەبوو چونکە کورد وەك ئەرمەن ئەو توانایەی نەبوو دەنگی بێزاری خۆی و باسی شۆڕش و ئامانجەکانی بگەیەنێتە ولاٌتان)، لەلایەکیتر نابێت ئەوەشمان لەیادبچێت پارتی داشناك کە پشتیوانی لە خۆیبوون دەکرد لەبەرئەوەبوو ئەوان لەتورکیادا نەیاندەتوانی بەتەنیا هیچجۆرە جوولاٌنەوەیەك بکەن و دەیانویست سوود لە راپەڕینی کوردان وەرگرن دژی حکومەتی دیکتاتۆری تورکی کەمالی کە بە دوژمنی سەرسەختی هەردوولایان دەزانین، لەمەوە ئەوەمان بۆ روون‌دەبێتەوە کە هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن لە رۆژە سەخت و دژوارەکانیشدا هەر پێویستیان بەیەکبووە و هاوکاری یەکتریانکردووە.

بەمشێوەیە رێبەرانی تازەی خۆیبوون دێنەسەر ئەوەی کە هەموو بەدحاڵی و ساردوسڕیەکی نێوان ئەم دوو نەتەوەیە بەیەکجارەکی حەلوفەسڵکراوە و شتێکی والەئارادانەماوە شایەنی باسکردنبێت، بێگومان ئەم هاوکاری و پێکەوەژیان و دۆستایەتییە لەنێوان ئەم دوو نەتەوەیە بەشێوەیەکی زیندوو کاریگەر هەتا نسکۆی شۆڕش و تەنانەت دوای شۆڕشیش هەربەردەوامبووە و کاتێك شۆڕش دەستیپێکرد ئەرمەنەکان لەسەر هاوکاری و یارمەتی خۆیان بەردەوامبوون.

بەتایبەتی ئەرمەنەکان لە تەورێز کارخانەیەکی بچووکی چەك و فیشەکی سەربازیان رێکخست و بە بەردەوامی فیشەك و جبەخانەیان دەنارد بۆ فیداکارانی چیای ئاگری و هاوکۆمەکی شۆڕشگێرانیان دەکرد ئەوە بۆ هەموو لایەك روونبوویەوە بە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئاگری ئەوەبوویە خاڵێکی وەرچەرخان لە پەیوەندیەکانی کورد و ئەرمەن جگەلەوەش پارتی داشناکی ئەرمەنی لە شۆڕشی ئاگری بەشداریەکی تەواوی هەبوو تەنانەت (رۆبین پاشا) سەرکردەیەکی تاشناکی بوو لە هەوڵی بەدەستهێنانی پشتیوانی بەریتانا و ئێران بوو بۆ کوردەکانی تورکیا لە هەوڵی پەیداکرنی چەك و تفاقی ئێرانی بوو بۆ کوردەکان.

تەنانەت دوای شکستی شۆڕشی ئاگری لە ساڵی ١٩٣٠داشناك لە کۆنگرەی (سۆسیالیست ئینتەرناسیۆناڵ)دا بەشداربوو کە لە رۆژی ٣٠/ئابی١٩٣٠ لە سویسرا بەڕێوەچوو، لەڕاستیدا بەپێی داواکاری داشناك لەو کۆنگرەیەدا

مادەیەکی کۆنگرەکە باس لە کوشتاری کورد دەکات کە بەدەست تورکەکان کراوە و وتراوە تورکەکان دەیانەوێت ئەوەی بەسەر ئەرمەنیاندا هێناوە بەهەمانشێوە بەسەر کوردیشدا بهێنن.

ئەمەیە هەڵویستی جوامێرانی ئەرمەنی برای کورد کە لەدەرەوەش لە خەم و ئازاری کوردا بوون، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دوای شکستی شۆڕشەکە ئەرمەنەکان بەوەفابوون و پابەندبوون بەو پەیمانەوە و پشتی کوردیان بەرنەدا و درێژەیان بە هاوکاریەکانیان دەدا، هەرئەمەش وای لە کەسایەتیەکی وەك زنار سلوپی کرد بڵێت (بەڕاستی ئەرمەنەکان پابەندبوون بە بەڵێنەکەیان و چی کەوتەئەستۆیان دریغیاننەکرد، تەنانەت لەچاپکراوەکانیشیاندا بەرگرییان لە پرسی کورد دەکرد).

سەرئەنجام پەیماننامەی نێوان ئەم دوو نەتەوەیە گرنگی و بایەخی مێژوویی خۆی هەبوو، گرنگیەکەشی لەوەدابوو کە تائەوسەردەمەش هەندێك ئەرمەنی توندڕەو هەبوون پڕوپاگەندەیان لە دژی کورد دەکرد، بەلاّم دوابەدوای ئەم پەیمانە ئەرمەنەکان بەیەکجاری بڕیاردەدەن کە بەهەمـوو شێوەیەك واز لە پڕوپاگەندەکانیان لە دژی کورد بێنن و بەدەم کێشەی کوردەوەبن.

ئەمە لەلایەك و لەلایەکیتریش ئەم پەیمانە لە ئاستی دەرەوە و ناوەوەش گرنگی مێژووی هەبوو، لەڕووی ناوەوە هەردوولا بەتەواوی کەوتنە هاوکاری یەك و لەپێناو دابینکردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان تێکۆشان و بەتەواوی چارەسەری کێشە و ئاریشە هەڵواسراوەکانیان کرد و لاپەڕەیەکی پرشنگداری پڕشانازیان بۆ هەردوو نەتەوە تۆمارکرد و یەکێتی و دۆستایەتی و پەیمانی نێوانیان پاراست و دژی دوژمنی خۆیان و پڕوپاگەندە هەڵواسراوەکان بوون جگەلەوەش ئەرمەنەکان بەتەواوی وازیان لە خەونی دروستبوونی دوڵەتی گەورەی ئەرمەنی هێنا لەسەر خاکی کوردستان و لەئاستی دەرەوەش رۆڵێکی گرنگی هەبوو بەوەی کە لەڕێگەی ئەرمەنەکانەوە دەنگی کوردەکانیان گەیاندە دەرەوە و سەرنجی کوردان و ئەمەنی دەرەوەیان بۆ کۆمەڵەی خۆیبوون راکێشا و لەڕووی هاوکاری و هاوسۆزییەوە لەدەرەوە بەرگریان لە پرسی کوردەکان دەکرد و لەلایەکیتریش کوردیان بەبێتاوان ناودەبرد و ئەوەشیان راگەیاند کە تورکیای کەمالی دژی کورد و شۆڕشەکەیەتی.

بەمەش ئەم پەیمانە سەلماندی کورد و ئەرمەن دۆستی یەکن و پەیوەندیەکی ستراتیژی لەنێوان ئەو دوو نەتەوەیەدا هێنایەبوون، ئەم پەیمانە هەتا دوای کۆمەڵەی خۆیبوون بەردەوامبوو، هەتا ئەمڕۆش هیچجۆرە کێشە و گیروگرفتێك لەنێوان ئەو دوو نەتەوەیەدا روونەداوە شایەنی باسکردنبێت و لاپەڕەکانی مێژوو شتی وای بۆ تۆمارنەکردووین و شاییەتحاڵی ئەو رووداو و سەردەمەن.

سەرەڕای ئەوەش ئەم پەیمانە رەنگدانەوەیەکی باشی لەسەر دوارۆژی پەیوەندیەکانی کورد و ئەرمەن هەبوو تەنانەت تائەم سەردەمەش بەشی کوردی لە رادیۆکانی ییەریڤانی ئەرمەنی دانراوە هەواڵ و گۆرانی کوردی لێدەدەن و گرنگی بە کەلتور و فەرهەنگی کوردی دەدرێت و پەیوەندەکان بەتەواوی ئاساین و هەردوولا گرنگی بەیەك دەدەن.

لەکۆتاییدا بەهیوای ئەوەی توانیبێتم سەرەداوێکی راستییەکانم بۆ خوێنەرانی کورد روونکردبێتەوە و ئاشنامکردبێتن بە راستییە مێژوویەکان.

دەکرێت بۆ مێژوو ئەوە بڵێین شۆڕشی ئاگری رەنگدانەوەی باش و بەرچاوی هەبوو لە پتەوکردنی پەیوەندیەکانی نێوان کورد و ئەرمەن کە بوویە مایەی ئیمزاکردنی پەیماننامە دووقۆڵیەکانی نێوانیان.

**ئەنجام**

لە ئەنجامی ئەم کورتە توێژینەوەیەدا گەشتینە ئەوەی کە بڵێین نەتەوەی کورد و ئەرمەن دوو نەتەوەی ئاری هیندۆئەوروپایین و دوو نەتەوەی دۆست و هاوکاری یەك بوون، لە زۆربەی کات و قۆناغەکانی مێژوودا ئەمانە دۆست و هاوکار و هاوخەمی یەکتربوون و پێوەندیەکی کۆمەلآیەتی باشیان هەبووە، بەهۆی نزیکیان لەیەکدییەوە لە زۆربەی زۆری رووداوەکانی مێژوویاندا هاوبەش و هاوئازاربوون ئەمەشە بووەتە هۆی ئەوەی هەردوولا بوونەتە خاوەن یەکچارەنووس و یەکهەست، لە سەردەمی دەوڵەتی مادەوە بگرە تا سەردەمەکانی بەدرخان پاشا و شێخ عوبەیدوڵلا و شێخ سەعیدی پیران و کۆمەڵەی خۆیبوون ئەمان هاوکاری یەك بوون و کوردەکان ئەرمەنەکانیان پاراستووە و لە مردن رزگاریانکردوون.

دەبێت ئەوەش بخرێتەڕوو مەحاڵە لەمێژوودا دوو نەتەوەی هاوسنوور و دراوسێ هیچکات ناخۆشی و شەڕیان لەنێواندا نەبووبێت و لەیەکتریان نەکوشتبێت ئەمانیش بەهەمانشێوە دووچاری ئەوەبوون، بەلآم ئەمانە هیچی بەخواستی خۆیان نەبووە بەهۆی فرتوفێڵ و هاندانی ناحەزانی هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن بووە، بەلآم خۆشبەختانە ئەمان بەهۆی کەسی سیاسی و شارەزایانی هەردوولا هەرزوو توانییان ئاشتی و برایەتی لەنێوان خۆیان بچەسپێنن و پشت لەهەموو ئەو ناخۆشییانە بکەن کە بە فیتی دەوڵەتی عوسمانی تووشیانهات، مێژوونووسانی هەردوولا شایەتی ئەم راستییەن کە چۆن ئەم دوو نەتەوەیە ئاواتەخوازی ئاشتی و پێکەوەژیانی دۆستانە بوون، کەسایەتی سیاسی هەردوولا وەك شەریف پاشا و بوغز نۆبار پاشا چۆن پێکەوە شانبەشانی یەکتر لە هەوڵی بەدەستهێنانی مافەکانی ئەم دوو نەتەوەیە بوون پێکەوە یاداشتیان پێشکەش بە کۆنگرەی ئاشتی پاریس دەکرد.
لەڕاستیدا کۆمەڵکوژی ئەرمەن هەروا کارێکی عەفەوی لەخۆوە نەبووە بەڵکو ئەمە پلانێکی بەرنامە بۆداڕێژراوبوو هەر لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە هەتا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی هەموو دەسەلآتداران وەك ئایدیا و شارێگەیەك لەسەری دەڕۆشتن، سەرئەنجامیش مێژوونووسانی ئەرمەن ئەوەیان بۆ هەموو لایەك روونکردووەتەوە کەوا کورد بێلایەن و بێبەرییە لە کۆمەڵکوژی و کوشتاری ئەرمەن و هەموو ئەو تاوانە قێزەونە دەخەنە ئەستۆی دەڵەتی عوسمانی و سوڵتانەکانی و سەرانی ئیتیحادوتەرەقی تورکی، سەرئەنجام ئەم دوو نەتەوەیە جارێك بەناوی ئایین و جارێك بەناوی کوردبوون یان ئەرمەنیبوون دووچاری ماڵوێرانی بوون جگەلەوەش پەیوەندی و خاڵە هاوبەشەکانیان زۆر لە خاڵە ناکۆکیەکان زیاترە.

ئەمە راستی ئەو بابەتە بوو کە لای من گەلاڵەبوو، توانیم بەپشتبەستن بە رای مێژوونووسانی بێلایەن و مێژوونووسانی خودی ئەرمەنەکان بیسەلمێنم کە کورد بێتاوانە لە کوشتاری ئەرمەنەکان.

••••

# هەموو شتێ دەربارەی باشووری سودان

هێمن ئیبراهیم ئەحمەد

### سەرەتایەکی مێژوویی

کێشە و گرفتی باشووری سودان رەگوڕیشەیەکی دێرینی هەیە، ساڵی ١٨٨٢ دەوڵەتی سودان بەشێکبووە لە وڵاتی میسر، ساڵی ١٨٨٥ بریتانییەکان سودان و میسریان کردە کۆلۆنیالی خۆیان. بێگومان بوونی بریتانییەکان لەو ناوچەیەدا بووە بە هۆکارێك بۆ زیاتر ئالۆزبوونی گرفتەکانی نێوان هەرێمەکانی ئەو دەوڵەتانە بەتایبەت سودان، چونکە بریتانییەکان بەردەوام لایەنگری باشووری سودانیان دەکرد بەتایبەت لە قۆناغی سەربەخۆبوونی سوداندا لە ساڵی ١٩٥٦دا. کاتێك بریتانییەکان لە سودان پاشەکشەیانکرد پرسی جیابوونەوەی باشووری سودانیان لەدوایی خۆیان ورووژاند و دەرئەنجامەکەشی بریتیبوولە یاخیبوونی باشوورییەکان لە ساڵی ١٩٥٥دا و دواتر کێشەکە درێژەیکێشا و رووبەڕووبوونەوەکان ساڵی ١٩٦٢ زیاتر ئالۆزی بەخۆوەبینی بەتایبەتی پاش دروستبوونی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری لە باشووری سودان. سەرەڕای ناکۆکی و نایەکگرتوویی نێوانیان بزووتنەوەی سیاسی و خێڵەکییە شۆڕشگێڕەکان بەشێوەیەکی رێکخراوەیی لە ساڵی ١٩٨٥دا (بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری) پێکهێنرا کە ئەمەش بووەهۆی زیاتر ئالۆزبوونی بارودۆخەکە بەتایبەت لەپاش دەستولاتگرتنەدەستی حکومەتی رزگاری نیشتیمانی لە ساڵی ١٩٨٩دا. دواتر بە مەبەستی هێنانەئاراوەی کەشێکی ئاشتیـیانە لە مانگی ئوکتۆبەری ١٩٨٩ کۆنگرەی نیشتیمانی بەسترا.

بریتانییەکان بەردەوام پاڵپشتی خۆیان بۆ باشووری سودان دووپاتدەکردەوە و هانی دانیشتوانی باشووری سودانیان دەدا بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش لە دژی دەستولاتی باکوورییەکان. هەمیشە ئەوەیان بەگوێی خەڵکی باشووری سوداندا دەدا کە ئەوان وەکو کوێلە سەیردەکرێن لەلایەن باکووریـیەکانەوە و مامەڵەیانپێوەدەکرێت و بریتانییەکان تەنانەت بۆ چەسپاندنی تۆوی جیاکاری لەنێوان باشوور و باکووری سوداندا ئایینی ئیسلام کە ئایینی باکوورییەکان لە باشوور قەدەغەکرد و ژن و ژنخوازییان لەنێوانیان قەدەغەکرد و تەنانەت رێگە بە هەندێ جلوبەرگ نەدەدرا لە باشوور لەبەربکرێت چونکە ئەوجۆرە جلوبەرگە هی باکوورییەکان بوو. بریتانییەکان مەبەستیان پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بووە ئەو پشتگیرییەیان لە باشوورییەکانی سودان دەکرد، هەوڵی ئەوەیان دەدا کە ئایینی (ئەرسەدۆکس)ی بگۆڕن بۆ (پرۆتستانت)ی و (کاسۆلۆك)ی و هاندانیان بۆ رقلێبوونەوەی موسڵمانەکان، چونکە ئامانجی سەرەکی بریتانییەکان رێگرتنبوو لە بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە باشووری سوداندا، بۆیە بەردەوام پێشنیاری ناردنی هێزیان دەکرد بۆ باشووری سودان.

له حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا جەنگی ناوخۆیی لەنێوان تەواوی هەرێمەکانی باشووری سوداندا سەریهەڵدا، ئەم جەنگەش بەتەواوی کاریگەریی هەبوو لەسەر دارمانی ئامرازەکانی ژیانی مرۆڤایەتی له ناوچەکەدا، ئەم شەڕەش لەنێوان هەرێمەکانی باکوور و باشووری سوداندا زیاتر ئەوکاته دەستیپێکرد کاتێ که موسڵمانەکان دەسەلاتیان گرتەدەست و شەڕوپێکدادان لەنێوان دەسەلاتی باکوور و بزووتنەوەی میللی رزگاری باشووری سوداندا هەڵگیرسا، ئەمەش لەپێناو پەیڕەوی له سیاسەتی عەلمانییەت و مافی چارەی خۆنووسین، دواتر له سالأنی هەشتاکاندا کاتێك که گەڕان بەدوای نەوتدا دەستیپێکرد کێشه و ململانێکان لەسەر باشووری سودان بەهێزتربوو، لەبەرئەوه هەردوولایان باکوور و باشووری سودان له کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥ ڕێکەوتن له چوارچێوەی ئاشتی گشتیدا ئەم ڕێکەوتنه سەرەتایەك بوو بۆ ئاشتبوونەوەی هەردوولایان و ئەوەش سەرئەنجام بووه هۆی ئەنجامدانی راپرسییەك له ساڵی ٢٠١١دا، بۆ بڕیاردان لەنێوان سەربەخۆبوون یان مانەوه له چوارچێوەی سوداندا.

## ناساندنی دەوڵەتی باشووری سودان

### شوێنی جوگرافی دەوڵەتی باشووری سودان

مەبەست له شوێن، شوێنی دەوڵەته بەگوێرەی شوێنه فەلەکییەکەی واته شوێن بەگوێرەی (بازنەکانی پانی و هێڵەکانی درێژی)و هەروەها شوێن بەگوێرەی دەوڵەته دەوروبەرەکانی دەوڵەت، شوێن بەهەمووە مانا جیاوازەکانییەوه کاریگەریی هەمەلایەنەی هەیه لەسەر دانیشتوان و رەوشی سیاسی دەوڵەت لەبەرئەوەی دەوڵەتان لەڕووی شوێنی جوگرافییەوه لەیەکتری جیاوازن، بۆیه کاریگەری ئەو شوێنەش جیاوازه له دەوڵەتێکەوه بۆ دەوڵەتێکیتر، هەروەها بەنیسبەت شوێنی (فەلەکی)یشەوه دیاریکردنی ئەم شوێنه بەگوێرەی بازنەکانی پانی گرنگی زۆرتره نەك هێڵەکانی درێژی، چونکه شێوازه گشتییەکەی ئاووهەوا لەسەر بنەمای پلەکانی بازنه پانییەکان دیاریدەکرێت، بەلأم بەشێوەیەکی گشتی شوێن گرنگییەکەی کاریگەر و بەرچاوی هەیه له زانستی جوگرافیا و پەیوەندییه سیاسییه نێودەوڵەتییەکاندا، چونکه دیاریکردنی شوێنی هەر ناوچەیەك یان هەرێمێك یان دەوڵەتێك گرنگی تایبەتی خۆی هەیه، لەبەرئەوه شوێن فاکتەری هێزه بۆ دەوڵەت.

بەپێی شوێنی گەردوونی (astronomical location) دەوڵەتی باشووری سودان دەکەوێته نێوان بازنەی پانی (٢ - ١٤) پلەی باکووری هێڵی کەمەرەیی و هێڵی درێژی ( ٢٤ - ٣٦ ) پلەی رۆژهەلاتی هێڵی گرینج. بڕوانه نەخشەی ژماره (١).




نەخشەی ژمارە (١) شوێنی فەلەکی دەوڵەتی باشووری سودان

**سەرچاوە:**
**www.map.ox.ac.uk**

شوێن بەگوێرەی دراوسێیەتی (vicinal location) لە دیاردە گرنگ و بەبایەخەکانە لە پەیوەندییە سیاسییەکاندا، شوێنی دەوڵەت بەگوێرەی دراوسێکانی کاریگەری خۆی هەیە لەسەر دەوڵەت کە هەندێجار دەبێتە مایەی خێروخۆشی بۆ دەوڵەت و هەندێجاریش دەبێتە مایەی شەڕ و ئاژاوە بۆ دەوڵەتان، بۆ نموونە: سوسرا وڵاتێکی داخراوە و ناڕوانێتەسەر هیچ رووبەرێکی ئاوییدا، هەروەها ئەفغانستانیش بەهەمانشێوە داخراوە هیچ رووبەرێکی ئاویی نییە، بەڵام سویسرا و ئەفغانستان لەهەموو روویەکەوە دوو دەوڵەتی تەواو جیاوازن، ئەوەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی دراوسێتی کە هەردوو وڵاتەکە داخراون، بەڵام  بە چەند وڵاتێکی جیاواز دەوردراون.

ئەگەر سەیری نەخشەی دەوڵەتی باشووری سودان بکەین دەبینین شوێنێکی داخراوی هەیە و ناڕوانێتەسەر هیچ رووبەرێکی ئاوییەوە، دەوردراوە بەهەر یەکە لە وڵاتانی (ئەسیوپیا) لە رۆژهەڵاتەوە و (کیـــنیا و ئۆگەندا) لە باشووریەوە و هەردوو وڵاتی (کۆماری کۆنغۆی دیموکرات و ئەفریقیای ناوەند) لە رۆژئاوایەوە و (باکووری سودان) لە بەشی باکوورەکەیەوە و (جوبا)ش پایتەختەکەیەتی. بڕوانە نەخشەی ژمارە (٢ ).




نەخشەی ژمارە (٢) شوێنی دەوڵەتی باشووری سودان

### ئاووهەوای دەوڵەتی باشووری سودان

ئاووهەوا بە یەکێك لە رەگەزەکانی پێشکەوتن دادەنرێت. زۆربەی ئەو وڵاتانەی پێشکەوتوون لەدونیادا بەشێکی هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئاووهەوا. لەوانە گونجاوی ئاووهەوا بۆ چالاکییە مرۆییەکان و نەبوونی توندوتیژی کەشوهەوا کە دەبێتە هۆی کاریگەری لەسەر توانای لەش و ژیری مرۆڤ. ئەوە جگەلەوەی کە ئاووهەوا پەیوەندی بەتینی هەیە لە بەستنەوەی بە رووەکی خۆرسك و دانەوێڵە و کشتوکاڵەوە کە ئەمانە هەموویان کاریگەرییان هەیە لەسەر باری ئابووری و کۆمەڵایەتی وڵاتەکە.

ئاووهەوای باشووری سودان بەشێوەیەکی گشتی ئاووهەوایەکی خولگەییە و ئەگەر تەماشایەکی جوگرافیای سروشتی باشووری سودان بکەین بەئاسانی جیاوازی نێوان هەرێمەکانی باشوور و باکوورمان بۆدەردەکەوێت، چونکە باشووری سودان دەوڵەمەندە بە باران و رووەکی خۆرسك و مێرگ و رووبار و گژوگیا و کشتوکاڵ و ژینگەی لەبار و مەوادی خاو، بەلاَم پلەکانی گەرمای بەرزە بەهۆی نزیکی لە هێڵی کەمەرەیی و گۆشەی بەرکەوتنی تیشکی خۆر کە بە ستوونی و نیمچە ستوونی دەکەوێتەسەری و دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمییەکەی. بڕی بارانی باشوور لەنێوان (٤٥٠ – ١٠٠٠ ملم)دایە. ئەو بڕەش زۆربەی لە وەرزی هاویندایە و لەماوەی یەك ساڵی تەواودا نزیکەی ( ٩) مانگی بارانی تێدادەبارێت، بەتایبەت لە ناوچە سنوورییەکان.

**بەرزونزمی باشووری سودان**

دیاردەی بەرزونزمی لە جوگرافیای سیاسیدا خەسڵەت و گرنگی ستراتیجی خۆی هەیە، چ لەڕووی هێرشبردنەوە بێت یان لەڕووی بەرگرییەوە یان هەردووکیان بەیەکەوە.

دەوڵەتی سودان بەگشتی لە باشوورەوە بانێکی بەرزە و چەند دەریاچەیەکە و لە باکوورەوە بیابانێکی گەورە و لە رۆژهەلاتی ولاتەکەدا بانی حەبەشە و دەریای سوورە لەرۆژئاوایدا کێوەکانی (مرە)و (میدوب).

بەرزونزمی ولات یەکێکە لەو فاکتەرانەی کە تاڕادەیەك کاریگەری لەسەر چارەنووسی سیاسی ولاتان هەیە، ئەگەر سروشتی ولات بەرزی زۆری تیادابوو ئەوە بواری لەباری بۆدەرەخسێ بۆ بەرگریکردن، ئەگەرچی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا تاڕادەیەکی زۆر گۆڕانکاری لە بەهای سیاسی و ستراتیجێتی شوێنە بەرزەکاندا کردووە، بەلام بەهەمانشێوە بەرزایی کاریگەری خۆی هەیە لە مەسەلە جێۆپۆلەتیکەکاندا، چونکە دەبێتە هۆی سستکردنی جموجۆڵی زەمینی و رێگرە لەبەردەم تۆڕی پەیوەندییەکاندا.

**رووبەری دەوڵەتی باشووری سودان**

رووبەر ئەگەر فاکتەرێکی سەرەکی نەبێت لە دەستنیشانکردنی هێزی سیاسی دەوڵەتدا، ئەوا بێگومان فاکتەرێکی گرنگە، بەلام بەگشتی بەهای راستەقینەی رووبەر بەندە بە رەگەزیترەوە، وەك دانیشتوان لەڕووی ژمارەیان، چڕییان، ئاستی رۆشنبیری و زانستی و شارەزاییان، بەلام رووبەری دەوڵەت لەجیهاندا بە یەکێك لە بنەماکانی هێز بۆ دەوڵەت دادەنرێت، بە مەرجێك کە دانیشتوانەکەی بتوانن بەکاریبهێنن، چونکە پێویستی بە سەرەنجدان هەیە لە تایبەتمەندییە سروشتییەکانیتری زەوی، لەبەرئەوە رووبەر بەتەنها ناتوانێت پێوەری هێز بێت.

بەلام فراوانی رووبەری دەوڵەت گرنگیەکی زۆری هەیە بەتایبەت لەکاتی جەنگدا کە ئەم گرنگییە لەو زاراوە سەربازییەوە دەردەکەوێت کە دەڵێن بەرگریکردن لە قوولاییەوە "Defense in Dept." دەوڵەتی رووبەربچووك هەرزوو دەروخێت لەبەرامبەردا دراوسێ و دەوڵەتە رووبەرگەورەکاندا، بۆ نموونە: سوپای هۆڵەندا نەیتوانی بەرگریبکات لەماوەی تەنها ٤ رۆژ هیتلەر داگیریکرد لەشەڕی دووەمی جیهانیدا، بەلام رووسەکان توانیان لە قوولاییەوە بەرگریبکەن، توانیان سوپای نازییەکانیان بەرەو ناوەوە کێشبکەن و تاوەکو هەموو توانا و هێزێکی سوپاکەیان ئیفلیجکرد، وەك پێشتر لە ساڵی ١٨١٢ لەگەڵ سوپای ناپلیۆندا کردیان.

ئەگەر سەرنجی رووبەری دەوڵەتی تازە لەدایکبووی باشووری سودان بدەین دەبینین ئەم ولاتە رووبەرەکەی دەگاتە(٥٨٩,٧٤٥)کم چوارگۆشەیە، ئەوەیە جگەلە ناوچە کیشەلەسەرەکان وەکو (جیبال ئەلنوبە، ئەبیە، نیلی شین).

بەگشتی رووبەری سودان (٢,٥٠٥,٨١٠)کم چوارگۆشەیە و بە گەورەترین ولاتی ئەفریقا و دەیەمین گەورە ولاتی جیهان دەژمێردرێت، ئەمە لەکاتێکدا کە (٥٨٩٧٤٩)کم چوارگۆشەی رووبەرەکەی بەر باشوور دەکەوێت کە دەکاتە زیاتر ٢٤٪ ی کۆی رووبەری گشتی ولاتەکە.

## سنووری دەوڵەتی باشووری سودان

سنووره سیاسییەکان گرنگترین فاکتەری دیاریکردن و جیاکردنەوەی یەکەسیاسییەکانە لەیەکتری، هێڵە سنوورییەکان هێڵی بایەخدار و بڕیارلێدراون، چونکە بابەتی سنوور لە باسە سەرەکی و گرنگەکانی جوگرافیای سیاسی دەژمێردرێت. ڕۆڵی ئەو هێڵە لەبنەڕەتدا جیاکردنەوەی خاکی دوو وڵاتە لەیەکتری.

لەڕاستیدا هیچ سنوورێکی سیاسی نییە لەجیهاندا هەموو خەسڵەتە چاکەکانی لەخۆدا کۆبکاتەوە زۆرینەی ئەو سنوورانەی بەوبارەی ئێستا هەیە لە ئەنجامی فشاری جیاوازیدا سەریانهەڵداوە، تەواو دەستنیشانکردنی سنوورەکان و ڕوونی و ئاشکراییە یانی مانای ئەوە نییە ئیتر تووشی گۆڕان نابێت.

سنووری باشووری سودان ناکۆکی هەیە لەبارەی دیاریکردنی سنوورەکەیەوە بەتایبەت بەشە باکوورییەکەی و ئەوەی زیاتر کێشەکەی ئاڵۆزکردووە بوونی سەرچاوەی نەوتییە لە ناوچەی ئەبیێ، دوایی چەندین پێکهێنانی لیژنە بۆ دیاریکردنی سنووری ناوچە، بەڵام ئەنجامی کارەکان کۆدەنگی بەدواوە نەبوو دوای چەندین پێکدادانی خوێناوی لە ساڵی ٢٠٠٨ لە ئەبیێ مەترسی سەرهەڵدانەوەی شەڕ لەنێوان باکوور و باشوورییەکان هاتەئاراوە، هەربۆیە هەردوو لایان ناکۆکییەکەیان هەڵسپارد بە لیژنەی ناوبژیوانانی نێودەوڵەتی لە لاهای.

ڕێکەوتنامەی ئاشتی سەرانسەری ساڵی ٢٠٠٥یش نەیتوانی کۆتایی بە شەڕی نێوان باکوور و باشوور بهێنێت سەبارەت بە دیاریکردنی سنووری نێوانیان، حکومەتی سودان لە گفتوگۆکانی لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەی باشووری سوداندا پشتدەبەستێت بەو دیاریکردنە ناسراوەی سنووری باکوور و باشوور کە لە سەرەتای سەربەخۆیی سودان لە ساڵی ١٩٥٦ دیاریکراوە، بەو مانایەش تائێستاش سنووری دەوڵەتی باشووری سودان بەتەواوەتی دیارینەکراوە و کێشە و گرفت هەیە لە بە شێکی سنوورەکەیدا.

## شێوەی دەوڵەتی باشووری سودان

شێوە ڕەگەزێکی گرنگی دەوڵەتە چ لەڕووی بەرگریکردنەوە بێت لە دەوڵەت لەئاست دەستدرێژییە دەرەکییەکاندا یان لەڕووی دەسوڵاتی ناوخۆییەوە بێت بەسەر زەوییەکانی دەوڵەتەکەدا. بە سەیرکردنی تەواوی نەخشەی سیاسی جیهان تێدەگەین کە شێوەی هەندێ لە وڵاتان بەجۆرێکی سەیر ئەندازەییە بۆ نموونە: وەکو زۆربەی وڵاتانی ئەفریقا، لەکاتێکدا هەندێکیتریان بەشێوەی پەرشوبڵاوە، وەکو ئەندۆنیزیا. کەم ئەمجۆرە وڵاتانە پارچەپارچەن لاوازن لەڕووی بەرگریکردنەوە. سەرەڕای ئەوەی کە پێشکەوتن بە چەك و هونەری شەرکردن ڕوویداوە کاریگەری لەسەر گرنگی شێوەی وڵات لە بەرگریکردن لە ئاسایشی خۆیی کەمکردووەتەوە، بەڵام شێوەی دەوڵەت دادەنرێت لەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر پەیوەندی دەرەکی و ڕامیاری و ئابووری لە پێشکەوتنی ناوخۆیی یەکە ڕامیارییەکاندا و چۆنێتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان.

ئەگەر سەیری شێوەی دەوڵەتی باشووری سودان بکەین دەبینین شێوەکەی نزیکە لە شێوەی سێگۆشەوە بنکەکەی بۆ باکوورە و سەرەکەی بۆ باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی بەجۆرێك زاڵە بەسەر درێژبوونەوەدا. هەروەك ئەوەی شێوەی جوگرافی دەوڵەتی باشووری سودان جیادەکاتەوە ئەوەیە کە نزیکە لە شێوەی (کۆبۆوە) (Compact).

### ئابووری دەوڵەتی باشووری سودان

بنەما ئابوورییەکان یان دەرامەتە ئابوورییەکان رەگەزی تەواوکەری پێکهاتەی سیاسی دەوڵەتە، دەرامەتە ئابوورییەکان وەکو سووتەمەنی و کانزاکان رۆڵێکی گەورە دەگێرن لە جیهانی ئەمرۆدا. چ لەسەر ئاستی ناوخۆیی بێت چ لەسەر ئاستی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی بێت. باشوور سودان مێژوویەکی پڕ لە شەڕ ململانێی هەیە کە ئەوەش وایکردووە کە کەشوهەوایەکی نالەبار باڵ بەسەر ئەو ولاتەدا بکێشێت و بێتە هۆکارێك بۆ دارِمانی ئابووری ئەو دەوڵەتە.

ئەگەر تەماشای ئابووری باشووری سودان بکەین دەبینین پێکهێنەرە سەرەکییەکەی بریتییەلە سەرچاوە سروشتییەکان کە نەوت وەکو سەرچاوەیەکی گرنگ و بایەخداری ئەم دەوڵەتە پشتیپێدەبەسترێت، حکومەتی سودان لە ساڵی (٢٠٠٨ ) رۆژانە (٥٠٠ هەزار) بەرمیل نەوتی لە کانگە نەوتییەکانی ناوەڕاست و باشوور دەردەهێنا و هەناردەی دەرەوەی ولاتی دەکرد کە ئەگەربێتو ئەو داهاتە نەوتییە بکەوێتە ژێردەستی باشووری سودان ئەوە دەتوانن ژێرخانی ئابووری خۆیانی پێبونیادبنێن و لایەنەکانیتری ژیانیانی پێباشتربکەن لەڕووی تەندروستی و خوێندەواری و رۆشنبیری و خزمەتگوزارییەوە.. هتد، هەروەها سەرچاوەکانی دارودرەختیش رۆڵی بەرچاوی هەیە، بۆ نموونە: (داری ساج) کە پێکهێنەری بەشێکی ئابووری باشووری سودانە و چەندین سەرچاوەی سروشتیتر کە پێکهاتووە لە کانزای (ئاسن و مس و کرۆمی خاو و خارسین و ئەنگۆستین و بەردی بەبایەخ و ئالتون) لەگەڵ هەموو ئەو سەرچاوە سروشتییانەدا باشووری سودان هێزێکی ئاوی گرنگی هەیە کە سوودی ئابووری گرنگی هەیە، بۆ نموونە: رووباری نیل و لەچەند ناوچەیەکیشیدا کشتوکاڵی وەکو (بەرووبوومی شەکرەمەنیی و گەنم و بندۆق و میوە) دەکرێت وەکو پاڵپشتییەك بۆ لایەنی ئابووری ولات. دەوڵەتی باشووری سودان بەهۆی بەپیتی خاکەکەیەوە ناسراوە لەجیهاندا.

دەوڵەتی باشووری سودان خاوەنی دەرامەتی سروشتی نوێبووەیە، بۆ نموونە: زەوی گونجاو بۆ کشتوکاڵ و دارودرەخت و رووەك و گژوگیای چڕوپڕ لە شێوەی دارستاندا و سەروەت و سامانی ئاژەڵی گەورە کە هێشتا بەشێوەیەکی ئابوورییانە سوودیلێوەرنەگیراوە، دەرامەتی ئاوی لە شێوەی رووبار کە دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارۆئاوی ئوگور پلانی زانستی بۆ دابنرێت.

### پێکهاتەی دانیشتوان لە باشووری سودان

دانیشتوان تەوەرێکی سەرەکی لێکۆڵینەوەکانی جوگرافیایی سیاسی پێکدەهێنن، ئەویش بەو پێودانەگەی کە دانیشتوان ئەو هێزە بنەرەتییە پێکدەهێن کە سەنگی جێوپۆلەتیکی هەر هەرێم و دەوڵەتێك دیاریدەکات، لەو روانگەیەوە کە فاکتەری دانیشتوان لەمبارەویەوە دوورابییەکی ژیانی کاریگەری گرنگی هەیە، جگەلەوەی کە دانیشتوان فاکتەرێکی گرنگی کێشەی سیاسی هەرێم یان دەوڵەت پێکدێنێ و ئەم فاکتەرە لەمڕووەوە کاریگەرییەکەی لە کاریگەری فاکتەرە سروشتی و ئابوورییەکان کەمترنییە.

فاکتەری مرۆیی کاریگەری راستەوخۆی هەیە لەسەر هێزی دەولات و ئەندازەی گەشەکردنەکەی و پەیوەندییەکانی هەیە، (ئەرستۆ) سەرەنجیدابوو کە یەکێك لە هۆیەکانی شکستی ئەسینیا کەمی دانیشتوان بووە، هەندێك لە لێکۆڵینەوەش هۆی سەرکەوتنی ناپلیۆن لەشەڕەکانیدا بەسەر دەوڵەتە دراوسێکانیدا لە کۆتایی سەدەی (

١٨)و سەرەتای سەدەی( ١٩ )دا دەبەنەوە سەر زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی فەرەنسا.

دانیشتوانی باشووری سودان لەڕووی پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانەوە بریتییەلە کۆمەڵێ رەگەزی جۆراوجۆر و تارادەیەك ئاڵۆزی پێوەدیارە. هەرچەندە بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی باشووری سودان زۆر دواکەوتووە ئەویش وایکردووە کە بەئاسانی نەتوانرێت هەموو پێکهاتە ئەتنۆگرافی و دیمۆگرافییەکانی باشووری سودان ئاشکرابکرێت.

بەپێی ئەو ئامارانەی کە هەیە ژمارەی دانیشتوانی باشووری سودان (٨،٥) ملیۆنن و نزیکی رێژەی ٣٠٪ کۆی دانیشتوانی تەواوی دەوڵەتی سودان پێکدەهێنن، هەرچی دەربارەی چڕی دانیشتوانی دەوڵەتی باشووری سودان، ئەگەرچی شتێکی ئەوتۆ لەبارەیەوە نەنووسراوە بەڵام چڕی دانیشتوانی دەوڵەتی سودان بەگشتی نزیکەی (١١ کەس / کم٢) لەسەر ئاستی پێوانەی چڕی دانیشتوان لەجیهاندا.

### ئایین لە دەوڵەتی باشووری سودان

جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەی کە دەبێتە ریگاڕۆشنکەرەوەی خەلکی و ئاستی شارستانییەتی بەرزدەکاتەوە ئایینە، لەهەمانکاتدا بووەتە هۆی هەڵگیرسانی زۆرینەی شەڕ و جەنگەکان لەدوای هۆکاری ئابووری ئایینەکان بەرپرسی یەکەمی جەنگە تاڵ و کوشندەکان بووە (جگەلەم جەنگانەی دوایی) ئاین هۆکارێکی کارایە لە لێکۆڵینەوەکانی جوگرافیایی سیاسیدا، هەر لە سەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ ئەم ناوچەیە هۆکاری جیاوازی و بەریەکەوتن بووە، ئەوە هۆکاریك بووە تائێستاش بەکراوەی ماوەتەوە. هەرچەندە زۆربەی نووسەرە عەرەبەکان رایانوایە کە کۆلۆنیالیزمی بەریتانی بە پلان و بەرنامەیەکی دیاریکراوەوە تۆوی دووبەرەکی لەنێوان باکوور و باشووردا چاندووە و ئایینی کردووەتە هۆکارێك بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانی خۆی، دانیشتوانی باشووری سودان شوێنکەوتووی دوو ئایینن یەکەمیان: (مەسیحی)یە و دووەمیان: (مسوڵمانن)و هەروەها شوێنکەوتووی ئایینە ئەفریقییە تەقلیدییەکان و (وەسینییەکانن) کە نوینەری کۆمەڵێکی کەم لە دانیشتوانن، زۆرینەی مەسیحییەکان بریتینلە مەسیحی (کاسۆلیکی)و (ئەنجلیکان) لەسەرووی ئەوانەشەوە چالاکی هەندێ کۆمەڵەیتر لەدوا ئاماری رەسمیدا لە کتێبی سالانی مەسیحییەت کە لە ساڵی (١٩٨٦) کە ئەنجوومەنی کەنیسەکانی جیهان دەریانکردووە، دەڵێت دانیشتوانی باشوور پێکهاتووە لە (وەسینییەکانن). کە رێژەیان دەگاتە نزیکەی (٢٪)ی دانیشتوانی ئەو وڵاتە کە ئەمانە باوەڕیان بەهیچ جۆرە ئایینێك نییە و نزیکەی (١٨٪) دانیشتوانی موسڵمانن و (٨٠٪) مەسیحین.

### زمان لە باشووری سوداندا

بەلای توێژەرەوەکانەوە یەکێتی زمان رەگەزێکی گرنگە لە رەگەزەکانی یەکێتی نەتەوەییە. زمان کۆڵەکەی رۆشنبیری نەتەوەییە، رۆشنبیریش بۆ نەتەوە وەکو گیان وایە بۆ مرۆڤ، ئەو رۆشنبیرییەی مرۆڤ هەیەتی بەهۆی زمانەوە دەستیکەوتووە. زمان گرنگترین فاکتەری یەکێتی نێوان دەوڵەتە.. جیاوازی زمان لە زۆرینەی کاتدا دەبێتە هۆی ناکۆکی و جیاوازی لەنێوان دانیشتوانی وڵاتدا، دانیشتوانی ئیستای جیهان بە نزیکەی (٣٠٠٠) زمان قسەدەکەن، هەندێك لەو زمانانە سەدان ملێون مرۆڤ قسەیپێدەکەن وەك زمانی (چینی و ئینگلیزی) هەندێکیتریش

کۆمەڵی بچووك و ژمارەی کەم قسەپیێدەکەن، پێکهاتەی زمانی هەندێك کیشوەر سادە و ساکارە، بەڵام هەندێکیتر گران و ئاڵۆزە، ئەوروپا و ئەفریقیا و تاڕادەیەکیش ئاسیا لەوانەن کە ئاڵۆز و گرانە، هەندێك وایبۆدەچن خاڵی لاوازی پێکـــهاتەی نەتەوەیی بەشێکی زۆری دەوڵەتە ئەفرقییەکان دەگەڕێتەوە بۆ فرەی و جۆراوجۆری لەزمانەکەیاندا کە بە (٧٠٠) بۆ (١٠٠٠) زمان مەزنە دەکرێت، کۆلۆنیالیزمی ئەوروپاش بارودۆخەکەی ئاڵۆزترکردووە بەوەی هەوڵیانداوە زمانی نەتەوەیی خۆیان بەناو دانیشتوانەکەیدا بڵاوبکەنەوە.

چەند جۆرێك زمان هەیە لە باشووری سوداندا، بەڵام زمانی فێرکردن و حکومەت و ئیشوکار بریتییەلە زمانی ئینگلیزی کە زمانی فەرمی باشووری سودانە. لە ساڵی (١٩٢٨)وە دانپێدانراوە وەك زمانێکی ڕەسمی باشووری سودان تاوەکو لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە لەدوای ئەم کاتەوە زمانی عەرەبی بایەخپێدراوە و ناسراوە بەناوی ( عەرەبی جوبا) کە لە سەدەی نۆزدەدا لەنێوان نەوەی سەربازییە سودانییەکاندا بڵاوبووەتەوە کە زمانی تیرەی (باری)یە کە بەشێوەیەکی فراوان بەکاریدەهێنن هەروەها سێ زمانی ئەفریقیتر بەکاردەهێنرێت بەشێوەیەکی فراوان کە بریتییەلە (توك جینق) یان زمانی (دینکا) و (توك ناسی) یان زمانی (النوير) نزیکەی (٢) لەگەڵ (توك شلو) یان زمانی (الشلوك). زمانی عەرەبی بە زمانی ڕەسمی دەوڵەتی سودان و زمانی ئینگلیزی بەشێوەیەکی بەربڵاو لە باشووری سودان بەکاردەهێنرێت. باشوورییەکان زیاتر لە سەد زمانی ناوخۆیی قسەدەکەن، بەڵام زمانی ئینگلیزی زمانی ڕەسمییە بەپێی دەستوری کاتی لەکاتی ئێستادا و زمانی عەرەبی زمانی گفتوگۆی ڕۆژانەی نێوان کۆمەڵ و هۆزە جیاوازەکانە، خەڵکی جوبای پایتەخت بە زمانێك قسەدەکەن کە پێیدەوترێت (عەرەبی جوبا).

## هۆکارەکانی کێشەی باشووری سودان

- وەکو ئاشکرایە کە وڵاتی سودان پێشتر بەشێك بووە لە وڵاتی میسر لە ١٩٥٦/١/١ سەربەخۆیی وەرگرت، بووە وڵاتێکی سەربەخۆ لەناو نەخشەی سیاسی جیهاندا. سودان وڵاتێکە جیاوازی نەتەوە و ئایینی زۆری تێدایە، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی دابەشبووە بەسەر هەردوو ئایینی (ئیسلام)و ئایینی (مەسیح)یدا.

جیاوازی نەتەوە و فەرهەنگ و ئاین و دەسەڵات و بارودۆخی تایبەتی جوگرافی چەند زەمینەیەکی جیاوازییان دروستکردووە کە بووەتە هۆی خولقاندنی کێشە و گرفت لە هەرێمەکانی باشووردا لەگەڵ باکووردا.

دانیشتوانی باشووری سودان نزیکەی ٣٠٪ی دانیشتوانی دەوڵەتی سودان پێکدەهێنن، ئایینی باشوورییەکان مەسیحییە و بەسەر چەندین گروپ و خێـــڵدا دابەشبوون، بە زمانی ئینگلیزی و چەند دیالەتێکی جیاجیا قسەدەکەن، حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی سودان دانیشتوانی باشووری سودانیان چەوساندووەتەوە و بە چاوی سووکەوە مامەڵەیان لەگەڵ کردوون، چونکە دەستەلاتەکانی باکوور بەردەوام هەوڵی ئەوەیانداوە کە باشوور بەعەرەببکەن و دانیشتوانی باشووریش کۆڵیاننەداوە لە خەباتکردن و ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ دەسەلاتی باکووردا.

- ململانێی نێوان باکوور و باشوور پێش داگیرکردنی سودان هەر بوونی هەبووە لەنێوان باکووری عەرەبی موسڵمان و باشووری زنجی مەسیحیدا، ئیسرائیل کاتێك کە درکی بە گرنگی مەسەلەی باشووری سودان کرد لای خۆیانەوە

بەپێویستیانزانی کە ئەم دەوڵەتە سەربکەوێت و لە باکوور جیابێتەوە، بۆئەوەی پەیوەندی پەیوەندی فەرمییان هەبێت لەگەڵ باشووردا و ئامانجەکانی خۆیان بهێننەدی، ئەوەش بە دروستکردنی کیانێکی نامۆ و سەربەخۆیە لە سودانی یەکگرتوودا کە هیچ پەیوەندییەکی بە باکوورەوە نەبێت.

- هاتنی عەرەب و ئیسلام بۆ سودان بەهاتنی کێشە و گرفتی نەژادی و ئایینی و فەرهەنگی دادەنرێت، چونکە باشووری سودان نەتەوەیەکی ناعەرەبە و ئیسلامیش نین، عەرەب هاتووەتە ناوچەکە بۆ بلاّوکردنەوەی ئایینی ئیسلام دواتر بووە بە هۆی هەڵگیرساندنی چەندین شەڕ و ململانێی دینی و نەژادی لەنێوان هەردوو باکووری موسڵمان و باشووری مەسیحیدا. بەمشێوەیە شەڕێکی خوێناوی کە لەنێوان باشوور و باکووردا بەدرێژایی نزیکەی نیوسەدە ( ٥٠ساڵ) بەردەوامبووە، چونکە لەگەڵ هاتنی ئایینی ئیسلام و گواستنەوەی کلتوری عەرەب بۆ ناوچەیەکی جیاوازتر لەخۆی بێگومان لەهەر بارێکدا بەرهەڵستی دروستدەکات.

- لە ساڵی ٢٠٠٩دا باشووری سودان بە خاڵێکی توندوتیژی سەربازیدا تێپەڕبوو کە بووە هۆی مردنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئەم ناوچەیە و ئەو بارگرژی و توندوتیژییەی کە لەم ماوەیەدا روویدا بووە هۆی دروستبوونی رێکەوتنامەیەکی ئاشتییانە لەنێوان باکوور و باشووردا بۆئەوەی هەردوو لایان بگەن بە قۆناغێك لەسەر بەهای ئاساییش و کۆتاییهێنان بەو بارگرژییەی کە لەنێوان ئەو دووبەرەیەدا هەیە گرنگترینی ئەو هۆکارەش کە بووە هۆی دروستبوونی ئەو شەڕ و توندوتیژییە مەسەلەی مافی چارەی خۆنووسین بوو.

### جیابوونەوەی باشووری سودان

حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی سودان نەیانتوانیوە چارەسەرێکی ریشەیی بۆ کێشەی باشووری سودان بدۆزنەوە، لەبەرئەوە بەشێوەیەکی فراوان تۆی ئاژاوە و دووبەرەکی چەسپابوو لەنێوان گروپە جیاوازەکاندا. بۆیە حکومەت سەرکەوتوونەبوو لە چارەسەرکردنی ئەم دیاردانە ئەمە بووە هۆی سەرەتایەك بۆ جیابوونەوەی باشووری سودان لە باکوور، چونکە بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ولاّت تووشی چەندین کێشەی وەکو ئابووری و بلاّوبوونەوەی نەخۆشی و نەخوێندەواری و دارِمانی کەرتی کشتوکاڵی و پێشەسازی چ لەسەر ئاستی ناوخۆیی چ دەرەوەدا، هەموو ئەم بارودۆخانە رێگەخۆشکەربوون بۆئەوەی باشووری سودان هەوڵی سەربەخۆبوون بدات، ئەم ململانێیە درێژەی هەبوو تا ساڵی ٢٠٠٥ کە باشووری سودان لە ساڵی ٢٠٠٥ مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشرا.

هەر لەوکاتەوە بزووتنەوەی رزگاری باشووری سودان بوو بە دۆست و هاوپەیمانی ئەمریکا و پشتگیری ئەو ولاّتەی بەدەستهێنا، بەمەش هەریەکە لە ولاّتانی ئۆگەندا و ئەریتریا و ئەسیوپیا بوونە دۆست و جێگای دالّدەدان و چالاکی بزووتنەوەکە، چونکە هەریەکە لەئەو ولاّتانە هاوپەیمانی ئەمریکابوون، بەمشێوەیە رۆژ لەدوای رۆژ قەیرانەکانی حکومەتی باشووری سودان زیاتردەبوون، بۆ نموونە: وەکو دارِووخانی ئابووری و سەرهەڵدانی کێشەی دارفۆر و فشاری نێو دەوڵەتی لەسەر حکومەت و دووکەرتبوونی حیزبی حاکم بۆ دوو باڵی (بەشیر و تورابی). هەموو

ئەمانە فاکتەری بەهێزبوون بۆ چوونەپێشەوەی دانووسانەکانی حکومەتی سودان لەگەڵ باشوورییەکان و قبوڵکردنی داواکارییەکانیان هەتا لە ساڵی ٢٠٠٥ ڕێکەوتننامەی (نیڤاشا)یان مۆرکرد و حکومەتی خەرتووم رازیبوو لە ساڵی ٢٠١١ راپرسی بکرێت لەناو دانیشتوانی باشووری سوداندا ئەگەر دەنگیاندا بۆ سەربەخۆیی ئەوە خۆیان چارەنوسی خۆیان دیاریبکەن حکومەتی سودان دڵنیابوو کە دانیشتوانی باشووری سودان دەنگ بۆ جیابونەوە دەدەن، بەڵام ناچاربوو رێکەوتننامەکە ئیمزابکات و رازیبێت بەوداهاتووە، سەرئەنجام زۆرینەیان دەنگیان بۆ سەربەخۆییدا و رۆژی ٢٠١١/٧/٩ کۆماری باشووری سودان راگەیەنرا. یەك رۆژ پێش راگەیاندنی ئەو دەوڵەتە نوێیە حکومەتی خەرتووم بە رەسمی دانینا بە سەربەخۆیی ولاتی کۆماری باشووری سوداندا وەك ولاتێکی سەربەخۆ ناساندنی، بەلام رۆژنامەی (واشنتۆن پۆست)ی ئەمریکی دەمێك بوو پێشبینی جیابوونەوەی باشووری سودانی کردبوو، ئەوەش بە بەڵگەی پشتگیرکردنی راستەوخۆی بریتانیا و بلاوکردنەوەی ئایینی مەسیحییەت لە باشووری سودان و هاندانی خەڵکی ئەو ناوچەیە بۆ داواکردنی مافی چارەی خۆنووسین. دوایی شەڕ و قووربانییەکی زۆر لەکۆتاییدا دانیشتوانی باشوور گەیشتن بە ئامانجی خۆیان و سەربەخۆبوون لە بەڕێوەبردنی ولاتدا.

باشووری سودان دوایین دەوڵەتی راگەیەندراوی سەربەخۆیە و ٥٤هەمین ولاتی کیشوەری ئەفریقیایە و ١٩٣هەمین دەوڵەتە لەجیهاندا، یەکێکە لە دەوڵەتە هەرە دواکەوتووەکانی ئەفریقا. ئێستا دوای سەربەخۆیی باشووری سودان و جیابوونەوەی لە باکوور شەڕ و ناکۆکی دووبارە سەریهەڵداوەتەوە لەنێوان هەردوولایاندا لەسەر مەسەلەی دیاریکردنی سنووری دەوڵەتی باشووری سودان و ناوچە نەوتییە جێناکۆکەکان.. نەتەوەیەکگرتووەکانیش هەڕەشەی سزادان لە هەردوولایان دەکات ئەگەر بە ئاشتییانە چارەسەری کێشەکانیان نەکەن.

## گرنگترین هۆکارەکان کە بوونەتە هۆی جیابوونەوەی دەوڵەتی باشووری سودان

١. ولاتی سودان ولاتێکی فرەجیاوازیی، زۆریی ئایینی، ئیتنی، رۆشنبیری و نەتەوەیی جیاوازە و لە باکووری سودان رۆشنبیری ئیسلامی عەرەبی سەردەستە و بە چاوێکی کەم سەیری رۆشنبیری کەلتوری باشوور دەکەن و ئەم گرێ دەروونییە رۆڵی سەرەکی بینوە لە قووڵترکردنەوەی کێشەکانی نێوان باکوور و باشوور.

٢. پەنابردنی حکومەتەکانی خەرتووم بەدرێژایی ٤٥ ساڵ بۆ رێگەچارەی سەربازی هەوڵی سەرکووتکردنی هەموو دەنگ و رەنگە جیاوازەکان بە لۆژیکێکی سەربازی، ئەمەش رۆژبەڕۆژ کێشەکەی قووڵترکردووەتەوە، چونکە مەحاڵە بە لۆژیکی سەربازی خواستی گەلان سەرکوتبکرێت و بەدرێژایی مێژوو ئەو ئەزموونە شکستیخواردووە، ئەگەر بە رێگەی زەبروزەنگەوە بۆ ماوەیەك نەتەوەیەکی بێدەسولات بێدەنگکرابێت لەکاتێکیتردا سەریهەڵداوەتەوە.

٣. بەهۆی جیاوازییە زۆرەکانی ئەو رووبەرە فراوانەی ولاتی سودان و بوونی داگیرکاری ئیستعماری و زۆری هۆیتر بەدرێژایی مێژووی ئەو ولاتە، باکوور و باشووری سودان نەیانتوانیوە تێکەڵبن و هاوئاهەنگییەکی پێکەوە ژیانی تێدابەرجەستەببێت، بەپێچەوانەوە رۆژبەرۆژ جیاوازییەکان قووڵتربوونەتەوە.

٤. دانیشتوانی سودان وەك پێکهاتەیەکی مەسیحی جیاواز لەڕووی رەنگ و کەلتور و رەگەزەوە هەموو کات ترسی توانەوە و نەمانی ناسنامەی خۆی بووە و لە هەوڵی سەلماندنی خۆیدا بووە، لەهەمانکاتدا باکووری موسوڵمان و

عەرەب و سپی خۆی بە نەتەوەیی سەردەست و خاوەندەسوڵات و هەژموون زانیوە و لە هەوڵی ئەوەدابووە کە ناسنامەی سودان عەرەبی ئیسلامی بێت و بەجۆرێك لەجۆرەکان خۆی بە باڵاتر و لەپێشتر زانیوە لە دانیشتوانی باشوور.

٥. بێگومان هەر لەکاتی دروستبوونی دەوڵەتی سودانەوە لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی رابردووەوە هەوڵی دەرەکی هەبووە بۆ زەقکردنەوەی کێشە ناوخۆییەکانی ئەو وڵاتە و لەکاتی پەنادانی ئۆپۆزیسیۆنی ئەریتیری و ئەسیوپی و ئۆگەندی لەلایەن حکومەتی خەرتوومەوە ئەو وڵاتانەش کەوتنەپەنادان و هاوکاریی بزووتنەوەی باشووری سودان ئەو هاوکاری و پەنادانە رۆڵی گرنگی بینی لە سەرکەوتنی ئەو بزووتنەوە و بەدەستهێنانی پشتیوانی ئەمریکی و وڵاتە رۆژئاواییەکاندا.

بۆیە لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە هەر نەتەوەیەکی جیهان ئەگەربێتو خاوەنی رەگەز و ئاین و زمان و کەلتوری تایبەت بە خۆی بێت، ئەوا پێویستی بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ هەیە لە چوارچێوەی سنووری یاساییدا. هەرێمەکانی باشووری سودان بەدرێژایی نیوسەدە لە شەڕ و ململانێدا بوون لەگەڵ حکومەتەکانی باکووردا، چونکە وڵاتی سودان جیاواز ی زۆری تێدابوو لەڕووی ئایینی، ئیتنی، رۆشنبیری و نەتەوەیی.. هتد، بۆ نموونە: لە باکووری سودان‌دا رۆشنبیری ئیسلامی عەرەبی دەستوڵاتداربوو، بە چاوێکی کەم سەیری رۆشنبیری کەلتوری باشوورییەکانیان دەکرد، ئەمەش بووە بە گرێکی دەروونیی لای دانیشتوانی باشوور لەبەرئەوە بەردەم شەڕی خوێناوییان هەڵدەگیرساند. ئەگەرچی دەوڵەتی باشووری سودان ئیستا سەربەخۆیە و بڕیاربەدەستی خۆیەتی، بەڵام تائێستاش شەڕ و ململانێ بەردەوامە لەگەڵ باکوورییەکاندا، بەهۆی ئەوەی کە هێشتا هەندێ ناوچە هەیە بەتەواوی سنوورەکەی یەکلاییەنەکراوەتەوە ئەمەش بووە هەوێنی هەڵگیرسانی شەڕ لەناوچەکەدا. دەبێت ئەوەش بزانین کە دەستبردن بۆ رێگەچارەی سەربازی و هەوڵی سەرکووتکردنی هەموو دەنگ و رەنگە جیاوازەکان و دژایەتیکردنی ئازادی ئاین و نەتەوەیی بە لۆژیکێکی سەربازی گرفت و کێشەکان قووڵتردەکاتەوە، چونکە مەحاڵە بە لۆژیکی سەربازی خواستی گەلان سەرکوتبکرێت. بەدرێژایی مێژوو ئەو ئەزموونە شکستیخواردووە، ئەگەر بە رێگەی زەبروزەنگەوە بۆ ماوەیەك بێدەنگکرابێت لەکاتێکیتردا سەریهەڵداوەتەوە و پاشان بە شکڵ و شێوازی نوێترەوە هاتووەتە مەیدانەوە.

•••


**سەرچاوەکان:**

**کتێبە کوردیەکان:**

١. د. جەزا توفیق تالیب: بایەخی جێوپۆلەتیکی دانیشتووانی هەرێمی کوردستانی عێراق، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکولینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٩

٢. دوره میر حەیدەر (مهاجرانی): بنەماکانی جوگرافیای سیاسی، و: هاوڕێ یاسین محەممەد ئەمین، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠١٠

٣. عیززەتوڵلاَ عیزەتی: جیۆپۆلەتیك، و: کەمال رەشید شەریف، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی ٢٠٠٤

٤. محەمەد عەبدولغەنی: جوگرافیا و پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان، و: د. جەزا تۆفیق تالێب و ئەحمەد عەلی ئەحمەد، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥

**کتێبە عەرەبییەکان:**

٥. احمد ابو سعدة: من المنشورات الالكترونية لوزارة الثقافة، الهئية العامة السورية للكتاب، ٢٠١٠، الفصل الثانى

٦. الاستاذ. علي عباس حبيب: الفدرالية والانفصالة في افريقيا، دراسات عن جنوب السودان، مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٩

٧. بداية ازمة جنوب السودان، كتبهات ملوك النيل، في ٢٤ مايوى ٢٠٠٨

٨. مصطفى احمد ابوالخير: ازمات السودان الداخلية والقانون الدولي المعاصر، ايترك للطابعة والنشر، قاهرة، ٢٠٠٦

٩. عبدالله عبدالرزاق ايبراهيم: المسلمون والاستعمار الاوروبى الافريقيا، عالم معرف الكويتية، سنة ١٩٨٩

١٠. على شلش و الاخرون: جغرافية الاقاليمة المناخية، جامعة صلاح الدين، ١٩٨٧

١١. على عباس الحبيب: دليل الجغرافية، دار النشر للطباعة، القاهرة، ١٩٩٧

١٢. عمار حسن بشير: التغير السكانى (تاثره في ادراة الموارد الطبيعية في السودان بعد الانفصال)، الادارة والتعليم للتخطيط والاقتصاد، خرطوم، سبتمبير، ٢٠١١

١٣. محمد رياض، كوثر عبدالرسول: افريقيا، دراسة لمقومات القارة، دار النهضة العربية، ١٩٧٨

١٤ب.د. احمد ابراهيم دياب: الهوية السودانية عبر التاريخ، دراسة تحليلية تاصلية تاريخية، عميد مركز البحوث و الدراسات.

**English books:**

١٥- D the Africa development bank,the political economic of south sudan.a scoping analytical study.

١٦-Richard Mulir, Modern political Geography, Na, Cmillan – london, 1975, p2

١٧-Uncertain future: armed violence in southern Sudan. by Claire McCoy and emile lebrun.

**توێژینەوە:**

١٨. شاخەوان عەلی مەحمود و شێرزاد سالح: کێشەی باشووری سودان، توێژینەوەی هەردوو خوێندکارە پێشکەشی ئەنجومەنی کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکانی بەشی جوگرافیای زانکۆی سلێمانییان کردووە، وەك بەشێك لە پێویستییەکانی پلەی بەکالیۆرس لەجوگرافیادا، بەسەرپەرشتی، د. جەزا تۆفیق تالیب، ٢٠٠٧.

**دیراسات:**

١٩. عمر محمد عبدالله: اقليما كردستان العراق و جنوب السودان، دراسة مقارنة، مجلة كولان العربى، مؤسسة كولان للثقافة والاعلام عدد (٥١) اربيل، ٣١ اب، ٢٠١٠

٢٠. جيلبرت خاديا جالا: دراسات عالمية، شرق افريقيا الامن وارث الهشاشة، مركز الامارات للدراسات والبحوث الاستراتيجية، بدون سنة.

٢١. دراسة انفصال جنوب ســـودان و تداعيات على الامن القومي العربي، ديسمبر ٢٠١١ بدون صفحة و اسم الكاتب
٢٢. سامر اسماعيل: مركز الكشاف للمتابعة والدراسات الاستراتيجية، القسم الخامس/ مخصص للسودان، ٩- ١- ٢٠١١
٢٣. العاجبة الطيب مصطفى: بحث تكميلى، مقدم نيل، درجة مانجستير في دراسات الكوارث الرجين، العدد، ٨٦، الطبعة الاولى، ٢٠٠٩.

**ماڵپەرەکانی ئینتەرنیت:**

٢٤. www.ahram.org
٢٥. الصراع فى جنوب السودان، موسوعه المقاتل Al moqatel.com.، بحث عن مشكله جنوب السودان، فى ٨ - ٧ -٢٠١١.
٢٦. www.aljazeera.net
27. www.alrakoba.net
28. www.ara.reuters.com
29. www.asskeenh.com
٣٠. www.bbc.co.uk\arabic\business\٢٠١٢
31- www.wikipedia.com
٣٢. جون ادم، جنوب السودان، موقع www.bbc.co.uk /news/world-Africa.
٣٣. حسن محمد علوى، الحرب فى جنوب السودان، www.aljazeera.net
٣٤. www.sudanjournal.com

# بۆ ئەوەی شوێنەوار و كەلتوری شارستانی وێران نەكرێن

ئامادەكردنی: گۆڤاری كۆچ

یاداشتی كەمپینی ١٧ ملیۆن كەسی بۆ پاراستنی شوێنەوار و كەلتوری شارستانی كوردستان

یاداشت بە (١٠٠٠) دانە چاپ كراوە لە (٢٦٠) لاپەڕەی گەورەدا پێشەكیەكەی بە زمانی كوردی شێوە زاری كوردی كرمانجی خوارو و كرمانجی سەرو و بەزمانی عەرەبی وتوركی و ئینگلیزی نوسراوە.

لە پێشەكیەكەیدا نوسراوە چۆن دەستەی باڵای كەمپین توانیویەتی پتر لە حەڤدە ملیۆن خەڵكی كوردان لەسەر ئەم یاداشتە كۆبكاتەوە كە پێشتر هێندە كورد لەسەر هیچ قەزیەیەكی نیشتیمانی كۆنەبونەتەوە لە كوردی ئیسلام و ئێزیدی و لە مەسیحیەكانی كلدان و سوریان و ئاشوری بۆ بەرگری كردن و پاراستنی مێژوو شوێنەوار و كەلتوری شارستانی كوردستان.

(٩٦) لاپەڕەی یاداشتە و ئەوەی دیكە ناوی حزب و ڕێكخراو و ئەو كەسانەیە كە ئیمزایان لەسەر كردوە. داخوازیەكانی كەمپین (١٩) خاڵە. دانەی یاداشتەكە دراوەتە چەندین كەس و لایەن لەوانە پەرلەمان و سەرۆكی هەرێم و سەرۆكی حكومەتی هەرێم و یونسكۆش.

یاداشت بەوپەڕی زانستیانەو بە بەڵگەو وێنەوە نوسراوە وێنەی هەندێ شوێن وەك نمونەیەك لەو شوێنەوارانەی لە ماوەی ئەم (٢٣) ساڵەی دەسەڵاتی كوردیدا وێران كراون لەلایەن خەڵك و لەلایەن دائیرەكانی حكومەتی هەرێمەوە كاول كران و لە (گردی قشڵە) ی خاوەن مێژووی شەش (٦٠٠٠) هەزار ساڵەییەوە دەستی پێكردوە كە لە بەردەمی مزگەوتی گەورەی سلێمانی فرۆشرا بە دەوڵەمەندێك لەلایەن سەرۆكی ئیدارەی سلێمانی پێشوو ەوە پاش ئەوەی كە ئاگادار كرا بە یاداشتێك بە ئیمزای هەزار و دە كەس كە ئەم گردە شوێنەوارە و بنچینەی میژوی شاری سلێمانییە و نابێ تێك بدرێ.

كەمپین لەسەر ئاستی كوردستانی گەورەیە و لە یاداشتەكەیدا نوسراوە چۆن توركیا مێژوو شوێنەوار و كەلتوری شارستانی كوردستان وێران دەكات و چۆن زۆر لە خاكی كوردستانی باكور نقوم دەكات لە ژێر ئاوی ئەو بەنداوانەی لەسەر ڕوباری فورات و دیجلە دروستی دەكات و پڕۆژەی ( GAP)ی توركیا كە (٢٢) بەنداوە شەش بەقەدەر هەمو پارێزگای سلێمانی لەژێریاندا نقوم دەكات كە (٧٦٠٠٠) كیلۆمەتر دوجایە.

یەك لەو شوێنەوارە مێژوویی و کەلتورییانە شاری (حەسەن کەیف) (HESEN KEFE)ە. تورکیا بۆ چەندین مەبەستی ڕەگەز پەرستی ئەم کارە دەکات لەوانە بچوك کردنەوەی کوردستان کەئەمەش زۆر خەتەر ناکترە لەوەی صدام کردویەتی لە ئەنفال و بۆردومانە کیمیاویەکانی هەڵەبجە و ناوچەکانی دیکە.

هەروەها یاداشت باسی وێران کردنی شوێنەوار و مێژوو کەلتوری شارستانی کوردستانی ژێر دەستی ئێرانیشی کردوە و نمونەی لێ هێناوە و باسی سێ بەنداو دەکات  کە ئێران لەسەر ڕوباری ئەڵوەند و سیروان و زێی بچوك دروستی کردوە کەزەرەر و زیانێکی زۆری هەیە بۆ کوردستانی باشور لەڕویی ئابوری و سیاسیەوە هەروەها باسی وشك کردنی دەریاچەی (ئورمیەی) کردوە و هەتا بوەتە هۆی تێکدانی ژینگەش لەبەشێکی زۆری کوردستانی ڕۆژهەڵات. یاداشت داوا لە کورد دەکات دژی ئەم کارانەی تورکیاو ئێران بوەستێ.

ئەم یاداشتە گەورەترین یاداشتە کە تا ئیمڕۆ نوسرابێ لە بابەتی خۆیدا وەك چۆن ئەمە گەورەترین کەمپینە لە مێژوی کورددا  تا ئێستا و لە وانەیە یەکەمین جار هۆی نەنوسینی مێژووی کورد لەلایەن  کورد خۆیەوە لەم یاداشتەدا شی کرابێتەوە کە پێشتر چەندین کەس هەوڵی شی کردنی ئەم مەتەڵەیان داوە و بۆیان نەدۆزراوەتەوە و بۆیان شی نەکراوەتەوە .

ئەوەی ئەم یاداشتە بخوێنی دەزانێ ئەوەی ڕاسپێردراوە بە نوسینی دەیان ساڵە سەرقاڵی کێشەکانی  مێژوو شوێنەوار و کەلەپوری شارستانی کوردستان بووە .

یاداشت زۆر بە وردی چوەتە نێو مێژوو و کاریگەری ڕابردوو ی لەسەر بیری نەتەوایەتی لە ل **٣٣-٣٦** ئەم بابەتە وەها نوسراوە:

((شوێنەوار بناغەی مێژووە و مێژووی شارستانی کۆنی کوردستانە لەبەرئەوەی مێژو و شوێنەوار و سامانی بەڵگەنامەیی و هونەری تەلارسازی نەتەوەیی کاریگەری زۆرە لەسەر زیندوکردن و گەشەپێکردنی بیری نەتەوەی و هۆشیارکردنی گەل، دەوڵەتە ئیستعماریەکان و داگیرکەران هەوڵیان داوە میللەتانی ژێر دەستیان بیر لەم بابەتانە نەکەنەوە و بیر لەڕابوردوی خۆیان نەکەن و هەوڵیان داوە دیوارێك لە بەینیان و بەینی مێژوو ڕابردویان دروست بکەن وە میللەت بەرەو داڕزینی فیکری و کۆمەلایەتی و دەرونی و کەسایەتی ببەن.

لەبەر ئەمە مستەفا کەمال(ئاتاتورك)وتویەتی:(ئەگەر بتەوێ میللەتێك سەرگەردان بکەی مێژو و کەلتوریان لەنێوببە) جا ئەوەی ڕویداوە لەم بیست و دوو ساڵەدا لە نێوچونی مێژو و کەلتوری کورد دەچێتە خانەی بیرو سیاسەتی ئاتاتورك بێ ئەوەی ئێمە هەستی پێ بکەین.

دەوڵەتە ئیستعماریەکان و دەوڵەتەداگیرکەرەکان چاکیان زانیوە ڕابردو دەبێتە هۆی شانازی کردن، شانازیش متمانە وە بڕوا بەخۆبون لەلای مرۆڤ پەیدا دەکات ئەمەش گیانی ناڕازی بون لەژێردەستی دەخولقێنێ ئەوەش دەبێتە هۆی سەرسەختی بەرامبەر داگیرکەر سەرسەختیش دەبێتە هۆی بەگژداچونی داگیرکەر، ئەوەش دەبێتە هۆی ڕزگاربون کەڤۆناغی کۆتاییە.

کەریم خانی زەند پاش نەمانی نادرشا توانی بەهێزی شمشێر بەسەر هەموو ئەوکەسانەدا زاڵببێ کەدەیان ویست جێگەی نادرشا بگرن وەئێرانی هەموی داگیر کرد لەگەڵ کوردستانی ڕۆژهەڵات ساڵی(١٧٥٠)بەلاّم کەریم خان

ناوی خۆی نەکردە(شاهەنشاه) بەڵکو نازناوی (وەکیل)ی بۆخۆی پەسەندکرد یانی وەکیلی شاهەنشاهی ئێران لەکاتێکدا شاهەنشاه نە لە ئاسمان و نە لە ژێر بیر بونی نەبو. کەریم خان جەسارەتی نەکرد و خۆی بەلائق نەزانی بڵێ من شاهەنشاهی ئێرانم چونکە شتێکی لەڕابردوی کورد نەدەزانی بەگوێرەی مێژوو وەشوێنەوارانی هەزاران ساڵ ، نەیدەزانی کۆنترین شارستانی لەجیهاندا لەولاتەکەی کەکوردستانە هەڵقولاوە و بلاوبوتەوە لەولاتانی دەوروبەر ، هیچی نەدەزانی (لەدەولەتی گوتی)کە سەد ساڵ لەهەموو عێراق حوکومی کرد و (ئۆتۆنۆمی)ی دایە سۆمەریەکان کەیەکەمین نیزامی ئۆتۆنۆمی یە لەمێژوودا ، نەی دەزانی شارستانی لەکوردستانەوە چۆتە عێراق چونکە پێش ئەوەی خەڵکی کوردستان بچن بۆ ناوەندو باشوری عێراق و ئاوەدانیی بکەن شوێنەواری هیچ مرۆڤێك نەدۆزراوەتەوە لەناوەندو باشوری عێراق، نەی دەزانی شارستانی سۆمەرو ئەکەد درێژەپێدانی شارستانی شاخەکانی زاگرۆس بوە ، نەدەزانی (دەولەتی ماد)یش دەولەتی کورد بوە تاشانازی بەوڕابردوەوە بکات. کەریم خان تەنیا ئەوەی زانیوە کەکوردە وەکوردیش هەر ژێر دەست بوە وەخزمەتکاری ئەم دەولەت و ئەو دەولەتە بوە وە نەتەوەیەکی نزم بوە وەلایق نەبوە ببێتە خاوەن دەولەت وە تا ئەو دەولەتەی خۆی دروستی کردبو لە ئێران لایق نیە بەناوی کوردەوەبێت ، ئەو زوعف و بێمتمانەیی وەخۆبەکەم زانینەی لەنەفسیەتی کوردا چەسپی بو بەهۆی (ژێردەستی)یەکی دوورو درێژ لەبیرو هۆش و نەفسیەتی کەریم خانیشدا چەسپی بو ئیتر خۆی وەك کوردێك لایق نەدی بڵێ من شاهەنشاهم ، من شای ئێرانم بەڵکو وتی من وەکیلی شای ئیرانم بەلام(محمد ئاقای)قاجار کاتی دەسەلاتی وەرگرت لەنەوەکانی کەریم خان کەتورکمان بو و(نێرەموك)یش بوو یەکسەر ڕاگەیاند کەشای ئێرانە.

عادەتی وازهێنانی کورد لەزمانەکەی بەئاسانی و قسەکردن بەزمانی بێگانە هەر بەهۆی ئەو هۆکارانەی سەرەوەیە نمونەی ئەم بوارە زۆرە وەك کوردی فەیلی و کوردێکی زۆری دیکە لەناوەندو باشوری عێراق و هەروەها کوردێکی یەکجار زۆری باکور کە وازیان لەزمانی خۆیان هێناوە و بەتورکی قسە دەکەن کە ڕەنگە بگاتە چەند ملیۆنەك. ئەم عادەتە کەلەکۆنەوە لەلای کورد هەبووە بۆتە هۆی بزربون و توانەوەی کوردێکی زۆر لەنێو نەتەوەکانی دیکەدا لەئەفغانستان و قەفقاسیایەوە بگرە تا یەمەن و میصر و باکوری ئەفریقیا وە تاهەرێمی (کوردۆڤان) لەسودان.

ئەمەیە مانایی ڕابردو وەشانازی کردن بەڕابردو.دەبایە دەسەلاتی کوردی لەماوەی ئەم بیست و دوو ساڵەدا رابردو زیندوبکاتەوە لەنێوخەڵکدا نەك بەوێرانکردن و سڕینەوەی شوێنەوارەکان درێژە بدات.

هەر لەبەر ئەوەی مێژو و شوێنەوار کاریگەری زۆری هەیە لەسەر گەشەکردنی بیری نەتەوەیی و شانازی کردن بەڕابردو دەزگا جاسوسیەکانی دوو دەولەتی دراوسێ بەپیلانێکی داڕێژراو وێران کردنی شوێنەوارو شوێنەکانی مێژووی و کەلتوری کوردستان و قەبرستانەکانی باوو باپیران تاقەبری پیاوچاکان کەلەلای خەڵك پیرۆز بوە کردە ئامانج لە سەرەتای ڕاپەڕینی(١٩٩١)وە بەلام لەبەرئەوەی خۆیان ڕاستەوخۆ نەیان دەتوانی ئەم کارە بکەن بەخەڵکێکی ساویلکە ی بێ هۆش و بیرو بێ مامۆستا لە کورد ئەم پیلانەیان دایە جێ بەجێ کردن، دەزگا جاسوسیەکان بەهۆی تاقمە قاچاخچیەکانی خۆیانەوە درۆ دەلەسەی هەبونی خزنە و زێڕ و مرواری لەژێر شوێنەوارەکان تا لەنێو شاخە بەردەی رەق و تەقی ژێر پایە پردە کۆنەکان لەنێو خەڵکدا بلاوکردەوە هەروەها هەبونی

خزنە لەنێو ئەشکەوتەکان و هەبونی ئەڵماس لەنێو بەردە ئاشە کۆنەکان تا بلاٌویان دەکرد کەوەختێك دەرمان هەبوە و کاتێ لەبەردیان دەدا نەرم دەبو وەك هەویر و زێرو خەزنەیان تێدا دەشاردەوە هەروەها درۆ و دەلەسەی هەبونی زێرو زیو لەنێو قەبری شێخە بەناوبانگەکان و قەبری ناودارە کوردەکانیش تا خەڵك قەبرەکانیان تێکی بدەن و سوکایەتی یان پێ بکەن، سوکایەتی بەباو و باپیرانی خۆیان بکەن و ببێتە میللەتێکی ساویلکە و گێل وەنەفسیەت نزم و دارزاو و بێ بناغە .

ئیتر ئەوە رویدا کە رویدا لەم بیست و دووساڵەی رابوردودا وەك ئاشکرایە لەلای هەمو خەڵکی کوردستان.

بێ گومان ئەمە جەنگێکی رۆشنبیری بوو ئەو دوو دەوڵەتە لەگەڵ کوردی بەرپاکرد بۆ وێران کردنی رۆشنبیری کۆنی کوردستان و وێران کردنی مێژووی کورد و وێرانکردنی شارستانیەتی کۆنی کوردستان کە کۆنتربوە لەشارستانی هەمو ولاٌتانی دیکە ، کە خۆیان ئەوشارستانیە کۆنەیان نەبوە. میللەتانی زیندو بەئاواتن دیوارێکی کۆن لەژێر ئەرز و بەهۆی دروستکردنی شەقامێکی سەرەکی دەرکەوێ لەنێوشارەکانی وەك لەندەن و پاریس و بەرلین و رۆما تاشانازی پێوەبکەن و بپارێزن تا ئەو دەوڵەتانەی لەسەر دەریان لەژێر دەریاش لەشوێنەوارەکانیان دەگەرێن تا بیان دۆزن وەدەریبێنن و بیان پارێزن.

دەزگا جاسوسەکانی دوو دەوڵەتی داگیرکەر بەهۆی ئەو جەنگە رۆشنبیریەوە کە کاریگەر تربوو لەجەنگی چەکدارانە ویستیان میللەتی کورد سربکەن لەبواری فیکریەوە وەك سرکردن بە حەشیش و ئەفیون و گیانی شانازی کردن بەرابردوو لەنێو کورد بکوژن تا متمانە و بروا بەخۆی و بەمیللەت و نیشتمانەکەی نەمێنێ تاببێتە میللەتێکی ساویلکە وبێ هیمەت و سست و خاو دارزاوی بێ رەوشتی بێ هۆش و بیر بەگوێرەی بیرو خواستی ئاتاتورك لەکاتێکدا نەوەکانی ئاتاتورك ناهێڵن گەشتیارێك لەنێو شاری ئەنقەرە دەست لەدیوارێکی کۆن بدەن تا ئەگەر بۆ متفەرکیش بێت. سەرکردایەتی هەردوو حزب یەکێتی و پارتی بەگوێرەی زانیاریە نهێنیەکانیان بەم پیلانەیان دەزانی لەسەرەتاکانی سالاٌنی پاش راپەرینی(١٩٩١)بەلاٌم هەردوو حزب بەرهەڵستی ئەم پیلانەیان نەکرد. داگیر کەران جەنگە رۆشنبیریەکەیان فراوان کرد تا شارەکانیش بگرێتەوە بۆ وێران کردنی بیناکانی مێژووی و کەلەپوری و گەرەکە کۆنەکان و نەهێشتنی هیچ سیمایەکی کۆن لەنێوشارەکاندا تاهەندێ لەکاربەدەستە گومان لێکراوەکان و دەوروپشتیان لەچینی چڵکاو خۆر کەخوێندەواریش بون بلاٌویان دەکرد و دەیان ووت ئەوخانو کۆنانەو ئەو خانو نەخشدارە رزیوەکان چی سودی هەیە بۆ کورد بابروخێندرێن و بینای نوێ لەشوێنیان ئاوا بکرێت و شوێنیان بکرێ بەدوکان و بازار و گەراجی گشتی. خەڵك هەیە چاك دەزانێ ئەم بیرۆکە ژەهراوی یە لەدەرەوە هات بەهۆی کەسانی سەر بەدەرەوە. ئەمەشیان بلاٌوکردو دەیان ووت زۆر لە قەلاٌو بینا گرنگەکانی کوردستان داگیر کەران ئاوایان کردوە و یان شوێنی زوڵم و زۆرداری بون و با بێنە روخاندن تابەم هۆیەوە کەسانی گێل ئەوانەشی وێران بکەن ، دەیان ووت باسەرای سلێمانی بروخێنین چونکە حکومەتی عیراق زۆڵم و زۆرداری تێدا کردوە بەلاٌم نەیان دەوت با بارەگاکانی هەردوو حزبی دەسەلاٌتدار و بینای پەرلەمان وەهەندێ لەقەسرەکانی سەرکردەکان بروخێنین چونکە لەلای بەعسەوە ئاواکراوە و بارەگاکانی حزبی بەعس بون و ئەو هەموو زوڵم و زۆرداریەی بەعس تێیانداکراوە چونکە مامۆستایان پێیان راگەیاندبون بینا مێژوویەکان و کەلتوریەکان و گەرەکەکۆنەکان بدەنە روخاندن وەمەبەستیان ئەمانە بوو. جارێك

ساڵی(٢٠٠٤) وەکیل وەزیری رۆشنبیری لەلای هەندێ کەس ووتی با منارەی هەولێر بروخێت چونکە هی کورد نیە بەڵکو (سوڵتان مزەفەر) ئاوای کردوە و تورکمان بوە. ئەم بەرێزە نەزانیوە مێژوو بەپلەی یەکەم هی وولاتە لەپێش ئەوەی هی نەتەوە بێ، چونکە ولاّت دەمێنێ و نەتەوە و دەوڵەتان دێن و دەرۆن و هەرنەتەوەیەك هات دەبێتە وارسی هەموو نەتەوەکانی رابردو و هەموشوێنەوارو کەلتوریان دەبێ بیپارێزێ وەك تورکی ئاوارە کەئێستا لە(ئەنادۆڵ)خۆی بەمیرات گری هەمو ئەو گەلانەی پێشتر دەزانێ کە لە ئەنادۆڵ جێنشین بون و حوکومرانی کردوە و شوێنەوارەکانی خۆیان بەجێ هێلاّوە وەك هیتی(حپی) ئاریەکان و گریك و یۆنان و رۆمان و بیزەنتی، شوێنەوارەکانیان بەهی خۆی دەزانێ و دەپارێزێ چونکە هەموو شوێنەواری ئەو ولاّتەن کەئێستا تورکی تێدا دەژی کە ئەنادۆڵە. لەوانەیە زۆر لەکاربەدەستانی ئێمە پلەی رۆشنبیرییان لەهی بریکاری وەزیری رۆشنبیری بەرزتر نەبێت تا زۆر کەسیش دەڵێن کام لە بەرپرسان کتێبێك دەخوێنێ و تا هەندێکیش دەڵێن بەڵکو رۆژنامەش ناخوێنن.))

لە ل ٣٨ دا هاتوە :

((هەرسێ دەوڵەتی ئێران و تورکیا و سوریا بەرپرسن بەرامبەر شوێنەوار و مێژووی کەلتوری کوردستان یان پارێزن چونکە بەشێکن لە کەلتوری شارستانی جیهان.

جەنگی رۆشنبیری بۆ کوشتنی فیکرو بیرو هۆش و مێژووی و رۆشنبیری و گیانی شانازیکردن بەرابردو بوە. رژێمی بەعس و صدامیش تا توانی هەوڵی دا رۆشنبیرانی کورد دوربخاتەوە لەرابردو و شوێنەوارو مێژو و سامانی بەڵگەنامەیی (التراپ الوپائقی) و بابەتی کەلەپوری شارستانی کورد و سەرقاڵیان بکات بەشیعرو چیرۆك و وەرگێرانی شتی بێگانە بەمەرجێك ئەو شیعرە بێ تەئسیربێ و ئەو نوسینانەی بێگانەکانیش پەیوەندی بەکوردەوە نەبێت، رژێم لەمێژو و کەلەپوری شارستانی دەترسا چونکە دەبێتە گەشەکردنی بیری نەتەوەی کور وەك چۆن هەموو داگیرکەران لەوە دەترسان بۆنمونە دەسەلاّتدارانی فەرەنسا لە جەزائیر رۆژنامەنوسێکی فەرەنسی درایە دادگا لەبەرئەوەی دوو وتاری بلاّوکردبو لەبارەی هونەری تەلارسازی لەگەرەکە کۆنەکانی جەزائیردا دادگا تۆمەتباری کرد بەوەی کە ئەو بابەتە کاریگەری هەیە لەسەر گەشەکردنی بیری نەتەوەیی لەجەزائیر.))

یاداشت زۆر رەخنەی توندی لە دەسەلاّتی کوردی و حکومەتی هەرێم گرتوە کە فرسەتی بۆ هات بۆ بەرپا کردنی نەهزەیەکی فکری لە کوردستان و پاکسازی رۆشنبیری کوردی لەو گەندەڵیەی رژێمی بەعس تێی خستبو بەلاّم نەیان کرد و بەڵکو رێگەشیان لە پاکسازی رۆشنبیری کوردی گرت کە تاقمێکی رۆشنبیر پاش راپەرینی ١٩٩١ زۆر هەوڵی بۆ دا. لەم بارەیەوە لە یاداشتدا ل ٣٩ دا وەها هاتوە:

(( مخابن دەسەلاّتی کوردی لەمانای شوێنەوار و مێژو و کەلەپوری شارستانی و لەمانای رابردوو تێ نەگەیشتوە لەبەر ئەمە دەستی خەڵکیان بەرەلاکردوە لەوێران کردنی شوێنەوار و گەرەکەکۆنەکان و وێران کردنی رابردو و لەموحاسەبەکردنی مێژووش ناترسن ئەمە هەمووی بەپێچەوانەی خەونی هەندێ لە رۆشنبیرە راستەقینەکانی کورد بو لەسەرەتاکانی راپەرینی (١٩٩١) دەیاندیت وە وایان دەزانی دەسەلاّتدارێتی کوردی رابوون

(نهچه) یەکی فیکری لەکوردستان دەخولقێنێ و شۆرشێکی فیکری و ڕۆشنبیری بەرپا دەکات بۆ قەرەبوکردنی هەموو ئەو خەسارەتانەی سەدان ساڵ کورد توشی بوە لەم بوارانەدا بەهۆی دەوڵەتە داگیرکەرانەوە بەڵکو تاهەندێ لەوڕۆشنبیرانە لەنامەکانی خۆیاندا هانی کاربەدەستە گەورەکانیان دەدا بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێکی ڕۆشنبیری لەکوردستان چونکە هەر شۆڕشێکی راستەقینە لەجیهان بکرێ ئەو شۆڕشە مێژوو کەلتور دەکاتە بنچینەو پاڵپشت بۆخوی، فەلسەفە جۆراوجۆرەکان و لەپێش هەموان فەلسەفەی یۆنانی جەختی لەسەر ئەمە کردۆتەوە.

لەسەرەتای ڕاپەڕینەوە کۆمەڵێك ڕۆشنبیر لەم بیرە فەلسەفیە جیهانیەوە دەستیان پێکرد و لەدەوری ناوەڕۆکی زاراوی (اصلاح-پاکسازی) کۆبون واتا پاکسازی رۆشنبیری کوردی لەهەموو بوارەکانی شوێنەوارو مێژوو وەکەلەپوری شارستانی و ئەدەبی لەو گەندەڵیەی کەرژێمی بەعس توشی کردبوو، نامەو بەڵگەنامەکانی ئەم بوارە بۆ مەبەستی گۆڕانکاری و چاکسازی لەم وەرچەرخانە نوێیەدا نێردران بۆ سەرکردەکانی کورد و هەندێ نامە لەسلێمانییەوە نێردران بۆ رۆشنبیرانی هەولێرو بەهدینان تا داوای گۆڕانکاری و شۆڕشی رۆشنبیری بکەن لەسەرکردایەتی کورد، لەیەکێك لەو نامانەدا بەمێژووی (٢٣/٨/١٩٩١)ئەم دەقەی خوارەوە هاتوە (دەبێ حەرەکەی اصلاح دەست پێ بکەن ،پێویستی کورد ب گۆڕانکاری و ب شۆڕشی ڕۆشنبیری هەیە )وەك وێنەی ئەم نامەیەی بلاّو بوە لەگۆڤاری خاپور ژمارە (٣) (١٩٩١) وەجارێکی دیکەش دەق و وێنەی ئەم نامەیە لەبەهدینان بلاّوبۆتەوە.

لەم بوارەدا زۆر هەوڵ درا بەلاّم مخابن سەرکردایەتی کورد ڕێگربوو بەرامبەر ئەم دەنگە و هەوڵدانەکانی ئەم ڕۆشنبیرانەیان خاپورکرد و لەسەر هەمان گەندەڵی رۆشنبیری کوردی کاتی بەعس ڕۆشتن و متمانەیان دایە ئەو رۆشنبیرانەی دار دەستی بەعس بوون لەگەندەڵی کردنی رۆشنبیری کوردی و ئەمانەیان هێنایە ریزی یەکەم.

دواتر کۆمەڵێك رۆشنبیر لەژێر ناونیشانی (پاکسازی بزوتنەوی رۆشنبیری کوردی) یاداشتێکیان دا یە حکومەتی هەرێم و پەرلەمان و بەرەی کوردستانی و سەرکردایەتی هەموو حزبەکان و داوای پاکسازی رۆشنبیری کوردییان کرد لەگەندەڵی، یاداشتەکەش بلاّوکرایەوە لەرۆژنامەی (رێگای کوردستان) ژمارەی رۆژی (١١/٥/١٩٩٣) بەلاّم سودی نەبوو زۆر هەولّی دیکەش دراوە لەم بارەیەوە لەلایەن خودی ئەو کادر و ئەندامە حزبییە دڵسۆزو هۆشیار و دوربینەوە بەلاّم سەرکردایەتی حزبەکان گوێ نەداوە بە بیروبۆچون و ڕاپۆرتەکانیان. دەزگای ڕاگەیاندنەکانیش بەگشتی خراونەتە دەستی کەسانی لاواز لەبواری ڕۆشنبیریەوە وهەندێ لەکۆنە بەعسیەکان کەئەمە بو بەهۆی شێواندنی ڕۆشنبیری و مێژوو و بابەتە هونەرییەکان.

ئەگەر سەرکردایەتی کورد ئەو گیانە شۆرش گێڕانەی پاش ڕاپەڕین سەری هەڵدا لە کوردستان پەروەردەی بکردایە و بەرەو پێش تری ببردبایە و فراوانتری کردبایە لەهەموو شارو دێهاتەکان ئێستا کورد دەبوو بەنەتەوەیەکی پۆلاّیین لەبیرو هۆش و یکگرتن و گیانی بەرەنگاری بوون بەرامبەر داگیرکەران. نمونەیەك لەم گیانە ئەوەیە کەلەکاتی مانگرتنی کانونی یەکەمی ١٩٩١ لەسلێمانی و هەولێرو دهۆك وە چەند شارێکی دیکە کۆمەڵێك لەگەنجانی کەلار لەو سەرمایەدا بەسینگی ڕوتەوە و بەبێ کراس و بەپێ بەرێپێوانەوە هاتنە سلێمانی بۆ پیشتگیری کردنی مانگرتوەکان ونیازیان بوو بەو جۆرە رێپێوانەوە بچن بۆخاڵی سنور لەخاپور هەروەها هەندێ لەخەڵکی سلێمانی بەسنگی ڕوتەوە و بەو جۆرە رێپێوانەوە چون بۆ هەولێرو دهۆك بۆلای مانگرەکان کە ئامانجی ئەو مانگرتنە لابردنی

ئابلوقەی ئابوری بوو لەسەر کوردستان و داخلّ کردنی کەرکوك بۆ نێو ناوچەی ئەمنی وەفراوانکردنی هێلّی ئەمنی ٣٦ بۆ هێلّی ئەمنی ٣٤ بۆ شاخی حەمرین وە هەروەها دیاری کردنی بارودۆخی قانونی کوردستان پاش ئەوەی کەحکومەتی عیراق ئیدارەکانی خۆی لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان کێشایەوە. بەلاّم مخابن ئەم گیانە شۆرش گێرانەی سەری هەلّدا پاش راپەرینی ١٩٩١ وردە وردە خامۆش کرا تائیمرۆ دەبینین کۆمەلّگای کوردی بەرەو قۆناغی دارزین (انحلال)دەچیّ تا دەستەو تاقمێك پەیدابووە کە خۆشیان بە کورد پەروەر دەزانن فەیسبوك و سایتەکانیان کردۆتە مەیدانێکی پان و بەرینی شەرە جنێو بەیەکترو بەحزبەکان و تا سەرکردەکانی شۆرشەکانی کورد. بێگومان ئەم دارزینەشی هۆیەکانی خۆی هەیە .

(جگەر خوێن)ی مەزنیش وتویەتی: ئەحمەدی خانی بەناقوسا مەزن نەکاری کوردی هشیار بکە.

بیر مەندی کورد ئەحمەدی خانیش وتویەتی:

ئەزمامە دحکمەتا خودێدا          کرمانجی د دەولەتا دنێدا

یاداشت زۆر باسی لەوێرانکردنی قەبرستانەکان کردوە لەلایەن دائیرەکانی حکومەتی هەرێمەوە و نوسیویەتی ئەو کارە پێچەوانەی ئاین و یاساو ئەخلاق و مافی گشتی یە و نوسیویەتی بەگوێرەی یاسای شوێنەواران قەبرستان شوێنەوارە و دەبیّ بپارێزرێت و نمونەی بە وێنەوە هێناوە لە وێران کردنی قەبرستانەکان و پتر لە هەمویان قەبرستانی دۆلّی ئەصحابان لە سماقولّی لە باکوری (کۆیە) کە دائیرەی رێگەوبانی هەولێر قەبری ئەصحابان و کوژراوە کوردەکانی لەنێو بردوە کە دەوری (٥٠٠) کەس لە هەردوولا کوژراوە لە سالّی (٢٢کۆچی =٦٤٢زایینی) ە هەمویان لە مەیدانی شەرەکەدا نێژرابون. لە ل ٩٠ دا باس لە وێران کردنی گەرەکە کۆنە کەلتورییەکانی شاری سلێمانی کردوە کە دەسەلاّت لە سلێمانی بە وێران کردنی داوە و بەشێکی گەورەن لە کەلتوری شار و ئەوەی ماوە دەبیّ بپارێزرێن.

•••

# عەلی شەریعەتی ..

# ئەو کەسەی هەموو رۆژێك تیرۆر دەکرێت!

نووسینی: حەبیب محەممەد دەروێش




عەلی شەریعەتی لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٣) لە یەکێك لە گوندەکانی سەبزەوار بەناوی (مزینان) لەدایکبووە، سەبزەوار یەکێکە لە شارەکانی پارێزگای خوراسان کە دەکەوێتە لێڕەواری دەشتی گەورە بەناوی (کوێر).

باوکی محەممەد تەقی شەریعەتی، یەکێکە لە راڤەکارە ناسراوەکانی قورئانی پیرۆز و لە گەورە بیرمەندان و تێکۆشەرە موسوڵمانەکانە و دامەزرێنەری سەنتەری (بڵاوکردنەوەی راستییەکانی ئیسلام) کە ئەرکی هۆشیارکردنەوەی جەماوەر بوو سەبارەت بە رۆڵی راستەقینەی ئاین لەکۆمەڵگەدا.

شەریعەتی لە سەرەتای ژیانییەوە دەستیکرد بە چالاکی سیاسی، بۆیە هەر لە قۆناغی دواناوەندی خوێنکاریدا پەیوەندیکرد بە باڵی گەنجانی بەرەی نیشتیمانی. شەریعەتی لە ساڵی ١٩٥٤ چووە کۆلێژی ئادابی زانکۆی مەشهەد. لە زانکۆ زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی دامەزراند سەبارەت بە ئامانجەکانی ئیسلام، ئەمەش بەپشتبەستن بە هەوڵەکانی باوکی لەو بوارەدا.

کاتێك دەسەڵات لە ساڵی ١٩٥٨ دەستی وەشاند لە بزووتنەوەی بەرگری نیشتمانی و هەڵیوەشاندەوە، عەلی شەریعەتی لەکاتێکدا هێشتا خوێندکاری زانکۆ بوو بۆ ماوەی شەش مانگ بەندکرا. دوای تەواوکردنی زانکۆ بە پلەی نایاب لە ئاداب، لە ساڵی ١٩٥٩ لە نێردەیەکی خوێندندا نێردرا بۆ فەرەنسا، لەوێ لەپاڵ خوێندندا درێژەیدا بە چالاکییە سیاسییەکانی و لقی ئەوروپای بزووتنەوەی رزگاری ئێرانی دامەزراندا، ئەم بزووتنەوەیە لە لایەن ئایەتوڵڵا تالەقانی و مەهدی بازرگانەوە لە ساڵی ١٩٦١وە دامەزرابوو.

لە فەرەنسا، دەستیکرد بە خوێندنی مێژووی ئایینەکان و زانستی کۆمەڵناسی و ئاداب و سۆسیۆلۆجیای ئایینی کرد بە مەیدانی تایبەتمەندی خۆی، بۆیە دکتۆرایەکی لە سۆسیۆلۆجیای دینی بەدەستهێنا و دکتۆرایەکیتریشی لە مێژووی مەعریفەی ئایینەکان بەدەستهێنا.

عەلی شەریعەتی بەردەوامبوو وەك تێکۆشەرێك لەپێناو رێکخستنی بزاڤی ئیسلامیدا لەدەرەوە و رۆڵی هەبوو لە پێکهێنانی یەکەم ناوکی کۆمەڵە خوێندکارییە ئێرانییەکان لە دەرەوە و هەروەها یەکێك بوو لەو چالاکوانە

دیارانەی کە پشتگیری شۆڕشی جەزائیری دەکرد، خۆپیشاندانەکانی ڕێکدەخست و بەشداری کاریگەری هەبوو لەو چالاکییانەی کە ڕێکدەخرا بۆ پشتگیری لەو شۆڕشە، بۆیە لە دەوڵەتی فەرەنسییەوە دەسگیرکرا و خرایەزیندانەوە.

هەر لە فەرەنسا شەریعەتی ناسراوی پەیداکرد لەگەڵ تێکۆشەرەکانی جیهانی سێ، لەوانە (ئیما سیزار، فرانز فانون) کە بەشێك لە کتێبەکەی فانونی بە ناوی (ستەمدیدەکانی زەوی) وەرگێڕا بۆ سەر زمانی فارسی. لەکاتی گەڕانەوەی شەریعەتی بۆ ئێران لە ساڵی ١٩٦٣ لەسەر سنوور دەستگیرکرا و پاش ماوەیەك ئازادکرا و بۆ سوکایەتیکردن بە کەسایەتی زانستی و ئەکادیمی وەك مامۆستای خوێندنگەیەکی سەرەتایی گوازرایەوە لە یەکێك لە گوندە دوورەدەستەکان.

شەریعەتی لە تراوگەکەی بەردەوامبوو لە چالاکی کلتوری خۆی و دەستیکرد بە ووتنەوەی ئەو وانە گشتییانەی کە ئامانجلێی ڕۆشنگەری ئایینی بوو.

دەنگی شەریعەتی زایەڵەی زانایەکی دڵسۆز و لەهەمانکاتدا قووڵ بوو، ئەمەش بەشێوەیەك کاریگەربوو ژمارەی بەشداربووانی وانەکانی کەمترنەبوو لە سێ هەزار تا چوار هەزار بەشداربوو.

لەژێر ئەو هەژموونەی شەریعەتی پەیدایکرد دەسەڵات ناچاربوو وەك مامۆستا بیگوازێتەوە بۆ زانکۆی مەشهەد، لەزانکۆدا شەریعەتی درێژەیدا بە چالاکییە فیکری و کلتورییەکانی، لەماوەی ئەو چوار ساڵ و نیوەی لەزانکۆدا بوو بەردەوام ناوی دەگەشایەوە وەك مامۆستایەکی باوەڕدار و خاوەن فیکر و کلتورێکی رەسەن. دەسەڵات بەم کاریگەری و چالاکیانەی شەریعەتی تەنگەتاوبوو، بۆیە بڕیاریدا دووریبخاتەوە لە زانکۆ و خانەنشینیبکات.

لە ساڵی ١٩٦٩ حوسەینییەی ئیرشادی لە تاران دامەزراند، دوای ماوەیەك بوو بە سەنتەرێك بۆ چالاکییەکانی شەریعەتی و دەستیکرد بە وتنەوەی کۆمەڵێ وانە لەبارەی ئیسلام و مێژووی شیعە لە چوارچێوەی تێڕوانینی بۆ ئیسلام، بەشێوەیەك ویستی کۆمەڵێ چەمکی باوی هەڵە سەبارەت بە ئیسلام ڕاستبکاتەوە.

نەوەیەك لە گەنجان لە دەوری چالاکییەکانی حوسەینییەی ئیرشاد کۆبوویەوە و وانەکانی شەریعەتی لە شێوەی مەلزەمە و لەسەر کاسێت تۆماردەکرا بە هەزارەها بەناو ئێراندا بڵاودەکرایەوە، بۆیە دەوترا شەریعەتی هەموو کۆمەڵگای کرد بە زانکۆیەك و وانەکانی تیادادەوتەوە.

لە ساڵی ١٩٧٢ دەسەڵات هیچ چارەسەرێکی نەما بێجگەلە داخستنی حوسەینییەی ئیرشاد و دەستگیرکردنی هەریەك لە عەلی شەریعەتی و باوکی و هێشتنەوەیان لەزینداندا بۆ ماوەی هەژدە مانگ، لەو ماوەیەشدا بە دڕندانەترین شێواز ئەشکەنجەدران.

بە نێوانگیری و داوای بەرپرسە جەزائیرییەکان لە ساڵی ١٩٧٥ ئازادکران، بەڵام شەریعەتی خرایەژێر چاودێری و هەموو چالاکییەکی ئاشکرای لێقەدەغکرا.

لە ئازاری ساڵی ١٩٧٧ تارانی بەجێهێشت بەرەو لەندەن لەڕێگای بەلجیکا و فەرەنسا، بۆئەوەی لە لەندەن قۆناغی نوێ لە چالاکی لەدەرەوەی وڵات دەستپێبکات، دوای ئەوەی هەموو ڕێگاکانی لەناو ئێراندا لەبەردەمدا داخرا.

دوای مانگێك لە مانەوەی لە لەندەن لەلایەن هەواڵگری شای ئێرانەوە (ساواك) بەشێوەیەکی تەمومژاوی تیرۆرکرا، ئیران رێگەینەدا جەنازەکەی بهێننەوە بۆ ئێران، بۆیە لەسەر پێشنیار و دەستپێشخەری سەیید موسا سەدر تەرمەکەی گوازرایەوە بۆ سوریا، بۆئەوەی لەتەنیشت مەرقەدی سەییدە زەینەب کچی ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیب بنێژرێ، عەلی شەریعەتی زیاتر لە سەد کاری لەدوای خۆی بەجێهێشت کە وەرگێڕاوە بۆ زۆربەی زمانە زیندووەکانی دنیا (ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەرەنسی، ئیسپانی، ئیتالی، تورکی، ئوردی، مالی، ئەلبانی، بنگالی، تامیلی و عەرەبی کە زۆرترینیان لەلایەن (دار الامیر) بۆ کلتور و زانست لە بەیروت کراوە بە عەرەبی، تائێستا چەند ژمارەیەکی کەم لە کتێبەکانی وەرگێڕاوەتەسەر زمانی کوردی کە لە پەنجەکانی دەست کەمترن و بەشێوەیەکی پەرشوبڵاو و لێرەولەوێ لەلایەن هەندێ لە وەرگێڕە کوردەکانەوە کراوە.

شەریعەتی کاریگەرییەکی زوری دکتور موسەدیق وەك کەسایەتییەکی نیشتمانی ئێران، بەتایبەتی کاتیك هەستا بە بەڕێوەبردنی هەڵمەتی خۆماڵیکردنی نەوتی ئیران، بۆیە شەریعەتی لە ساڵی ۱۹٥٤و هەر لە قۆناغی دواناوەندیدا چووە ریزی رەوتەکەی موسەدیقەوە.

لە ئاستی جیهانیدا کەوتەژێر کاریگەری کۆمەڵێ بیرمەندی گەورەی وەك (فرانز فانون، جان پۆڵ سارتەر، ریمۆن ئارون، ماسیبۆن، ماك بریك، هینری ماسیە).

بەهۆی بیروبۆچوونەکانی لەسەر مێژوی شیعە و بەتایبەتی شیعەی سەفەوی و رەخنەگرتنی لە زانا گەورەکانی سەردەمی سەفەوییەت لە (مەجلیسی و عامیلی) و بە خورافات سەیرکردنی بیروباوەڕەکانی و رەخنەگرتنی دەسەڵاتی رۆحانییەت لە حەوزەکان لەلایەن کومەڵێ لە مەرجەعە گەورەکانی شیعەوە لە ئایەتوڵڵا و ئاتوڵڵاعوزماکان فەتوای حەرامی خوێندنەوەی کتێبەکانی دراوە لەوانە:

١. ئایەتولا مالیك ئەلحوسەینی.
٢. ئایەتولاعوزما سەیید کازم ئەلمورعیشی.
٣. ئایەتوڵڵاعوزما سەیید محەممەد سادق ئەلحوسەینی ئەلروحانی.
٤. ئایەتوڵڵاعوزماسەیید محەممەد سادق تەباتەبائی.
٥. ئایەتوڵڵاعوزما سەیید عەبدوڵڵا شیرازی.
٦. ئایەتوڵڵاعوزما سەیید شیهابەدین حوسەینی ئەلنەجەفی.
٧. ئایەتوڵڵاعوزما سەیید حەسەن تەباتەبائی.
٨. ئایەتوڵڵاعوزما سەیید جەواد تەبریزی.
٩. ئایەتوڵڵاعوزما سەیید تەقی تەباتەبائی.
١٠. ئایەتوڵڵاعوزما سەیید غازی شەهرودی.
١١. ئایەتوڵڵاعوزما محەممەد هادی ئەلمیلانی.
١٢. ئایەتوڵڵاعوزما سەیید عەلی ئەلحوسەینی ئەسفەهانی ئەل ناین.

١٣. ئایەتوڵڵاعوزما سەید ئەلخوئی. خوئی هەندیك لە برگەی کتێبەکانی دەهێنا بێئەوەی ناوی شەریعەتی بەرێ و پاشان دەیوت ئەمجورە کتێبانە حەرامە خوێندنەوەی.

١٤. ئایەتوڵڵاعوزما سەید ئەبولحەسن ئەلقەزوێنی.

بەشێك لەو پیاوە ئاپینییە شیعانە داستەواژەی (گومڕا و گومڕاکەر- چاڵ ومچل)یان بۆ شەریعەتی بەکاردەهێنا، هەنێکیشیان تۆمەتباریاندەکرد بەوەی لەژێر کاریگەری مارکسیزمدایە، هەندێجاریش بەوە تۆمەتباردەکرا کە پیشتر پەیوەندی بە موجاهیدنی خەلقەوە هەبووە، بەلام ئەوەی گرنگە بوترێت لەسەر شەریعەتی ئەوە بیروبۆچوونەکانی شەریعەتی سەرەتای قۆناغیکی نوێ بوو لە ئێران و ناوچەکەدا و کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر نەوەی ئەو قۆناغە و توانی توێژی گەنجان تەیاربکات بە بیروباوەڕەکانی و ڕێگاخۆشبکات بو هەڵگیرساندنی شورشی گەلانی ئیران، هەروەها بیروبوچوونەکانی لەلایەن موجاهیدی خەلقیشەوە بایەخی زۆری پێدەدرا تا ئەو رادەیەی بە یەکێك لە تیورسینەکانی خۆیانی دەزانی. شەریعەتی وەك زانایەکی سوسیۆلوجی موسڵمان تائیستاش جێگای بایەخی زوربەی بیرمەندانی جیهانە بەگشتی و جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی، ئەوەش دوای وەرگێرانی زوربەی کتیب و وانەکانی بۆ سەر زوربەی زمانە زیندووەکانی جیهانی.

•••

**سەرچاوەکان:**

١. http://library.tebyan.net

٢. http://www.alrashead.net/index.php?derid=784&partd=19

٣. /www.shariati.com/

# دکتۆر عەلی شەریعەتی
# پیاوێك هێشتاش لە ئاسمانی دنیای رۆشنبیریدا دەدرەوشێتەوە

ئامادەکردنی: موسعەب ئەدهەم

بەداخەوە بۆ ئێمەی کورد "شەریعەتی" هێشتا ناسراو نییە بەوجۆرەی کە پێویستە، چونکە ئێران وەکو ولاتێکی دراوسێمان و بەهۆی نزیکی فەرهەنگی و کلتوریمان بەیەکەوە، دەبوو ئاگاداری رۆشنبیری ئەو ولاتە بین کە تەژییە لە شتی گەلەك جوان و سەرنجراکێش و چەندین عارف و فەیلەسوف و ناوداری تێداهەلکەوتووە، لە سەردەمی نوێشدا چەندین رۆشنبیر و بیرمەند گەرچی هەندێکیان بەداخەوە لە دەرەوەی ولاتەکەیانن، بوونەتە جێگەی سەرنجی دنیای دەرەوە و ئەوروپا و جیهان بەگشتی سوودیانلێوەردەگرێت و لە زانکۆ و سیمینارە نێونەتەوەییەکاندا کۆڕیان بۆدەگیرێت و زانکۆ بەناوبانگەکان بانگهێشتیاندەکەن، لەکاتێکدا ئێمەی کورد و دنیای رۆشنبیریمان چەندین فەیلەسوف و بیرمەندیدیکەمان پێدەناسێنن کە نەك هەر لەڕووی فەرهەنگی و کلتورییەوە لێکنزیك نین، بەڵکو بۆچوون و تێزەکانیشیان چەندین فەرسەخ لە دنیا رۆشنبیری و فەرهەنگی و کوردیمانەوە دوورە.

"شەریعەتی" هەرچەندە لە ولاتەکەی خۆیدا و لە دەرەوەش لە ناساندن و ناسێنراوی دەرچووە و رەخنەی لێدەگیرێت و ناتەواوی و کەموکوڕی لە هزر و ئەندێشەکانی دەخرێتەڕوو کە ئەمە بۆ هەر بیرمەند و فەیلەسوفێکیتریش هەر راستە، بەلاّم هێشتاش لای ئێمەی نەتەوەی کورد نەناسراوە هەرچەندەش لەڕابردوودا کەسانی وەکو "مامۆستا هەژار موکریانی"و "مامۆستا سەدیق بۆرەکەیی" چەند شتێکی کەمی ئەم بیرمەندەیان بۆ زمانی شیرینی کوردی وەرگێڕراوە لەئێستاشدا تاڕادەیەك خەریکە بەرهەمەکانیدی بە خوێنەری کورد ئاشنادەکرێن.

شەریعەتی لە ساڵی (١٣١٢- ١٩٣٣ز) لە خێزانێکی مەزهەبی چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، باوکی "موحەممەد تەقی شەریعەتی" پیاوێکی زانا و خواناس بووە و مامۆستای زانکۆی "مەشهەد" بووە. شەریعەتی پاش ئەوەی دەچێتە زانکۆی ئەدەبییات و زانستە مرۆییەکانی زانکۆی "مەشهەد" و بەشی ئەدەبییاتی فارسی دەخوێنێت، هەر لەهەمانساڵدا لەگەڵ یەکێك لەهاوپۆلەکانیدا بەناوی "پوران شەریعەت رەزەوی" هاوسەرگیریدەکات. بوونی بیرکردنەوەی داهێنانکاری بوویە هۆی ئەوەی "د. شەریعەتی" بەدرێژایی قۆناغی خوێندنی زانکۆیی کاری لەسەر بەرهەمگەلی وەکو وەرگێڕانی "ئەبوزەری غەففاری"، وەرگێڕانی "نزا"، بەرهەمی "ئەلیکسس مارل"و هەروەها کۆمەڵێك وتار و لێکۆڵینەوەیتری نووسی. بەهۆی ئەوەی لەبەشەکەیدا یەکەمبوو بۆ تەواوکردنی خوێندن بۆ

"فەرەنسا" نێردراوە. لەوێ دەستیکردوە بە خوێندنی زانستەکانی وەکو: کۆمەڵناسی، بنەماکانی زانستی مێژوو و مێژوو و فەرهەنگی ئیسلامی و لەگەڵ مامۆستاگەلی مەزنی وەکو: "ماسینون، گوریچ و سارتەر و.. هتد، ئاشنابووە و سوودیلێوەرگرتوون. هەڵبەتە چەند وتار و نووسینێکی "سارتەر"و نووسەرانیتری وەرگێڕاوە و بلاّویکردنەتەوە. پاشان ئەوەی دکتۆرا لە کۆمەڵناسی و مێژووی ئایینەکان وەردەگرێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئێران. لەوسەردەمەشدا بەرگری لەوبزوتنەوەیە دەکات کە لەئێراندا بە سەرۆکایەتی "موسەدیق" چالاکی نواندووە و پشگیری خۆی لەم بزوتنەوەیە دەکات. دوای ماوەیەکی زۆر دەبێتە مامۆستای زانکۆی "مەشهەد"و لە ساڵی (١٣٤٨)دا بانگ دەکرێت بۆ "حوسێنییەی ئیرشاد"و بەخێرایی بەرپرسیاریەتی کاروباری فەرهەنگی ئەم حوسێنییە و دەست بە وتنەوەی کۆمەڵناسی مەزهەبی، مێژووی شیعە و زانستە ئیسلامییەکان دەکات و لە ماوەیەکی کەمدا سەرنجی بیسەران و کەسانی بەشداربووی ئەو دامەزراوە رادەکێشێت.

هێزی قسەکردن و نووسینی "د. شەریعەتی" هێندە کاریگەر و جێگای سەرنجی بیسەران و خوێنەرانی بووە کە لێکۆڵەرێکی وەك "محەممەد ئەسفەندیاری" دەنووسێت: ژمارەی ئەو خوێندکارانەی زانکۆ ناوی خۆیان لەوانەکانیدا تۆمارکردبوو گەیشتووەتە زیاتر لە (٥٠٠٠٠) پەنجا هەزار خوێندکار، هەروەها کۆی ئەو نووسینانەی لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا چاپ و بلاّوکراونەتەوە گەیشتووەتە (١٥) ملیۆن نوسخە و کتێبی "ویلایەت"ی زیـــــــــاتر لە (١٠٠٠٠٠٠) یەك ملیۆن نووسخەی لێبلاّوکراوەتەوە.

"هاشمی رەفسنجانی" بە مامۆستایەکی بنەڕەتی و سەرەکی دەزانێت لە شۆرشی ئێراندا، هەروەك کەسێکی وەکو "د. موستەفا چەمران" کە سەرکردەیەکی ئەوکات و کەسێکی دیاربووە، وتوویەتی هاوڕێی سەرەکیم لە باشووری لوبنان بۆ رووبەڕووبوونەوەی جوولەکە کتێبی "بیابان"ی"شەریعەتی" بوو.

نووسینەکانی "د. شەریعەتی" وەك خۆی دەڵێت: بۆ سێ جۆر نووسین دابەشبوون، یان لە سێ بوار و کایەیەدا، ئەوانیش:

١. ئیسلامییات: بابەتە ئایینییەکان، نموونەی ئەمانەش: کتێبی ئیسلامناسی، حەج، نیایش و.. هتد.
٢. ئیجتماعییات: بابەتە ئەکادیمی و زانستییەکان دەگرێتەوە و نموونەی ئەمانەش: بابەتەکانی کۆمەڵناسی و فەلسەفەی مێژوو و تەشەیوع و.. هتد.
٣. کویریات: بابەتە عیرفانی و ئەدەبییەکان دەگرێتەوە، نموونەی ئەمانەش: گفتوگۆکانی تەنیایی، نیشتنەوە لە بیابان، و.. هتد.

"د. شەریعەتی" لەبارەی ئەم سێ جۆر بەرهەمانەی دەڵێت: ئەگەر پێمبڵێن کامەیان باشترینە و کام بخوێنرێتەوە، ئەوا دەڵێم: ئەگەر بۆ خەڵکی و خەڵکە گشتییەکە بێت، "ئیسلامناسی"، گەر بۆ کەسانی تایبەت و خوێنەری دەستەبژێریش بێت، ئەوا دەڵێم: "نیشتنەوە لە بیابان"، چونکە هەموو کەس بەرگەی وشکی و ترس و حیرەت و بای بیابان ناگرێت و نایەوێت بەوجۆرە بژی.

"شەریعەتی" پاش ئەوەی فشارێکی زۆری لەسەربوو لەلایەن حکومەتی شـــای ئەوکاتەی ئێران، ئیدی ساڵی (١٩٧٧) زایینی بەرەو "بەریتانیا" کۆچدەکات و هەر ئەو شەوەی دەگاتە "لەندەن"ی پایتەختی "بەریتانیا" بۆ سبەی بەیانی لە تەمەنی (٤٣) ساڵیدا کۆچیدواییدەکات، هەرچەندە هەندێك پێیانوایە و زۆرترین بۆچوون جەختلەسەرئەوەدەکەنەوە کە بە پیلانی رژێمی "شا" مردووە، بەلاّم ئەمە گومانە بەوپێیەی لەم مەلەفەدا نووسینێکی بیرمەند و رۆشنبیری ناودار"د. عەبدلکەریم سروش"مان وەرگێڕاوە کە هەمووی باسی چۆنییەتی مردنەکەی دەکات و خودی خۆی لەوکاتەدا لەوێبووە و ئاگاداری چۆنیەتی مردن و بەشداربوویەکی شۆردنی تەرمەکەی و ئاگاداری ناردنەوەی تەرمەکەی بۆ "سوریا" بووە.

کردنەوەی ئەم مەلەفەش لەوڕووەوە بوو کە پێشتر ئاماژەمانپێدا تاکو خوێنەری ئێمەش ئاشنای تێز و بۆچوون و تەنانەت ئەو رەخنانەش بێت لێیگیراوە، هەڵبەتە دەبوو مەلەفەکە لەوە دەوڵەمەندتربووایە کە ئێستا هەیە، بەلاّم هێندە لە توانای ئێمەدا بوو، هەرچەندە هەوڵماندا و مەلەفەکە زێدەترلەوەبێت کە ئێستا هەیە بەوپێیەی پەیوەندیمانکرد بە کوڕی گەورەی مەرحوم "شەریعەتی" کە ناوی "ئیحسان شەریعەتی"یە و هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لەفەلسەفەدا و هەروەها هەردوو کچەی "د. سارا شەریعەتی"و "د. سەوسەن شەریعەتی" کە نەك لەبەرئەوەی منداڵی "د. شەریعەتی"ین، بەڵکو لەبەرئەوەی کەسانی بەتوانا و دیارن هەم نووسینیان هەیە و هەمیش لە زانکۆکاکانی ئێراندا وانەدەڵێنەوە، بەلاّم بەداخەوە تاکو ئێستا چاوەڕوانین و خودایاربێت گەر لەداهاتوودا وەلاّم و نووسینی ئەوانمان بەدەستبگات، بێگومان بلاّویدەکەینەوە.

دواجار لەم مەلەفەدا کەمتر ویستوومانە بابەتەکانی "شەریعەتی" بۆ زمانی کوردی وەربگێڕن، هێندەی نیازمانبووە بیناسێنین و خاکەڕاییانە پەنجەرەیەك بەڕووی دنیا جوانەکەی ئەم بیرمەندە ناوادارە والاّبکەین.

•••

تێبینی: بۆ زانیارییەکانی نێو ئەم وتارە سوود لە ئەنتەرنێت، "ویکیپیدیای عەرەبی" وەرگیراوە.

# لە (شەریعەتی)یەوە
# لەبارەی مردنی شەریعەتی

نووسینی: عەبدولکەریم سروش
وەرگێڕانی مـــوسـعەب ئـەدهەم

ئەمڕۆ بیست و هەشتی کانونی یەکەمی ساڵی (١٣٨٤)ە، مەرحوم "د. عەلی شەریعەتی" لە (٢٩)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٣٥٦) هەتاوی لەدنیادەرچوو. رەنگە زۆرێك لە ئێوە یان هیچ یەك لە ئێوە لەیادیدا نەبێت کە لەورۆژانەدا و بەتایبەت لەورۆژەدا و رۆژێ دوو رۆژ دواتر، هەرئەم بینایەی کە ئێستا ئێوەی تێدایە و هەرئەم شەقامانەی دەورووبەر چ قەرباڵغی و جەنجاڵییەك بوو و چ کەسانێك لەم دانیشتنەدا بوون و چ قسەگەلێك لەوکۆبوونەوەیەدا کران. جەنابی "ئیحسان شەریعەتی" یەکێك لە قسەکەرانی ئەو دانیشتنە بوو و من بەتەواوی لە یادمە کە لە خاڵی خوارەوەدا و لە خوارەوەی دانیشتەنەکەدا دانیشتبووم و زۆرێك لە دۆستەکانمان لە ترسی ساواك بە قیناعێك بە رووخسارەوە لەم دانیشتنەدا ئامادەبیان هەبوو. ئەگەر بمەوێت ناویانبهێنم ناوی ئاشنا و ناسراویان تێدابوو. لە یادمە بەرێوەبەرانی "حوسەینییەی ئیرشاد"و سەرانی ئۆپۆزسیۆنی دژی شای ئێران لەوێ ئامادەبوون، هەروەها کەسانیتر لە چینە جیاوازەکان کە دووربوو لەهیچ دانیشتنێکدا لە تەنیشتی یەکتر و لەگەڵ یەکدا دابنیشن، لەژێر ئەم سەقفەدا کۆبووبوونەوە. کەسانێك لە فەرەنسا، لە ئەمریکا، لە وڵاتە ئەوروپیەکانیتر و لە بەریتانیاوە لێرەدا ئامادەبوون. ئاغایان بەنی سەدر، دکتۆر حەبیبی، سادق تەباتەبایی و ئیحسان شەریعەتی قسەیانکرد و بەتایبەت ئیحسان لەوساڵانەدا زۆر لاوبوو و لە ئەمریکاوە گەڕابوویەوە و هەڵبەتە مەرگی باوکی گەلێك پەرێشانیکردبوو و قسەی کاریگەری دەکرد.

جەنابی "بەنی سەدر" لە قسەکانی خۆیدا ئاماژەی بە خاڵێك کرد و پشتی بە یەکێك لە نووسینەکانی خودی مەرحوم "شەریعەتی" دەبەست کە وتبووی: پێمدەڵێن هێندە کارمەکە، هێندە توند مەڕۆ، بەجۆرە تەمەنت کورتدەبێت، ئەگەر بەجۆرە و هێندە کاربکەی ناتوانی زیاتر لە پێنج ساڵ بەزیندوویی بمێنیتەوە. "بەنی سەدر" دەیگوت ئەو نووسینە چوار ساڵ و هەشت مانگ پێشمەرگی شەریعەتی نووسرابوو و لەبەرئەوە ئەو پێشبینییانە بەتەواوی راست دەرچووبوون.

هەموو ئەمانە ئەو دەنگانە بوون کە لەژێر ئەم سەقفە و ئەم فەزایەدا باسدەکران و بەرزدەبوونەوە و گوێگران دەیانبیستن و چ دڵانێك بریندار و چ چاوانێك دەگریان. هیچم بیرناچێت و فەرامۆشناکەم. هەموو گروپەکان باوکی مەعنەوییان لەدەستدابوو. ئەو نیگا و روانینانەی تاکەکان بۆ یەکتریاندەکرد، روانینی قووڵ، گەلێك پڕمانا و لەهەمانکاتدا خەمۆك و ترساو لە ئاییندە بوو کە بەهۆی لەدەستدانی ئەم رابەرە چ شتێك دێتەپێشەوە.

لە بیرمە گروپە چەپەکان، فیدراسۆنەکان، کەسانیتر، هەموویان پەیامی سەرەخۆشیان ناردبوو. لەهەمان ئەو دیوارەی بەرامبەردا تابلۆیەك داکوترابوو کە (فیدراسۆنی فێرخوازانی ئێرانی، سەرەخۆشی مەرگی "شەریعەتی" خەباتگێڕی دژی رژێم) دەکەن. ئەمە دەستەواژەیەك بوو کە لەوکاتانەدا زۆر بەکاردەهێنرا. من ئەمەم بەتایبەت وت تاکو دەستەواژەی گوتارەکەم بەشێوەیەکی دیار خستبێتە پێشچاوتان. هیچ کەس نەیدەوت "عەلی شەریعەتی" خەباتگێڕی رێگەی ئازادی یان خەباتگێڕی رێگەی دیموکراسی یان دیموکراسی بەناوبانگ ئەم گوتانە لەناودانەبوون. ئەوەی گرنگبوو و وەکو فەزیلەتێکی بێمشتومڕ و لەسەرووی چۆن و بۆچی ئەوەوە قسەی لەبارەی دەکرا و لەبارەیەوە جەختدەکرایەوە، هەر ئەم "خەباتگێڕیبوون"ە بوو کە لەوڕۆژگارەدا هەمووانی دەخستەژێر چەترێکەوە. لە یادمە خانمەکان لێرەدا سەراپا بوونیان هەبوو. منداڵی خودی خۆم کە هەر لەم "لەندەن"ەدا لەدایکبووبوو، ئەم شوێنەی قەرباڵغدەکرد بەرەو ئەملاوئەولا دەچوو کە ئێستا ئەویش لێرە ئامادەیە. رۆژگارێکی سەیربوو و یادهێنانەوەی ئەوڕۆژانەش هەم سەرووئاسایی یادگاری سەرنجڕاکێش و سەرسووڕهێنەرن و هەمیش گەلێ مانادار و پەندفێرکەربوون.

مەرگی "شەریعەتی" بەجۆرێك لەناکاو روویدا و لێدان و شۆکەیەکی بە رۆحی هەموو خەباتگێڕان و بەتایبەت منداڵانی موسوڵمان دروستکرد کە لەڕاستیدا وەسفناکرێت. من لەهەمان ئەوڕۆژانەدا لە "لەندەن" بووم.

مەرحوم جەنابی " موتەهەری" و مەرحوم جەنابی "عەللامە تەباتەبایی"یش لە "لەندەن" بوون. یەکێکیتر لە زانایان کە ناوبانگی کەمترە بەناوی جەنابی "کشفی" لە "لەندەن" بوو. ئەویش لە تایفەی فەیلەسوفان بوو و هەموویان ئێستا بە رەحمەتی خودا رۆیشتوون.

مەرحوم "موتەهەری" لەبنەڕەتدا حەزینەدەکرد لەوەی لەوڕۆژانەدا دەربکەوێت و تەلەفۆنێکی بۆ من کرد و پێیوتم: من نایەمەدەرەوە و نامەوێ دەربکەوم تاکو کەمێك شار کپببێتەوە و هەڵچوون بنیشێتەوە. لە مەجلیسی رێزلێنان و پرسەی "شەریعەتی"یش ئامادەنەبوو. پاش ئەوە من سەفرێکی تاڕادەیەك دووردرێژم کرد بۆ "ئەمریکا"و لە دانیشتن و کۆڕ و کۆبوونەوە جیاوازەکانی ئەنجومەنە ئیسلامییەکان فێرخوازانی زانکۆکانی سەرانسەری "ئەمریکا"، لە ٧-٨ ویلایەتدا قسەمکرد و دەمبینی کە مەرگی لەناکاوی مەرحوم "شەریعەتی" چ کاریگەرییەکی قووڵی لە سەر رۆحی ئەم لاوانە داناوە. لەڕاستیدا هەموویان پرسیاریان ئەمەبوو کە چی بوو؟و هەڵبەتە هەموویان تورەبوون لە رژێم لەوەی کە بیریاندەکردەوە لێیداون و بەجۆرە "شەریعەت"ی لەوانسەندووەتەوە و تووشی مەرگێکی لەجۆرەی کردوە.

لەهەمان ئەو رۆژانەدا ئەم یاداوەرییەم نووسی و جارێکیدیکە بۆتان باسدەکەم: (بەیانی (٢٩)ی مانگی خورداد، یەکێك لە دۆستە خۆشەویستەکانمان کە لەم دانیشتنەشدا ئامادەن تەلەفۆنی بۆ کردم و بینیم دەگری. هەواڵی هاتنی دکتۆر "شەریعەتی" لە "فەرەنسا"وە بۆ "بەریتانیا"مان هەبووو بڕیاربوو سبەی ئەوڕۆژە لەگەڵ دۆستاندا بۆ دیداری بڕۆین بۆ "ساوت همپتن"، بەڵام هاوڕێکەم تەلەفۆنیکرد و بەگریانەوە وتی: وەرە بڕۆین بۆ "ساوت همپتن"، بەڵام ئیتر لەگەڵ جەنازەی دکتۆردا رووبەڕوودەبینەوە، چونکە ئیدی زیندوونییە. بەویژدانەوە بڵێم ئەوساتانە زۆر تاڵبوون، زۆر.

لێرەدا یاداوەرییەك دەڵێم کە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا لەزەینمدایە. سێ کەس بووین. بە رێکەوتین و بەرەو ئەوشوێنەی مەرحوم دکتۆر شەوی پێشتر لەوێ بووبوو. دوو کچی مەرحوم دکتۆر، ئەو گەنج بوون، وەکو دوو چۆلەکەی پەژموردە، جلی مشکییان پۆشیبوو و لەتەنیشتی دیوارێکدا وەستابوون. غەم سەراپای روخساری داپۆشیبوون. چووینەناو ژوورێکەوە و ئەو قەرەوێڵەیەیان پیشاندایین کە مەرحوم "شەریعەتی" لەسەری نووستبوو. وتیان تاکو درەنگانێکی شەو لەگەڵ ئێمە دانیشتبوو و قسەیدەکرد. تازە لەرێگاشەوە گەیشتبوو و لەسەرووی ماندوبوونیشەوە، دانیشت و دانیشت و چایخوارد و قسەیدەکرد و جگەرەیکێشا و.. هتد، تاکو نزیکی سەحەر. پاش بانگی بەیانی نوێژیکرد و رۆیشت بۆ پشوودان ژوورەکەی تاکو بخەوێت. کاتی خواردنی نانی بەیانی، ئەهلی ماڵەکە چاوەڕوانی مەرحوم دکتۆر بوون تاکوبێت و لەگەڵیاندا نانبخوات. دەیانوت نەهاتوو و درەنگیکرد. بانگمانلێکرد. وەڵامنەبوو. رۆیشتین بۆ ژوورەکەی، وتیان کە چووینە ژوورەوە بینیمان کە دکتۆر بە دەموچاو کەوتووەتە سەرزەوی. تەنانەت ئەو خاڵەی ژوورەکە کە شوێنی سابیدن لووتی دکتۆر لەوێ هێشتا دیاربوو، پیشانیاندایین، بەتەواوی دیاربوو ئەوکاتەی ویستوویەتی لەسەر تەختەی نووستنەکەیەوە بێتەخوارەوە، دڵی ئازاری بۆ پەیدابووە و دەستیخستبوویەسەر دڵی و ئیتر نەیتوانیبوو کۆنترۆڵی خۆی بکات بە رووی دەموچاودا کەوتبوویە سەرزەوی.

بەهەرحاڵ بەبینیی ئەم دۆخە راستەوخۆ ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنیان ئاگاداركردبوویەوە و پیاوانی فریاکەوتنیش تاکو هاتبوون، لەهەمان ئەوشوێنەدا سەرنجیان لە نیشانەکانی ژیانی مەرحوم دکتۆر دابوو و دیارییانکردبوو و وتبویان (١٥) خولەکە وەفاتیانکردووە و لەهەمانکاتدا بەپەلە بەرەو نەخۆشخانەی "ساوت همستن"یان بردبوو.

ئێمەش رۆیشتن بۆ نەخۆشخانە، دکتۆریان بردبوو بۆ ژووری شۆردن و رێگەیاننەدا ئێمە بچینە ئەوژورە. من کارتی خوێندکاریم پێبوو و لەبەرئەوە لەسەری نوسرابوو دکتۆر فلان، وایانزانی من پزیشکم رێگەیاندا بچمە ئەوژوورەوە و لەگەڵ دۆستان چووینەژوورەوە. دوو جەنازەی تێدابوو، یەکەمیان لادایەوە تاکو جەنازەکەی دکتۆرمان پیشانبدەن، بەڵام هی ژنێك بوو، جەنازەی دووەمیان پیشاندایین کە جەستەی مەرحوم دکتۆر بوو. زۆر زۆر هێمن و ئارام خەوتبوو. لەڕاستیدا من کەمتر روخسارێکی ئارامی لەوجۆرەم بینیبوو. مووەکانی سەری تاکو سەرشانەکانی هاتبوون و سەرووئاسایی ئارام خەوتبوو.

جەنابی "میناچی" کە لەگەڵماندابوو، رۆیشتەپێشەوە و بەهۆی ئەوەی بریکاربوو و لەگەڵ کۆمەڵێك کاروبار ئاشنایی هەبوو، کەمێك هەوڵیدا تاکو بەوردی سەیربکات و بزانێت ئایا زامێك یان کاریگەری لێدانێك یان شتێك لەسەر جەستەی دکتۆر دەردەکەوێت یان نا؟ کە لەڕاستیدا هیچشتێك دەرنەکەوت. روخسارێکی زۆر ئاسایی هەبوو، تێکنەچوو بوو، چاوەکانی لێکنابوو و چووبوویەناو خەوێکی بەنازی ئەبەدییەوە.

هاتینەدەرەوە و گەڕاینەوە بۆ "لەندەن"و دۆستەکانیترمان ئاگادارکردەوە. بەهەرحاڵ پێشەکی و کارەکانی سەرەتای مەراسیمی پرسەی مەرحوم دکتۆر ئەنجامدران. کۆمەڵێك لە دۆستان لەسەرانسەری دونیاوە – بەوجۆرەی کە وتم- هەموویان ئاگادارکرانەوە و یەك لە دوای یەك، لێرەو و لەوێ گەیشتن. لەوڕۆژانەدا "لەندەن"، رۆژانێکی زۆر قەرەباڵغی تێدەپەڕاند و هەموو ئەو کەسانەی کە لەوکاتەدا ناوێکیان هەبوو و لە دژەکانی بەناوی رژێمی شا بوون، لێرە کۆبووبوونەوە.

هەرلەمکاتانەدا جەنابی "شەبستەری"یش کە ئیمامی مزگەوتی "هامبۆرگ" بوون، بەبێ ئەوە ئاگایان لە رووداوێکی لەمجۆرەبێت، بەرەو مەنزڵی یەکێك لە دۆستەکان کە هەموو ئەوانیتر لەوێبوون، هاتبوو. بەمنیان وت کاتێك هاتم، بینیم هەموو روخسارەکان داگیراون. من ئاگاملێنەبوو چی روویداوە، بەلاّم کە چوومەناو دانیشتنەکەوە، بینیم دانیشتنێکی نائاساییە. کاتێك پێیانوت مەرحوم "شەریعەتی" لەدنیادەرچووە، بەشێوەیەکی زۆر سروشتی ئاهێکیهەڵکێشا و وتی: عەجەب! دکتۆر "شەریعەتی"یش پەیوەستبوو بە مێژووەوە و لەڕاستیدا بە مێژووەوە پەیوەستبووبوو.

بەهەرحاڵ شتە سەرتاییەکان ئەنجامدران و بەپێچەوانەی ئەوەی کە بەناوبانگبوو جەنازەی مەرحوم "شەریعەتی"، لێرە واتە لە "ئیمام بارە" نەشۆرا، بەڵکو لە یەکێك لە مزگەوتەکانی "لەندەن" کە مزگەوتێکی بچووك و تایبەتبوو بە ئەهلی سوننەوە و شوێنی شۆردنی هەبوو، شۆردرا. بەندە و جەنابی "شەبستەری" شۆردن و کفنکردنی خرایەئەستۆمان، واتە لەڕاستیدا دۆستان داوایان لە جەنابی "شبستەری" کردبوو و ئەویش بەمنیان وت: وەرە پێکەوە ئەمکارەبکەین، هەڵبەتە دوو کەسیتر یارمەتیاندااین ئەوانیش جەنابی دکتۆر "ئیبراهیم یەزدی"و جەنابی "سادق قوتبزادە" ئەم چوارە کەسە بووین کە مەرحوم دکتۆریان هێنا. ئیدی جەستەی دکتۆر سەلامەتنەبوو، سەراپا پشکنیبوو، سەر و جەستەیان پشکنیبوو، نموونەیان لێدەرهێنابوو و توێژینەوەی پزیشکی زۆر جیدییان لەسەر ئەنجامدابوو.

نەخۆشخانەی "ساوس هیمپتۆن"، راپۆرتێکی دوورودرێژی پزیشکی لەبارەی مەرگی دکتۆرەوە بلاّوکردەوە و تیایدا وتبوویان، شتێگی گوماناوی نەبینراوە و مەرگیش بەهۆی بۆنموونە، کوشتن، دەستێك، ژەهر و.. هتد، شتێکی لەمجۆرەنەبوو و واپێدەچوو کە بە مەرگی سروشتی لەدنیادەرچووبوو. مەرگی سروشتی واتە بەهۆی جەڵتەی دڵەوە. وا رێکەوت هەر ئەورۆژەی رۆیشتین بۆ "ساوس هیمپسۆن"و بۆ یەکەمجار لەگەڵ جێگەی خاڵی مەرحوم "شەریعەتی" رووبەڕووبووینەوە و پاشان رۆیشتین بۆ نەخۆشخانە، لەهەمان ئەوژوورەی کە مەرحوم دکتۆر خەوتبوو، سەڵتڵێك بوو کە نزیکەی (٤٠) پاشماوەی و جگەرەی سووتاوی تێدابوو، واتە لەهەمان ئەوکاتە کورتەدا، مەرحوم دکتۆر برێکی زۆر جگەرەی کێشابوو. پزیشکانی دانیشتووی دانیشتنەکەمان باشتر لە من دەزانن کە لەحاڵەتی توندی و گرژی توندی دەمارەکان و ئەو فشارەی دکتۆر لەورۆژانەدا تیایدابوو، هۆکاری حاڵەتێکی لەمجۆرەبووە، بەتایبەت ئەوشەوە پێش رووداوەکە مەرحوم "شەریعەتی" بەرەو فڕۆکەخانەی "هیپرو" رۆیشتبوو، چونکە بڕیاربوو کچەکانی بێن، هەموو رێبواران هاتبوون جگەلە کچەکانی ئەو. دۆستێکان وتی، دکتۆر سەرووئاسایی دڵەراوکێ بوو بوو، چونکە خێزانەکەی لەتەلەفۆندا پێیوتبوو کە کچەکان لە گومرگ و بەشی کۆنترۆڵی پاسپۆرت تێپەڕبوون و بەرەو فڕۆکە رۆیشتوون. کاتێك کچەکان نەهاتبوون، ئەو زۆر بەتوندی تووشی دڵەراوکێ بووبوو کە نەوەکو فێڵێك لەم نێوەندەدا بوونی هەبێت و بەناوی سواربوونی فڕۆکەوە کچەکانیان رێنوێنیکردبێت و بەرەو شوێنێکیتریان بردبن و بۆنموونە گلیاندابنەوە یان خستبنیانەزیندانەوە. هەموو ئەم بیرۆکانەی بەسەرداهاتبوون و ئەو سەرووئاسایی ئالۆزبووبوو. هەڵبەتە کچەکان هاتبوون و لەگەڵیدا رۆیشتبوون بۆ "ساوپ هیمپن". ئەم فشارە رۆحییانە بوون و دواتر بووبوویە هۆی کێشانی ئەم هەموو جگەرەیە کە من واگوماندەبەم بەباشترین روویەك دەتوانین هۆکاری ئەو وەستانی دڵ و جەڵتەی دڵی لەناکاو

روونبکەینەوە.

جەستەی مەرحوم دکتۆر شۆردرا و خرایە ناو تابوتێکەوە. لەهەمان ئەورۆژانەدا وا رێکەوت جەنابی "شێخ مەهدی شەمسەدین" کە سەرۆکی مەجلیسی بالاّی شیعەکانی لوبنان بوو، لە لەندەن بوو. لەیادمە گفتوگۆیەکمان لەگەلْ دۆستاندا ئەنجامدا و من بە بەرپرس دانرام کە لەگەلْ جەنابی "شێخ مەهدی شەمسەدین "قسەبکەم و داوایلێبکەم کە بڕوات بۆ "سوریا"و "لوبنان" لەگەلْ "حافیز ئەسەد"دا قسەبکات تاکو بە مۆلەتی ئەو و هاوڕایی ئەو جەنازەی مەرجوم بەرەو "سوریا" بگوازرێتەوە و بەجۆرەش ئەمکارەمکرد. لە فرۆکەخانە جەنابی "شەمسەدین" پێیوتم راستەوخۆ لێرەوە دەچم بۆ "سوریا"و گفتوگۆی پێویست دەکەم. بەهەرحالْ ئەمکارانە ئەنجامدران و جەنازەی مەرحوم دکتۆر بەرەو "سوریا" گوازرایەوە، بەلاّم لە شەقامەکانی "لەندەن" هەوالێکیتر هەبوو و شتێکیتر دەگوزەرا. ئەمکارانەی کە عەرزمکردن هەمیشە لەپشتی پەردەوە ئەنجامدەدران. لە شەقامەکانی "لەندەن" ژمارەیەکی زۆر لە فێرخوازان و لایەنگرانی مەرحوم "شەریعەتی" کۆبوبوونەوە و تابوتێکیش لەپشتیانەوە دەجوولاّ. هەلْبەتە ئەم تابوتە خالْیبوو و جەنازەی دکتۆری تێدانەبوو، چونکە ترسی ئەوە هەبوو کەسانێك پەیدا بن و بێحورمەتی یان هەر رووداوێکی نەخوازراو ئەنجامبدەن.

ئەو وێنە و ڤیدیۆیانەی هی ئەوکاتەی لەبەردەستدان گەر بیانبینن، بەتەواوی دیارە کە زۆرێك لە خەلْکی، سەرورخساری پێچراو و بەهاوار و خرۆشاوەوە بەرەو ئەو تابوتە هێماییە دەڕۆن. بۆ "ئیمام بارە" هاتن، واتە هەرئەم شوێنەی کە ئێستا تیایدان، کۆبوونەوەیەکی شکۆدار بەئەنجامگەێنرا و پاش ئەوە هەلْبەتە کۆبوونەوەی زۆر لە بەریتانیا و ولاّتەکانیدیکە ئەنجامدرا و هەموویان یادی مەرحوم "شەریعەتی"یان بەزیندوویی راگرت. لەهەمووی کاریگەرتر، دانیشتن و کۆبوونەوەیەك بوو کە لە "مەشهەد" ئەنجامدرا و باوکی مەرحوم دکتۆر لەودانیشتنەدا هەبوو و وتەیەکی کورت، بەلاّم بە دەستەواژەی "فیردەوسی" پڕ لەئاوی چاو، لەوێ باسکرد کە کاسێتی ئەو وتارە بەخێرایی لەهەموو شوێنێکەوە بلاّوبوویەوە.

•••

**سەرچاوە:**

**کتێبی "از شریعتی"، ن/ د.عبدالکریم سروش، موسسه فرهنگی صراگ، تهران، چاپ دوم، ١٣٨٥، ص ٢٤٨-٢٥٥.**

# (شەریعەتی) بت نییە

## گفتوگۆ لەگەڵ (موجتەبا موتەههەری) کوڕی مورتەزا موتەههەری

**وەرگێڕانی: ڕێبوار کوردستانی**

ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە کە لەگەڵ "موجتەبا موتەههەری"، کوڕی بیرمەندی و کەسایەتی ناوداری ئێرانی "مورتەزا موتەههەری" ئەنجامدراوە، تیایا باس لە پەیوەندی نێوان باوکی و "د. شەریعەتی" دەکات و جیاوازی و ئەو خاڵانەی کە بوونە هۆکاری دوورکەوتنەوەی ئەم دوو بیرمەندە نووسەر و خاوەن بۆچوونە تایبەتانە دەکات کە بەئێستاشەوە دەشێبوترێت هەریەکەیان بە کاریگەری و جێکەوتی خۆی لەسەر دنیای رۆشنبیری ئێرانی داناوە و هەیە. "

**و. کوردی"**

**پرسیار: گرنگترین رەخنەی شەهید "موتەههەری" لەسەر بیروبۆچوونەکانی - "دکتۆر شەریعەتی" چیبوو؟**

**وەڵام:** ئەگەر بە دیدێکی واقیعبینانە سەیری دکتۆر "شەریعەتی" بکەین، دەبینین ئەو لە حەوزە جیاوازەکانی وەکو: کۆمەڵناسی، مەزهەبی، مێژووی شارستانییەت، مێژووی ئایینەکان، مێژووی ئیسلام و قوتابخانە کۆمەلاّیەتی - سیاسییەکان، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زۆر باشی ئەنجامداوە، بەلاّم حەقیقەت ئەوەیە کە ناکرێت ناوی "ئیسلامناس"ێکی لێبنێین.

**پرسیار: بۆچی؟**

**وەڵام:** لەبەرئەوەی "دایرە المعارف ئیسلامی"و بەشێوەیەکی گشتی ئیسلام، کۆمەڵێك لە زانیاری و زانستی ئیسلامی و مرۆییە. زانیارییەکانی پێغەمبەران، بە زانستی مرۆیی دەژمێردرێن و بەتەواوی زانستی ئیسلامی نین و لەبەرئەمەش رەنگە هەڵوەشاندنەوە و جیاکردنەوەی زانکۆی ئەدەبییات و ئیلاهییات کارێکی دروستنەبێت. زانستە

ئیسلامییەکان و زانستە مرۆییەکان جیانین. باوکم دەیوت: پسپۆڕی و بەشی من ئیلاهییات و زانستە مرۆییەکانن. لە ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامی یان مرۆییدا، ئیسلام کۆمەڵێك لە زانستەکان و لەوانەش فیقە، ئوسوڵ، تەفسیر، فەرموودە، کەلام، فەلسەفە، عیرفان، کۆمەڵناسی، دەروونناسی و.. هتد. کەسێك کە دەیەوێت لەم حەوزەیەدا قسەبکات، دەبێت زانیاری تەواوی لەبارەی ئەم زانستانەوە هەبێت تاکو بتوانێت بابەتەکان شیکار و چارەسەربکات. لەبەرئەوە ئیسلامناسی جێگە و پێگەیەکە کە تاکو زانیارییەکان و لق و پۆپەکانی شیکارنەبن و تاك بەتەواوی بەسەر ئەم زانیارییانەدا زاڵنەبێت، ناتوانێت ئیسلامناس بێت.

هەموو کەسێك دەتوانێت لە هەندێك لەم بەشانەدا کە کەلامی نوێ و تایبەتمەندی و پسپۆڕی و زانستی خۆیەتی، قسەبکات، بەڵام ناتوانێت لەبارەی هەموو زانستەکان و زانیارییەوە مرۆییەکانەوە بۆچوونی خۆی بڵێت. بەڵگە ئەوەنییە ئەو کەسەی لەبارەی یەك دوو یان چەند بەشێك لە حەوزەی زانستە مرۆییەکان زاڵ و بەتوانابێت، لەبارەی کۆمەڵە زانیارییەکیش خاوەن بۆچوون بێت. خاڵێکیتر ئەوەیە کە لە زانستە ئیسلامییەکاندا، سەنتەر و چەقی بنەڕەتی فیقە و فوقەهابوونە و ئەمەش گرنگیی تایبەتی هەیە. هەر لەبەرئەمەش ئەوکەسانەی لەم حەوزانەدا دەخوێنن و پەیوەستیان بە دەروونناسی مێژوو، حیکمەت یان عیرفان پەیوەستن، هەمیشە سەرەتا ئەدەبییات و فیقە و بنەماکان دەخوێنن و پاشان دەچنەناو ئەو بەشانەی پسپۆڕی تایبەتی خودی کەسەکەن.

دکتۆر "شەریعەتی" ڕۆشنبیرێکی ئایینییە. کەسێك تاکوڕادەیەك ئاگاداری زانستە ئیسلامییەکان بوو و پەیوەند و پەیوەستی بەم زانستانەوە هەبوو، لەڕۆژئاوادا دەرسی خوێندبوو و فەزای خوێندنی لە ڕۆژئاواوە ئیلهامیوەرگرتبوو. ئەدەبییات و پێوەرە نوێکانی ئەمرۆی دەناسی و مەبەستی بوو ئیسلام لەگەڵ پێوەرە نوێکاندا، بە زمان و ئەدەبییاتی نوێ بە دنیا و وەچەی نوێ بناسێنێت. بە دەستەواژەی ئەمڕۆ بە"نوێگەری" ناودەبرێت. شەهید "موتەههەری" باوەڕیوابوو دکتۆر "شەریعەتی" ڕۆشنبیرێکی ئایینییە و بە وردی ئاشنایی لەگەڵ دنیای مۆدێرندا هەیە، دەبێت لەگەڵ زانایەکی گەورەی ئایینی و ڕۆحیدا یان کەسێك لە مەرجعەکان پەیوەندی بەردەوامی هەبێت. نەك تەنها لەبارەی "شەریعەتی"یەوە، بەڵکو هەر ڕۆشنبیرێکی ئایینی کە دەیەوێت لەم حەوزانەدا بچێتەناوەوە و کاربکات، دەبێت ئەم پەیوەندییە دروستبکات و بپارێزێت تاکو دووچاری خلیسکان و هەڵەنەبێت.

## پرسیار: کێشەی دکتۆر "شەریعەتی" لە "حوسەینییەی ئیرشاد"و ماجەرای جیاوازییەکانی ئەوسەردەمە هەر لەسەر ئەم بابەتانە بوو؟

**وەڵام:** باوکم لە سەرەتای ئەوکاتەی لە "حوسێنییەی ئیرشاد" بوو، دەیوت دەبێت سوود لە بوونی دکتۆر "شەریعەتی" وەربگیرێت. باوەڕیوابوو ئەم دیاردە نوێیە پیرۆزە، بەڵام دەبێت لەژێر چاودێری و ڕێنمونی ڕۆحانییەت و ڕۆحدا بێت کە خاوەنی بەرچاوڕوونی و ڕۆشنبینی ئایینین و دەبێت ئەوەش لە سوودی ئیسلام سوودیلێوەربگیرێت، بەڵام بەومەرجەی قسە و بەرهەمەکانی لەژێر چاودێری چاودێرییەکی زانستی - کە خاوەنی خوێندنی قووڵی حەوزەیین - بێت.

کێشەی رۆشنبیری ئایینی، سەرنجی ورد بە گۆڕان لە قاڵبەگەرایی ئایینی و نوێگەراییەتی و زۆرجار کەمتر سەرنج لە کرۆکی ئایین و جێگیربوونی دەدرێت. ئەم نوێگەرایی و گۆڕینی شێوە و قاڵبە، پیرۆزە، بەڵام کێشەی رۆشنبیرانی ئایینی و دکتۆر "شەریعەتی" ئەوەبوو کە بەشێوەیەکی قووڵ ئاشناییان لەگەڵ زانیارییە ئیسلامییەکاندا نەبوو. "شەهید موتەههەری" باوەڕیوابوو ناتوانرێت هەر قسەیەکی نوێ تەرحبکرێت و بخرێتەڕوو. تەنها جوان قسەکردن بەسنییە، قسەی چاك هەڵسەنگێنراو و قسەکردنی پاك گرنگە. ئەم دوانە دەبێت لەگەڵ یەکتردا کۆببنەوە. دکتۆر "شەریعەتی" زیاد لەوەی پاك و ورد قسەبکات، جوان قسەی دەکرد. شەهید "موتەههەری" باوەڕیوابوو قسەکردنی جوان بەخششێکی مەزنە بەومەرجەی کە قسەکان هەڵبسەنگێنرێن و قووڵ و پاك دەرببڕدرێن و جیایی رۆشنبیری ئایینی لە رۆحی سوننەت، ویلایەت، عیرفان، شەریعەت، رۆحانییەت و مەرجەع، بۆ کۆمەڵگە کاریگەری زیانبەخشی لەگەڵدایە کە دەبێتە هۆی ئەوەی هەندێجار رۆشنبیری ئایینی نزیکبوونەوەیەك لە رۆشنبیری رۆژئاوایی پەیدابکات و دووچاری خلیسکان و زیانی جیدیبێت.

**پرسیار: لەمڕووەوە نموونەیەکتان لەبارەی رەفتاری دکتۆر "شەریعەتی" لەبەردەستە؟ دکتۆر " شەریعەتی" چ شتێکی کرد کە بیردەکەنەوە رۆشنبیری ئایینی لە رۆشنبیری رۆژئاواییەوە نزیکبووەتەوە؟**

**وەڵام:** بۆنموونە: دکتۆر "شەریعەتی" لە رەخنەگرتنی لە رۆحانییەت، هەندێجار رۆحانییەتی نەفیکردووە و بابەتی ئیسلامی لە منهای رۆحانییەتدا دەخستەڕوو. لەمڕووەوە بۆچوونی باوکم وەکو بۆچوونی ئیمام بوو و دەیوت رۆحانییەت کێشەی هەیە و دەبێت رەخنەیلێبگیرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرێزترین و پاکترین دامەزراوە، رۆحانییەتە. هیچ شتێك ناتوانێت جێگەی رۆحانییەت بگرێتەوە و نەدەبوو دکتۆر "شەریعەتی" رۆحانییەتی نەفیبکردایە. رەخنەی رۆحانییەت دەبێت بۆ چاکسازی و پاراستن و مانەوەی رۆحانییەت بێت، نەك نەفیکردنی.

**پرسیار: چ کەسانێك دەتوانن رەخنە لە رۆحانییەت بگرن؟**

**وەڵام:** باشترین کەسانێك کە دەتوانن ئەم دۆخە بگۆڕن، رۆحانییەتە. کەسێك خۆی پەرێشانی حەوزە و رۆحانییەت بێت و خۆی بەشێك بێت لەم توێژە. دەبێت خودی رۆحانییەت رەخنە لە حەوزە بگرێت. کەسێك ناتوانێت لەدەرەوە ئەمکارە بکات و رەفتار و گوفتاری شەهید "موتەههەری"و "بەهەشتی"و ئەو وتارانەی لەمڕووەوە نووسیان، ئەوە پیشاندەدات ئەوان باوەڕیانوابوو کەسانی زانکۆیی ناتوانن رەخنە لە رۆحانییەت بگرن، ئەمکارە پەیوەستە بەخودی ئەم دامەزراوە پیرۆزە و زانایانی ئایینی و مەرجەعەکانەوە. باوکیشم رەخنەی لەم حەوزەیە دەگرت. دەیوت دەبێت لە باس و وانەکانی حەوزەدا، داخوازی نوێ و بابەتی رۆژانە بێنەناو حەوزەوە. دەبێت حەوزە بگۆڕدرێت.

شەهید "موتەههەری" باوەڕیوابوو کاری "شەریعەتی" وەکو ڕۆژهەڵاتناسەکانی وەکو (ڤیکتۆر هۆگۆ، گۆتە) و شاعیرانی فەرەنسی و ئەڵمانییە کە بەهەموو ئەو پەیوەندییەیان بە ڕۆژهەڵاتەوە، نایناسن، بەڵام ڕۆژهەڵاتناسی "ئیقباڵی لاهوری"، ڕۆژهەڵاتنایسیەکی واقیعیە، چونکە تیایداژیاوە. ئیسلام بابەتی ناسین و مەعریفەتە. ئەم مەعریفەتە سەرچاوەی مەعریفی دەوێت، "سوژە" نییە. دکتۆر "شەریعەتی" وەکو کاری "هۆگۆ"و "گۆتە"، ئیسلامی کردە بابەتی شیعر و دەستکردن بە سروود و وتنی ئیسلام.

هەندێجار بەهۆی هەندێك لە هەڵەکان، ئێمە تاکەکان نەفیدەکەین. هەندێ کەس لەجیاتی ڕەخنە لە قسە، دەستدەکەن بە ڕەخنەگرتن لە قسەکەر. کاری دروست و عەقلانی ئەوەیە کە ئێمە دەستبکەین بە ڕەخنەی دروست و ڕاستیی دکتۆر "شەریعەتی"، نەك نەفیکردنی. مەرحوم "جەعفەری" بە کوڕەکەی وت تاکو "حەج"ی "شەریعەتی" نەخوێنێتەوە نەچێت بۆ "حەج". دوو جۆر ڕوانینی هەڵە لەبارەی "شەریعەتی"یەوە بوونیان هەیە. هەندێك بە ئەفسانەی دەزانن و بێگوناه و هەرچی نووسیوە، وەحی ئاسمانییە. هەندێکیش دەڵێن ئەو کەسێکی بێباوەڕ "ملحد"و بێدینە کە مەبەستی خیانەت بووە.

**پرسیار: پەیوەندی نێوان شەهید "موتەههەری"و دکتۆر "شەریعەتی" چییە؟ لەسەرەتاوە چ پەیوەندییەك لەنێوان ئەمانەدا بوونی هەیە تاکو جیاببنەوە.**

**وەڵام:** دکتۆر "شەریعەتی" بە بانگهێشتی شەهید "موتەههەری" چووەناو "حسێنییەی ئیرشاد"ەوە. باوکم باوەڕیوابوو کەسێکە لەڕۆژئاوادا تەواویکردوە و باوەڕدارە و پەیوەستە بە زانیارییە ئیسلامییەکانەوە، دەبێت سوود لە زمانی نوێ و جوانییەکەی وەربگیرێت. لەبەرئەوە بوونی دکتۆر "شەریعەتی" بە شتێکی دەوڵەمەند و گەنجینە بژمێرین، بەڵام دواتر کە بابەتی هاتنەناوەوەی ئاغای "میناچی"و ئەوانیتر خرایەڕوو، بابەتەکان شێوەیەکیتریان وەرگرت. دکتۆر "شەریعەتی" دەروونێکی پاکی هەبوو، هەر لەبەرئەمەش ڕێگەی بە باوکمدا دەست بۆ نووسینەکانی ببات.

**پرسیار: مامەڵەی شەهید "موتەههەری" لەگەڵ دکتۆر "شەریعەتی" چۆنبوو؟**

**وەڵام:** مامەڵەی باوکم لەگەڵ "شەریعەتی" لەگەڵ لێبوردن و ئاسانکاریدا بوو. لێبوردن و ئاسانکارییەك کە پێوەری هەبوو و نەدەچووەناو بنەما و بنەڕەتی ئایینەوە. بۆنموونە: باوکم دەیوت: توانا و ئامادەگی ئایینی هەمووان وەکو یەك نییە، هەموو خەڵکی ناتوانن کراوەبن، بەڵام هەموو کەسێك هێندەی ئاییندارى خۆی ڕێزدارە. ئەگەر لێبوردن و ئاسانکاری بەم مانایە بێت، قسەیەکی تەواو و ڕاستە یان دەیوت: دەبێت ئازادی بیرکردنەوەمان هەبێت، هەندێك لە تاکەکان ئەندێشەی هەڵەیان هەیە، بەڵام ئێمە دەبێت بەرگەبگرین، نەك لەڕووی لاوازییەوە، بەڵکو بەهۆی دڵفراوانی و گەورەییەوە، بەهایانپێبدەین، وەکو ئەهلی کتێبە هەندێجار ئەم سنوورانە تێکەڵدەبن و دەبێت تاڕادەیەك و بڕێك لێبوردن و قبوڵکردن لەیەك بوونی دیارییکرێت.

**پرسیار: شەهید "موتەههەری" رووەو دکتۆر "شەریعەتی" لایەنگری بۆ دروستبوو یان دکتۆر "شەریعەتی" بەرەو ئەوان رۆیشت؟**

**وەڵام:**سەرەتا بۆئەوەی کە "شەریعەتی" بەسوودی ئیسلام سوودیلێوەربگیرێت، شەهید "موتەههەری" بەدوای "شەریعەتی"دا رۆیشت، بەلاّم دواتر جیاوازییەکان دروستبوون و "میناچی" نەیهێشت پەیوەندی چاك دروستبکەن، شەهید "موتەههەری" لەم رووداوە جیابوویەوە و وتی: ئەگەر "شەریعەتی" بیەوێت بەبێ بۆچوونی ئێمە و رۆحانییەت درێژەپێبدات، لەگەڵیدا هاورانین و رێگەمان جیادەکەینەوە. باوکم پێشبینیدەکرد کە دکتۆر "شەریعەتی" بەبێ رێنمونی رۆحانییەت و تاکی ئایینناس لە زانستە ئیسلامییەکاندا، دووچاری هەڵخلیساندەبێت. گەورەترین هەڵخلیسکانی دکتۆر "شەریعەتی"یش تێزی "ئیسلام کۆتایی ئاخوند" بوو. بۆئەم قسانە ئیمام هێڵی بەژێر وشەی "مەرحوم"دا هێنا و لە بەیاننامەی ئەنجومەنی ئیسلامی ئەمریکا وتیان "لەناوچوون"ی دکتۆر "شەریعەتی" بەسە.

ئەم رووداوە ئەوە پیشاندەدات ئیمام لەناوەوە زۆر لە "شەریعەتی" نارەحەتە. ئیمام بۆچوونی توندیان دەربڕی و وتیان ئەوکەسانەی هێرشیانکردە "شێخ بەهایی"و " عەللامە مەجلیسی"، تێناگەن! دکتۆر "شەریعەتی" دەیوت ئێمە پێویستمان بە "ئەبو عەلی" نییە، پێویستمان بە "ئەبوزەر"ە، بەلاّم شەهید "موتەههەری" دەڵێت، نەخێر، جەنابی رۆشنبیر! ئێمە هەم پێویستمان بە "ئەبوزەر"ە و هەمیش پێویستمان بە "ئەبو عەلی سینا". روانینی ئەو زیاتر لە دیدی کۆمەڵناسییەوە زاڵتربوو. هەڵەی ئەو ئەوەبوو کە بابەتەکانی لەرووی مێژوو و کۆمەڵناسییەوە شیکار و چارەسەردەکرد و شۆرشی لەرووی کۆمەلاّیەتییەوە شیکاردەکرد و لە لایەنەکانیتر بێئاگابوو، لەگەڵ پەیوەندییەکی توندی بە زانستە ئیسلامییەکان هەبوو، دەیوست خزمەتبکات، دڵسۆزی ئایین بوو و باوکێکی مەزنی بەرێزی هەبوو، بەلاّم بەداخەوە نەیتوانی لەم بازنەیە بەچاکی سوودوەربگرێت.

دکتۆر "شەریعەتی" لەجیاتی رەخنە لە رۆحانییەت، رۆحانییەتی نەفیدەکرد کە هەڵبەتە ئەو دەروونێکی پاکی هەبوو، هەر لەبەرئەمەش بەرهەمەکانی بە باوکم سپاردن بۆ پێداچوونەوە و رەخنەگرتن. شەهید "موتەههەری" دەیوت ئەگەر "شەریعەتی" زیاتر زیندووبمایەتەوە، رەنگە زیانی زۆرتری هەبوایە. لەهەندێ رووەوە ئەوە حیکمەتی خودایە کە ئەوی بۆ لای خۆیبردەوە و لە لوتفی ئیلاهی بوو. ئەگەر بمایە، کەلینی نێوان رۆحانییەت و چینی رۆشنبیر زیاتردەبوو. ژمارەیەك شەیتان، لەم نێوەندەدا کێشەیان دروستدەکرد، نەخۆشی رۆحیبوون و سوودیان لەم کەلێن و جیابییە وەردەگرت و ئەم بابەتە دەروونییەش لەجیایی خستنەناو زانست و ئایین – ئایین و عەقڵ، ئایین و سەرکەوتن، کاریگەری هەیە.

•••

**سەرچاوە:**

**ئەنتەرنێت، سایتی "تابناك"، ساڵی (١٣٨٩) بلاّوبۆتەوە.**

# (شەریعەتی)، بیرمەندی ئازادی

نووسینی: د. ئیحسان شەریعەتی
وەرگێڕانی: مـــوسعەب ئەدهەم

ئەی سەروتر لە خەیاڵ و پێوانە و گومان و وەهم و لەهەمموو ئەوەی وتوویانە و بیستمان و خوێندوومانەتەوە!

بابەتی قسەی من ئەمڕۆ، توێژینەوەی کۆتاپەیامی "شەریعەتی"یە لە کۆتاییەکانی ساڵەکانی تەمەنی پڕباری ئەودا، لە بڕگەیەك کە من خۆم لە پێکهاتن و دروستبوونیدا شانازی ئامادەگی و بەشداریکردنم هەبوو، واتە لەدایکبوونی سێ سییانەی (ئازادی، بەرامبەری، عیرفان) لە ساڵی (١٣٥٥)، واتە ساڵێك پێش کۆچی لە ئێران.

بە بۆچوونی من بۆ بەدواداچوونی ئەم پرۆژەیە کە پێیئاشنان، بەهێزی ڕێگەی شەریعەتی" کە وەکو من "شەریعەتی" تەنها وەکو کتێبێك ناناسێت، ئەگەر دەبێت لە حەوزەی تاکەکەسییەوە بە عیرفان دەستپێبکات، لە حەوزە و بواری کۆمەڵایەتی بە خەبات لەگەڵ ئازادیدا دەستپێدەکات. دەزانین کە "شەریعەتی" لەمەودوا ئازادیخوازی و لەبەرامبەری ئەودا کە مامۆستای "شۆڕش"ەکان بوو، هەندێجار لەڕووی تیۆرداڕێژەرانی "سیستەم"ەکان، ڕەخنەی لێگیراوە و من ئەمڕۆ هەوڵدەدەم ئەوە پیشانبدەم بۆچی "شەریعەتی" بیرمەندی ئازادییە و خودی ئەم ئازادییە چییە؟ هەروەها لە چوار پایەی سەرەکی و فەلسەفیدا جیهانبینی "شەریعەتی" واتە لە یەزدانناسی، مرۆڤناسی، فەلسەفەی مێژوو و کۆمەڵناسی، بۆچی و چۆن ئازادی دەروازە و ڕوانینی ڕێگەی ئەوە؟

### ١. خودای شەریعەتی (یەزدانناسی یان ئیلاهییاتی رزگاربەخش):

خودای هەرکەس خوونەریتی ئەوە. "هراکلیت" دەیوت: خوونەریتی هەرکەسێك خودای ئەوە. (ئاتوس - ئەنترۆپوس- دیمون). خودای "شەریعەتی"، خودای قورئان، خودای عیرفانی ئێران، ئازادی ڕەها یان باڵایە (لە هەرشتێك ڕەنکی پەیوەستیبوون هەڵبگرێت). ئازادی باڵا یان باڵابوونی ڕەها "تعالی مطلق" یەکەمین تایبەتمەندی خودای ئەوە. لەلایەکیترەوە، ئەو خودایەکە هەر لەم "نزیکی"یانە. لە ڕەگی بناگوێ لە من نزیکترە کە ئونس و نزیکینلێیەوە، دۆستی گوێگری ئاشنا و هاوەڵی باڵا "رفیق اعلی"یە. "هراکلیت" لەبەردەم تونورێکدا دانیشتبوو کەسانێکی ژیر کە بۆ هاتنی ئەم فەیلەسوفە مەزنە هاتبوون و سەریان لەم دۆخە ئاساییە سوڕمابوو و سەرنجیاندەدا و حەکیمیش بانگهێشتیکردن تاکو هەر لەوشوێنەدا دابنیشن و وتی: (خودا، هەر لەوجێگە و شوێنەدایە، گۆڕەپانی ولاّبوونی ئەمری پیرۆز، هەر لەمجۆرە ژیانەدا و شوێنی نیشتەجێبوونی هەڵبژاردنی ئێمە.)

"هیگڵ" دەیوت: بۆ ناسینی گیانی نەتەوەیەك دەبێت خودایان بناسیت. جەنگی "ئەسکەندەر"و "دارا" خەباتی "زیۆس"و "ئاهورا" بوو. مێژوو ئەگەر جەنگی مەزهەبە دژی مەزهەب، ئەم مەیدانە جەنگی خودایانە. "هیگڵ" دەیوت: (گەل و نەتەوەیەك کە خودایەکی خراپیان هەیە، یاسا و ڕێسای خراپ و.. حکومەتێکی خراپیان هەیە). وێنای خودای ئیسلام بە وتنی "نە" بە خودایانی "ئازادی لە"و بۆ گەیشتن بە ئازادی "ئازادی بۆ، ڕزگاربوون و سەرکەوتن" دەستپێدەکات. "الا"، پەرستشی خودا، (مەحکومییەتی مرۆڤە بە ئازادی)یە، "سارتەر"و شۆرشی زەوی.

پاش بەدیهێنانی بوون، ئەم خودای بەدیهێنەرەی مرۆڤ دەبێت تاکو لەتەنیایی بێتەدەرەوە و گوێگرێك بدۆزێتەوە. بوونەوەرێك بەدیبهێنێت و دروستبکات تاکو لەسەر زەویدا گەندەڵی و خوێنرێژی ئەنجامبدات؟ "فریشتەکان"، شتێك دەزانم کە ئێوە نایزانن! و عاشقترین فریشتەکان بە خودا، شەیتان، شەیتانیبوون مۆڵەتی لە عیشق وەرگرت. خوداش مرۆڤی دروستکرد و درەخت یان میوەی قەدەغەکراو و شەیتانیبوونی عیشق تاکو مرۆڤ لەبەرامبەریدا بوەستێت و ئازادبێت. لێرەوەیە مافی هەڵبژاردن، بەرپرسیارییەتی گوناه، خێر و شەڕ و توانای هەموو بەهاکان.

بۆیە مرۆڤ نە فریشتەیە و نە ئاژەڵ. ئەو لەنێوان (احسن التقویم و اسفل سافلین) دوو رووگە و دوو لایەنە. لایەن و ڕووگەیەکیان بۆ خۆی و خودی خۆی (ڕزگارمبوو، ڕزگاری ڕزگاربوو و بینیم کە منم بەشداری هیچکەس ناکەم، منم وەکو جەزیرەیەك لە چوار لاوە سنوردار بە خودی خۆم. جیهان و ئەوەی تێیدایە لەژێر پێیەکانمدا و هیچ کەسێك لەکەنارمدا و هیچ لەسەر سەرم، چ دەسەلاتێکی پڕشکۆی خودایی!.. بوومە بوون و شۆڕاوە و سپی بوومەوە و گڵێکی بێشێوە و لە دەستی ئازادییەکانی خۆمدا و لەژێر قەڵەمی زێڕینی ئەو! ئەو؟ ئەو کێیە؟ خۆم، خودی ئازادیبەخشم، پەروەردگارم.. مەگەرنا هەرکەسێك بەوئەندازەیەی کە دروستکەری خۆیەتی؟

لەبەرئەوە خودا، من – منەکان، گیان – جیهان، خودی – جیهانی بوون "ئیقباڵ"، خودای (مرۆڤێکە کە بۆئەم خودا گەڕاوەتەوە، لەئەوپەڕی بێخودی بۆ خودی خۆی و ئیدی شایستەیی ئەوەی هەیە کە پێیبڵێین لە کەعبە تێپەڕە! چونکە ئەو خاوەنی ئیرادە و توانای سەرکەشی و لەبەرئەوە بەرپرس و دروستکەری وێنای خۆیەتی. واتە ئەوەی مرۆڤگەراکان "هیومانیستەکان"و بوونگەرا "ئەگزیستانسیالیست"کان هەوڵدەدەن تاکو بە ئینکاریکردنی خودا، مرۆڤ بەوەبگەیەنن). لێرەدا "شەریعەتی" هۆشیاری و ئاگاداریدەدات کە (ئەگەر بمانەوێت ئەم جیهانبینییە "عیرفانی"یە لە چوارچێوەی یەکێك لە قاڵبە زیهنییەکان (مرۆڤگەرایی، ناخگەرایی، بوونگەرایی) بگونجێنین خیانەتمان لە حەقیقەت کردووە. چونکە بەناچاری دەبێت ئەم بابەتە بسڕینەوە، چونکە بنەڕەتیترین تایبەتمەندی ئەم جیهانبینییە مرۆییە نەبوونی قاڵبە (کۆ بەرهەم. ١١٩،١٣)و خوداش لێرەدا بریتییەلە کۆمەڵێك تایبەتمەندی باڵای ڕەها "متعالی مطلق": بەهاکان واتە مانای بوونی مرۆڤ و ئەو تەواوکارییانەی پێوەری تەواوکاری ئەون و خودا کۆی هەر ئەم بەها هاوبەشانەی نێوان مرۆڤ و خودا، جیلوەی خودئاگایی، دروستکردن، داهێنان، زانستی ئەوە). لەم جیهانبینییەدا، ناتوانرێت مرۆڤ جیاواز لە خودا دابنرێت و بزانرێت ئەگەر جیهان مانای نەبێت، قسەکردن لەبارەی مانای مرۆڤەوە وەهم و شتێکی وەهماویە.

**٢. ئازادی، پێناسەی مرۆڤ (مرۆڤناسی):**

ئازادی یەکێکە لە سیفەتە دیارەکانی مرۆڤ، هەروەك ئاگایی، ئیرادە و دروستکردن نییە، بەڵکو بنەڕەتیترین سیفەتی جوێکەرەوەی و لەبنەڕەتدا پێناسەی ئەوە، چونکە مرۆڤ تەنها بوونەوەرێکە لەبووندا کە ئازادە.

ا. مرۆڤ بوونی ئازاد یان ناچارکراو: مەجبور" و مەحکومە بە ئازادی. بوونەوەرێکی کەوتوو یان نیشتووەوە کە چییەتی "ماهیت"ی خۆی، خۆی دروستیدەکات. ئەم پێشکەوتنەش جیاکەرەوەیەکی میتافیزیکی نییە، چونکە چییەتی "ماهیت"ی مرۆڤ کتومت هەمان بوونی ئەوە و بوونی ئەو ئازادی، بوونی ئەو، بە دەستەواژەی "هایدگەر"، "لە" جیهانبوون (سروشت و میژوو)، "لەگەڵ" ئەوانیتر بوون (کۆمەڵگە)، و "خود" بوونە.

ب. خودگەری خود، خودی رەسەن، "من کامەم؟"، (بنەڕەتیترین پرسیاری کەویریات)، بریتیەلە دوورکەوتنەوە و بینین و روانینی خود لەدەرەوە. خود وەکو "ئەویتر" بینین "پۆل ریکۆر"و پاشان "گەڕانەوە" بۆ خود و خودبوون "دۆزینەوەی شوناس". بۆیە شوناسی پێشوو، بۆماوەیی، سوننەتی، نەتەوەیی، ئایینی بوونی نییە. بەڵکو دەبێت بەرەو شوناسبوون و یان شوناسازی و شوناس دۆزینەوە نێوان دوو "خود" رووبەڕووین. مرۆڤ شتێکە بەرامبەر بە خۆی. مرۆڤ بوونەوەرێکە کە لە خۆی سەرووتر دەڕوات و بە دەستەواژەی "نیچە"، "دەبێت" لەو سەرووتر بڕوات (مرۆیی، سەروتربوونی مرۆیی). بۆ نموونە پەیوەندی خود – مرۆیی لەگەڵ شوناسی نەتەوەیی لە شێوەی راستی و دروستیدا، نەك پیاهەڵدانی شوناس بەمانای خودێکی پێشتر دروستبووی نەژادی – نەتەوەیی، بەڵکو دروستکردنی پەیوەندییەکی رەخنەگرانەیە، وایە لەدەرەوە لەگەڵ دەرککردنی هەروەك ئایدیایەکە. ئەمەشە مانای گەڕانەوە بۆ خود کە تیۆریای تایبەتی "شەریعەتی" نەبووە و پێش ئەویش لەلایەن کەسانیتری وەکو "جەلال"و.. هتد، خراوەتەڕوو. "شەریعەتی" خۆی لە پێشەکی "گەڕانەوە"دا دەنووسێت، شوناسی نەتەوەیی و شارستانی ئێمە لەبنەڕەتدا هیچکات نەفینەبووە تاکو (وەك وڵاتە ئەفریقییەکان و.. هتد)، "شوناسگەرایی" پێویستبێت. تیۆریای تایبەتی "شەریعەتی" نەك گەڕانەوە بۆ خود، بەڵکو باس لە جۆرێك گۆڕان و هەڵگەڕانەوەشیەتی لە سیستەمی رابردووشدا و "گەڕانەوە بۆ کام خود"ە.

**٣. فەلسەفەی مێژوو، "زانستی بوون بە" مرۆڤ:**

پاش دابەزینی مرۆڤ لە بەهەشت (لە حاڵەتی تاکەکەسی)یدا بەرەو بیابان (مێژوویەك کە بەشێوەی جوگرافیا دەرکەوتووە و بەتایبەت لەڕۆژهەڵاتدا جۆرێك هیچگەرایی رۆژهەڵاتی دروستکردووە)، دەتوانین فەلسەفەی مێژووی "شەریعەتی" لەم تەوەرانەی خوارەوە کورتبکەینەوە:

ا. رۆیشتنی ئازادی رۆح لە جەبرە پێوستەکانیان بە دەستەواژەی ئەو لە "چوار زیندان"ی، سروشت، مێژوو، کۆمەڵگە و دەروون. لە قۆناغی یەکەمدا گۆڕینی هێزە دەروونییەکان "ترس، تەماع و هەڵپەکردن و وەهم" بۆ

سیستەمەکانی "زۆر و زێڕ و تەزویر"و ئەمەش نەك تەنها وەسفی ئەدەبی، بەڵکو لەڕووی زانستیشەوە " ئایدۆلۆژیای سێ بەشی کۆمەڵگە هیندی – و – ئەوروپییەکان"ە. کە "جۆرج دومزیل" لێکۆڵەری گەورەی فەرەنسی پیشانیداوە.

ب. سەرەوژێربوونی مێژوو: لە قۆناغەکانی سەرەتادا، خودا هێشتا راستەخۆ دەستدەخاتە چارەنووسی مرۆڤەوە و بە ناردنی پرۆمیتەکان یان پێغەمبەران و بە سروش "وەحی" بەرەو تەواوکاری دەبات تاکو قۆناغی خاتەمییەتی "موحەممەد"و خەتمی وەحی یان سەربەخۆیی عەقڵ (بە دەستەواژەی ئیقباڵ)و تاکو "غەیبەت" بە (دەستەواژەی شەریعەتی)، قۆناغی تەواوبوونی ئیمامەت، رێبەری کاریمایی و سەربەخۆیی بۆچوونی خەڵکی یان دیموکراسی پەیماندرا و و رێنمونیکراو لەلایەن رۆشنبیران یان "زانایان"یەوەیە.

ج. غەیبەت، چاوەڕوانی خۆشی و فەلسەفەی مەهدەوییەتە بەرەو نێودەوڵەتی ئازادی و عەدالەتی نەتەوەکان. لە جیهانەکەیتر و باشتر (ئالتەر – مۆندیالیزم) لەبەرامبەر جیهانی سازی تۆڕی تەکنیکی سەراپای زەوی سەرمایەداری جیهانخۆر.

**٤. ئازادی لە کۆمەڵگە یان فەلسەفەی سیاسی "شەریعەتی":**

أ. "شەریعەتی" باوەڕیوایە شۆرشی فەرهەنگی لەپێش شۆرشی سیاسی و ئازادی بەخشەوەیە. چونکە نائاگایی لە مافەکان، رێگری هاتنەدی دیموکراسییە بەتایبەت لەو کۆمەڵگایانەی لە حاڵی فراوانبووندان. لە کۆمەڵگەیەکی شارستانیدا، رەخنەی ئاین پێش مەرجی هەر رەخنەیەکیترە. بۆیە نوێگەری (رێنیسانسی فەرهەنگی و ریفۆرمی ئایینی) بەرنامەی سەرەکی رۆشنبیرە.

ب. گەڕان بەدوای یەکسانی نێوان دیموکراسی سیاسی "لیبرالیزم"و دیموکراسی کۆمەلایەتی "سۆشیالیزم" تایبەتمەندی و خاڵی جیاکەرەوەی فەلسەفەی سیاسی "شەریعەتی"یە بۆ کۆمەڵگە. رەخنەی ئەو لە لیبرالیزم لەسەر بەشی دووەمی ئەم قوتابخانەیە کە لە حاڵەتی شۆرشی سەرەتا بەرەو پارێزگاری دەڕوات و ئازادیخوازی تەنها بە "سوودی رێگری" کەمینە دەبێت. بۆیە رەخنەی "شەریعەتی" لە لیبرالیزم لەسەر دوو لایەن و بواری "داگیرکاری "ئیمپریالیزم"و بەرهەمهێنان "کاپیتالیزم"ە، لەهەمانکاتدا "شەریعەتی" بە دووی "ئیقباڵ"دا ماف و ئازادییە مرۆییەکان قبوڵدەکات، نەك تەنها قبوڵیاندەکات، بەڵکو ئەمانە بە لایەنی کەمینە دەزانێت.

بەکورتی "شەریعەتی" هەروەك "ئیقباڵ" کە پاش دواکەوتنی خەلافەتی "عوسمانی" سیستەمی "کۆماری" بە ناونیشانی گونجاوترین سیستەمی ناسراو بۆ فەلسەفەی سیاسی ئیسلامی هاوچەرخ قبوڵدەکات. لەبارەی دیموکراسیش تەنانەت لەشێوەی کەمینەی لیبراڵییەکەیدا، واتە قبوڵکردنی بنەماکانی وەکو "فرەیی" (پلورالیزمی

فیکری – سیاسی)، لێبوردن و ئەلتەرناتیڤ (مافی کەمینە بۆ گۆڕینی بە زۆرینە).

ئەم لایەنگیریە روەو ئازادییەکان و مافەکان لە فەلسەفەی سیاسی "شەریعەتی"دا لە بۆنە و نەریتەکانی نێوان هزری مرۆڤەکاندا بە ناونیشانی بوونەوەری ئازاد کە لە دۆخی ئاساییدا بۆ "مرۆڤ گورگی مرۆڤ" دەتوانن بگۆڕدرێن و یان بە قبوڵکردنی سیستەمی "ماف" بەرەو دۆخی "مەدەنی" دەگەن، بەلاّم "شەریعەتی" بیرمەندی ئازادییە بۆ "ژیان". ئەو فێرخواز و مامۆستای "چۆنیەتی ژیان"ە، نەك چۆنیەتی مردن، "بمرە و بمرێنە"، یان مەرگ و جەنگ و توندوتیژی، چونکە فەلسەفەی شەهادەتی ئەو نەك خەبات، کە دیوێکی لاوەکی هەیە، بەڵکو پەیامی – خوێن – ی "حسێن"ە لە نەی زەینەب"وە هەڵدەستێتەوە. هەر بەوجۆرەی کە "تشیع" ئەگەر پەیڕەوی لە نموونەی ئیمامی ئازادی و مرۆڤی بالاّ نەك "سەرووبالاّ"، ناویدیکەی بنیّ "فاتیمە"و لە وەچەی ئەم شێرەژنە گیانئازادەیە. هەر بەوجۆرەی ئیسلام بە پشتیوانی "خەدیجە" پەروەردەبوو.

بەکورتی: ئازادی چییە؟ (ئاگایی لەوەی کە نیمە)، واتە هەستکردن بە بەندی و "رزگاری لە" شوێن و پێگەی زیندانیکراو (پێناسەی نەرێنی ئازادی) یان رزگاری "لە" بە مانای "لیبراڵ" و تاکو ئازدای، رزگاری یان سەرکەوتن کە (ئازادی بۆ) (پێناسەی ئەرێنی ئازادی)یە.

ئاگایی خود چییە؟ هەمان ئەوەی لە فەلسەفەی حەج لە ناسینی زانستییەوە دەستپێدەکات و لەدایکبووی عیشقە و تەنها سوپایەك لەجیهاندا کە تیایدا هەر سەربازێك فەرماندەیە و عیشق لەترۆپکیدا "خۆشەویستن"ە و هەموو ئەمە جۆرێك خودئاگاییە تێکەڵ بە کردار (ئێمە و ئیقباڵ).

(عیشق لێرەدا، ریشەی دەرکەوتنی قوتابخانە عیرفانییەکانی و مەزهەبیەکانە، جیلوەیەك لەهەمان ئەوە و لە کەناری ئازادیدا، تایبەتمەندییەکی زۆر بالاّ کە تەنها لەو خودا و نیاز و پێویستی بوونی مرۆڤە، کە لەسەرمایەداریدا لەناودەچێت و لە سۆشیالیزمی دەوڵەتیدا دەبێـە یەك رەهەند. ئەگەر ئەم سێ بوارە لەتەنیشتیەکەوەبن، گەورەترین شت پێشکەش بە مرۆڤ دەکرێت کە: (دڵێکی وەکو "عیسی"تان هەبێت، ئەندێشەیەکی وەکو "سوکرات"و دەستێك وەکو دەستی "قەیسەر"). بەلاّم لەمرۆڤێکدا.. لەبەر بنەمای رۆحێك و بۆ گەیشتن بە ئامانجێك.

(من هەردووکیانم دەوێت، هەم عیشق و هەم ئازادی. دڵم دەکەمە قوربانی عیشقم و عیشقیشم دەکەمە قوربانی ئازادی)، بەلاّم ژیان چییە؟ (نان، ئازادی، فەرهەنگ، ئیمان و خۆشویستن). گەڕان بەدوای "حەقیقەت و جوانی": (حەقیقەتی ئایینم، بوون و رێگە رۆیشتن. نا، بوویە ژیانم و کارم. جوانی بوویە عیشقم و بیانووی ژیان و ژیانکردنم)وە چۆنیەتی ژیان؟ رێگە رۆیشتن ئایینی حەقیقەت کە زانست دروستدەکات. مانەوەی کار، ئایین – خێر کە ئەخلاق دروستدەکات. بیانووی ژیان، جوانی دۆستی و دۆستایەتی کە هونەر دروستدەکات. لەسەر "پەرستگە"دا "شەریعەتی" نووسیویانە: (هەرکەسێك بێهونەرە، نەیەتەناوەوە! دواجاریش "شەریعەتی" لە "کۆنفۆشیوس"ەوە دەگوازێتەوە: (ئەوەی ژیان ناناسێت، چۆن دەتوانێت لەبارەی مەرگەوە، مەعریفەت بەدەستبهێنێت و ئەوەی توانای خزمەتی زیندوانی نییە، دەتوانێت چ خزمەتێك بە رۆحی مردووەکان بکات؟)

**٦. پێویستی زیندووڕاگرتنی یادی "شەریعەتی"**

ئەمڕۆ بۆ ئەوانەی پارێزگارارنی ڕێگەکەی ئەون، پارێزگاریکردنە لەوەی  تووشی سێ نەخۆشی "نیچە"یی نەبێت:

١. رووکردنە "شەریعەتی" هەروەك شتێکی مێژوویی، "شەریعەتی" جەستەیەك، شەقان، مۆزەخانەیەك و.. هتد، نییە.

٢. هۆشیاربین لەوەی سۆز و هەستی پاکمان لە وێناکردن و بەرجەستەکردن و دروستکردنی کەسایەتی وا لە ئەو نەکەین بیکەینە خاچ و شێوە بتێك. قۆناغەکان و زەمینە جیاوازەکان فەرامۆشنەکەین، واتە نەکەوینە ناو هەڵەی تەقلید و دووبارەکردنەوەوە.

٣. نەکەوینەناو بیانووی ئینکارکردنی شێوە رەخنە و و شێوە رۆشنبیرانەوە یان نەکەوینە داوی شاردنەوەی حەقیقەت، ڕێگەی هەڵە و شتانی گوماناوی نەگرینەبەر.

بەڵێ ڕێگەی چوارەم، ڕێگەی "شەریعەتی" زیندوو و زیندووکردەوە، پەیامی "شەریعەتی"یە بە "لەدایکبوونێکیتر"، هەر بەوجۆرەی کە لەدایکبوونیدیکەی "شەریعەتی" بە "ئەبوزەر" (ئیجتماعییات)، قوتابخانەی مام ناوەند (ئیسلامییات)و جارێکیدی خوێندنەوەی مەسنەوی (کەویریات)، دەستپێکرد. واتە هەمانشێواز و ڕێگەی نوزایی پیرایشگەرایانەی سوننەت بەشێوەیەکی گشتی و لێرەدا "سوننەتی شەریعەتی" بۆئێمە، چونکە ئەگەر بیرمەندی ئازادییە، فێرکاری و مامۆستاییە کە ئێمە فێردەکات کە دەتوانین لەبەرامبەر ئەودا و ڕێگەیەکی سەرەوە، بیربکەینەوە.

"شەریعەتی" بەندەی خودای ئازادی یان "رەببی قەڵەم"ە. خودای مامۆستایەك کە قورئان بە بانگهێشتنی ناوی ئەو دەستپێدەکات، لەمڕووەوە، فێرکاری ئێمە نەك بە ناونیشانی ئەندێشە و بیرۆکەیەك لەکتێبەکاندا، بەڵکو فێرکاری ڕێگە و شێوازی ئازادی، بەرامبەر و عیرفانییە کە هەمان جیهان - ئاگایی، کۆمەڵگە - ئاگایی و خود - ئاگاییە.

بۆیە ئێستا زۆر لەجێگەی خۆیدایە تاکو تۆ قەڵەم، تەوتەمت بوو، دەستتکرد بە قەڵەم و قەڵەمت لەدەست لانەبرد، بڵێین کە:

ئەی مامۆستا و فێرکاری ئازادی،<br>
پیرۆزی ئازادی!<br>
بڵێ هەر ساتێك لەکوێیت، چی دەکەی، تاکو بزانین ئەوساتە لەکوێ بین، چی بکەین؟<br>
یان ئەوەی ئێمە لەبەردەم خۆتدا بخوێنیتەوە یان ئەوەی تۆ لەبەردەمی خۆمان بخوێنینەوە!<br>
و بە یادی هاوارەکانی خەڵکی لە سەرەتای شۆڕشدا:<br>
ئەی مامۆستای شەهید! ئەی سەرەتای بێداری! دژی داگیرکاری، دژی ستەمکاری، دژی بەرهەمهێنان، دژی

ئیستیحماری!
بۆ ئەمرۆی ئێمە بخوێنە! دووبارە بخوێنە!
بخوێنە بەناوی گوڵی سوور لە سپێدەی شەو
کە باغەکان هەمویان بێدار و بەرهەمداربوون
بخوێنە دووبارە بخوێنە تاکو کۆترانی سپی
دووبارە بۆ هێلانەی خوێناوی بگەرێنەوە.

"دکتۆر ئیحسان شەریعەتی" کوڕی "د. عەلی شەریعەتی"یە و لە ساڵی (١٣٣٨) لە مەشهەد لەدایکبووە، یەکەمین منداڵی "د. شەریعەتی"یە. بەشی فەلسەفەی زانکۆی "سۆربۆن"ی "فەرەنسا"ی تەواوکردووە. نامەی دکتۆراکەی بە ناونیشانی (شوێنکەوتنی سیاسی فەلسەفەی هایدگەر و هەڵسەنگاندنی خوێندنەوەی ئێرانی لای "ئەحمەد فەردید"ە). ئێستاش لە "تاران" دەژی.

ماوەیەك بە ناونیشانی مامۆستای میوان لە گروپی فەلسەفەی "زانکۆی تاران" و "زانکۆی ئازادی ئیسلامی" وانەیوتووەتەوە.

**بەرهەمەکانی:**

١. فەلسەفەی "هایدگەر و خوێندنەوی ئێرانی"، تاران، انتشارات گام نو، ١٣٩٠.

٢. "ئایین و دەوڵەت"، پاریس، انتشارات ارشاد، ١٣٦١.

٣. "فەلسەفەی خودی لە ئەندێشەی ئیقباڵی لاهوری" پاریس، ، انتشارات ارشاد، ١٣٦٢.

٤. "تیۆریای نەفس"، "ئیبن سینا"، سیمینار، زانکۆی پاریس، ١٣٦٤.

٥. "فەلسەفەی سیاسی فارابی"، راڤەی ریسالەی "سیاسە المدنییە"و وەرگێڕانی بۆ فەرەنسی، ١٣٧٠. ئەمانە و چەندین لێکۆڵینەوە و وتار و نووسینیتر.

•••

**تێبینی: ئەم بابەتە لە ساڵی (١٣٨٨)دا نووسراوە.**

**سەرچاوە: پێگەی "دکتۆر عەلی شەریعەتی"**

# (شەریعەتی) کێ بوو، چی وت؟

## گفتوگۆ لەگەڵ (د. سروش دەباغ)

وەرگێڕانی: موسعەب ئەدهەم

لە رۆژانی شەهیدبوونی دکتۆر "عەلی شەریعەتی" گفتوگۆیەکمان لەگەڵ "د. سروش دەباغ" کوڕی رۆشنبیر و بیرمەندی ناوداری ئێرانی "د. عەبدولکەریم سروش" ئەنجامدا تاکو بۆچوون و روانینی ئەو لەمڕووەوە بزانین.

**پرسیار: رووی جیاواز و سەرنجڕاکێشی زمانی پێیوەندی و ئەوئامانجانەی "شەریعەتی" لە مەیدانی بیر و ئەندێشەدا پێیانەوە خەریکبوو، لەگەڵ زمانی پەیوەندی زانایانیتر ئەو قۆناغە لەچیدایە کە رەنگە بتوانرێ بوترێ پایەکانی گوتاری ناو زانکۆ و نەوەی نوێمان، لەگەڵ بوونی ئەو رەخنەگەلەی کە هاووەچەکانی "شەریعەتی" هەیانە و تەنانەت رۆشنبیری ئایینی ئێمەی لەسەروەستاوە؟**

**سروش دەباغ:** ئەگەر مەبەست سەرنجڕاکێشانی گوتار و گوتاری مەرحوم "شەریعەتی" بێت، دەتوانرێ بوترێ کە "دکتۆر شەریعەتی" کەم تا زۆر لەگەڵ زمانی سوننەت ئاشنابوو، هەرچەندە ئەم ناسینە بەشێوەیەکی زۆر قووڵنەبوو. بڕێك تەفسیر، هەندێك کەلام و هەندێکیش فەلسەفەی دەزانی، باوکێکی زانای هەبوو و ژینگەی پەروەردەی ئایینی هۆکاری پێگەیشتن و فراوانبوون و گەشەی ئایینی ئەو بوو. لەسەرووی ئەمەشەوە لەگەڵ شێوازی ژیانی ئایینی ئاشنا بوو.

هەموو ئەمانە بوونە هۆکاربوون لەکرداردا، ئەوساتەی زاریدەکردەوە و شتێکی دەنووسی، داخوازی و مەبەستی لە سوننەتی ئایینی سەردەمی خۆی کاریگەر بێت. ئەو لە هەمانکاتدا ئاشنایی لەگەڵ ئەدەبییاتی مۆدێرندا هەبوو و قەڵەمەکەی، پەخشان و دەربڕینی، تەژی لە ئامۆژە و ئایدیا مۆدێرنەکان بوو. "دکتۆر شەریعەتی" لەلایەکەوە ئاگاداری "کافکا" بوو و لەلایەکیترەوە "گلشیری" خوێندبوویەوە و ئاشنایی لەگەڵ "سارتەر" هەبوو، هەڵبەتە لەبارەی قووڵایی رۆچوونی دکتۆرەوە لەم بیر و هزرانەدا بڕیارنادەم، بەڵام لەبارەی ئەوەی بۆچی زمانی سەرنجڕاکێشبوو، دەبێت ئەوەمان لەبەرچاوبێت مەرحوم "شەریعەتی" مەعریفە، ناسین و جیهانبینی خۆی لە قاڵبی زمانێکی سەرنجڕاکێشدا رژاندبوو. زمانێکی سەرنجڕاکێش کە رەنگە کەسانیتر هەیانبێت و وەکو پێویست بەهۆی مەعریفەتیانەوە نەبێت. "شەریعەتی" بینالەسەر پەروەردەی ئایینی و بەلەبەرچاوگرتنی پێشینەی

منداڵی لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ باوکی خۆیدا کە زانایەکی ئایینیبوو و ئاشنایی تاڕادەیەکی دکتۆر "شەریعەتی" لەگەڵ دونیای مۆدێرنە و.. هتد، هەموو ئەمانە لەسەرووی توانای سیحری دەربڕین و سیحری قەڵەمەکەی، کەسایەتییەکی ئاراوتەیی "استثنایی" دوستکردبوو کە کەمتر لەکەسێکدا هەموو ئەم شتانە کۆدەبنەوە.

دکتۆر "شەریعەتی" تواناییەکی سەرسووڕهێنەری لەقسەکردندا هەبوو. بەمانای وردی وشە گوتەبێژ و وتاربێژبوو. هاوڕای ئەوەی کە "ئەرستۆ" لەبارەی هونەری گوتاربێژییەوە دەیوت و هونەری جیاوازی لەقسەکردندا لەیەکترجیاکردبوویەوە و ناسیبوو. یەکێکیان هونەری وتاربێژی، یەکێکیتر هونەری جەدەل و گفتوگۆ بوو لەکۆتاییدا هونەری بەڵگەهێنانەوە. دکتۆر "عەلی شەریعەتی" زیاد لەوەی قسەی جەدەلی و بەڵگەهێنانەوە بەکاربهێنێت بەچاکی سوودی لە هونەری وتاربێژی وەردەگرت. ئاوازی دەنگی دڵئەنگێزی "شەریعەتی" لەوتارەکانیدا و گەنجینەی زاراوە دەوڵەمەندەکانی، گوێگری بەرەو لای خۆی رادەکێشا و سیحری لە گوێگر دەکرد.

بۆ وتاربێژێك و رۆشنبیرێك کە دەچێتەناو مامەڵە و گفتوگۆ لەگەڵ چینی مامناوەند، بۆئەوەی خەڵکی بەگشتیش بتوانن لە قسەکانی بەهرەمەندبن، بوونی هونەری وتاربێژی، گەلێك گرنگە.

هەڵبەتە نابێت دەردمەندی و بوونی ئازاری "شەریعەتی" فەرامۆشبکەین. لەم دەردمەندییەشدا ئەرکی نەدەخستەسەر خۆی و شتی دروستکراونەبوو. ئەو وێنای راستەقینە و واقیعی خۆی لەبارەی کێشەکان و زیانە فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەوڕۆژانەی موسوڵمانان و ئێرانیان بێکەموکورتی دەردەبڕی و لەژێر کاریگەری گوتاری رەخنەگرانەی مۆدێرنە، وێنای ئەوەبوو کە تووشبوون بە ماشینیزم لە فەرهەنگی ئێمەدا، رۆژئاوازەدەیی و داگیرکاری، خەڵك بە گێلکردن "استحمار" و ستەمکاری کە لەلایەن رۆژئاواییەکانەوە دامێنی ئێمەی پیسکردووە، رێگرە لە پێشکەوتن و گەیشتن بە سەری مەنزڵی مەبەستی ئێمە.

لەلایەکیترەوە هونەر دەبڕینی ئازار و دەردی هەبوو و بە چەشنێکی زۆر سەیر ئەمەی تێدابوو. وتویانە و هەموومان بیستوومانە کە: (قسەیەك لەدڵەوە بێتەدەرەوە، بەدڵیشەوە دەنیشێت.) سەلمێنەری دیاری ئەم قسەیە لە رۆژگاری "شەریعەتی"یشدا بوو.

دکتۆر "شەریعەتی" لەوڕووەوە لە ماوە و درزی نێوان سوننەت و مۆدێرنە هەنگاوی دەنا و لە رۆشنبیرە کاریگەر و بەناوبانگە ئایینییەکانی پێش شۆرش بوو، ئەو بابەتانەی کە دەیخستنەڕوو، خۆماڵی و ئێستاییبوون. ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێشەکانی دەربڕینی دکتۆر "شەریعەتی". هەڵبەتە خۆماڵیبوونی ئەندێشەکانی دکتۆر "شەریعەتی" لەلایەکیترەوە رەخنەی رەخنەگرانی بەدواوەبوو.

من لەم دواییانەدا رەخنەم لە یەکێك لە رۆشنبیرانی هاوچەرخ گرتووە کە باوەڕیوایە هەموو ئەو کارانەی لە حەوزەی ئەندێشەدا و لە سەردەمی نوێدا کە رۆشنبیرانی وەکو "شەریعەتی" ئەنجامیانداوە، جۆرێك وەرگێڕان و بیرکردنەوەی ئێمە لەکۆتاییدا جۆرێك وەرگێڕانە، نووسیومە و لەوێدا هێناومە یەکێك لەوکارانەی کە رۆشنبیرانی ئایینی وەکو "شەریعەتی" ئەنجامیانداوە، چەمکسازییە.

کارێك کە سەرکەوتنی وەکو "شەریعەتی" لەگەڵدایە. ئەو لەگەڵ هەبوونی ئەوەی کە گونجاوی لەنێوان ئەو کۆمەڵگەیەی کە تیایدادەژیا، دۆزینەوەی بابەتگەل لە جیهانی دەوروبەری خۆی و بەدوی بیناکردنی چەمکگەلی نوێ

بینالەسەر ئەو بابەتانەی لەدەوروبەری خۆی و روونکردنەوەی بەوەدەزانی کە رێگاکانی بدۆزێـەوە کە دەتوانێت بۆ واقیع کاریگەربێت.

لە باسی چەمکسازیدا دکتۆر "شەریعەتی" چەمکگەلی وەك: خودسازی شۆرشی، شیعەگەری عەلەوی، شیعەگەری سەفەوی و گەڕانەوە بۆ خودی دروستکرد. یەکێك لە پێوەرە سەرکەوتوەکانی رۆشنبیر و بیرمەندێك پێوەری توانایەتی لە چەمك سازیدا. چەمکسازی کە پەیوەستە بە پۆلبەندی ئەو بابەتانەی لەگەڵیاندا دەست و پەنجە نەرمدەکەین و تاکو رادەیەکیش ئەو رێگایانەی دەیانگرینەبەر و روونکردنەوەی ئەوەی چ بەرهەمگەل و ئەنجامگەلێك لەسەر کردارەکانمان هەیە.

بە بۆچوونی من نهێنی سەرکەوتنی دکتۆر "شەریعەتی" کۆمەڵە هۆکارێکە کە ئاماژەیانپێکرا. ئەو هونەرمەندبوو لە دیاریکردنی ئازار و رەنج و دەربڕینی ئازار. دڵسۆزی لە دەربڕینیدا شەپۆلدەدات و لەلایەکیترەوە بەمەبەست، هونەری وتاربێژی چاکدەزانی و دەستێکی باڵای لە چەمکسازیدا هەبوو.

## پرسیار: ئایا رێڕەوگۆڕین و بیرکردنەوە لە ژیانی "شەریعەتی"یدا بەشێوەیەکی یەکجۆرە یان قۆناغی جیاوازی لە رێڕەوی ئەندێشەی ئەودا دەبینین؟

**سروش دەباغ:** لەنێوان فەیلەسوفان خۆرئاوادا کە قۆناغی فیکر جیاوازییان هەبووە، بۆنموونە: دەتوانین ناوی "ڤیتگنشتاین"ی پێشوو و "ڤیتگنشتاین"ی دواتر یان "هایدگەر"ی پێشوو و "هایدگەر"ی دواتر ببەین. بەڵان لەبارەی دکتۆر "شەریعەتی"یەوە، زۆربەی ئەو کارانەی کە "شەریعەتی" ئەنجامیداون، لە دەوری (٤٠) ساڵیدان. بەومانایەی تەنانەت لاوی و تەمەنی گەنجی ئەو بە کۆتا نەگەیشتووە.

ئەگەر تەمەنی زیاتربوایە، بێگومان شتانی پوختەتری باسدەکرد و دەردەبڕی و چ بگا بەوەی پێداچوونەوەی بەهەندێك لە ئایدیاکانی خۆی دەکرد. بە باوەڕی من لە چەند شتانێکدا شاهێدی چوونەناوەوە و دەستکاریکردن لە مەیدانی ئەندێشەی "شەریعەتی"داین، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بوارێکی بۆ گۆڕانکاری فیکری نەبوو. کات تەنگ، زیندان کە بەشێك لە ژیانی ئەو لەوێ گوزەرا، بە گوتەی خۆی: (هەزار شەوی تەنیایی) کە لە کتێبی "لەگەڵ گوێگرانی ئاشنا"دا ئاماژەپێیکردووە، هەموو ئەمانە بواری گەشەپێدانی فیکرییان لەووەرگرتەوە. خودی خۆی ژیانی خۆی بە پێنج ساڵی جیاواز دابەشکردبوو کە هەر یەك لەوانە و لەوساڵانە بە کارێکەوە خەریکبووە.

"شەریعەتی" باوەڕیوابوو کە لێکۆڵەر نییە و باری ئازاری "ئەبوزەر"و هەموو ستەملێکراوانی جیهان خراوەتە سەرشانی ئەو. جۆری رۆمانتیکی بوو، کەسێکی ئازاراوی کە زیاتر بیرۆکە و بیرکردنەوەکانی روەو جوولە و بزاوتن بوو جوڵە دروستکردنی بە هۆکاری دەوڵەمەندکردنی کاروبارەکان دەزانی. ئەمە بەو مانایە نییە کە کەڵکەڵەی حەقیقەتی نەبوو، بەڵکو ئەوەی سەنتەر بە بیرکردنەوەکانی دەبەخشی، دروستکردنی بزووتنەوە و شۆرش بوو.

لەهەمانکاتدا "شەریعەتی" پێداگری لەسەرئەوەدەکرد کە شۆرش پێش خودئاگایی، ترسناکە. لەهەمانکاتدا هەنگاوێکە کە بیرۆکەکانی بەشێوەیەکی زۆرینە و فرە پۆلبەندی دەکەین، لەژێر گوتاری شۆرشدا بەناوی ئایین و

بەسوودوەرگرتن لە گەنجینەی وێناکان و شتە سەلمێنراوەکانی ئایین، پۆلبەندی دەکرێت. ئەو ئەنجامەی لێرەدا بەدەستدەهێنرێت بریتییەلەوەی کە ناتوانرێت بەڕوونی ناوی قۆناغە هزرییە جیاوازەکانی ماوەی ژیانی دکتۆر "شەریعەتی" بەرین.

**پرسیار: هەر بەوجۆرەی "سروش" دەیوت: لە کۆتاییەکانی تەمەنی دکتۆر "شەریعەتی" لەگەڵ زنجیرەیەك بابەتی رۆحی داخوازی گۆشەگیری و گۆشەگیری رووبەڕووین، ئایا بەرهەمێك لەو قۆناغانەی دکتۆر "شەریعەتی" لەبەردەمماندا هەیە؟**

**سروش دەباغ:** بەڵێ کۆتاییەکانی تەمەنی، کتێب گەلێکی وەکو عیرفان، بەرامبەر، ئازادی و هەندێکیتر لە ئایدیا و بۆچوونەکان لەهەمان ئەوکاتانەدا بلأودەکاتەوە و رەنگە ئەم حالّی گۆشەنشینی، پەیوەستبێت بە حاڵ و دۆخی پاش زیندانیکردنی کە کۆچی دکتۆر "شەریعەتی" بەدواوەیە و لەدوای مانگێك پاش کۆچکردن، وەفاتدەکات.

**پرسیار: "شەریعەتی" ماوەیەکی زۆر لە خانەکانی زیندانی تاکەکەسی تێپەڕاندبوو. لە حاڵ و دۆخی دەروونناسی زیندانیانی تاکەکەسییەکان ئەوەباسدەکرێ کە بەتێپەڕبوونی کات گۆڕان بەسەر بۆچوونیان دێت، ئایا لە حاڵ و دۆخی ئەویشدا و پاش ئازادبوونی لە زیندان، خاڵێك هەیە لەم خاڵەدا باسبکرێت؟**

**سروش دەباغ:** "عەلی رەهنما" لە کتێبی (موسوڵمانێك لەگەڕان بەدوای یۆتۆپیا)دا هەوڵدەدات تاکو ئەوە پیشانبدات کە شیکارکردنی "شەریعەتی" لەزینداندا گۆڕانی بەسەردا هات. هەڵبەتە دەبێت ئەوەمان لەبەرچاوبێت کە ئەم بۆچوونە دژیشی هەیە و خۆشەویستانی "شەریعەتی" ئەم بۆچوونەیان بەدڵنەبوو، کەسانێك باوەڕیانوایە کە "شەریعەتی" لەزینداندا بەم ئەنجامە گەیشت کە دەتوانرێ بۆ پاراستنی بزووتنەوە و سەرکەوتنی کۆتایی بزووتنەوە لەزینداندا خەریکی رەخنەی مارکسیزم بێت.

**پرسیار: هۆکاری جەنجاڵی بیرمەندانی سوننەتی لەمەڕ بیرۆکەکانی دکتۆر "شەریعەتی"و تەنانەت باسی هەڵگەڕانەوە "مرتد" زانینی لەلایەن هەندێك کەسەوە کە لەگەڵ ئەوەشدا تیغی تیژی گومانی بەرەو رۆیشتووە، چییە؟**

**سروش دەباغ:** باسی رەدکردنەوەی دکتۆر شەریعەتی کەمبوو و پاش شۆرشیش زۆر کەمتربوویەوە. رەنگە هەندێك وا گومانیانکردبێت کە قسەکانی دکتۆر "شەریعەتی"، دژی ویلایەت، دژی ئیمامەت یان تەنانەت لەو شەتەحییاتانەی لە گفتوگۆکانی تەنیاییدا هەن، پێشێلکەری نبوەت بێت. بەشێوەیەکی گشتی بەمجۆرە سەیری

"شەریعەتی" نەکرا و شتێکی سەرتاپایی نەبوو. لەبنەڕەتدا نابێت کەسێك بەمجۆرە شتانە لەڕووی مەعریفییەوە نەفیبکرێت و نابێت هیچکات دامێنی ئەم بابەتانە زیادبکرێت تاکو کۆمەڵگە لە دادوبێداد و گفتوگۆی زانستی بێبەشنەبێت.

**پرسیار: لەبارەی گفتوگۆکانی تەنیایی "شەریعەتی"یەوە شتێکتان لەیادە کە حاڵەتی ئەو بەچاکی نومایانبێت؟**

**سروش دەباغ:** بەڵێ، لەبیرمە لە گفتوگۆکانی تەنیاییدا، لەجێگەیەکدا هەندێك لە حاڵ و دۆهی خۆی دەخاتەڕوو و دەستەواژەگەلی وەك بیستنی دەنگی زنگ لەناو خۆیدا هەستپێدەکات. ئەم دەستەواژەیە یادهێنەرەوەی ئەم بەیتەی "حافیز"ە کە دەڵێت:

کس ندانست که منزلگه مقصود کجاست
انقدر هست که بانگ جرسی می اید

واتە: (کەس نازانێت مەنزڵگەی مەبەست لەکوێوەیە، هێندە هەیە دەنگی زەنگ دێت.

**پرسیار: ئایا زانستە مرۆییەکان و زانستە ئیسلامییەکانی "شەریعەتی" هۆکاری دژیەکی لەبیرۆکەکانیدا نابێت؟**

**سروش دەباغ:** شەریعەتی وەکو کەسێکی ئایدۆلۆژی هەوڵیدەدا تاکو سەرچاوە فەرهەنگییەکانمان پاکوخاوێنبکاتەوە و کۆمەڵێك ئامراز لە خەباتێکی شۆڕشگێڕیدا بداتەدەست گوێکرانی. بەومانایەی "شەریعەتی" بەتەواوی ئەکادیمیستێك و لێکۆڵەرێك نەبوو و هەڵبەتە ئەمەش بەومانایە کە ئاشنایی ئەو لەگەڵ ئامۆژە و فێرکارییە ئایینییەکاندا ڕەدبکەمەوە.

**پرسیار: بەشێوەیەکی گشتی ئایا ئەندێشەی ئایینی "شەریعەتی" بەسەر ئەندێشەی رۆژئاوایی "شەریعەتی"دا زاڵبوو یان بەپێچەوانەوە یان مامناوەند بوو؟**

**سروش دەباغ:** لەگەڵ هەردوو ئەم گوتارانە بەشێوەیەکی نەك زۆر قووڵ ئاشنابوو. نە قووڵبوونەوەی زۆری لە سوننەتی ئیسلامی هەبوو و نە قووڵبوونەوەی قووڵی لە سوننەتی رۆژئاوایی هەبوو. دەتوانرێت حاڵەتی مامناوەند لە ئەندێشەی "شەریعەتی" بدۆزرێتەوە. بڕێك کەلامی دەزانی و بڕێکیش فەلسەفە، کەمێك زیاتر مێژووی ئیسلامی

دەزانی و کەمێك توانای لە تەفسیر و عیرفاندا هەبوو. لەلایەکیترەوە لەگەڵ کۆمەڵناسی نوێ ئاشناییەکی مامناوەندی هەبوو. هیچکام لەم بابەتانە ڕێگری بیرمەندی کەسێك نابن، چونکە هەر بەوجۆرەی وتم، گەنج و گەنجینەی مەعریفی - بوونگەرایی زۆری هەبوو. بەڵام دەبێت بە شایەدی بەرهەمەکانی دەبێت بەشێوەیەکی مامناوەند هەڵسەنگاندنی بۆبکرێت.

### پرسیار: لەکۆتاییدا هۆکاری نەمری "شەریعەتی" چییە؟

**سروش دەباغ:** هونەرمەندبوو لە ئامرازی ئازار و دەردا، چەمکسازێکی بەتوانابوو. هەبوونی ژیانێکی کەم تا زۆر سەرنجڕاکێش و نهێنیئامێز، قەڵەمی سیحری هەبوو، کاریزمابوونی کەسایەتی، ئەو دڵسۆزییەی تیایدادەبینرا، لەبەرچاوی ئەوانیتردا حاڵ و دۆخی بوونگەرایی خۆی باسدەکرد کە لە "گفتوگۆکانی تەنیایی"و "کویر"دا هاتووە و کەمتر ڕۆشنبیری خەریکی ئەمە بووە، هەموو توانا و پێگەی کەسێك زیاددەکات.
لە "گفتوگۆکانی تەنیایی"دا لەگەڵ مرۆڤێکدا ڕووبەڕووین کە کەم تا زۆر کەسایەتی خۆی لەبەرامبەر گوێگردا ڕووتکردووەتەوە و ئەمکارەش هەستی نزیکی بە گوێگر دەبەخشێت و دووری و ماوەکانی لەگەڵدا کەمدەکاتەوە. "شەریعەتی" مرۆڤێکی ڕەسەن بوو بەهەمان ئەو پێناسەیەی کە بوونگەرایی "ئەگزیستانیسالیزم" لە مرۆڤی ڕەسەن هەیەتی. پێشبینیدەکەم مانا و نەمربێت.

•••

**تێبینی ئەم گفتوگۆیە ساڵی (١٣٨٩) ئەنجامدراوە.**

**سەرچاوە: ئینتەرنێت.**

# تەنیایی یان جیایی؟

نووسینی: د. عەلی شـەریعەتی
وەرگێڕانی هەڵکەوت هەورامی

بیرمەندانی گەورەی وەکو (مارتین هایدگەر، سارتەر، یاسپەرس)و تەنانەت (بیکت و ئەریك فرۆم) قسە لەبارەی تەنیایی مرۆڤەوە دەکەن و تەنیایی بووەتە رۆحی فەلسەفە و هونەر و ئەدەبی مرۆڤی ئەمرۆ. منیش ئەم وشەیەم بە هەڵە هەڵبژارد، بەتایبەت لە ساڵەکانی دواییدا، بەردی بناغەی فیکریم و روانینی فەلسەفیم لە جیهانبینی فەلسەفی و مرۆڤناسی فەلسەفی و فەلسەفەی ژیانی تاکەکەسیم بوو، هەر بەوجۆرەی لە کتێبی "کویر"، بیاباندا نموونەی لەمجۆرە بیرکردنەوە و بەرهەمی نووسینەکانی ئەم قۆناغەی قەیرانی فیکری رۆحی من دەتوانن ببینن کە ئێستاش قسەی لەبارەوەدەکەم، بەڵام بە ناونیشانی ئەو زاراوەیەی کە بۆ ئەم هەستە بنەڕەتییەم هەڵمبژاردبوو، واتە "تەنیایی" هەڵەمکردووە، واتە سەرنجی ئەوەمنەدابوو کە ئەوەی دەمەوێت بیڵێم لەگەڵ ئەوەی (سارتەر و هایدگەر)و نهیلیزم و پووچگەرایی نوێ و تەنانەت بوونگەراکانی ئەمرۆی رۆژئاوا دەیڵێن، وەکو یەك نییە و جیاوازە. نابێت لەژێر کاریگەری ئەوانەدا منیش وشەی تەنیایی بەکاربهێنم، من بۆ روونکردنەوەی ئەم هەستە بنەڕەتییەم لە فەلسەفەی ژیان و مرۆڤناسیدا دەبوو "جیایی" هەڵبژاردایە.

### واقیعییەتگەرایی

ئەمرۆ دوو جۆر تەرزی فیکری لەدنیادا بوونیان هەیە:

یەکێکیان تەرزی فیکری واقیعییەتگەرا، هەستگەرا، ریالیزمی نوێیە کە فەلسەفە، ئەدەبییات، هونەر، رۆح، چێژ، داهێنانی هونەری و ئامانجەکان و ئایدیاکان و مەبەستەکان و سیاسەت و کۆمەڵگە و رێوڕەسمی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفەی مرۆڤناسی و گشت ئەمانە و هەمووی دەبێت لە چوارچێوەی واقیعییەتدا سنووورداربێت. واقیعییەت چییە؟ واقیعییەت واتە ئەوەی بەرهەستە، دیار و هەبووە. ئەم روانین و رۆح و لایەنگرییە لەهەمـوو قوتابخانە جیاوازەکاندا و تەنانەت دژەکانی ئەمرۆی فەرمانڕەوا بەسەر سەدەی بیستەمدا و بەبلاو لە رۆژهەلات و رۆژئاوادا هاوبەشە. لەوانە لە مارکسیزمە دەوڵەتی و سۆشیالیزمی رۆژئاوایی کە پڕە لە رۆح و روانینی بورجوازی رۆژئاوایی لە ژیان و لە دەربڕینی مرۆڤ و ئایدیاکانی مرۆڤ و فەلسەفەی ژیانە، چونکە جیاوازی کۆمۆنیزمی دەوڵەتی و لەگەڵ سەرمایەداری تایبەتی لە شێوەی ژیانی ماددی و توێژدانان و هەبوونی چینە ئابوورییەکان و مۆڵکایەتی سەرمایەیە و فۆرمی دابەشکردن و بەکارهێنانە و گەرنا هەردووکیان ژیانی مرۆڤ لەسەر

بنەمای هەبوونی ماددی و رەسەنێتی ئابووری وەکو یەك باسدەکەن و دەریدەبڕن و هەردووکیان ریالیستی ماددی و ئابووری "دنیا"یین. روانینەکانی بەرژەوەندیخوازی، ماددیگەری، رەسەنێتی سوود، رەسەنێتی ئازادی تاکەکەسی (کە مەبەست لە ئازادی بازرگانی و لابردنی کۆتەکان و مەرجی یاسایی و گومرگی و رێوشوێنی یاسایی و دەوڵەتی لە بەرهەمهێنان و فرۆشتنی بازاڕ بوو)و کەپیتالیزم و کۆمۆنیزم و کۆلیتیوئیزم "مۆڵکایەتی دەستەجەمعی"، رەسەنێـتتی ئابووری، رەسەنێتی ژینگە، رەسەنێـتی سروشت، رەسەنێتی تاك و تەنانەت مەسیحییەتی پرۆتستانت لە روانینی کرداری و هەروەها ئازادی ئەدەبییات و هونەر کە بە کردار بەرەو پشتبەستن و ددانپێدانان و رازیبوون بەوەی بوونی هەیە و هەرچی لە ژیان و کۆمەڵگە و غەریزە و رەفتارە ئەخلاقی و رەگەزی و حەزە رۆحییە لادانەکان بەرەوی هەیە، رۆیشتووە و بە فرۆیدیزمی بازاڕی و پیس و بلاّوکردنەوە و دەربڕینی هەموو پیسییە شاراوەکان لە گۆشە پەنهانەکانی کۆمەڵگە و پەیوەندییە شاراوەکانی تاکەکان و پشتی دیوارەکان و تاریکییەکان یان گۆشەکانی رۆحی بەئاگا و نائاگای مرۆڤ لە حەزە ناسروشتی و رێگەپێنەدراوەکان و دەرهێنانی هەموو و خستەسەر کاغەز و خستەڕووی و تەنانەت بەجەختکردنەوە و زیاتر قسەلەسەرکردنی و پیشاندانی بەهەمووان و تەنانەت خستەبەردەم منداڵانیشەوە!

هەموو ئەمانە واتە رایالیزمی نوێ یان سوریالیزمی نوێ و لەبەرئەوە رایالیزمی نوێ تەنها قوتابخانەیەکی تایبەتی فەلسەفی نییە، روانینێك، رۆح و رەفتاری هاوبەشی مرۆڤی نوێ و تایبەتمەندی فەرهەنگ و شارستانییەت و ژیان و بیرکردنەوەی نوێیە کە لە رێنیسانسەوە، واتە سەرەتای دەرچوون لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە – کە سەردەمی مەزهەب و رۆحانییەت و خوداگەرایی و ئاخیرەتگەرایی و نەفیکردنی واقیعییەت و پشتکردن لە سروشت و کوشتنی نەفس، واتە غەریزە واقیعییەکان و ئەو نیاز و پێداویستییانەی کە هەن لە مرۆڤی واقیعیدا لەبەرخاتری حەقیقەتی باڵا و بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان و کۆششکردن بوو بۆ ئەودیو بوو- تاکو ئەمڕۆ تایبەتمەندی و خاڵی دیاری بیرکردنەوەی رۆژئاواییە، لەهەموو و بوارەکانیدا (فەلسەفە، هونەر، ئەدەبیات، ژیان و کۆمەڵگە و سیاسەت..)و تەنانەت لە قوتابخانە دژەکانیدا (سۆشیالیزم و کەپیتالیزم)، چونکە لەهەموو ئەمانەدا رۆحێك بوونی هەبوو و ئەویش "رۆحی بۆرجوازی" بوو، چونکە "سەردەمی نوێ" لە سەدەی (١٥ و ١٦)ەوە تاکو ئێستا کە لەبەرامبەر "سەدەکانی ناوەڕاست"ە، لە سەدەی (٥ تاك ١٥) لەبنەڕەتدا سەردەمی گەشە و سەرکەوتن و فەرمانڕەوایی چینی بۆرجواز دژی چینی فیودالّی (سەدەکانی ناوەڕاست)ەو سروشتییە کە تەنانەت کۆمۆنیزمیش کە لەڕووی چینایەتییەوە دژی ئەوەیە، لەڕووی رۆح و روانین و سەیرکردنی مرۆڤ و ژیان و جیهانبینی لەگەڵیدا هاوشێوە و لێکچوویێت، چونکە لەم رۆحەوە تێربووە و جیاوازی سۆشیالیزمی رۆژهەلاّتی کە لە شارستانییەت و مێژوو و مەزهەبە رۆژهەلاّتییەکاندا پێشینەی هەیە، لەگەڵ سۆشیالیزمی رۆژئاواییدا لێرەدایە.

### راکردن لە واقیعییەت "ئایدیالیزم"

لەبەرامبەر ئەوەدا بەشێوەیەکی رەها و بەشێوەکی گشتی، ئایدیالیزمی نوێ یان داماڵڕاوی و تاکبوونەوە و رووتبوونەوە لەهەر شتێك، ئایدیالیزمی نوێی فەلسەفی، ئایدیالیزمی نوێی هونەری، ئەدەبی و تەنانەت فیکر و

هەستی. لە ئایدیالیزمی نوێدا مرۆڤ بالاٌتره لە جیهانی واقیعییەت و جیهانی واقیعییت لەژێرپێی میعراجیدایە و جیهانی واقیعییەت بەهای نییە و مرۆڤیش دەبێت داماڵراو لە کۆمەڵگە، داماڵراو لە سروشت، داماڵراو لەهەرچی واقیعییەت و دیار و لەدەرەوەی هەموو ئەوەبێت کە بەرهەستە کەوتوو لەبەردەم پێیەکاندا، خەریکی تەواوکاری رۆحی خۆی، دەروونگەرایی خۆی و پەروەردەی زەینی تاکی خۆی و کەشفکردنی ئامادەگییە زەینییەکانی خۆی بێت و بەوپێوەرەی کە بۆ جیهانی واقیعی و ژیانی رۆژانەی کۆمەلاٌیەتی و ئەوەی پێویت و دیارە و ماددییە و سروشت و تەقلیدی سروشت و تەسلیمبوونی واقیعییەت لایەنگری پەیدادەکات، دادەڕووخێت.

زەینگەرایی، تاکگەرایی، خودگەرایی، دەروونگەرایی و لەوشەیەکدا ، راکردن لە واقیعییەت یان سەرکەشی لە دیاری ئەمڕۆ، سیفەتی دیاری ئەدەبییاتی مۆدێرن و روانینی مۆدێرن و هەروەها شەپۆلی هونەری ئەمڕۆی ئەوروپاری رۆژئاوایی و ئەمریکایە کە داوێنی تاکو رۆشنگەری ئەو ولاٌتانەی لە حاڵەتی دواکەوتندان و تەنانەت ئەو نەوەیەی خوێندنی تەواوکردووە و بەتایبەت نووسەر و هونەرمەندی کۆمەڵگەی روسیا رۆیشتووە و درێژبووەتەوە. ئەمە شەپۆلێکی "نویٚ"یە کە لەبەرامبەر رۆحی ریالیزمی نویٚ کە لایەنگری واقیعییەتە، سەرکەشیکردووە و و هەوڵدەدات تاکو لە واقیعییەت رابکات و رووتبوونەوە و داماڵران لە شتانی دیار، راکردن لە واقیعییەتی بەرهەست، زەینیگەرایی و نەفکردنی تەقلید و تەسلیمبوون لەبەرامبەر ریالیزمی سروشت و کۆمەڵگە و ژیان و شارستانییەت و هونەر و ئەدەبییات، تایبەتمەندی ئەم شەپۆلە مەزنەیە.

•••

**سەرچاوە:**

**کتێبی "نیایش"، د. عەلی شەریعەتی، کۆبەرهەمی ژمارە (٨)، چاپی سیانزەهەم، ١٣٨٤.**

# فەلسەفەی نزا

## ئاگایی، عیشق، نیاز و جیهاد لە نزادا

نووسینی: د. عەلی شەریعەتی
وەرگێڕانی: لیان ســـــەیدی

**پێشەکی**

من خۆم لە قسەکردن بە دوور دەگرت، ئەمەش لەبەردوو هۆکار بوو:

هۆکاری یەکەم ئەوەیە کە لە بۆچوونی مەزهەبییەکانمان بە شێوەیەکی گشتی - هەڵبەتە بە ئاراوتە"استپناو"ی ئاراوتەکان- و هەروەها لە بۆچوونی ئەو چینەی خوێندنیان تەواو کردووە و بە گوتەی ناسراو رۆشنبیر، واتە هەم ژمارەیەك بە پەیوەستن بە نزاوە و هەم ژمارەیەك کە هێرش دەکەنە سەر نزا، هەردووکیان نزا بە مانای دەرمانێکی ئارامبەخش و سڕکەر دەزانن و تێدەگەن و بە ناونیشانی قەرەبووکردنەوەی لاوازییەکان، راکردن لە بەرپرسیارییەتییەکان، بێکاری، تەمبەڵی، دوورکەوتنەوە لە مەترسییەکان و هەروەها هەڵنەگرتنی بەرپرسیارییەتی کۆمەڵایەتی و بەرگری لەبەرامبەر ژیان و بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم کەمی و ناتەواوییانە و ئەم لاوازییانە، نزا بووەتە جێگرەوەیەك بۆ ئەم تایبەتمەندییە مرۆییانە. واتە هەمیشە خەیاڵی ئەوە دەکەین کە لەجیانی بیرکردنەوە، هەوڵدان، جیهادکردن، بەرگری، خەباتکردن، بەرگەگرتنی سەختی و نارەحەتییەکان، قبوڵکردنی بەرپرسیارییەتی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی، دەتوانرێ نزابکرێت. لەبەرئەوە لە مانای فراوانی وشەکەدا، نزا بریتییەلەوەی تاکی نزاخوێن دەیەوێت لە خودا ئەو شتانەی کە دەبێت بە هەوڵ و کۆشش و کار و رەنجکێشان بەدەستیانبهێنێت، لەبەرخاتری تەمبەڵی و لاوازی لە خودا داوایانبکات. ئەمجۆرە تێگەیشتنە لە نزا قسەکردن لەبارەیەوە بۆ من زۆر کێشەی دروستکردووە، لەبەرئەوە ناچاردەبێت کاتێکی زۆرم هەبێت تاکو سەرەتا چۆنیەتی پەیدابوونی بیرێکی لەمجۆرە و تێگەیشتنێکی لەمشێوەیە لە نزا لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، بپشکنم و بڵێم کە چ جۆرێك و بەچ شێوەیەك ئەم مانایە لە نزاکان پێش ئیسلام و سەرچاوە نائیسلامییەکان چوونەتە ناو تێڕوانینی ئیسلامی ئەمڕۆوە، واتە بووەتە روانینی موسوڵمانانی ئەمڕۆ و هەروەها چۆنیەتی لاوازییەکان، شکستەکان و نائومێدییەکان و رووداوی نەخوازراوی مێژووی ئیسلامی و بووەتە هۆی بێتوانایی موسوڵمانان بۆ دۆخی ئەمڕۆ و چینی خەڵکیش ناچار لەبەرئەوەی لەبەدەستهێنانی ئامانجەکانیان نائومێدبوون، لە جێگیرکردنی ئایدیاکانیان بێتوانابوون و خۆیان لاواز بینیوەتەوە لەبەدەستهێنانی ئەوەی مەبەستیان هەبووە، بەرەو ئەمجۆرە تێگەیشتنە لە نزا بەرێکەوتوون و باوەڕیان بەوەکردووە کە نزا دەتوانێت قەرەبووکەرەوەی لاوازی ئیرادەی مرۆڤ و قەرەبووکەرەوەی راکردنی مرۆڤ لە بەرپرسیارییەتی بێت و بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی کە دەبێت لەڕێگەی کار، رەنج، سەبر و ئارامگری، ئیمان، بیرکردنەوە و بەرگری و بەرگەگرتن بەدەستبێت، دەبێت پشت بە نزا و نزابکرێت.

من ئەگەر فرسەتی ئەوەمبێت دەمەوێت بڵێم نزا، بەپێچەوانەوە نەك تەنها قەرەبووکەرەوەی لاوازی مرۆیی نییە، بەڵکو بەهێزکەری توانای مرۆیی و درێژەپێدەری کاری ئەرێنی و هەوڵی دروستکردنی تاك لە دروستکردنی ژیانی تاکەکەسی کۆمەڵایەتیەتی. واتە نزا لە کەناری کار و لە کەناری بەرپرسیاریەتیدا نییە، بەڵکو نزای ئیسلامی، پاش بەرپرسیارییەتی و لە درێژەی رەنج و کار و جیهاد و ئارامگریدا بوونی هەیە. ئەوکەسانەی دەقە بنەڕەتییەکانی نزایان لە مێژووی ئیسلامدا بۆداناوین، خۆیان نموونەی سەرمەشقێکی لەجۆرە و نموونەی دیاری بنەڕەتێکی لەجۆرەن. کەسانێك هەن لە جەنگ لەگەڵ دوژمندا و لە هەوڵی بۆ بەختەوەربوون و خۆشبەختبوون، هەوڵی سەربەخۆبوون، ئازادبوون و لە کۆشش بۆ نابودی و لەناوچوونی هەموو هۆکارەکانی مەترسی و لاوازی تاکەکەسی و گشتی و لە هەوڵ و خەباتی جیدی کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕی، هەمیشە بێداربوون، هەمیشە ئامادە و پڕچەك بوون و پەیمانیانداوە و خۆیان بە جەستەی خۆیان چوونەتەناو ترسناکترین مەیدانەکانی خەباتەوە و ئەمانەش نزایانکردووە! ئەو کەسانەی گۆشەنشینی، رەهبانییەت و راکردن بۆ کێو و راکردن لە کۆمەڵگە و بێزاری لە چارەنووسی خەڵکی و راکردن لە بەرپرسیارییەتی کۆمەڵگەیان هەبێت و لەگۆشەیەکدا پەنایان بۆ دەیرێك، پەرستگایەك، کێوێك بردبێت و کاریان هەمووی نزاکردنبێت، بوونیان نەبووە. "عەلی" بووە کە نزای کردووە! چۆن نزای کردووە؟ پێغەمبەر"د.خ" نزایکردووە، چۆن نزایکردووە؟ هەموو پێشەکییەکانی خەباتکردن، بێداری گشتی و سەربازی هەموو هێزەکان و هەروەها رێکخستنی ریزبەندی و گەیشتن بە بچووکترین خاڵە تاکتیکی و ستراتیژییەکانی جەنگی رەچاوکردووە، ریزبەندیکردووە و پشتی بە هێزی لۆژیکی و هێزی مەعنەوی و ماددی جەنگ و خەبات بەستووە و لەبەرامبەر دوژمندا وەستاوە و هەموو بنەما و رێسا بنەڕەتی و لاوەکییەکانی خەباتی رەچاوکردووە و پاش تەواوبوونی هەموو ئەم پێشەکییە لۆژیکی و زانستی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و سیستەمی و ئابووری، نزایکردووە. ئەویش نزاینەکردووە کە ئەگەر خودایا گەر خیانەتمانکرد، ئەگەر چووینە ژێربار، ئەگەر لە ترسی شمشێر رامانکرد، ئەگەر خۆماندا بەدەستی دوژمنەوە و ئەگەر دوژمن ئازایەتییەکی زیاتری لە ئێمە پیشاندا و ئەگەر ئێمە حەق و شایستەیی سەرکەوتنمان بەسەر دوژمندا نەبوو، تۆ بە کەرەمی خۆت سەرمانبخە بەسەریاندا، تۆ بە موعجیزەی خودایی خۆت ئەمانە بە یەکجار لەناوببە، لاوازیانبکە، نابودیانبکە!.

ئەمە "عەلی"یە پاش ئەوەی لەبەرامبەر دژمندا دەوەستێت و بچووکترین خاڵە دەروونی و فیکری و مەعنەوی و سیستەمی خەباتکردن لەگەڵ دوژمندا فێردەبێت پاشان وتاردەدات:

(کێوەکان بجوولێن تۆ مەجولێ، نیگات بەرەو بەرزترینی ریزی دوژمن بنێرە، "سەیری ئەم بەردەمەت مەکە کە یەکێك ببینی دەستی بۆ چەك بردووە، لەوێ لەسەنگەردا وەستاوە، ئێستا لەوێوە تیرێك دێتەدەرەوە، بەرگری و خۆگرتن و زاڵبوونی رۆحی خۆت لەدەستبدەیت، سەیری دوورەدەستی ریزی دوژمن بکە" کێوەکان بجوولێن و تۆ مەجولێ، نیگات بنێرە بۆ دوژمن و ددندانەکانت بەتوڕەییەوە بەسەریەکدابدە و پێیەکانت بەزەوییەوە دابکوتە و کەللەسەرت بە خودا بسپێرە و جەنگ بکە و پاشان بزانە سەرکەوتن بەدەست خودایە!).[1]

پاش ئەم هەموو کارانە، نزایدەکرد، ئەویش نزایەکی لەمجۆرە:

(خودایا ئەگەر ئێمە بەسەر ئەمانەدا سەرکەوتین، لە خۆبەگەورەزانین و خۆویستی و ستەمکاری و ناتەواوی و ستەمی تایبەتی رزگارکەران (کە تالآن و ناموسی خەڵکانیان دەبرد) بپارێزە. ئەگەر شکستیشمان خوارد و تێکشکاین لە زەلیلی و بەندەیی بپارێزە).[٢]

ئەمە زمانی نزا بوو، ئەم زمانانەبوون کە نزایاندەکرد، ئەوکەسانەی کە هەمیشە پەیمان و بەڵێنی کۆمەڵایەتی و رێبەری سیاسی و بەرپرسیارییەتی ژیانی تاکەکەسی و چارەنووسی خەڵکانیتریان راستەوخۆ لە دەستی خۆیاندا بوو ژیانیان هەمیشە بۆ بەرسیارییەتی کۆمەڵایەتی داناوە، لە درێژەی کاری ئەرێنی کۆمەڵایەتییان ئەمجۆرە نزایانەیان کردووە، نەك وەکو دەرمانێکی سڕکەر و نەهێشتنی ئازار و کوژەری دلێری و پیاوەتی و هەستیاری و ئاگایی و بێداری، بەوجۆرەی کە ئێمە خەیاڵدەکەین و بیریلێدەکەینەوە.

کێشەی دووەم ئەوەیە کە من پێش ئەوەی بڕۆمە دەرەوەی وڵات، وا رێککەوت کە لە ئێران بووم، کەم تا زۆر ئاشنای شێوازی بیرکردنەوەی بیرمەند "ئەلیکسس کارل" فەیلەسوف و زانای گەورەی فەرەنسی هەبوو و هەروەها شەوق و تاسەیەکی زۆرم بۆ ناسینی هەبوو. لە ئەوروپاش یەکەمین کتێبك بەدوایدا دەگەڕام کتێبی "نزا" بوو کە یەکێکە لە کارە زانستی و هزرییەکانی "ئەلیکسس کارل"ە. دواجار پەیدامکرد. "ئەلیکسس کارل" کەسێکە دووجار خەلاّتی نوبڵی وەرگرتووە. ئەم دوو خەلاّتە نۆبڵەی لە بابەتی فەلسەفی، یان ئەدەبی و مێژوویی و تەنانەت زانستە مرۆییەکاندا وەرنەگرتووە، بەڵکو لە زانستە ئەزموونییەکاندا بەدەستیهێناون، یەکێك لەم دوو خەلاّتە لەبەرخاتری پەیوەندی رەگەکان و شێوەی کارکردنیان بووە کە بۆ یەکەمینجار ئەوەی داهێنا و خەلاّتەکەیتری لەبەرئەوە بوو کە دڵە جووجکەیەکی زیاتر لە (٣٥) ساڵ لەدەرەوەی جەستەیەوە لەتاقیگەکەیدا بەزیندوویی هێشتییەوە و لەم ماوەیەدا هەرچەند جارێك ئەم دڵە چەندینجار گەروەدەبوو و ناچاردەبوو بچووکبکەنەوە، تاکو وایلێهات پاراستن و مانەوەی بەزیندوویی لەتاقیگەدا بووە کێشە، بەلاّم سەرکەوتنی ئەو لەوەی کە ئەندامێکی زیندوو لەدەرەوەی ئەندامەکان و جەستەدا بۆ ماوەی (٣٥) ساڵ بەزیندوویی بپارێزێت وایکرد ببێـتە شایستەی خەلاّتی نۆبڵ. لەبەرئەوە "ئەلیکسس کارل" کەسێکی فسیۆلۆژییە، پزیشکێکی نەشتەرگەرە، پسپۆرێکی ئەندامەکانی جەستە، کارئەندامزانی "فسیۆلۆژی"یە. نە کەشیشێکە لەڕووی ئایینی و نە فەیلەسوفێکە لەڕووی بیرکردنەوەی کەلامی و فەلسەفی و لۆژیکی و نە تەنانەت دەروونناسێکە لەڕووی دەروونی و سۆزدارییەوە سەرنجی لە بابەتی نزادابێت.

ئەو پزیشکێکە کە بەدرێژایی پەیوەندی لەگەڵ نەخۆشگەلی جیاوازدا و هەروەها جۆرە جیاوازەکان لە کەشیش و نەشتەرگەر و سیاسەتمەدار و مافپەروەر و کرێکار و جوتیار و پیشەوەر، بەرهەمەکانی نزای لەڕووی مرۆیی، رۆحی و لەسەرەتادا تەنها لەڕووی جەستەییەوە، لەسەر ئەمجۆرە جیاوازی نەژادی جیاواز لێکۆڵینەوەی کردووە. ئەنجامی چەندین ساڵ توێژینەوە و خوێندنەوەی - بە ناونیشانی ژینگەناسێك و بە ناونیشانی فسیۆلۆژێك و هەروەها پاشان بە ناونیشانی سەرۆکی دامەزراوەی مرۆڤناسی راکفلەر- بوویە هۆی ئەوەی لێکۆڵینەوەکانی بەشێوەیەکی بەشێکی بچووك بەناوی نزاوە بنووسێت و پاشانیش پەیامێکی بچووکتری بەناوی "تێڕامانەکانم لەڕێگەی سەردانی لورد".

ئەم پیاوە بۆچوونەکانی لەبارەی نزاوە گەلێك جێگەی گرنگی پێدانن. چونکە بەوجۆرەی کە وتمان نووسەران و بیرمەندانی مەزهەبی گەلێك زۆرهەن کە لەبارەی بەهای نزا و کاریگەرییەکانی دوعاوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان ئەنجامداوە، بەلاّم زانایەکی ژینگەناسی و شانەناسی تەنها لەڕێگەی توێژینەوەکانی نەخۆشیناسی و فسیۆلۆژی و ئەوەش لەڕێگەی ئەزموونە کەسییەکانی خۆیەوە – تاقیکردنەوەکانی تاقیگەیی- توێژینەوە لەبارەی نزاوە بکات، ئەمە شتێکی بەهادارە، بەتایبەت لەلایەن کەسێکەوە کە دنیای ئەمڕۆ بە ناونیشانی یەکێك لە جەمسەرە دیار و بەرجەستەکانی بیرکردنەوەی زانستی نوێ بناسێت. ئەو لەم کتێبەدا کە وەرگێڕانی فارسییەکەی چەندین ساڵە بلاّوبووەتەوە، لەڕووی نزاوە هەندێکجار بە روونکردنەوەیەك دەگات و هەندێکجار چەند دەرەنجامێك رادەگەیێنێت کە تەنانەت بۆئێمە کە باوەڕمان بە کاریگەری نزا هەیە، سەرسووڕهێنەرە. یەکێك لەوشتانە کە دەیڵێت: بەرهەمەکانی نزا و دابونەریتی پەرسش و نزاکردن کاتێك لەکۆمەڵگەیەکدا روو بە لاوازی و فەرامۆشبوون دەڕۆن، پێشەکییەکانی داڕووخان و نەمانی بەرگری ئەو نەتەوە و کۆمەڵگەیە فەراهەمدەبێت. لەبەرئەوە کۆمەڵگە بەلەدەستدانی کرداری پەرستش و نزا هاوسەنگی خۆی بۆ گەشەی میکرۆبەکانی داڕووخان، هەوڵدان، بەشبەشبوون و بە زاراوەی تایبەتی خۆی "ئەنسرۆپی"، واتە لاوازی و پیری هێزی هاوسەنگی و لاوازی جەستەیی، کە لێرەدا بەمانای لاوازی هاوسەنگی کۆمەلاّیەتییە، ئامادەدەکات. ئەو دەڵێت: (رۆم، رۆمی بەشکۆ و خاوەنی شارستانییەت و دێرین، دووری خەڵکەکەی و فەرامۆشکردنی سوننەتی دێرینی مرۆیی لە پەرستندا، بەرەو لاوازی و زەلیلی برد).

ئەو هەندێکجار دەستەواژەی زۆر جوانی قووڵی شاعیرانەی هەیە، هەندێجار زۆر ئالۆزی قوڵی فەیلەسوفانە و زانایانە. ئەو دەڵێت: (نزا هەر وەك ئەمانەتێك، هاوڕێی کەسێکە کە هەمیشە و زۆرجار لە خودا دەپارێتەوە و نزادەکات، گورزەی نووری نزا و پەرستنی خودا لە سیما و رووخسار و جووڵە و نیگای کەسی نزاکەردا هەمیشە دەدرەوشێتەوە و بۆ هەر جێگەیەك کە دەڕوات لەگەڵ خۆی دەیبات).

(ئاماری تاوانەکان پیشانیداوە بەشێوەیەکی مام ناوەند ئەوکەسانەی بەناونیشانی تاوانبار و خیانەتکار لەکۆمەڵگەدا ناسراون، ئەوکەسانەن کە یان هیچ یان زۆر بەکەمی و نەزانانە نزادەکەن. بەپێچەوانەوە لەهەمانئاستدا و لەهەمانڕێڕەودا و لەهەمانجۆر و تایپی کۆمەلاّیەتی و توێژی ئابووری، زۆربەی ئەوانەن کە هێشتا سوننەتی نزایان پاراستووە، لەئەنجامدانی تاوان پارێزراون و هەندێجار گەر ئەوەش بکەن و بەشێوەی پیشەیی و سەرگەرمی هەمیشەیی و سیفەتی دیاریکراویان نییە، بەڵکو هەڵخلیسکانێکە یان رووداوێکە لەژیانیاندا).

لەهەمەوو ساڵێدا دامەزراوەی "لۆرد" بە شایەدی خودی "ئەلیکسس کارل" لە کتێبی "نزا"دا ئاماری ئەو کەسانەی شیفایان بۆهاتووە بەهۆی نزاوە کە بەشێوەی موعجیزەئاسا بە ددانپێدانانی پزیشکەکان ئەو شیفایەیان بۆهاتووە، بە فەرمی بلاّودەکاتەوە. هەمیشە ستوونی ئەو کەسانەی موعجیزەئاسا بەهۆی نزاوە شیفایان بۆهاتووە پڕ لە ژمارەی فراوان، بەلاّم "کارل" ئەوە دەسەلمێنێت کە لە (٣٠) ساڵی کۆتاییدا ئەم سەرژمێری و ئامارە رووەو کەمی دەڕوات. پاشان خۆی ئەوە رووندەکاتەوە کە هۆکارەکەی: (سەردانیکەران ئێستا زیاتربوونەتە گەشتیار و رێبوار و موسافیر)و ئەوکەسانەش کە پەرێشان و سەوداسەر و عاشیق و ئارەزومەند دەهاتن تاکو داخوازی خۆیان وەربگرن، کەمبوونەتەوە.ئەم بەدڵخۆشی و بۆ خۆشی و دووڵ و لەهەمانکاتدا بۆ گۆڕینی ئاووهەوا دێن و ناچار

كاریگەری و بەرهەمێك لە نزاوە نابینن. هەر بەوجۆرەی خودی "كارل" لە میكانیزمی كاریگەری نزادا دەڵێت: (نزا بۆ هەبوونی توانا و توندی و هەروەها بەشوێنەوەبوون و بەردەوامی و هەروەها پاكی و دڵسۆزی بێت و لەگەڵ ئەوەشدا حاڵەتی هێرشكردنی دەستبكەوێت).

ئەم (حاڵەتی هێرشكردنەی دەستبكەوێت) زۆر جوانە، لە نزا و دەقە ئیسلامییەكانیشدا فراوانە كە زۆرجار دەڵێن: (بەوجۆرەی منداڵێك بە پێداگرتنێكی زۆرەوە شتێك لە دایكی داوادەكات). "كارل" هەروەك ئەمە دەڵێت. ئەو دەڵێت، دەبێت نزا توندی لەگەڵدابێت، واتە نزا بەشێوەی ویرد و جووڵەی زمان نەبێت، بەجۆرێك زمان و لێو كاری خۆیان بكەن و مێشك و دڵ خەریكی كارەكانیتربن. وەكو ئەو كەسانەی كەوا دەزانن فێڵ لە خودا دەكەن و ئەویش ئەوەیە كە دانیشتنی ئامۆژگاری و كارەسات و بۆنەكاندا بەشداریدەكەن، لێرەدا پاداشتی بەشداریكردن لە دانیشتن و بۆنەكەدا وەردەگرن و لەهەمانكاتدا دەستدەكەن بەوەی لەجیاتی گوێگرتن بە وتەكان و قسەكان، نزاكردن یان قورئانخوێندن و بەم هۆیەوە پاداشتی قورئان خوێندن و نزاكردن دەركدەكەن، واتە دەیانەوێت دووجار و لە دوو شتدا پاداشتوەربگرن و زرنگ و چالاكترینەكان لەم دوو حاڵەتەدا كە گوێیان لە مینبەرە و چاویان لە دەقی قورئان و لێوەكانیشیان خەریكی زیكر و ویرد! واتە سێجار پاداشت كۆدەكەنەوە! لەكاتێكدا نازانن ئەم دوو سێیەیتریش خراپدەكەن.

بەهەموو هێز و هەموو دەرك توانات بخوازە، ئەمە مانای توندی و پێداگرتنە. ئەوەی كە جەخت لەسەر ئەم رستانە دەكەمەوە لەگەڵ ئەوەی داخوازی و داواكاری ئەم رستانە بۆ ئێمە ئاشنایە، لەبەرئەوەیە كە لە زمانی "كار"ەوە بیستنی گەلێك بەبەهایە: (ئەو كەسانەی بامدار نزادەكەن و تاكو ئێوارە وەكو گیانەوەرێك، گیانەوەرێكی درندە ژیاندەكەن، ئەمانە ئەوكەسانەن هیچكات بەرهەمەكانی نزا لەخۆیاندا نابینن).

نزای ئەمانە دوابڕاوە، چونكە بەشێوەی بەردەوامی دڵ و پەیوەستبوونی رۆح و ویژدان، بەرەو رووی كانونی رۆحانی جیهان نزاناكرێت، بەڵكو بەشێوەی ئەنجامدانی وەزیفەیەكی میكانیكی، بەیانیان نزاكردن و هەموو رۆژەكەیتر هەروەك ئاژەڵ خەریكبوون بە كاری ژیان و خوارد و خۆراك و وەرگرتن و:

این مر ان را همی كشد مخلب
و این مر ان را همی زند منقار

ژیانكردن! نزای بەرەبەیان هەیاهو و دەنگەدەنگی پیسی درێژایی ژیانی رۆژ بە فەرامۆشی دەسپێرێت. ئەمەیە كە هەركات نزادەكرێت و هەركاتێك دڵ بە نزاوە بەرەو رووی ئەو كانونە مەزنەی جیهان پەیوەستدەبێت، پاشتر دەبێت كەسی نزاكەر بەرهەم و كاریگەری ئەم پەیوەستبوونە لەهەموو حاڵەت و هەموو پەیوەندییەكانی ژیانی رۆژانەیدا لە كۆمەڵگە و لە خێزان و لەخۆیدا بپارێزێت، تاكو بەرهەمی نزا بەشێوەی گرێك لەدەروونیدا پەرشوبلاوبێتەوە لە سەراپای رۆح و بوونیدا. سەیری قورئان بكەن:

بسم اللة الرحمن الرحيم

( ارايت الذى يكذب بالدين. فذلك الذى يدع اليتيم. ولايحض على طعام المسكين. فويل للمصلين. الذين هم عن صلوتهم ساهون. الذين هم يراون. ويمنعون الماعون. ) (سورەتی الماعون)

(نزا ئەوەی پیشانداوە مرۆڤ هەرچی بخوازێت دەستیدەکەوێت و لەهەر دەرگایەك بدات، بەروویدا دەکرێتەوە. نزا دەبێت بەشێوەی هێرشکردن ئەنجامبدرێت). حەزرەتی "عیسا" لەرێگەیەکەوە دەڕۆیشت، نابینایەك لە کەناری رێگاکەدا دانیشتبوو، بە توندی و توڕەییەوە دامێنی گرت و رایکێشا و بە توڕەیی و جەبر و توندییەوە داوایلێکرد تاکو بینایی بۆ بگەڕێتەوە و ببینێت. ئەو دامێنی "عیسا"ی بەرنەدا، تاکو "عیسا" وتی: ئیمانت شیفایدایت، بەلاّم نزا لەهەمان ئەوکاتەی داواکردنی شتێکە، بەدەستهێانی داخوازییەکیشە، لەلایەنێکیترەوە قوڵترە لەم قسانە. لێرەدایە کە لە نزای ئیسلامی نزیکتردەبینەوە.

**عیشق**

نزا تەنها هۆکارێك نییە بۆ بەدەستهێنانی نیاز و پێداویستییەکانمان، بەڵکو خودی تەجەللابوونی عیشقێکیشە. زۆرجار ئەوەی لەگەڵ لۆژیك و توێژینەوەی شیکاری و زانست و بیرکردنەوە زانستی و فەلسەفی بەدەستەوەنایەت، بە عیشق و بە پەیوەستبوونی رۆح بە مەعشوق و بە دڵسۆزی دەروون و خاڵیبوونەوە لەهەرچی جگەلە ئەو، بەدەستدێت. ئەمەیە کە ((خودا، ئەم هێمای بالاّی بوون و ژیان کە دوو موعجیزەی بوون و ژیان لەوە سەرچاوەیانگرتووە، ئەمە دەستەواژەیەکی زۆر جوانە، ئێمە لەگەڵ ئەم چەمکەدا زۆر ئاشناییمان هەیە، لە دەقەکانی حیکمەت و عیرفانماندا بوونی هەیە، بەلاّم ئەم دەستەواژەیە، دەستەواژەیەکی عاریفانە و زۆر ناسك و قووڵ لە زمانی کەسێکەوە کە تەنها لە تاقیگە و لەگەڵ فسیۆلۆژی و ئەرك و وەزیفەی ئەندامەکانی لەش سەرووکاری هەیە، زۆر جێگەی سەرنجە، هەروەها گەیشتن بەم هەستە قووڵە عیرفانییە لە رێگەی تاقیگەوە ناکۆتا جێگەی سەرنجە). خودا، ئەم هێما بالاّیە کە دوو موعجیزەی ژیان و بوون لەوەوە سەرچاوەیانگرتووە، هەر بەوجۆرەی خۆی لە بەرامبەر چاوەکانی ئەو کەسەی کە جگە تێگەیشتن، شتێکیتر تێناگات، پەنهاندەکات و خۆی دەشارێتەوە، بەهەمان ئەندازە خۆی لەبەرامبەر ئەو کەسەی کە جگەلە خۆشویستن، شتێکیتر تێنگات، ئاشکرادەکات!)).

ئەو کەسانەی تەنها رێگەی ناسین بیرکردنەوەی لۆژیکی و عەقڵی دەزانن، ئەو کەسانەی هێمای ژیان و مانای بوون دەیانەوێت رۆحی بوونەوەر بەهەمانشێوە شیبیکەنەوە و بە بەشبەشکردنی لۆژیکی سنووداریبیکەن وەکو شتە سروشتی و یاساکانی فیزیا و کیمیا، ئەمانە ئەو کەسانەن کە تێگەیشتنی رەمز و هێمای بوونی خودا زۆر دژوارە بۆیان، بەلاّم ئەو کەسانەی لە مانای خۆشویستن، عیشق و لەخۆبوردن و دڵسۆزی تێدەگەن، بە ئاسانی خودا دەناسن چۆن؟ بەو ئاسانییەی بۆنی گوڵێك دەکەین، دەتوانین هەست بە ئامادەگی خودا بکەین و هەست بەوەبکەین کە هەموو شوێنێك لە ئەو پڕە!.

(لە کۆتایی کڵێسایەکدا، هەموو خەڵکی رۆیشتبوون. مەراسیمی پەرستشی دەستەجەمعی تەواوبووبوو.

کورسییەکان هەموویان چوڵبوون. لە کۆتا ریزی کورسییەکانی تەلارەکەدا، هێشتا کەسێك دانیشتبوو. نە فەیلەسوف، نە پزیشك، نە حەکیم، نە فەقیە، مرۆڤێکی زۆر سادەی لادێیی! کەشیشەکە رۆیشت و پێیوت: لێرەدا چی دەکەیت؟ وتی: من ئەو دەبینم و ئەو من دەبینێت!).

هەر بەم سادەییە ئەو خودایەی لەبەرامبەر ئەندێشە فەلسەفییە قوڵەکانەوە خۆی دادەپۆشێت و دیار نییە، لەبەرامبەر هەستی سادە و خۆشویستنی بێڕیا و عیشقێکی پاك و بالآدا خۆی روون و ئاشکرا نومایاندەکات. نزاکردن تەجەللا و دەرکەوتنی عیشق و هەستکردن و خۆشویستنە. لەبەرئەوە رێگەیەکە بۆ ناسین، رێگەیەکە بۆ ئیمانهێنان. لەبەرئەوە ئەوەی کە "کارل" تەرحی نزا دەکات، دەکرێت پێناسەبکرێت بەوەی کە: نزا یان پاڕانەوە تەجەللای عیشق و دەرکەوتنی نیاز و پێویستی رۆحی مرۆڤە. عیشق مانای چییە؟ نیاز یانی چی؟ لەجیاتی ئەو روونکردنەوە دورودرێژەی کە دەبێت ئەنجامیبدەم و کاتم نییە، ئەم رستە رووندەکەمەوە و دەیخەمەڕوو و وابیردەکەمەوە دانیشتنەکە پێویستی بە روونکردنەوە نییە.

مرۆڤ بە پێوەری ئەو بەریەککەوتنانەی کە لەژیانیدا هەیە، مرۆڤ نییە، بەڵکو دروست بە ئەندازەی ئەو نیاز و پێداویستییانەی لەخۆیدا هەستیانپێدەکات، مرۆڤە. ئاستی بالآ و پلەی تەوارکار "کمال"ی هەر مرۆڤێك لەگەڵ پلە بالآ و تەواوی نیاز و پێداویستییەکانی کە هەیەتی و ئەو ناتەواوییانەی لەخۆیدا هەستیانپێدەکات، کتومت دەتوانرێت ئەندازەگیری بکرێن و بپێورێن. واتە هەرکەسێك بەو پێوەرە مرۆڤترە کە نیازی تەواوتر، بالآتر و تەواوکارتری هەیە. مرۆڤە گچکەکان، نیازی بچووکیان هەیە و مرۆڤە گەورەکان، نیازی گەورە. لێرەدا مانای ئەو حەقیقەتە وردەی کە دەڵێت: (ئەوانەی کە دەوڵەمەندترن، پێداویستییان زیاترە).

بەهای "عەلی" لە بێنیازتربوونیدا لەوانیتر نییە، بەڵکو لە هەستکردن بە نیازە بەرز و بالآکانی ئەودایە لەمەڕ ئەوانیتر و هەروەها لە هەستی نیازمەندتربوون و هەستی زیاتر کەمیکردنی ئەو لەبووندایە، کە ئەوانیتر هەستێکی لەمجۆرەیان نییە.

لەزانستیشدا بەمجۆرەیە. هەرکەسێك نەك تەنها بە پێوەری ئەو زانیارییانەی کە هەیەتی زانایە، بەڵکو بە پێوەری ئەو نەزانین و نەزانراوانەی کە لەجیهاندا هەستیانپێدەکات، زانایە. بۆ من کاتێك سەیری ئاسمان و زەوی دەکەم، چەند نەزانراوێك زیاتر بوونیان نییە، بۆچی ئاسمان ئاوییە؟ بۆچی ئەستێرەکان لەوسەرەوە وەستاون؟ بۆچی هەورەکان بەمجۆرەن؟ بەلآم ئەو کەسەی کە ئاسماننناسە هەزاران نەزانراو لەئاسماندا دەدۆزێتەوە.

رۆحێکی گەورە کە رێڕەوی کائینان و هەروەها کاروانی تەواوکاری و ئامادەگی و توانای تەواوکاری و عروجی رۆحی مرۆڤ تاکو سەری مەنزڵە زۆر دوورەکان دەبینێت و لوتکەی رەها لە کێوی سەربەخودا کێشراوی بووندا دەبینێت و هەستیپێدەکات، دووچاری حیرەت دەبێت و هەست سام و هەیبەت "خشیت" دەکات. ئەمە جیایە لە پەرێشانی و جیایە لە ترس و ترسنۆکی. حیرەت و سام لەبەرامبەر مەزنیبوون و شکۆی ئەبەدییەت و جوانی خودایە و دڵێك دەتوانێت ئەم هەستانە بدۆزێتەوە کە ئامادەگی تێگەیشتن و هەستی ئەمانەی هەبێت و دامێنی دەرککردنی تاکو دیوارە کۆتاییەکانی بوون فراوان و والآبێت. لەبەرئەمەشە کە دەبینین پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) ئارەزووی ئەوەدەکات کە: (خودایا حیرەتم زیادبکە). ئەم حیرەتە زادەی ناسینە و پەریشانی زادەی نەزانی.! سام یان

"خەشیەت" هۆکاری ئاشنایی لەگەڵ مەزنی و سەرسوڕهێنەرییە و ترس "جبن" هۆکاری گوناه و گومڕاییی. ئەو رۆحە کورت و چوار پەنجەییانە! کە توانای دڵیان بە ئەندازەی "ئەڵقەیەکی پەنجەیە و بلاوی فیکرییان تاکو نووکی لووتیان، زۆر خۆش و بێخەمن و بە پەنجەیەك و سوڕێك بەرزکردنەوەی مەحاسن و سەردانێکی "شا عبدالعظیم" و نان پێدانێك و چوار دینار خێر و خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەك "مفاتیح"، واهەستدەکەن لە زەریای "علم الیقین"دا و لە باوەشی "حور العین"لو بەجۆرێك خەیاڵ دەکەن وادەزانن لە جیهان و مرۆڤ و دونیا و دوارۆژ و حیساب و کیتابدا کە دەڵێی شوێنکەوتەی پردی "صراط"و فریشتەکانی بەهەشت لەدەوروبەریاندان. بەخوێندنەوەی کتێبی ئاسمان و جیهان "السماء و العالم" هەموو سروشت و جیهانی ماددی لە یەکەمین ساتی دروستبوونەوە تاکو قیامەت وەکو گیرفانی جلوبەرگەکانیان دەناسن. بەخوێندنەوەی "ناسخ التواریخ" کە هەموو مێژووەکانیدیکەی سڕیوەتەوە، مێژووی مرۆڤایەتی لە ئادەمەوە تاکو خاتەم وەکو ئاوخوازدنەوە دەزانن و شتێك نییە نەیزانن. بەخوێندنەوەی "منازل الاخرە"، لە یەکەمین هەنگاوی مەرگەوە تاکو هەستانی قیامەت، هەموو دوارۆژ وردتر لە جوگرافیزانێکی دنیا دەناسن و نەخشەیان لایە و دواجاریش بەهەبوونی کتێبی "مفاتیح الجنان" هەموو کلیلەکانی دەرگای بەهەشت بەدەستدەهێنن و ئیدی مرۆڤێك چی دەوێت؟

دەبینیت هەستی بچووکترین نیاز و پێداویستی، شیمانەی کەمترین نەزانی، وێنای ساتێکی گومان، لە خود و فیکر و کرداری خود و چارەنووسی خۆی نییە، بەلام ئەو مرۆڤە سەرسوڕهێنەرەی کە سنگی ئەنبوە گوشراوە لە ئاگایی و ئەندێشەی بەرێگای ئاسمان (مانای بەرزەکانی ئەودیو دنیا و بالاتر لە هەستپێکراو، هەستە بالاکان و شتگەلی ناسکی قووڵی خودایی) ئاشناترە لەڕێگاکانی زەوی (ژیانی رۆژانە و گەڕان بەدوای بەرژوەندییەکان و رێوڕەسمەکانی سوود و بەرژوەندی تاکەکەسی و دونیایی و ئاسایی)، ئەوە کە لەناکاو لەناو پێخەفی نەرمی ماڵدا، نیوەی شەوەکان هەڵدەستێتەوە و سینگی تەسك و تەنگ دەبێت و پەنا بۆ باخی دارخورماکانی دەوروبەری شار دەبات و لە دڵی شەودا، لە دەردی حیرەت و سام لە بەرامبەر مەلەکوت، مەزنی بوون و جوانی و هێزی راکێشانی خودا و هیچ و کەمی نیاز و پێداویستی خۆی، هاوار و ناڵەدەکات و لە هۆش خۆی دەچێت.

ئەو زیاتر هەست بە دواکەوتوویی دەکاتن چونکە زیاتر و دوورتر و بەرزتر دەبینێت. ئەو لەهەر قۆناغێکی بەرزیدا و لە تەواوکاری "کمال"دا وەستابێت، خۆی دواکەوتووتر و خۆی بە نیازتر و خۆی موشتاقتر و عاشیقتر لەو لوتکە بەرز و بالا و رەهایە دەبینێت، بەلام ئەوکەسەی هەموو جووڵەی ئەندێشە و نیگای تاکو چواردیواری ماڵەکەی و شوێنەکەی زیاتر کۆششناکات، هەرگیز هەست بە دواکەوتوویی، داڕووخان و سامی لە شتانی بێمانا نییە. چ کەسێك ترسی لە شتی پڕوپوچ هەیە و لە کەوتن دەترسێت؟ ئەوکەسەی کە دەتوانێت لوتکەی کێو ببینێت، بەلام ئەو کەسەی کە هەست بە بەرزییەك دەکات کە مەترێك و دوو مەترێك زیاتر نییە، هەست بە خۆبەگەورەزانین، سەرکەوتن، تەژی و پڕبوون دەکات و رۆحی تینوو و دڵی نیازمەند نییە.

ئەو هەموو ترس و ئەو هەموو ترس لە گزیکردنانە و ئەو هەموو بێهۆشکەوتنانە کە رۆحێکی گەورەی ئازاراوی تینوو و پەرێشان و بەئاگای وەکو: "عەلی" کە لە خەڵوەتەکانی نزایدا هەیە، تەنها و تەنها بەم شیکردنەوە مرۆیی و سەرووعەقڵی و زانستی و فەلسەفییەیە کە جێگەی سەرنجە. وەگەرنا بەرامبەر ئەو بابەتانەی لە

"مەدینە"دا تێدەپەڕن هەرگیز ڕۆحێکی مەزن و گەورەی وەکو "عەلی" ئەو نائارامییەی نییە و لەترسدا بێهۆشنابێت. ڕۆحێکی عاشیق و لەهەمانکاتدا ڕۆحێگی مەزن و گەورە کە نەك تەنها "مەدینە"و کۆمەڵگەی عەرەب و سەدەی حەوتەم و هەشتەم و نەك تەنها مرۆڤایەتی، بەڵکو بوون هەست بە هەستی توانای ناکۆتایدەکات و دامێنی "بوون" لەدەرەوەی چوارچێوەی بووندایە. ئەم ڕۆحە – وەکو بڵێسەیەکی بێقەرار و گەردیلەیەکی دوورکەوتوو لە خۆر- دوودڵ، ترساو، خوازرا و پەیوەستبوون بە نزا و زاری و پاڕانەوەوە. ئەمە یانی عیشق. عیشق، حیرەت و هەڵهاتن و بێقەرار و بێئارامی دوورکەوتوویەکە بۆ پەیوەستبوون، بۆ نوێکردنەوەی پەیوەندی، ناڵەی نەی وشك و بڕاوە و غەریب، لە ئارەزووی گەیشتن بە قامیشەلاَن.

•••

**سەرچاوە:**

**کتێبی "نیایش"، د. عەلی شەریعەتی، کۆبەرهەمی ژمارە (٨)، چاپی سیانزەهەم، ١٣٨٤.**

# تایبەتمەندییەکانی ( نزا )

نووسینی: د. عەلی شەریعەتی
وەرگێڕانی: موسعەب ئەدهەم

**ئەم بابەتەی خوارەوە پێشەکی کتێبی "نزا"ی "دکتۆر عەلی شەریعەتی"یە، کە لە سێ بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمی نامیلکەیەکی بچووکی زانا و پزیشکی بەناوبانگی فەرەنسی "ئەلیکسس کارل"ە بەناوی "نزا"ە و لە فەرەنسییەوە وەریگێڕاوە و بەشەکانیتری نووسینی "د. شەریعەتی" خۆیەتی، پیمانباشبوو ئەم پێشەکییەی کە بۆ ئەم کتێبەی نووسیوە، وەربگێڕین.**
**"و. کوردی"**

ئەگەرچی لەئیسلامیشدا نزا خاوەنی فەلسەفەیەکی لەمجۆرە و بەرهەمی لەمجۆرەیە، بەڵام ئەو خاڵەی کە لە دووتوێی خوێندنەوە و بەراوردکردنی دەقەکانی نزاکان و چۆنیەتی بەجێهێنانی هەندێکیان کە لە ئیسلام و مەسیحییەتدا بوونیان هەیە، لەپێشتر بوونێك هەیە کە نزا و دوعای ئیسلام بەسەر مەسیحییەتدا هەیەتی و ئەویش ئەوەیە کە دوعا لەئیسلامدا جگەلە لایەنی عیرفانی، خاوەنی لایەنی کۆمەڵایەتی و تەنانەت سیاسیشە.

بەتایبەت لە دەقەکانی نزاکانی مەزهەبی "شیعە" ئەم حاڵەتە روونتر و تیژتر بەرچاوماندەکەوێت و هەندێجار ئەوەهەیە کە هەندێك لە رستەکانی رەنگی دروشمێکی حیزبی و سیاسی بەخۆوەدەگرن.

دوعای مەسیحییەت لە دەوری ژیان و کێشمەکێشمەکانیدا دەسوورێتەوە و هەر بەوجۆرەی "کارل" دەڵێت: بنەڕەتی هەژاری و عیشقە، بەلاّم لەئیسلامدا توخمێکیتری بۆ زیاددەبێت و ئەویش دەربرینی ئازارەکان و ویست و داخوازییە کۆمەڵایەتی – گروپییە کە کەسی نزاکەر پێیانەوە وابەستەیە.

هاتنە ناوەوەی توخمی سیاسەت لە بابەتی نزا ئیسلامییەکاندا بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی بیرۆکە کۆمەڵایەتییەکان، هەمیشە لە باشترین فرسەتە گونجاوەکاندا بەوکەسەی کە نزادەکات و دەپارێتەوە دەردبڕێت و دەبەخشێت، دەبێتەهۆی ئەوەی ئەم ئایدیا و بیرۆکە پیرۆزانە بەشێوەیەکی جێگیر و هاوبەشی نێوان مرۆڤەکان کە لەم رێگەیەدا هەنگاوهەڵدەگرن، بلاّوببێتەوە.

لەوەی کە رابورد کاتێك ئایدیا کۆمەڵایەتییەکان لە پەنای نزاکاندا دەبن لە گەستنی قەیرانە سیاسییەکان و رۆژگاری تێکچووی کۆمەڵگە دەپارێزرێن و هەمیشە تایبەتمەندی ژیان و جووڵە لەگەڵ خۆیاندا دەپارێزن.

بە خوێندنەوەی دەقە جیاواز و جۆراوجۆرەکانی نزا ئیسلامییەکان، دەتوانرێت ئەمە هەڵبگۆزرێت کە نزای ئیسلامی - هەڵبەتە ئەو دەقانەی لەڕووی سەنەدی مێژووییەوە رەسەنێتییان هەیە- لەم توخمانە پێکهاتووە و دروستبووە:

١. رەوانبێژی.

٢. مۆسیقای کاریگەر و گونجاو لەگەڵ ناوەڕۆکی نزاکەدا (سەجع و هاوسەنگی، ماوە و دووری، نەرمی و درشتی، جناس و.. هتد).

٣. عەقڵ: تەرحکردنی بابەتگەلی فیکری و فەلسەفی بۆ ئاراستەکردنی عەقڵ و جووڵاندنی هێزی بیرکردنەوە بە هەماهەنگی و سازشکردن لەگەڵ حاڵەتی نزا و پاڕانەوە لەڕێگەی روونکردنەوە و دەربڕینی دەرکەوتە و رووخساری دەسەڵات، موعجیزاتی بەدیهێنان، جوانی و هونەرمەندییە بێشومارەکانی بەدیهێنەر.

٤. سیاسەت: لێرەدا بە مانای تەرحکردنی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان و روونکردنەوەی کێشمەکێشمەکانی نێوان حەق و ناحەق، چاکسازی و گەندەڵی، خۆشبەختی و بەدبەختی خەڵك و تەڵقینکردنی شەهامەت و نەفرەت دژی تاك یان کۆمەڵی ستەمکار و خەیانەتکار و راگەیاندنی وەفاداری بەرامبەر ستەملێکراو و بەرامبەر بە هەق و ئازادی و خۆشبەختی خەڵك و لەبەرامبەر خودادا.

٥. خۆبەدەستەوەدان و سەرکەشی: نزا ئیسلامییەکان هەوڵدەدەن تاکو ئەو مرۆڤەی نزادەکات، لەبەرامبەر خودادا تەسیلمبوون و خۆبەدەستەوەدان و خۆبەکەمزانین سەری خۆی دابنەوێنێت، بەڵام ئەم هەوڵدانە بەجۆرێك روودەدات کە لەهەمانکاتدا ئەوە بە مرۆڤ دەڵێت کە هیچ دەسەڵاتێکیتر، حکومەتێکیتر و خاڵی ئومێد و پشتبەستنێکیتر جگەلە ئەو بە فەرمی نەناسێت. بە دەستەواژەیەکیتر ئەم خۆبەدەستەوەدانە لەبەرامبەر خودادا جۆرێك ئەنجامدەدرێت کە ترس و بیمی لە هەر هێزێکیتر لەبیردەباتەوە و ناهێڵێت.

٦. سەرکەوتن: کەسی نزاکەر هەمیشە داوالەخودادەکات مەرجی دەروونی و هۆکار و ئامرازی دەرەکی جۆرێك فەراهەمبن کە ئەو بتوانێت دەستبکات بە کۆشش و هەوڵدان لەڕێگەی تەواوکار "کمال"، چاکە و خێردا و بەوجۆرەی خودا دەیەوێت سوودیانلێوەربگرێت.

بابەتی سەرکەوتن لەهەمانکاتدا بۆ رەسەنێتی توانای ئیرادەی مۆڤ دەگەڕێتەوە دەبێتەهۆی ئەوەی دیاردەی خۆبەشت زایین و خۆبینین کە هۆکاری توندتیژی رۆح و کورتی ئەندێشەیە، مرۆڤ داگیرنەکات.

٧. تەفویز: کاردانەوەی ئەو مرۆڤەیە کە لە دنیای چێژ و ئازار، هەژاری و دەوڵەمەندی و خۆشی و ناخۆشی خۆی زیاتر رۆیشتووە و بەرژەوەندی خۆی لە بەرژەوەندی گشت و سیستەمی گشتی بەدیهێنان تواندووەتەوە، بێجگەلەوەی پەی بە بێتوانایی خۆی بردووە و ئەوەی لە بەرژەوەندی خێر و چاکەی خۆیەتی دیارینیاکات. لێرەدایە کە مرۆڤ تاکو قۆناغی گومان و حیرەتی باڵا و پیرۆز سەرکەوتووە، چارەیەکیدیکەی نییە جگەلەوەی کاری خۆی بداتەپاڵ ئەو لەبەرامبەر ویست و دیاریکردنی ئەو خۆبەدەستەوەبدات و رازیبێت بەوەی کە ئەو بیەوێت.

٨. هەژاری فەلسەفی: یان بەهۆی لاوازی من، یان لاوازی زمان، توانای ئەوەم نەبوو زاراوەیەکی گشتگیرتر و فراوانتر لەمە بدۆزمەوە. لەبەرئەوە ناچارم ئەوە روونبکەمەوە هەر بەوجۆرەی "کارل" دەڵێت: بنەڕەتی نزا لەسەر دوو بنەما وەستاوە، ئەوانیش بریتییەلە هەژاری و عیشق.

یان کەسی نزاکەر ئەو کەسەیە لەداوالەخودا قەرزەکی جێبەجێببێت، نەخۆشییەکەی چاکببێتەوە، موسافیرکەی لە سەفەرەوە بە سەلامەتی بگەڕێتەوە و یان لەکاتی بەرزکردنەوەی پلەکان بە هەڵە دوو پلەی بە جارێك بۆ دەربچن! ئەمجۆرە نزایانە زیاتر لەنێوان مرۆڤە گشتی و خەڵك گشتییەکەدا بوونیان هەیە.
یان کەسی نزاکەی مرۆڤێکی باڵا و کەسێکە خودا عاشیقانە دەپەرستێت، لە گفتوگۆ لەگەڵ ئەودا، لە وەستان لەبەرامبەریدا، چێژوەردەگرێت.

جۆری یەکەم تاڕادەیەك تایبەتە بە خەڵکە گشتییەکەوە و جۆری دووەم رێگەیەکی تایبەتی عیرفانییە، بەڵام هەندێجار نزا بەشێوەیەکیتر دەردەکەوێت، لێرەدا نزا قۆناغەکەی لە هەژاری بەرزتر و لە عیشق جدیتردەبێت.

**لێرەدا ئەو مرۆڤەی نزادەکات بەوپەڕی توندوتۆڵی و تواناوە داوالەخودادەکات.**

لێرەدا مرۆڤێك داوادەکات کە بیر لە هەژار و دەوڵەمەندی، نەخۆشی و تەندروستی ناکاتەوە. ئەو هەست بە نیاز و پێداویستیتر دەکات، هەستبەوەدەکات مومکینە لە زنجیرەی تەواوکار"تکامل" دوابکەوێت، شایستەبوونی مانەوە و نەمری لەدەستبدات، رۆحی تاکو بەرزترین لوتکە کە چارەنووس بۆ بوونەوەری مرۆیی داناوە بەرزنەبێتەوە و نەڕوات. پێی لەم رێگوزەرەدا کە بە سەری مەنزڵی مەبەست دەگاتە سستی و بکات و لە نیوەی رێگەدا لەسەر لێوی بەحری فەنا گیان بە حەسرەت بسپێرێت.

لەم حاڵەتەدایە کە مرۆڤ لەبەرامبەر خودای ئیسلام نزادەکات و دەپاڕێتەوە، هەستکردن بە نیاز، عیشق و ترس بە توندی دایدەگرێت.

خودای ئیسلام تەنها باوکی میهرەبان و مەعشوقی نەرم و دەستەمۆی مرۆڤ نییە، ئەو لەهەمانکاتدا خاوەنی جەبەروت، قەهر و توڕەبوونە.

**ئەندێشە گەورەکان، نیازی گەورەتر و ئازاراویتریان هەیە.**

هەستی دواکەوتن لە تەواوکاری "کمال"، دوورکەوتنەوە لە دراوسێیەتی دۆست، لە مانەوەی ئەبەدی، لە ژیانی نەمری و مەحرومبوون لە چاکسازی و جوانی و خێر رەها و دواکەوتن لەوگروپەی توانیویانە تاکو ئەو جێگەیەی بەخوداوە پەیوەستبن درێژە بە رێگە بدەن و لە ونبوون و لەناوچوون لە گەرد و غوباری ئەو کاروانەی بەخێرایی تێدەپەڕێت تاکو خۆی بەوجێگەیە بگەیێنێت، ترسێکی لەمجۆرە لە دڵی ئەو مرۆڤەی سەرووتر لەوانیتر بیردەکاتەوە، بەرپادەکات کە بۆ ئەوانیتر جێگەی دەرککردن نییە.

بالاَترین نموونەی ئەم جۆرە نزایە لە قسەکانی "عەلی" خودای لێرازیبێت، لەگەڵ خودای ئیسلام دەتوانرێت بدۆزرێنەوە و بەم پێوەرەشە دەتوانرێت باشتر لە ترسەکان و لە هۆشخۆچوونەکانی تێبگەین.

توێژینەوەی ئەمجۆرە بابەتانە لە حەوزە زانستییە ئیسلامییەکاندا دەبێت بە رێگەی زانستی و لۆژیکی دەستپێبکەین.

لەئێراندا من ماوەیەك لەم زەمینەیەدا کارمکرد و بەرهەمی ئەو کارەی کە بڕیاربوو لەگەڵ پاشکۆی ئەم کتێبەدا بلاَوبکرێتەوە، بەداخەوە لەدەستچوو و هەموو ئەو یاداشت و خوێندنەوە لێکۆڵینەوانەی کۆمکردبوونەوە لەگەڵ وەرگێڕانی کتێبەکەدا لەگرفتارییەکدا کە بۆم دروستبوو لەدەستمدان. ئێستا کە لێرەدا دەقی ئەم کتێبەم دەستکەوتووە، لەبەرئەوە نە بوار و نە سەرچاوەی پێویستم هەیە بۆ وردبینی لەم بابەتەدا، وەرگێڕانی سادەی کتێبەکە پێشکەشی یاران و هاوبیرانی خۆم دەکەم و لێکۆڵینەوەی لۆژیکی فراوان لەبارەی بابەتی نزا و بەتایبەت نزای ئیسلامی بۆ کەسانێك جێدەهێڵم کە هەم بوار و سەرچاوەی زیاتریان هەیە و هەم شایستەیی زیاتر.

•••

**هاوینی ١٣٣٨- پاریس**

**عەلی شەریعەتی**

**سەرچاوە:**

**کتێبی "نیایش"، د. عەلی شەریعەتی، کۆبەرهەمی ژمارە(٨)، چاپی سیانزەهەم، ١٣٨٤.**

# رۆڵی ( شەریعەتی )

# لە خەباتی ئیسلامی پێشەوتووخوازی لە ئێران ١٩٦٥ - ١٩٧٧

نووسینی: وەلید محمود عەبدونناسر

وەرگێڕانی: بـــەرزانی مەلا تـەها

دکتۆر عەلی شەریعەتیی (لە ١٩ی یۆنیۆی ١٩٧٧دا تیرۆکراوە):

**یەکەم: خەبات لەپێناو دامەزراندنی کۆمەڵگەی یەکتاپەرستیی**

دکتۆر عەلی شەریعەتیی چوستو چالاکانە بەشداربیکرد لە پرۆسەیەکی نیشتیمانیی لەئێراندا و داوای گەڕانەوەی کرد بۆ خۆماڵیکردنی پیشەسازیی و نەوتی ئێران وەك هەمان کاری دکتۆر موسەدیق لەسەرەتای پەنجاکاندا.

لەسەر ئاستی سیاسیش شەریعەتیی داوای لەوکەسانە کرد کە رەخنە لە بیروبۆچوونەکانی دەگرن بەردەوام بن و گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن بۆ سەر رێگەی راست[1]. ئەمەش لەواقیعی پراکتیکیدا ئەو بڕوایەی شەریعەتیی رەنگیدایەوە کە کۆمەڵگەی یەکتاپەرستیی دەبێت وەسفداربێت بەئازادیی فیکریی و سیاسیی و ئاڵوگۆڕی بیروڕا و ئازادیی گوتن.

لەسەر ئاستی رۆڵی سەرخان/البنیه الفوقیه لە دامەزراندنی کۆمەڵگەی یەکتاپەرستیدا. شەریعەتیی گرنگیی داوە بەوەی بیروڕاکانی بگات بە زۆرترین گوێگر جا راستەوخۆ لەرێگەی سیمینار یاخود لەرێگەی کاسێتو نامیلکەکانەوە کە پەیامەکانی لەخۆ گرتبوو بۆ سەراسەری ئێرانو قوتابیانی ئێران لەدەرێ. شەریعەتیی رۆڵی خۆی دیاریکرد کە گرنگیی دەدات بە "بێدارکردنەوەی خەوتووان"[2]. ئەم رۆڵەی گۆڕانی بەسەردانەهات لە کاتێکدا شەریعەتیی لە قوتابخانەی مەشهەدی نێوەندیی بوو یاخود لەزانکۆی مەشهەد یاخود لەهۆڵی حوسەینییەی ئیرشاد کە لەساڵی ١٩٦٩دا دامەزرێنرا وەك هۆڵێك بۆ سیمیناریستە ئیسلامییە پێشکەوتووخوازەکان. ژمارەی ئامادەبووانی سیمینارەکانی شەریعەتیی لەساڵی خوێندنی ١٩٧٠/١٩٧١دا لە حوسەینییەی ئیرشاد گەیشتە شەش هەزارو لە هەر سیمینارێکیشدا زۆرینەی ئامادەبووان بریتیی بوون لە گەنجە رۆشنبیرەکان ئەوانەی کە قوتابی بوون یاخود دەرچووی قوتابخانە باڵاکانو پەیمانگەی مامۆستایانو هێندێك قوتابی خوێندنگە دینییەکان. زۆرینەی ئەو ئامادەبووانە شارەزای زانستە رۆژئاواییەکان بوون - هێندێکیان ئەو زانستانە هۆشی بردبوون و رێزیان لێدەنان. بەڵام سەرجەمیان

هەستیان بەوەدەکرد کە رۆژئاوا خیانەتیان لێدەکات: ئەوان بڕوایان بەوە هێنابوو کە رۆژئاوا دیموکراتخوازو ئازادیخوازە، پاشتر کتوپڕ بینییان پشتگیریی دەسەلاتی شا دەکاتو سەروەتو سامانی ولاتەکەیان بەکاردەهێنێت. ئەو گەنجانە دوژمنایەتیکردنی دەسەلات پێکڕا کۆی کردبوونەوە کە بە تێڕوانینی ئەوان ئامانج لێی دابڕینی کۆمەڵگەی ئێرانیی بوو لە ریشە فەرهەنگییەکەی لە رێگەی پرۆسەی بە رۆژئاوایی کردنەوە. هەمدیسان لەپێناو سەلماندنی ئەو راستییە کە خودی دەسەلات بێبەشیکردوون لەبەشداریی سیاسیی لەهەموو ئاستەکانداو بەرزکردنەوەی چینە بالاکان لەسەر حسێبی ئەو چینانەی کە گەنجان ئینتیمایان بۆی هەبوو: چینەکانی نێوەندو دنیا[٣]. لەبەر هەموو ئەمانە سروشتییە گوێبیستی عەلی شەریعەتیی بىو دوای بکەون کە فیکرێکی رەخنەگرانەی پێشکەش دەکردن - بەلام سوودی لەفەرهەنگیی رۆژئاوایی دەبینیو تەیاری دەکردن بەشێوەیەك لەگەڵ شوناسی نەتەوەیی ئەواندا بگونجێت. ئامانجی شەریعەتیی بریتی بوو لە گواستنەوەی ئیسلام بەشێوەیەکی جۆریی لە رێگەی راڤەی پێشکەوتووخوازییەوە بۆ واقیعی سیاسیی/کۆمەلایەتییو پاشتر دۆزینەوەی دۆخێك لە هۆشیاریی دەستەجەمعیی راستەقینە.

لێرەدا دەمەوێت ئاماژە بدەم بە بنکەی جەماوەریی شەریعەتییو گوێگرانی کە زۆرترو زیاتر هاریکار بوون لە بەهێزکردنی رۆڵی رێبەرایەتیی رۆشنبیران بەبێ پیاوانی دینیی وەك شادەماری پێشەنگی گۆڕانی شۆڕشگێڕیی.

هەرچی پەیوەندی هەیە بە پێکڕا ئاوێتەبوونی نێوان فیکرو جوولانەوە لە پراکتیکەکانی دکتۆر شەریعەتیدا، شەریعەتیی جموجۆڵەکانی بەتەنها لەسەر ئاستی فیکریی کورت نەبۆوە، بەڵکو دووچاری گرتن بۆوە لە هەردوو ساڵی ١٩٦٤-١٩٦٥داو دووەم لەماوەی سالانی ١٩٧٣-١٩٧٧دا[٤]. عەلی شەریعەتیی پەیوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ موجاهیدینی خەلقدا پەرەپێدا. بگرە دکتۆر موحەمەد ئەلسەعید عەبدولمۆئمین- یەکێك لەپسپۆڕانی کاروباری ئێرانیی رایوایە شەریعەتیی بەخۆی دامەزرێنەری راستەقینەی موجاهیدینی خەلقە[٥]. هەرچی بیریاری ئیسلامیی کۆچکردوو فازڵ رەسوڵە ئەم رایەی رەتکردۆتەوە گوتوویە شەریعەتیی تەنها پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ موجاهیدیندا هەبووە[٦]. بەلام ئەوەی کە سەرجەم کۆڵەران هاوڕان لەسەری ئەوەیە کە وەختێك شەریعەتیی لە پاریس بووە بەمەبەستی خوێندن چۆتە پاڵ جوولانەوەی رزگاریخوازیی ئێران کە ئەندازیار مەهدی بازرگان لەسەرەتای شەستەکاندا دایمەزراند، بگرە شەریعەتیی بەخۆی سەرپەرشتی نووسینی بلاوکراوەی ئێرانی ئازاد (نهچه ازادی) دەکرد کە جوولانەوەکە لە پاریس دەریدەکرد[٧].

رێبەرو کادێرانی موجاهیدینی خەلق پێشەنگی ئامادەبووانی سیمینارەکانی شەریعەتیی بوون، بگرە هەرئەوانە لەنێو ئامادەبووانی سیمینارو گوتارەکانی شەریعەتیدا ئەندامانیان بۆ رێکخراوەکە خڕدەکردەوە. شەریعەتیی بەئاشکرا لە دوو بۆنەدا پشتگیریی لە موجاهیدینی خەلق کردووە: یەکەم وەختێك دەڵێت بژاردەی فەرمانڕەوا لە ئێراندا کە هەرگیز قلێ نابێتەوە مەگەر لە رێگەی رێکخستنێکی شۆڕشگێڕیی کۆدەتاچییەوە. دووەم وەختێك بابەتێکی نووسیوە بەبۆنەی جوولانەوە شۆڕشگێڕییەکەی کە ئیمام عەلی رەزا پێی هەستا، شەریعەتیی پێیوایە ئەو جوولانەوەیە بناغەی مێژوویی جوولانەوەی جەنگی پارتیزانییە لە ئێراندا[٨].

**دووەم: تێڕوانینی فەلسەفیی بۆ مێژوو**

بەدەگمەن شەریعەتیی ئاماژەی بە ئێران داوە لە سیمینار یاخود کتێبەکانیدا جگە لەئاماژەکانی سەبارەت بە قۆناغی سەفەویی لە مێژووی ئێراندا (١٥٠١ - ١٧٢٢)، هەروەها شەریعەتیی بەئاشکرا گرنگیداوە بە قۆناغی سەرەتای مێژووی ئیسلامیی کە پێیوایە قۆناغێکی نمونەییەو بەهیچ کلۆجێك مێژووی هاوچەرخی ئێران ڕووداوی گەورەی وەك شۆڕشی دەستووریی (١٩٠٥ - ١٩٠٦) یاخود شۆڕشی دارستان/الغابە (١٩٢٠ - ١٩٢٢) بەخۆوە نەدیوە. هێندێك ئەوە دەخەنەپاڵ شەریعەتیی کە خۆی لەقەرەی ڕووداوە هاوچەرخەکانی ئێران نەداوە بەهۆی دزەکردنی پاتەخۆرانی ساواکەوە (دەزگای ئاسایشی سیاسیی ئێرانیی لەسەردەمی شادا) بۆ نێو ئامادەبووانی سیمینارەکانی شەریعەتیی‌و خواستی ئەو لەگەیاندنی پەیامەکەی بەزۆرترین ژمارەی خەڵکیی‌و -بەتایبەت گەنجان- لەدرێژترین ماوەی گونجاودا. سەرباری بڕوای دکتۆر شەریعەتیی بە بەردەوامیی ململانێ بەدرێژایی کاتەکان لەنێوان قابیل‌و هابیلدا پاڵی پێوەنا نمونەی مێژوویی‌و نمونەی خوازراوی ڕووداوو و پاڵەوانێتییە شیعەگەراییەکانی سەرەتا بەکاربهێنێت تاکو کاریکات لە گەیاندنی پەیامە هاوچەرخەکەی بە گوێگرانی بەبێ هێرشکردنە سەر ڕژێمی شاهەنشاهیی دەسەڵاتدار. بەڵام ئەم شێوازەی شەریعەتیی بوو بە هۆی قۆڵبەستکردن‌و جەزرەبەدانی بۆ دووجاران لەسەر دەستی ساواکدا.

**سێیەم: ئازادیی فیکرو لێکۆڵینەوە**

دکتۆر عەلی شەریعەتیی پێنج لیژنەی لە حوسەینییەی ئیرشاد دامەزراند بەئامانجی پەرەپێدانی جموجۆڵە ئیسلامییەکان، لیژنەی یەکەم گرنگی دەدا بەسەرلەنوێ ڕاڤەکردنەوەی قورئان، لیژنەی دووەم گرنگی دەدا بەسەرلەنوێ ڕاڤەکردنەوەی مێژووی ئیسلامیی. لیژنەی سێیەم تایبەتکرابوو بە هونەرو لیژنەی چوارەم کۆڵینەوە بوو لەزمان‌و ئەدەبی عەرەبیی‌و لیژنەی پێنجەمیش گرنگی دەدا بە زمانە بیانییەکان.

لێرەدا دەمەوێت باس لەوە بکەم کە لە ساڵی ١٩٧٧دا ئایەتوڵڵا خومەینیی ستایشی ڕۆڵی عەلی شەریعەتیی کردووە بەوەی کە چەندین بابەتی نوێی پێشنیارکردووەو بابەتە کۆنەکانی سەرلەنوێ خستۆتەوە بەرباس، هەروەها لەهەریەك لەو بابەتانەدا دواگوتەی خۆی پێشکەشکردووەو دەرگاشی کردۆتەوە بۆ ئیجتیهادو گفتوگۆکانی پاشتر کە دادی[٩].

**چوارەم: هەڵوێست بەرامبەر بەعەقیدەو بیروبۆچوونە نا ئیسلامییەکان.**

لەسەرەتای ژیانیدا، دکتۆر شەریعەتیی زمانی فەرەنسیی فێربووەو بڕێکی زۆری لە ئەدەبیاتی فەرەنسیی خوێندۆتەوە، هەر لەو قۆناغەی ژیانیدا چۆتە پاڵ جووڵانەوەی خواپەرستانی سۆشیالیست "نهزت خودا پارستانی سوسیالیست"، ئەمانە گروپێك بوون چەمکە سۆشیالیستییەکانیان پێڕەودەکرد[١٠].

وەختێکیش شەریعەتیی لە پاریس بۆ بەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا دەیخوێند، کتێبەکانی گارودیی‌و رادیکالیستە نائیسلامییە هاوچەرخەکانی خوێندۆتەوە وەك جان پۆڵ سارتەرو چێ گیڤاراو جەنەراڵ جیاب‌و فرانز

فانۆن. هەر لە پاریس شەریعەتیی ئامادەی سیمیناری رۆژهەلاتناسانو مامۆستا سۆسیۆلۆگە مارکسیستەکان بووە، لەقۆناغێکی پاشتردا دانی بەوە دانا کە کەوتۆتە ژێر کاریگەریی مارکسیزمو بوونگەرایی/الوجودیە. هەمدیسان چەندین کتێبی وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی فارسیی لەوانە کتێبەکەی گیڤارا دەربارەی جەنگی پارتیزانیو کتێبەکەی سارتەر (شیعر چیە؟/ماهو الشعر)و هەردوو کتێبەکەی فرانز فانۆن (لانەوازانی زەمین، سالّی پێنجەمی جەنگی جەزایریی). بەلاّم گرنگی پێدانەکانی شەریعەتیی بە فیکری رۆژئاوایی خالّی نەبووە لە رەخنە. ئەو دوو گوتاری ئاراستەی فانۆن کردووەو تەحەدای تێگەیشتنە نەرێنییەکەی دەکات سەبارەت بە دین لەچوارچێوەی خەباتدا لەپێناو رزگاربوون لە ئیمپریالیزم، شەریعەتیی لەو دوو گوتارەدا بەبڕواوە گوزارشتیکردووە لەو زەرورەتەی کە دین فاکتەرێکی سەرەکیبە لە بوژاندنەوەی شوناسی فەرهەنگیی گەلان لە جیهانی سێیەمداو دینیش چەکی ئەو گەلانەیە لەخەباتیاندا دژ بە ئیمپریالیزم. بەلاّم لەلایەکی ترەوە ئەو چەمکانەی لە فانونەوە وەرگرتووە سەبارەت بە رۆژئاوایکردنی فەرهەنگییو ئەو زیانە دەروونییەی کە دیاردەی ئیمپریالیزم لە جیهانی سێیەمدا دروستیکردووە.[١١]

بەپێچەوانەی برێکی زۆر لە بیریارانی هاوچەرخی ئیسلامیی، شەریعەتیی زۆرجاران لە سیمینارەکانیدا لە حوسەینیەی ئیرشاد نمونەگەلێکی لە ئەزموونە بیانییەکانەوە هێناوەتەوە. بۆ نمونە ئاماژەیداوە بە شکستی ئەزموونی لیبرالیزمی دیموکراسیی لە مەدغەشقەر، دیسانەوە نمونەکانی لیۆبۆلد سنجورو ئێمیە سیزێری بەکارهێناوە وەك حالّەتەکانی هاتنەپێشەوەی سەرکردەکان لە غەیری چینە ئەریستۆکراتییەکان یاخود دامەزراوە دینییەکان. لە حوسەینیەی ئیرشاد شەریعەتیی داوای لە ئێرانییەکانو زاناکانیان کردووە لەئیمام عەلی بکۆلّنەوە وەك لە کتێبەکانی کۆلّەری کریستیانیی جۆرج جەرداقدا هاتووە، هەروەها کۆلّینەوە لە ئەبو زەڕی غەففاریی لەو دیدگاوە کە نووسەری سوننی میسریی عەبدولحەمید جۆدە ئەلحەسار ئاماژەی پێداوەو داوای لێکردوون لە کەسە نزیکەکانی پێغەمبەر (د.خ)و شوێنکەوتووانی بکۆلّنەوە لە دیدگای رۆژهەلاّتناس لویس ماسینیۆنو کۆلّینەوە لە باسو خواسی ژیانی پێغەمبەر(د.خ) لە دیدگای مەکسیم رۆدنسۆنەوە[١٢].

هەریەك لە شیریل بناردو زەلّمای خەلیلزاد کە لەکتێبەکەیاندا "حکومەتی ئیسلامیی/الحکومە الاسلامیە" باس لەوەدەکەن کە شەریعەتیی لە شێوازی نووسیندا هاوشێوەی فرانز فانۆن نووسیویەتی، هەمدیسان لە کتێبەکەیدا (فەلسەفەی مێژوو: قابیلو هابیل) کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بونیادگەرا فەرەنسییەکان/البنیویون الفرنسیون[١٣].

ئێمە لێرەدا باس لەو رەخنانە دەکەین لە شێوازی پێشکەشکردنی بیروبۆچوونو ئەزموونە نائیسلامییەکانی عەلی شەریعەتیی گیراوە لە سیمینارەکانیدا بەشێوەیەکی کەموکورت پاشتر رەخنە لەو بیروبۆچونانە گیراوە لەبریی پێشکەشکردنی ئەو بیروبۆچوونو ئەزموونانە بەشێوەیەکی تەواو لە بنەڕەتدا. ئەمەش بەلّگەیە لەسەر ئەوەی کە شەریعەتیی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی هەریەك لە ئەلبێر کامۆو بودا[١٤]. بەلاّم ئێمە دەتوانین ئەو گلەییەی لەسەر لابدەین ئەگەر ئامانجی سیاسیی سیمینارەکانی شەریعەتیی بەهەند وەربگرین ئەویش بریتییە لە بەدەستهێنانی متمانەی گەنجی ئێرانیی بەدوور لە فەرهەنگیی رۆژئاواییو گێڕانەوەی بەرەو شوناسە ئیسلامییەکەی- با بە راڤە پێشکەوتووخوازیەکەشی بێت.

تێڕوانینە ئەرێنییەکەی شەریعەتیی دەربارەی گەشەسەندنە زانستییە رۆژئاواییەکان وایکرد راڤەگەلێکی مێژوویی عەقلانیی شانبەشانی راڤەگەلی ئەخلاقیی سوننەتیی دەربارەی چیرۆکە قورئانییەکان پێشکەش بکات. هەمیشە لە حوسەینیەی ئیرشاد ئەوەی دەدا بەگوێی شوێنکەوتووەکانیدا کە هیواخوازە بناغەکانی کۆمەڵناسیی ئیسلامیی‌و زانستی ئیسلامیی سەبارەت بە بنەڕەتی مرۆڤ دابنێت.[١٥]

### پێنجەم: هەڵوێست بەرامبەر بە تیۆکراسیی/الثیوقراطیة

راڤەی دکتۆر شەریعەتیی سەبارەت بە برێك لە چەمکە دینییەکان بەشێوەیەك کەوتەوە کە دژیەك بوو لەگەڵ راڤەکانی دامەزراوەی دینیی شیعەگەرایی فەرمیی لە ئێراندا، هەمدیسان پرسیارەکانی ئەو دەربارەی شەرعییەتی بوونی ئەو دامەزراوەیە وەك دەسەڵاتێکی فەرمیی کە بڕیار لە پرەنسیپەکان بدات ئەمەش دوژمنایەتیی برێك لە مەراجیعەکانی تەقلیدی شیعەی بەدووی خۆیدا هێنا (کە باڵاترین پلەکانە لە زنجیرەی هەرەمیی دامەزراوەی دینیی شیعەدا)، هەرچی رێبەرە دینییەکانی ترە لە بەرامبەر شەریعەتیدا قڕوقەپیان کرد.[١٦] شەریعەتیی لە هێرشەکەیدا بۆسەر دامەزراوەی دینیی فەرمیی گەیشت بەسنووری هێرشکردنە سەر لەقەبەکانی وەك ئایەتوڵڵاو حوجەتولئیسلام‌و پێیوابوو ئەم لەقەبانە پاشماوەی قۆناغی سەفەوییەکانە کە بەخشیویەتی بە پیاوانی دینیی لە بەرامبەر پشتگیریی‌و پاساوهێنانەوە بۆ بارودۆخەکانی ئەوکات. شەریعەتیی مەلا موحەمەد باقر ئەلمەجلیسیی[*] بە نوێنەری ئیسلامیی سەفەویی نێوزەدکردووە، کتێبەکەشی (بحار الانوار) وەك سیمبولی کتێبە دینییەکان نێوزەدکردووە کە لێوانڕێژە لە خورافیات، ئەم رەخنانە ئایەتوڵڵاکانی شیعەی لە ئێراندا قوشقی کرد کە مەجلیسییان بەچوارچێوەی مەرجعیی خۆیان لەقەڵەمدەدا لەسەر ئاستی فیقهیی. ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەت بەسەر ئایەتوڵڵا موتەهەریدا دەچەسپا، ئەو لەو سەروبەندەدا دیارترین پیاوی دینیی بوو لە تاران کە شەریعەتیی تۆمەتبارکرد بە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئیسلام بەبێ زانایان. موتەهەریی هەوڵیدا لە تۆمەتبارکردنەکەدا پشتگیریی ئایەتوڵڵا خومەینیی بەدەست بهێنێت. بەڵام خومەینیی ئەوکات لە نەجەفی ئەشرەف بوو لایەنگریی هیچ کامیانی نەکرد. سەرباری ئەوە پێشتر باسمانکرد دەکرێت ئەوە بەگریمانە بگرین کە بەکارهێنانی نێوی مارکس‌و فانۆن لە سیمینارەکانی شەریعەتیدا پیاوانی دینیی سوننەتیی خۆشیان لێ نەدەهات[١٧].

وێڕای ئەوەی عەلی شەریعەتیی زانستەکانی فیقهو شەریعەتی بە قووڵیی نەخوێندبوو، پیاوانی دینیی ئێرانیی تۆمەتبارکرد بە شێواندنی مانای دەقە ئیسلامیەکان بەتایبەت شیعییەکان‌و دوورکەوتنەوە لە رۆحی لێبوردەیی ئیسلامیی‌و بەهاکانی گفتوگۆو ئیجتیهاد کە لە رۆژگاری ئیسلامیی یەکەمدا پایەدار بووە، هەمدیسان شەریعەتیی تۆمەتباری کردن بەوەی کە دەستیان بە فیقهێکەوە گرتووە کە ناتوانێت گرفتەکانی کۆمەڵگەی هاوچەرخی ئێرانیی چارەسەر بکات، هەروەها تۆمەتباری کردن بە گردکردنەوەی ماڵودارایی بەنێوی دینەوە کە لە غەیری پێویستییە دینییەکاندا دەیبەخشن. دیسانەوە بێزاریی خۆی دەربڕیوە لە پیاوانی دینیی کە نادیندارەکانیان تۆمەتبار دەکرد بە بێباوەڕیی لە وەختێکدا لە بیروڕا گۆڕینەوەدا جیاوازیی دەکەوتە نێوانیانەوە. لەسەر ئاستی سیاسیش شەریعەتیی پیاوانی دینیی تۆمەتباردەکرد بە هاوکاریکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتێکی زۆردار یاخود

لەبەرامبەریدا قرِوقـەپ دەکـەن یـاخود لـەپێناو خاوەندارێتیـدا دەجـەنگن بەتـەنها بـەئامانجی بـەرگریکردن لـە جیاوگەکانیانو بەرژەوەندییە دامەزراوەییەکانیان.(١٨)

دەکرێت بە ئەندازەیەك لە متمانەوە بڵێین تۆمەتبارکردنی زانایان لەلایـەن شـەریعەتییەوە وەك هـەوڵێك بـۆ دۆزینەوەی ئیسلام بەبێ زانایان جۆرێك لە راستو دروستیی تێدابوو، هەمدیسان گێڕانـەوەی گـەنجانی ئێرانـیی بـۆ ئیسلام لەلایەن شەریعەتییەوە ئیسلامێك بوو جیاواز لە ئیسلامی زانایان. کۆڵـەری ئێرانـیی ئەرفانـد ئـەبراهامیان دەڵێت ئامانجی شەریعەتیی لە حوسەینیەی ئیرشاد بانگەوازبوو بۆ ئەڵتەرناتیڤی ئیسلامێکی سەربەخۆ لە تەعالیمـی سوننەتیی زاناکان. شەریعەتیی هەرگیز دەستبەرداری رەخنەگرتن نەبووە لە رەتکردنەوەی چەمکە رۆژئاواییەکان لـە لایەن پیاوانی دینییەوە، ئەو چەمکانە بەبڕوای ئەو خاوەن بەهاو نـرخ بـوون، هـەروەها بـەبڕوای شـەریعەتیی ئـەو رەتکردنەوەیەی چەمکە رۆژئاواییەکان لە لایەن پیاوانی دینییەوە هۆکارێك بوو بـۆ وەرچـەرخانی گـەنجی ئێرانـییو دوورکەوتنەوە لە ئیسلامو بەرەو فەرهەنگیی رۆژئاوایی(١٩). شـەریعەتییو بیروبۆچـوونەکانی گەنگەشـەیەکی/الجـدل زۆری هوروژاند چونکە لەوەختێکدا قسەو کتێبانی دەنووسیی کە پیاوانی دینیی رووبەڕووی هەر رۆڵێکی رۆشـنبیران دەبوونەوە بەدەر لە بازنەی دامەزراوە دینییەکان لە باسکردنی پرەنسیپە دینییەکاندا.

مەزنە پیاوانی دینیی لە قوم تەنها بەرەتکردنەوەی خوێندنەوەی کتێبەکانی شەریعەتیی لە قوتابخانە دینـییو حەوزە زانستیەکاندا نەوەستانەوە چونکە پێیانوابوو بەشێوەیەکی تەواوو قووڵ گرنگـییو بایـەخ نـادات بـە بابەتـە دینییەکان، هێندێکی تریان تۆمەتباری دەکەن بـە خیانـەتکردن لـە ئیـسلامیی شـیعەگەراو پێکـڕا کۆکردنـەوەی چەمکەکانی وەهابیەتو بەهائییو سوننەگەراییو کۆمۆنیزم. بەڵام بوو بەمایەی بڵاوبوونەوەی بنکـەی جەماوەریـی شەریعەتیی لەنێو قوتابیانی قوتابخانە دینییەکانو هێندێك لە گـچکە پیـاوانی دینیـدا ئەمـەش لەوەختێکـدا کـە بیروبۆچوونو پەیامەکانی عەلی شەریعەتیی لە گوتاری بڕێك لەزانایان لە ژمارەیەك مزگەوتدا رەنگیدایەوە.(٢٠)

### شەشەم: پشتبەستن بەسەرچاوە ئیسلامییەکان

شەریعەتیی هەمیشە جەختیکردۆتەوە لە ئینتیمای بۆ جووڵانەوەی ئیسلامیی، لێرەدا باس لە رۆڵی نێوەندیی ئەوە دەکەین لە دامەزراندنی رێکخـراوی ئیـسلامیی قوتابیـانی ئێـران لـە دەرێ لەسـەروبەندی گیرسـانەوەی لـە فەرەنسادا.(٢١) زۆر جاران پەنای دەبردەبەر نمونەگەلێك لە مێژووی ئیسلامییو گوتەی کەسایەتییە ئیسلامییەکان لە سەرەتای مێژووی ئیسلامدا تا شرۆڤەی تێزە فیکرییەکانی فانۆنو سارتەر بکات بۆ گوێگرانـی کـە بەلایانـەوە بـاو نەبوو.(٢٢) لەم چوارچێوەیەدا بزوێنەری شەریعەتیی بریتی بوو لە خواستی سیاسیی ئەو لـە بـەرفراوانکردنی ئاسـتی هۆشیاریی شۆڕشـگێڕییو پێـشکەوتووخوازیی بـۆ بازنەیـەك لـە گوێگرانـی کـە گەشـەکردنیان سـوننەتیی بـوو. لەسەروەختی مردنی شەریعەتیی لە ساڵی ١٩٧٧دا ئایەتوڵڵا خومەینیی دانی بەوە دانا کە شـەریعەتیی رێبەراتیـی نەوەیەك لە گەنجانی رۆشنبیری ئێرانیی کردووە لە رێگەی گەڕانەوەیدا بۆ ئیسلام. هەمدیـسان ئایـەتوڵڵا تاڵەقانیـی شەریعەتیی بە بیریارێکی شۆڕشگێڕو ئیسلامیستێکی پێشکەوتووخواز لەقەڵەمداوە.(٢٣)

**حەوتەم: هەڵوێست بەرامبەر بەئیمپریالیزم و زایۆنیزم و چەمکی سەربەخۆیی**

خانمە نووسەری ئێرانیی جولەکە نیکی کیدی پێیوایە عەلی شەریعەتیی یەکەم بیریاری ئیسلامیی ئێرانییە جیاواز لە پیاوانی دینیی کە نووسیویەو گوتوویەو هۆشیاریی داوە بە ژنی ئێرانیی دژ بەو پرۆسە بەردەوامەی بەرۆژئاواییکردن کە رووبەڕوویان دەبێتەوە جا لە رووی شێوازەکانی بیرکردنەوە بێت یاخود جلوبەرگ یاخود ژیانەوە. شەریعەتیی هێرشی کردۆتە سەر ویلایەتەیەکگرتووەکانو تۆمەتباریکردووە بە پشتگیریکردنی کێشەکانی زایۆنیزم بەهۆی دەسەلاتی زایۆنیزم بەسەر سەرمایەداریی رۆژئاواییدا. شەریعەتیی رایوایە کە پەیوەندییەکی ئۆرگانیی هەیە لەنێوان زایۆنیزمو ئیمپریالیزمی رۆژئاوایداو لە ئاخروئۆخری شەستەکانو سەرەتای حەفتاکاندا ئەو پەیوەندییە گەشەیکردووە(٢٤). شەریعەتیی هەوڵیداوە قەناعەت بە گەلی ئێرانیی بهێنێت لەمەڕ خەتەرناکیی ئەو هاوپەیمانێتییە ئیمپریالیستییە زایۆنییە. بیروبۆچوونەکانی شەریعەتیی بەمشێوەیە بەشێکبوو لە هەستو سۆزی دژ بە ویلایەتەیەکگرتووەکان کە لەو قۆناغەی ئێراندا روو لە هەڵکشان بوو.

**هەشتەم: رەهەندی بان نیشتیمانیی لەلای عەلی شەریعەتیی**

عەلی شەریعەتیی خۆی بە یەکێك لە ئەندامەکانی جیهانی ئیسلامیی نێوزەدکردووە کە گەلی ئێرانیی بەشێك بووە لەو جیهانە بۆیەشە نامۆ نییە کە شەریعەتیی چوو بێتە پاڵ ئەو خۆپیشاندانانە کە لە پاریس رێکخرا لەسەروبەندی مانەوەیدا لەوێ وەك پاڵپشتییەك لە هەردوو شۆڕشی گەلی جەزایریی و فەلەستینیی و مافی هەردوولایان لە رزگاربوون لە داگیرکاریی فەرەنسیی زایۆنیی یەك لەدوایەك. لە یەکێك لەو خۆپیشاندانانەدا شەریعەتیی زامارکراو بۆ ماوەی سێ رۆژان لە نەخۆشخانە چارەسەری بۆ کرا. هەمدیسان چالاکییەکانی شەریعەتیی لەنێو مسوڵمانە نائێرانییەکاندا هاریکاربوو لە نووسینی چەندین بابەت لە بلاوکراوەکانی بەرەی رزگاریخوازیی نیشتیمانیی جەزایریی لە پاریس.(٢٥)

پراکتیکەکانی عەلی شەریعەتیی هاوشێوەی بڕوا فیکرییەکانی بوو لە پێشینەیی سەرخانی عەقایدیی هەروەها پەیوەندیی جەدەلیی کارای نێوان فیکرو جوولانەوە. بۆیەشە دوودڵ نەبوو لە چوونە پاڵ جوولانەوەی رزگاریخوازیی ئێران یاخود لەپشتگیریکردنی موجاهیدینی خەلق وەك ئامرازگەلێك بۆ گۆڕانی سیاسیی. ئەمەش بەلگەگەلێکە لەسەر فاکتەری سیاسیی هەنووکەیی کە گرنگییەکەی بەلای شەریعەتییەوە کەمتر نییە لە فاکتەریی فیکریی ئامادەسازیی دوورمەودا. هەمدیسان لێرەدا ئاماژە دەدەین بە سروشتی ئیسلامیی و بژاردەگەرایی پێشەنگگەرای هەردوو جوولانەوەکە، رەنگبێ قەناعەتی بە شەریعەتیی هێنابێت کە هەردووکیان هەلن بۆ رێبەرایەتیکردنی خەبات لەپێناو کۆمەڵگەی لە یەکتاپەرستیدا. هەروەها رەنگبێ شەریعەتیی لەوە تۆقیبێت کە بەشدارینەکردنی لەو رێکخستنانەدا رەنگە پرسیاری لەسەر هوروژاندبێ سەبارەت بە جددیبوونی لە چوونی بۆ نێو کاری سیاسیی و دەرکەوتنی وەك بیریارێکی ئایدیالیست کە ناتوانێت پەیوەندیی بەواقیعەوە بکات. ئەمەش رێك دژیەکبوو لەگەڵ مۆجگاریی خودی شەریعەتیی بۆ رۆشنبیران بە تێکەلاوبوون بە جەماوەرو ژیان لەنێویانداو ئاگاداربوون لەو واقیعەی تێیدان.

وێڕای ئەوەی شەریعەتیی بەدەگمەن خۆی لەقەرەی مێژووی ئێران داوە ئێمە دەبینین بەکارهێنانی مێژووی ئیسلامیی لە سیمینارو کتێبو گفتوگۆکانیدا ڕەنگدانەوەی ئەو بڕوایە بوو بە بەردەوامبوونی ململانێ لەنێوان ستەمو دادپەروەریی لەسەرجەم سەدەکاندا. ئەو ئیستیعارە مێژووییانەی بەکاریهێناوە بۆ دەربازبوون بووە لە سیخوڕیی ساواك لە لایەكو دروستکردنی کاریگەریی لەسەر گوێگرانی کە خاوەن پەروەردەی ئیسلامیی بوون لەلایەکی ترەوە. هەمدیسان چالاکییەکانی شەریعەتیی لە حوسەینیەی ئیرشاد پابەندبوونی پراکتیکیی ئەوی دەرخست لە بووژاندنەوەی فۆرمێکی پێشکەوتووخوازیی لە فیقهو فیکرو زانستە ئیسلامییەکانی تردا. سەرباری بەکارهێنانی میتۆدێکی عەقلانیی لە راڤەی دینییو راگەیاندنی بەردەوامی بڕوای ئەو بە گفتوگۆکردن لەگەڵ بیروبۆچوونو بیروباوەڕە نائیسلامییەکاندا. سیمینارەکانی شەریعەتییو کتێبەکانی هەوڵێکی ئەون لەپێناو کێشانەوەی هەر میسداقیەتێك لەسەرجەم بیروبۆچوونو ئەزموونگەلە نائیسلامییەکان لەبەردەم گوێگرو خوێنەرە مسوڵمانەکانیدا بەتایبەت وەختێك ئەو بیروباوەڕو ئەزموونانە وەك ئەڵتەرناتیڤی ئیسلام پێشنیارکراون. هەمدیسان شەریعەتیی بەدەستی ئەنقەست لە هێندێك حاڵەتدا ئەو بیروبۆچوونو ئەزموونانەی بەشێوەیەکی کەموکورت دەرخستوە.

گوتەو جموجۆڵەکانی عەلی شەریعەتیی دژی دامەزراوەی دینیی ئێرانیی بوو، ئەو گومانی هەبوو لە مەشروعییەتی ئەو دامەزراوەیە لە رووی دینییەوە. هێندێك لە توێژە بالاکانی ئەو دامەزراوەیە بەشێوەیەکی توندڕەوانە وەڵامیان داوەتەوە بەلام کاریگەریی شەریعەتیی روونو ئاشکرا بوو لە نێو قوتابیانی قوتابخانە دینییەکانو گچکە پیاوانی دینیدا، بڕێك لە مەزنە پیاوانی دینیی وەك ئایەتوڵلا خومەینییو ئایەتوڵلا تاڵەقانیی ڕێزیان لێگرتووە، کتێبەکانی شەریعەتییو سیمینارو چالاکییەکانی هیچ گومانێك بەجێناهێڵن لە دوژمنایەتیکردنی رۆژئاواو زایۆنیزم لەسەر هەردوو ئاستی سیاسییو فەرهەنگیی لەیەك ئاستدا.

•••

## سەرچاوەان:


١. ارفاند ابراهمیان، (القوی السیاسیه فی الپوره الایرانیه)، فی ایران ١٩٠٠-١٩٨٠، سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٦.

هەروەها بڕوانە:فاچل رسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٦.

٢. Irfani. Op. cit. p. ٣٨.

هەروەها بڕوانە:.Richard. Op. cit. pp. ٢١٦-٢١٧

هەروەها بڕوانە:.Algar. Op. cit. p. ٩٨

*) صعود وهبوگ التیار الاسلامی التقدمی فی إیران (١٩٦٥-١٩٨١): د. ولید محمود عبدالناصر، دار المستقبل العربی، القاهره، ١٩٩٣.

٣. ارفاند ابراهمیان، (القوی السیاسیه فی الپوره الایرانیه)، فی ایران ١٩٠٠-١٩٨٠، سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٦.

هەروەها بڕوانە:فاچل رسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٦.

٢-Irfani. Op. cit. p. ٣٨.

هەروەها بڕوانە:.Richard. Op. cit. pp. ٢١٦-٢١٧

هەروەها بڕوانە:.Algar. Op. cit. p. ٩٨

Irfani. Op. cit. p. ١٢٠. .٤

هەروەها بڕوانە:.Richard. Op. cit. p. ٢٢٢

هەروەها بڕوانە: .Michael M.J. Fischer from Rellgious Dispute To Revolution (Harvard Massachusctts: Harvard University Press, ١٩٨٠), pp.١٦٥,١٨٠.

Abrahamian, Iran Between Two Revolution, op.cit.p.٤٧٢. .٥

٦. عبدالمؤمن، سەرچاوەی پێشوو، ص١٢٦-١٢٧.

٧. رسول، سەرچاوەی پێشوو، ص٢٨.

٨. ابراهمیان، (القوی السیاسیه فی الپوره الایرانیه)، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢٣.

هەروەها بڕوانە: .Irfani, op.cit.p.١١٩

Irfani, op.cit.pp.١١٩-١٢٠,١٢٦. .٩

Algar, op.cit.p.٨٨. .١٠

هەروەها بڕوانە: رسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦.

Abrahamian, "Ali Shariati: Ideologue of the Iranian Revolution", op. cit. p. .١١ ٢٤.

هەروەها بڕوانە: .Algar, op. cit. p. ٧٥

Irfani, op. cit. p. ١١٩.١٢

هەروەها بڕوانە: .Abrahamian, "Ali Shariati: Ideologue of the Iranian Revolution", op. cit. p. ٤٦٥.

هەروەها بڕوانە: .Mohamed Heykal. The Return of The Ayatollah. (London: Andre Deutsch, ١٩٨١), p. ١٢٩.

هەروەها بڕوانە: Cheryl Benard and Zalmay Khlilzad. "The Government of God", Irans Islamic Republic (New York: Colombia University Press, ١٩٨٤), p. ٤١.

Fischer, op.cit. pp. ١٦٥,١٧٠. .١٣

Benard and Zalmay Khlilzad, op. cit. p. ٤١. .١٤

Fischer, op.cit. pp.١٦٦,١٦٧..١٥

Ibid., op.cit. pp. ٨٣,١٧٤. .١٦

١٧. رسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢.

*) مەلا موحەمەد باقر ئەلمەجلیسیی مەرجیعێکی تەقلیدە لەماوەی قۆناغی سەفەوییداو لەساڵی ١٦٩٩ز مردووە، لەو پیاوە دینیانە بووە کە پاساوی هێناوەتەوە بۆ دەسەڵاتی سەفەوییو راڤەگەلێکی کەموکورتی دەربارەی مەزهەبی شیعە بەکارهێناوە.

١٨. هەمان سەرچاوە، لا ٥٧، ٦٠، ٦١.

هەروەها بڕوانە: . Irfani, op.cit. pp. ٧,١٢

هەروەها بڕوانە:.Benard and Zalmay Khlilzad, op. cit. p. ٣١

هەروەها بڕوانە:.Abrahamian, Iran Between Two Revolution, op.cit.p.٤٧٩

Keddie, op.cit. p. ١٢٣..١٩

هەروەها بڕوانە:.Benard and Zalmay Khlilzad, op. cit. p.٤٥

هەروەها بڕوانە:.Algar, op. cit. pp. ٧٨-٨٨,٨٩

هەروەها بڕوانە: رسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٨، ٥٩، ٦٠-٦١.

Algar, op. cit. pp. ٨٩,٩٣. .٢٠

هەروەها بڕوانە: Abrahamian, "Ali Shariati: Ideologue of the Iranian Revolution", op. cit. p. ٢٨.

٢١. رسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦.

هەروەها بڕوانە:.Fischer, op. cit. p. ٨٣

Keddie, op. cit. p. ١٩٦..٢٢

هەروەها بڕوانە:.Fischer, op. cit. p.١٦٧

٢٣. رسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦.

Benard and Zalmay Khlilzad, op. cit. p.٤٥. .٢٤

Algar, op. cit. p.٨٨. ٢٥

هەروەها بڕوانە: رسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦.

Abrahamian, "Ali Shariati: Ideologue of the Iranian Revolution", op. cit. p. -